# شەڕی گۆگامێلا

## ئەربێلا ٣٣١پ.ز

توێژینەوەیەکی مێژووییە لە هۆکار و دەرئەنجامەکانی

محەمەد ئەمین عەلی عەبدوڵڵا



حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی





بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی

۲۰۱۰

# شەڕی گۆگامێلا (ئەربیلا) ٣٣١پ.ز

## توێژینەوەیەکی مێژوویی لە هۆکار و دەرئەنجامەکانی

محەمەد ئەمین عەلی عبدوڵڵا

٢٠١٠

# شەڕی گۆگامێلا (ئەربیلا) ٣٣١ پ.ز

## توێژینەوەیەکی مێژوویی لە هۆکار و دەرئەنجامەکانی


-بابەت: مێژوویی

- نووسینی: محەمەد ئەمین عەلی عەبدوڵڵا

- پیتچنی: نووسەر

- هەڵەچنی: فەرهاد عەلی

- نەخشەسازیی ناوەوە: ئەکرەم محەمەد ئەمین

- نەخشەسازیی بەرگ: جبار سابیر

- زنجیرەی گشتیی کتێب: ٧٢٠

- سەرپەشتیاری کتێب: کارزان عەبدوڵڵا

- تیراژ: ٥٠٠ دانە

- ژمارەی سپاردن: (١٥٣٤)ی ساڵی(٢٠١٠)ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە.

-چاپخانە: چاپخانەی کەمال

- نرخ: ( ٥٠٠٠) دینار

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران- بەرامبەر کوردستانی نوێ
ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ﴾

صدق الله العظيم

(سورة يوسف الاية ١١١ )

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بــە:

-دایك و باوك و خوشك و براکانم، کە بەمیهری ئەوانەوە هەم.
-بە دوو پارچەی جگەرم، هێما و نیار و هاوسەرم، کە شەونخونی لەگەڵم کێشاو باری خەمەکانی هەڵگرتم .
-هەموو ئەوانەی شەڕ بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و نەهێشتنی شەڕ دەکەن .

# سوپاس و پێزانین

دوای سوپاس و ستایشی یەزدان، کە بواری گەیشتن بەو ئاواتە دێرینەی بۆ رەخساندووم، بەپێویستی دەزانم، رۆڵی هەموو ئەوانە بنرخێنم، کە لەبەرێوەچوونی پرۆسەی خوێندن و تەواوکردنی ئەو نامەیەدا، بەجۆرێك لەجۆرەکان شوێن پەنجەیان دیارە.

سەرەتا سوپاسی بێپایانم بۆ مامۆستا و برای خۆشەویست (پ.ی.د. قادر محەمەد حەسەن)، کە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی نامەکەی گرتە ئەستۆ و بەتەرخانکردنی کاتی زێرینی خۆیی و پێدانی سەرچاوە و خستنەرووی تێبینی و سەرنج و پێشنیار و هاندان و مامەڵەی برایانە و ئارامگرتنی لەبەرانبەر سستی و کەمتەرخەمییەکانم، بەری لەو کەمایەسییانە گرت کە چاوەروان دەکرا لەنامەکەدا رەنگ بدەنەوە.هەروەها سوپاس و رێزی زۆرم بۆ:

* برای گەورەو زیاد لەپێویست دلسۆزم(د.جعفر علی رسول)و برای خوشەویستم(م.سامان حسێن )،کە لەسەرەتاوە تاکۆتایی ئەوەی پێیان کرا بۆیانکردم.

* بەرێز (د. عیماد عەبدولقادر)، کە تێبینییەکانی رێنیشاندەری بەردەوامم بوون. بەرێز ( پ.د. محسین محمد حسن)، کە لە میانەی کۆرسەکانی خوێندن و لە کاتی نووسینی نامەکەشدا دڵسۆزانە پێمانەوە ماندووبوو و بەتەرخانکردنی کات و پێدانی سەرنج و تێبینی وردو بەردەوامی، سوودمەند و ورە بەرزی کردم.

* بەرێزان (پ.د. ارسن موسی رشید) و (پ. ی .عبدالواحد الرمضاني )و ( د. احمد کامل )و (م.یوسف خلف)، کە لە میانەی کۆرسەکاندا وانەیان پێداین.

* بەرێزان کارمەندانی (کتێبخانەکانی بەشی مێژوو و شوێنەوارو کتێبخانەی کۆلیژ) لە کۆلیژی ئەدەبیات و کتێبخانەی(ناوەندی زانکۆی

سەلاحەددین)لەهەولێر، (کتێبخانەی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی رانیە)، (کتێبخانەی گشتی شوینەوار) لە هەولێر و کتێبخانەی (کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی سلێمانی و کتێبخانەی گشتی و شوێنەوار) لە سلێمانی و کتێبخانەی کۆلیژی ئادابی زانکۆی دهۆك .

*هاورێی خۆشەویست و بەقەدەر خۆم دڵسۆز (بۆتان تۆفیق مەغدید) و هەموو ئەو هاورێ و برا وماموٚستا خۆشەویستانەی، کەهەر بە تەنها وشەیەکیش بێت پشتگیری و گیانی یارمەتیدانیان نیشانداوەو لەگۆشەیەکەوە بۆ سەرخستنی ئیشەکەم جێ دەستیان هەبووە.

## هێما کورتکراوەکان

| | |
|---|---|
| ل : | لاپەڕە |
| ب : | بەرگ |
| هتد : | هەتادوایی |
| ص : | الصفحه |
| د.ت : | دون التاريخ |
| د.م : | دون مكان الطبع |
| ج : | الجزء، جلد |
| مج : | مجلد |
| پ.ز | پێش زایین |
| ق.م | قبل الميلاد |

## پێشەکی

ئەگەر بەشێکی قسەکردن لەسەر مێژووی کۆمەڵگاکان، بەمەبەستی وردکردنەوەی پەیوەندیو ململانێ جۆراوجۆرەکانیان و هەڵوەستەکردن بێت، لەسەر ئەو ڕووداو و پێشهاتە کاریگەرانەی، کە ئایندەی هەستیاریان لێوە سەرچاوە گرتووە، ئەوە شەڕیش کە" تێکگیرانێکی سەربازی بەپێکدادان گوزارش لێکراوی سەرچاوە گرتووە لەململانێی نێوان هێزە سیاسیەکان[1]، چ ئەوەی ((کە ئامرازێك بێت لەئامرازەکانی توندوتیژی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان یاخود تێکۆشان بێت بەدوای بەدیهێنانی ئامانج و ئاواتی ڕامیاری یان هەرێمی ))[2]، یان وەك گوتراوە پێکهە لێژانی بەرژەوەندییە گەورەکان بێت کەبەشەڕ نەبێ چارەسەر نەکرێ[3]، وەك دیاردەیەکی هەمیشە ئامادەی ناو مێژوو، بارتەقای ئەوکاریگەرییەی هەیەتی، ئەو شوێنەوارەی بەجێی دێڵێ و ئەو ئایندەیەی لێی دەکەوێتەوە، -کە لە شەڕێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە- تەنها پێکدادانێکی سەربازی نیەوەدەکرێ لێکدانەوەی جیاجیای بۆ بکرێ و لەکایە جۆراوجۆرەکانی دیدا، شوێنی زیاتری بۆ تەرخان بکرێت، بەتایبەت بۆ ئێمە، کە ڕابردووی دوور وتاڵمان لەگەڵیدا هەیە و پێناچێ بەرۆکی ئایندەشمان بەربدات و دەبێ وردتر لای لێبکەینەوە و وەك مێژووش بایەخی زۆرتری پێبدەین، بەئەزبەرکردنی پەندو وانەکانیان ڕێی گەیشتن بەچارەنوس ڕوونتربکەینەوە و مێژووش زیاتر لەوەی بۆ مێژوو بێ، بیکەینە مێژوو بۆ ژیان،

---

[1] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري :الحرب عبر التاريخ ،ترجمة فتحي عبدالله الخمير ، (القاهرة:دت)،ص١٢.

[2] عبدالله حسين محمود :دراسات في التاريخ العسكري ،الطبعة الاولى ،(بيروت:٢٠٠٠)،ص٧٢.

[3] نفس المرجع ،ص٧٣.

دەکرێ جێی تێڕامان و لێکدانەوە بێت، بەتایبەتیش، کەوەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ومرۆیی، مێژوویەکی لەمێژینەی هەیە و بەقەدەر دێرینی مرۆڤ و ژیان کۆنە[٤].

گومانیشی تێدانیە، کە شەڕ بۆخۆی لەسەرینی زەمینەیەکی تایبەتدا هەڵدەگیرسێ و لەداوێنیشیدا ئایندەیەك پەیدا دەبێ، بەوەش ئەڵقەیەکی زنجیرەی مێژوو پێکدەهێنی، کە پەیوەندی ڕابردوو و داهاتووی خۆی هەیە[٥]. ڕاستەقینەیی سەنگ وبەهاو کاریگەری و پێگەشی لەراڤەکردن وتێڕوانینی ئەوانەوە بەدیاردەکەوێت.

گەلێ جاریش شەڕ لەخاکێکدا ڕوودەدات و گەل و میللەتانێك تێوەی دەگلێن، کەدوور و نزیك بەرژەوەندییان تێیدا نیە، کوردستانیش بەهۆی سروشتی جوگرافی و هەڵکەوتنی شوێنەکەی ،کەبەدرێژایی مێژوو جێی چاوتێبڕینی هێزە داگیرکەرەکان بووە، زۆرجار ئەوحاڵەتەی تووش بووە. جگە لەوەش شەڕ بەگشتی و بەتایبەتیش شەڕی داسەپاو، یان ئەوە کە وەك چاکترین میکانیزمی بەرگریکردن لەمانەوەو تاکە شێوازی هەمیشە بەردەست و لەدەستنەچووی تێکۆشان بۆ بەدیهێنانی مافە زەوتکراوەکان، لەمێژووی میللەتی کورددا بەردەوام پەنای بۆ براوە و چاوەڕوانی ئەگەری وا زوو دەست لێبەردان وکەمبوونەوەی ڕۆڵ وفەرامۆشکردنیشی ناکرێت، دەشزانین، کەشوێنەواری هەندێك لەو شەڕانە ئەوەندە دیار و بەرچاوە، کە دەهێنێ و گرنگە بۆ وانە لێوەرگرتن و لەبەرچاوگرتنی خاڵە بەهێز و لاوازەکانیان ،لای ئێمەش لەنێو بزاڤی زانستی و ئەکادیمی نووسینەوەی مێژوودا، لەجیاتی ئەوەی، کەوەك باوە لەچوارچێوەی لێکۆڵینەوەی تردا بەکورتی ئاماژەی پێبکرێ.. گۆشەی تایبەتی شیکارکردنیان بۆتەرخان بکرێت و وەك بابەتی سەربەخۆ بخرێنە ژێر نەشتەری لێکۆڵینەوەو، زەمینەی سەرهەڵدان و دەرهاویشتە جۆراوجۆرەکانیان شرۆڤە بکرێن.

لەو ڕوانگەیەوەو بەوەش شەڕی گۆگامیلا (ئەربیلا)ی ساڵی ٣٣١پ.ز، کە لەسەرخاکی کوردستان ڕوویداوە بەبەهێزترین ودواشەڕی یەکلاکەرەوەی داوە، تێکەڵ و پێکەڵەکانی پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی ومیللەتی گریك، کە هەردووکیان بێگانەبوون بەوخاکە، تیایدا بەرەی دووەم سەرکەوتوو کۆتاییش بەدەسەلاتی بەرەی یەکەم هات، هەرچەندە شەڕێکی

---

[٤] محمد عبدالفتاح ابراهيم :الحرب بين الماضي والحاضر ، (القاهرة:دت)،ص٢٠؛ عبدالله حسين محمود :دراسات في التاريخ العسكري ،ص٦٩.

[٥] حنا خياز :المعارك الفاصلة في التاريخ ،(بيروت:دت)،ص٧.

درێژخایەن نەبوو، بەڵام دیرۆکێکی پڕ بەربەرەکانی لەڕابردووی خۆیدا هەڵگرتبوو وئایندەیەکیشی هێنایە بوون، کەجوگرافیای زۆر چەمکی ئاوێتەی گۆڕان کرد. ڕێڕەوی مێژووی سەردەمی خۆی گۆڕی و وەك گەورەترین شەڕی مێژووی کۆنیش هەژمارکراوەو ئێستاشی لەگەڵدابێ، جێی سەرنجی توێژەران و پسپۆڕانی ئەو بوارەیە و دەگمەنن ئەو کتێبانەی لەسەر مێژووی ڕۆژهەلاتی کۆن نووسرابن، ئاماژەیان پێنەکردبێت...[٦] بۆیە، هەڵدەگرێ لە دووتوێی بابەتێکدا شەن وکەوی هۆکار و دەرەنجامەکانی بکەین وخوێنەرانی کوردیش زیاتر بە وردەکارییەکانی ئاشنابن.

لێرەشەوە هەڵبژاردنی بابەتەکە بۆ توێژینەوە و بایەخەکەی دەردەکەوێت، بەتایبەت، کە ئەو جۆرە بابەتانە بۆ پسپۆڕانی بواری مێژوو لای ئێمە نەبوونەتە خەم و وەکو پێویست لایان لێنەکراوەتەوە، لەمیانەی گەڕانیشماندا بەدوای سەرچاوەکان جگە لەکورتە باسێکی (عبدالله أمین أغا) لەسەر هەمان شەڕ، ئەویش بەگوتەی خۆی بۆ دیاریکردنی شوێنی ڕاستەقینە و ساغکردنەوەی ناوەکەی ئەنجامدراوە[٧]، نەك هەر هیچ هەوڵێکی دیکەی ئەکادیمی–بۆ بەرچاو ڕوونی–مان بەدەست نەکەوت، بگرە لەدیدی زۆر کەسیشەوە کە تەواوکردنی تێزێکی ماستەریان لەتەنها شەڕێکدا بەمەحاڵ دەزانێ، نوقلانەی بێئاکامی و ڕەنج بەخەساری خۆمانمان دەبیست.

هەرچی ئامانجی توێژینەوەکەشە، ئەوەیە لێکدانەوەیەکی وردو ئەکادیمیانەی هۆکاری هەڵگیرسان ویەکلایی بوونەوەو دەرەنجامە جۆراوجۆرەکانی ئەوشەڕە، بەپێی توانا و بێلایەنانە، بە بەکارهێنانی میتۆدی لێکۆڵینەوەی هەمەچەشن بەهیوای پەند لێوەرگرتن. وەك دەروازەیەکیش بۆ لێکۆڵینەوەی فراوانتر و بەپێزتر و وردتر، لەو بوارەدا بخاتە بەردەست، ببێتە سەرەتا و هاندەریش بۆ لێکۆڵەرەوانی بواری مێژوو لەکوردستان، کە ئاوڕی زیاتر لەودیاردەیە بدەنەوە. بەشێتەڵکردنی لایەنە جیاجیاکانی نموونەی لەوجۆرە، پەنجە لەسەر ئەوکایەیانە دابنێین، کەگۆڕانکاری تێیاندا، زەمینەی هەڵگیرسانی شەڕ دەڕەخسێنێ و ئەو میکانیزمانەش بخەینە بەرچاو، کەدەست پێوەگرتن و دەست لێبەردانیان، ئەگەری دووبارەبوونەوە یان ڕێ لێگرتن وئایندەی شەڕە ناچاریەکانیش دیاریدەکەن، لەوێشەوە لەمیانەی پەیامێکی بیرخستنەوەی

---

[٦] حبيب حنونا :تاريخ كرمليس ،مراجعة والاعداد االتراثي بهنام سليمان متي ،تقديم يوسف حبي ،(بغداد:١٩٨٦)،ص٣٢.

[٧] عبدالله امين اغا:معركة اربيلا (كوكميلا٣٣١ ق.م) ،(اربيل:٢٠٠٤)،مقدمة الكتاب.

ناڕاستەوخۆدا بەخەمخۆران وجلەوگیرانی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان بڵێین، کە (ئەوەی وانە لەمێژوو وەرنەگرێت، ناچارە دەبێ بەشە تاڵەکان دووبارە بکاتەوە).

گومانیشی تێدانیە، کەئەنجامدانی کاری لێکۆڵینەوە، لەبواری مێژووی کۆن بەتایبەتیش بۆدیاردەیەکی لەوجۆرە لەئێستای کوردستاندا، ئاسان نیەو بێ گیروگرفت بەڕێوەناچێت. هەرچی ئاستەنگە سەرەکیەکانی بەردەم ئەم هەوڵەی ئێمەش بوون، خۆی لەهەژاری کتێبخانەکانی هەرێم لە بوونی سەرچاوەی پێویست، دژواری بارودۆخی ئاسایشیش کە دەرفەتی ئاسودەگەڕان بەکتێبخانەکانی دیکەی شارەکانی عێراقی کەمدەکردەوە و نەرەخسانی هەلی چوونە دەرەوەو کێشەی نەشارەزایی لەزمانە ئەوروپاییەکان بەتایبەت زمانی یۆنانی ولاتینی، دەبینیەوە.کەڕەنگە زانینی یەکێك لەو زمانانە یان تواناشکانی تەواو بەسەر زمانێکی تری ئەوروپایی، لەوکەمایەسیەی کەم کردبایەوە، کە لەکارەکە تێبینی دەکرێ. جگە لەهەندێ گرفتی تایبەتیش کەلەدەمی لێکۆڵینەوەکەدا هاتنە پێش وبەشێکی ئەوکاتەیان برد، کەدەبوو بۆکارەکەم تەرخانی بکەم .

توێژینەوەکە، لەو پێشەکی و سێ بەش و ئەنجام وپاشکۆکان ولیستی سەرچاوە وکورتەی بابەتەکە بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی، پێکهاتووە و هەربەشێکیش بۆچەند باسێك وئەوانیش بۆچەند تەوەرەیەك دابەشکراون بەمشێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەکەمی پێکهاتووە لە دوو باس، کە هەریەکی چەند تەوەرەیەك لەخۆدەگرێت، یەکەمی تەرخانکراوە بۆ قسەکردن لەسەر سەرهەڵدانی بنەماڵەی ئەخمینی و شوێن و ناو و دیرۆکی سیاسی دەوڵەتەکەیان، بەکورتی ئاماژە بەسەردەمی پاشاکان کراوە تا هاتنی داریوشی سێیەم.

لەباسی دووەمیشدا، وێڕای ئاماژەکردن بەولاتی گریك ومیللەتەکەیی و قۆناغبەندی سەردەمە مێژووییەکان، جەختکراوەتە سەر دەوڵەتە شار و ئاڵوگۆڕی سیستەمی حوکمڕانی، تیایاندا وەك نموونە هەڵوەستە لەسەر شارەکانی ئەسیناو ئەسپارتا کراوە. لەبەرئەوەش، کە مەقدۆنیەکان خۆیان وەك گریك هەژمار دەکرد و بەشداریشیان لە لەشکرکێشیەکەدا ناچاری نەبوو، شارستانیەتی سەردەمی دوای لەشکرکێشیەکەش وەك تەواوکاری مێژوویی لەوەوپێشی شارستانی گریك سەیر دەکەین، بەکارهێنانی دەستەواژەی(گریك)مان لەبەرامبەر دەستەواژەی(مەکدۆنی، یۆنانی...هتد) بە شیاوتر زانی.

باسی دووەمیش تایبەت کراوە بۆ هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شەڕەکە و لە چوار تەوەردا باس لە ململانێی باو و لایەنی سیاسی و زەمینەسازی کەلتوری و هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی و هەندێ لایەنی تر، وەك هۆکار کراوە.

بەشی دووەمیشی، کە تەرخانکراوە بۆ سروشتی شەڕەکە و هۆکارەکانی یەکلایی بوونەوەی، لەدوو باس پێکهاتووە، لە یەکەمیاندا و لەمیانەی چوار تەوەردا باس لەئامادەبوون بۆ شەڕ و لەشکری هەردوولاو ناو و شوێنی شەڕەکە کراوە، باسی دووەمیش، کە دوو تەوەرەی لەخۆگرتووە، لەیەکەمیاندا و لەمیانەی چوار ناونیشاندا (لاوازی ئیمپراتۆرەکانی ئەخمینی و نەبوونی هەستی هاوبەندی و بەرەیەکی یەکگرتووی میللی لەدەوڵەتی ئەخمینیداو شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی ناوخۆو، ڕەوشی کارگێڕی و بارگرانی ئابووری و ئەرکی جۆراوجۆر)، وەك هۆکاری ناڕاستەوخۆی یەکلایی بوونەوەی شەڕ باسیان لێوەکراوە. لە تەوەرەی دووەمیشدا (ڕۆڵی سەرکردەو سوپاو چەك و ورەو گیانی شەڕکردن و چەند مەسەلەیەکی تر) وەك هۆکاری ڕاستەوخۆ بۆ یەکلابوونەوەی شەڕەکە، هەڵوەستەیان لەسەر کراوە.

هەرچی بەشی سێیەمیشە لە چوارچێوەی دووباس وبەچوار تەوەر بەرئەنجامەکانی شەڕی گۆگامێلا لە بوارەکانی (سیاسی و سەربازی و بەڕێوەبردن و، ئابووری و کۆمەڵایەتی، زانستی و ڕۆشنبیری و هونەری، هزری و دینی) دا شیکراونەتەوە و بەزۆریش جەخت لەسەرئەنجامە نزیکەکان کراوەتەوەو شۆڕبوونەوەی قووڵ بەنێو ئەنجامە دوور مەوداکاندا بەپێویست نەزانراوە.

بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە، کە زیاتر هەوڵدراوە هەمەلایەنانە لێی بڕوانرێت سوود لەسەرچاوەی جۆراوجۆری مێژوویی سیاسی و سەربازی و...هتد بەزمانەکانی عەرەبی وفارسی وئینگلیزی و کوردی وەرگیراوە لەنێویشیاندا هەندێك سەرچاوە هەن، کەزیاتر لەهەموان بوونەتە جێی پشت پێبەستن و بۆ ڕاییبوونی کارەکە بەبنەماگیراون، لەنێو ئەوانیشدا لەسەر هەندێکیان هەڵوەستەکردن بەشیاودەزانین سەرەتا کتێبی(ایام الاسکندر الکبیر فی العراق )، کەچەند بەشێکی کتێبی (مێژووی لەشکر کێشیەکانی ئەسکەندەری گەورە)ی نووسەری بەناوبانگی ڕۆمانی (فلافیوس ئاریانوس) لەدایکبووی کۆتایی سەدەی یەکەمی پ.ز و لەلایەن فۆاد جمیل لەدووتوێی هەشتاوچوار لاپەڕەدا بەزمانی عەرەبی وەرگێردراوە، نووسەر بۆ نووسینی کتێبەکەی پشتی بەزانیاری وەرگیراو لە (بەتلیمۆس وئەرستۆ پۆلس)ی دوو ئەفسەری ناوسوپای ئەسکەندەر و چەند مێژوو نووسێکی بەناوبانگ و تۆماری ڕۆژانە و وتارەکانی ئەسکەندەر و ڕۆژمێری

پاشـایەتی، کەلەلایـەن (یومینیـسی)سـکرتێری هەریـەك لـەفلیپ و ئەسـکەندەر ,پـارێزرابوو، وەرگرتـووەو کتێبەکـە لـەبارەی ئەسـکەندەر وەك ڕاسـترین وجێبـاوەڕترین سەرچـاوە (مرجـع)، ئاماژەی پێکراوە نووسەرەکەی بە بەناوبانگترین نووسەر هەژمارکراوە، ئەو بەشەی لەبەردەستدایە تایبەتە بەڕۆژ بەرێکردنی ئەسکەندەر لەعێراق، بۆیـە زۆرتـر لـەو بابەتانـەدا سـوودی لێبینـراوە، کەپەیوەندی بەناوچەکەوە هەبوو.

بەشـی سـێیەمی( الـسیر)هـی(بلوتـارك)ی ژیاننامەنووسـی بـەناوبانگی ڕۆمـانی، کـەنزیکترین بەرواری مردنی بەساڵی ١٢٠زدانراوە . لە لایەن (جرجیس فتح الله)کراوەتە عـەرەبی، یـەکێکی ترە لەو سەرچاوانەی بۆ ئـەم لێکۆڵینەوەیـە پـشتی پێبەسـتراوە، نـاوبراو لەبەرئـەوەی بەکەسـێکی زیندو وقەڵەم وبیر چالاك دەزانرێت، لێکۆڵەرەوان بۆبابـەتی پەیوەندیـدار زۆر دەگەڕێنـەوە سـەری بۆیە پێویست بوو بەهەندی وەربگرین . ئەو بەشـە بـۆ زمـانی فارسـی لەلایـەن (احمـد کـسروی) لـەژێرناوی (کتـاب بلوتـارخ ایرانیـان ویونانیـان) وەرگێـردراوە، بـەلام بەقـسەی خـۆی چـونکە مەبەسـتی لایەنە مێژوویەکە بووە و خۆی لەوەرگێڕانی ئەو بڕگانە بواردووە، کەبەداستانی بێ جێ و ئەفسانەیی زانیون (جەلال تـەقی)ش خـۆی گووتـەنی بـەکورتکراوەیی لـەژێرناوی (شـەڕەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی) کردوویەتی بەکوردی کەچـی وەرگێـردراوە عەرەبییەکـە بەدرێـژی لەسـەر هەموو مەسـەلەکانی نووسـیوە و وەهـا ئاماژەیەکیـشی تێدانیـە بۆیـە ئەگـەر پێویـست نـەبووبێ پەنانەبراوەتە بەر وەرگێردراوە فارسی و کوردیەکە و زیاتر پشت بەعەرەبییەکە بەستراوە.

هـەروەها کتـێبی (الاسـکندر المقـدونی )نووسـراوی بیرەوەرنووسـی هاوچـەرخی ئـەمریکایی هارولدلب، کە مێژوو نووسێکی ناسراوی جیهانیـە شـێوازێکی نووسـینی سەرنجڕاکێـشی هەیـە، بەگووتەی (زبیح الله ی منصوری) کەکتێبەکەی لەژێرناوی (قـدم بقـدم بااسـکندر درکیـشوەری ایران) هێناوەتە سەر زمـانی فارسی، ئەو کتێبە ڕووداوە مێژووییەکان هەر بەو جۆرە باسدەکات، کەڕوویانداوە. وەرگێڕە عەرەبەکانیشی (عبدالجبار الطلیي ومحمد ناصر الـصانع) زانیارییـەکانی ناوکتێبەکـە بـەدوور و درێـژ و ورد (تفاصـیل دقیقـة) ەدەبیـنن، کتێبەکـە بـۆ زمـانی کـوردیش لەفارسیەکەیەوە (عەلی ئەکبەر مـەجیدی ) کتومت وەریگێـڕاوە، بـەلام لەبـەراوردکردنی کتێبـە فارسـی وکوردییەکـە لەگـەڵ عەرەبییەکـە جیـاوازی زۆرم بـەدیکرد، بۆیـەش لـە وەرگرتنـی زانیارییەکانـدا وەرگێـردراوە عەرەبیەکـەمان بەشـیاوتر زانـی و تـا بـۆم کرابـێ پـەنام بۆفارسـی وکوردیەکەی نەبردووە.

لەنێو ئەو کتێبانەی تریش، کەلەسەر ئەسکەندەر نووسراون بۆ توێژینەوەکەی ئێمە بایەخی یەکجار زۆریان هەبوو کتێبی(اسکندر مقدونی )هی (اولریش ولکن)کەبەهەمان ناو( حسن افشار)هێناویەتە سەر زمانی فارسی، تیایدا ڕەوشەکە بەگشتی جوان هەڵسەنگێنراوەو ڕاڤەی پێشهاتەکان کراوە، زانیارییەکانیمان لەو ڕووەوە بەگرنگ زانی کەنووسەرەکە پسپۆڕە و ئەندامی ئەکادیمیای ئەڵمانیا بووەو خوێندنەوەشی لەسەر مێژووی لایەنە جیاوازەکانی ژیاریی کۆن هەیە و (یوجین بورزا)ش، کەپێداچونەوەی بۆ کردووە دکتۆرای لەزانکۆی شیکاگۆ لەبواری مێژووی یۆنانی کۆن وئەسکەندەری مەکدۆنی هەیە.

هەروەها (الاسکندر الکبیر )ی (الاب میتودیوس زهیراتی )، کە بەناونیشانی سەرنجڕاکێش و بەپشتبەستن بەسەرچاوەی جۆراوجۆر ولێکدانەوەی هەمەچەشن، بەڵام پچڕپچڕ بابەتەکەی بەرهەمهێناوەو سەرسامیشی بەئەسکەندەر و سەردەمی دوای مردنیەوە دیارە، یەکێکی دیکەیە لەسەرچاوە زۆر بەکارهاتووەکان و ڕاڤەکردنی ئەو وەك کەسایەتیەکی ئانی بۆ کردەوەکانی کەسێکی بڕوادار بەئەفسانە و خۆبەکوڕی خوازان و هاتنەوەی زۆربەی ڕاکانیشی لەگەڵ ڕای نووسەرانی تر بۆ کارەکەی ئێمە جێی بەهەند گرتن بوو.

کتێبی (الاسکندر الکبیر المقدونی) کە (بسام العسلی) نووسیویەتی وبەئاماژەدان بە گەلێك سەرچاوە ئەگەرچی بەشێوەی پەڕەگرافی وەرگیرا و ئاماژەی پێنەکردوون و بەگشتی سەرچاوەکانی نوسیووە، بەڵام ڕەوشی لەشکرکێشیەکە و بەرەکانی شەڕ و ڕابردووی ململانێ پێگەی ئەسکەندەری لەمێژوودا جوان لێکداوەتەوە بەقەدەر خۆی هەڵسەنگاندنی وردی ئەنجامداوە بۆ زۆر جێگای باسەکەی ئێمە بەکەڵك بوو.

وە کتێبی (الاسکندر الاکبر) ی (چون جنتر ) ئەمریکاییە. وتراوە، کە لەشێوازی ئەو نووسەرەدا زۆرتر پشت بەگەڕان و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ناوچەکان بەستراوە، هەر لەسەر ئەوبنەمایە و لەمیانی گەڕانیشی بەشار و وڵاتان و بینینی کەسایەتی سیاسی، وە ئەستۆگرتنی کاری جۆراوجۆر بەرهەمەکانی نووسیون دەشێ لەو کتێبەشدا پەیڕەوی هەمان شێوازی کردبێ بۆیە ئاماژەی بەهیچ سەرچاوەیەك نەکردووە، بەڵام بەهۆی کەم هەست پێکردنی ناکۆکی زانیاری لەگەڵ هی سەرچاوەکانی دیکەدا لەبەئەنجام گەیاندنی کارەکەی ئێمەدا شوێنی خۆی گرت .بەتایبەتیش کەوەرگێڕە عەرەبیەکەی (فاروق حافظ القاضي) پسپۆڕی لە مێژووی یۆنان و ڕۆمان هەیە ئەندامی کۆمەڵەی میسریش بووە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی.

کتێبی (مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة)هەردوو بەرگەکەی- (طه باقر)ە تائێستاش یەکێکە لەگرنگترین کتێبەکان، کە گرنگی بەشارستانیە کۆنەکانداوە، وەك خۆی وتویەتی بەرهەمی زیاتر لەچارەکە سەدەیەکی خەریکبوونی بووە بەپشکنین و لێکۆڵینەوەو وانە وتنەوەو بلاّوکردنەوە. بە پشتبەستن بەسەرچاوەی جۆراوجۆر بابەتەکەی لە دوو بەرگدا بەپوختی نوسیوە و لێکداوەتەوەو لەباسی هەردووبەرەی شەڕی بەشی یەکەمی توێژینەوەکە و زۆربەی شوێنەکانی تریشدا سوودی لێبینراوە، جێی ئاماژەیە کە بەبەراوردکردن لەگەڵ کتێبەکانی دیکە لەنووسینی هەندێك بەرواردا جیاوازی هەیە.

کتێبی (العصور القديمه) ی نووسەری بەناوبانگی ئەمریکایی (جایمس هنری برستد)ە، کە لەلایەن( داود قوربان)ەوە کراوەتە عەرەبی کتێبێکی زۆر پێویست بوو بۆ لێکۆڵینەوەکە بەتایبەت ئەو بەشانەی بۆ قسەکردن لەسەر ئەسکەندەر و شارستانی هیلینستی تەرخانی کردبوو. ئەو ئەگەرچی برگەبڕگە و لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆردا بەکورتی هەڵوێستەی لەسەر بابەتەکان کردووەو، بەلاّم زانیاری زۆری تێدابوو کەهەندێکیانمان تەنیا لەوێدا بینیوە.

کتێبی (تاريخ ايران باستان جلدی دوەم) ی مێژوونووسی گەورەی ئێرانی (حسن پیرنیا) کەکتێبێکی گرنگ و بەسوود بوو بۆ توێژینەوەکە و بەتایبەت، کە ئەو بەدرێژی لەسەر بابەتەکان و لەسەر هەردووبەرەی شەڕ لەوشوێنەدا، کەبۆ قسەکردن لەسەر دارای سێیەم تەرخانکراوە لێکۆڵینەوەی کردووە ئەو لەدرێژەی نووسینەکەیدا ئەگەر بەنیازبووبێت لەبەرژەوەندی پاشاکانی ئەخمینی و ولاّتەکەیدا لەمیانەی لەشکرکێشی شەڕی گۆگمیلادا بدوێت یان کەمایسی وخراپە و حاڵەتێکی نابەجێی ئەسکەندەر وسوپاکەی نیشانبدات، هەوڵیداوە پشت بەگوتەی مێژوونووسانی کۆنی نائێرانی ببەستێت.

کتێبی (تاريخ اليونان)هی (محمد كامل عياد)، کەبەپشتبەستن بەسەرچاوەی عەرەبی و ئەورووپی جۆراوجۆر، بەزمانی عەرەبی چاپی کردووە خۆی وتەنی لەلایەن فێرخوازان و ڕۆشنبیران پێشوازی گەرمی لێکراوەو چەند جارێك چاپکراوەتەوە نووسەر بابەتی یۆنان لەدوای مێژووی نەتەوەکەی بەگرنگترین بابەتی مێژوویی دەزانێ کەشایەنی بایەخ پێدانێ دەوڵەمەندی کتێبەکەش بەزانیاری لەبارەی مێژووی کۆنی گریك و ڕووداوە سیاسیەکانی پێش سەردەمی ئەسکەندەر وایکردووەو لەباسی گریکەکانی ناو بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە زۆر شوێنی تریش سوودی لێببینین.

هەروەها (اليونان مقدمة في التاريخ الحضاري)ی (لطفي عبدالوهاب يحيى) كە دكتۆرای لەفەلسەفەی مێژوودا هەیە و مامۆستای مێژووی شارستانی بووە لەزانكۆكانی ئەسكەندەریە و بەیروت كتێبەكەی بەدرێژی و بەجوانی نوسیووە میتۆدی مێژووی شارستانی پەیڕەوكردووە، كەبەتەنها جەخت ناكاتە سەرلایەنی سیاسی، بەڵكو توێژەر بەتێڕوانینێكی گشتگیر لە هەموولایەنەكانی ئابووری و سیاسی وفكری و هونەری لەكۆمەڵگا دەڕوانێت و بەكارلێكردنی هەموو ئەوانەش مێژووی ڕاستەقینەی كۆمەڵگا بەرهەمدێت. ئەوكتێبەش باس لەسەردەمەكانی پێش دەركەوتنی ئەسكەندەردەكات و لەبەشی یەكەمی توێژینەوەكە و لەباسی گریكەكاندا و زۆر جێگای تریش بەكەڵكی لێكۆڵینەوەكەمان هات.

(الحرب عبر التاريخ)ی(الفيلد مارشاڵ فيكونت مونتجميری )و یەك لەوسەرچاوە گرنگە سەربازیانە بوو، كەبۆ وردەكارییەكانی لایەنی سەربازی پەیوەست بەپێداویستیەكانی سەركەوتن لەشەڕو شەڕی گۆگامیلادا زۆر سوودی لێبینراوە گرنگی سەرچاوەكە لەوەدایە، كەنووسەرەكە خۆی فەرماندەیەكی سەربازی بووە و بەشداری شەڕەكانی یەكەم و دووەمی جیهانیشی كردووە و بەپشتبەستن بەو ئەزموونەی لەبواری سەربازی هەیبووە و لایەنی چاك وخراپی پێشهاتەكانی هەڵسەنگاندووەو سەرسامیشی بەئەسكەندەر پێوەدیارە.

كتێبەكانی (تاريخ مردم ايران)و(روزگاران)ی (عبدالحسين زرين كوب)، كەخۆی نووسەرێكی ئێرانیە و كەمێكیش بەلای ئەواندا دەیشكێنی، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا چاوی لەكەموكوڕی وخراپكاریانە نەپۆشیووە، كەبوونەتە هەوێنی هەرسهێنانی دەوڵەتی ئەخمینی بۆ قسەكردن لەسەر مێژووی ئەو دەوڵەتە لەمیانەی نامەكەدا سوودیان لێبینراوە.

(معركة اربيلا- كوكميلا-٣٣١ ق.م)، كەكورتە لێكۆڵینەوەیەكی (عبدالله امين اغا)یە بۆساغكردنەوەی ناو و شوێنی شەڕەكە ئەنجامیداوە، بەهێنانەوەی بەڵگە و پشتبەستن بەسەرچاوە لەسەر سەپاندنی ڕای خۆی و ڕەتكردنەوەی ڕای خەڵكی دیكە وەك شوێنی شەڕەكە هەڵوەستەی لەسەردەكەن، تەنها پێدادەگرێت لەو ڕووەشەوە بەئێمە تەبانیە" كە بڕیاری ڕەها لەسەر هیچ شوێنێك بۆ ئەو شەڕە بەڕاست تێناگەین لەحاڵی ئێستادا دەنا بەگشتی لێكۆڵینەوەكە بەبایەخە و وەلاّمی زۆر لەو پرسانەی تێدابوو كە عەوداڵی زانینی بووین، هەمان نەخشەشە، كە دەبوو بۆ ناو و شوێنی شەڕی گۆگامیلا كە لە توێژینەوەكەی ئێمەدا جێی بۆكراوەتەوە، بگێڕێتەبەر بۆیە پشت پێبەستنمان پێی لەو ڕووەوە زۆر بەپێویست زانی.

# بەشــی یەکـــەم

## پێـشینەی میــژوویی هــەردوو بــەرەی شــەڕی گۆگــامێلا (ئــەربیلا) ٣٣١پ.ز و هۆکارەکانی هەڵگیرسانی.

باسی یەکەم:کورتە باسێکی مێژوویی لەبارەی هەردووبەرەی شەڕ

باسی دووەم:هـۆکارەکانـی هـەڵگیرسانی شــەڕی گۆگامــێلا

## بەشی یەکەم

## پێشینەی مێژوویی هەردوو بەرەی شەڕی گۆگامێلا(ئەربیلا) ٣٣١پ.ز و هۆکارەکانی هەڵگیرسانی

### باسی یەکەم/ کورتە باسێکی مێژوویی لەبارەی هەردوو بەرەی شەڕ

### تەوەرەی یەکەم: فارسە ئەخمینیەکان

لەراستیدا، سەردەمی پێش کۆرش لە مێژووی ئەخمینیەکاندا تارادەیەك نادیارەو زانیارییەکی زۆر لەبەردەستدا نییە، ڕەنگە هۆیەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئاشوری و بابلیەکان لە تۆمارە فەرمیەکانیاندا شتێکی وایان لەسەر هێزە ڕامیارییە بچوکەکانی ئێران باس نەکردووە، هەرێمی فارس، دواتر بوو بە ناوەندی دەوڵەتی ئەخمینی، لەوکاتەدا لەژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی میدیا[٨] دابوو[٩] بەتایبەتیش ئەگەر زانیمان، کە سەرچاوە لەسەر مێژووی فارسی کۆن زۆر کەمە و ئەوەشی هەیە پشتی بە ئاماژەی پەرش وبڵاوی نووسراوەکانی پادشایەتی ئەو دەوڵەتانە و نووسینی مێژوونووسە یۆنانیەکان بەستووە، کەزۆر تێکەڵی ئەندێشە بوون وجێی پشت پێبەستن

---

[٨]میدیەکان: گەلێکی (هیندی-ئاری)ن لە دەوروبەری هەزاری پ.ز لەلاکانی ڕۆژئاواو باکوری بانی ئێران نیشتەجێ بوون و ئەکباتانا(همدان) پایتەختی هەرێمەکەیان بووە و ناو هاتنیان لەتۆمارەکانی ئاشوریدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (٩ی پ.ن). کلین دانیال: موسوعة علم الاثار، ج٢، ص٥٣٩. بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە: ئی.م.دیاکونوف: میدیا،وەرگێڕانی بورهان قانع،(ب ش:١٩٧٨).

[٩] سامی سعیدالاحمد و رضا جواد الهاشمي: تاريخ الشرق الادنى القديم (ايران والاناضول)، (بغداد:دت)، ص٩٥.

نییە[10]، بەڵام ئەوە دەزانین فارسەکانیش ئاریایی ڕەگەزن[11] و لەوانەن، کەبەنەتەوەکانی (هیندو- ئەورووپی ) ناسراون[12] دوای کۆچکردنیان لەزێدی خۆیان، کە بەدروستی نازانرێ کوێیە، بەڵام بەگشتی بریتیە لە ناوچەی هەڵکەوتوو لە باشوری ڕوسیا یان ئەو ناوچەیەی، کە لەباشوری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا بە بەشەکانی باشوری دەریایی دەریای ڕەش ( پۆنت Pontus)دا تێدەپەڕێ ، لە ناوەڕاستی ئەورووپاش بۆ ڕۆژئاوای ئۆراڵ، لەڕۆژهەڵات درێژدەبێتەوە[13] و لەسەرەتای هەزارەی یەکەمی پ.ز هاتوونەتە بانی ئێران و لەهەرێمی بارسوا (Parsua) ی هەڵکەوتوو[14] لەباشوری ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ نیشتەجێ بوون[15] بەڵام بەگوێرەی یەکێك لەسەرچاوەکان دەبێ گوزەرانی فارسەکان لەکەناری دەریاچەی ورمێ بەهۆی فشاری ئۆرارتۆیەکان[16] لەلای باکوری ڕۆژئاواو میدیایەکان لەڕۆژهەڵات و باشور لەگەڵ دژواری ڕووبەڕوو بووبن، بۆیە ناچار بەرەو باشور کۆچیان کردووە[17]. سەرچاوەی تریش هەیە، کە فشاری

---

[10] طه باقر واخرون :تاريخ ايران القديم ، (بغداد:١٩٧٩)،ص٢٥.

[11] عبدالله رازي: تاريخ كامل ايران،(تهران:١٣٧٨)، ص٢٠ ؛حنا خباز ،: المعارك الفاصلة في التاريخ (بيروت:دت)،ص٩.

[12] طه باقر: مقدمه في تاريخ الحضارات القديمة،(بغداد:١٩٧٣)،ج١ ،ص٥٧٢ ؛عبدالله رازى،تاريخ كامل،ص٢٠ ؛عامرسليمان و احمد مالك الفتيان: محاضرات في التاريخ القديم، (موصل:دت)،ص٢١١ ؛ عبدالرزاق محمد اسود: موسوعة العراق السياسية ، (بيروت:١٩٨٦)،ص١٩٤ .

[13] طه باقر واخرون:تاريخ ايران قديم، ص٢٥.

[14] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١ ،ص٥٧٢ ؛هايدماري كخ:اززبان داريوش، (تهران:١٣٨٥)،ص١١؛ سامي ريحانا:المجتمعات العسكرية عبر التاريخ ،(بيروت:١٩٩٦)،ص٩٥.

[15] طه باقر واخرون: تاريخ ايران قديم، ص٤٥

[16] بەمەملەکەتێك دەوترا کە لە هەرێمی بانی ئەرمینیا تاباشوری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش و باشوری ڕۆژئاوای دەریاچەی قەزوین پێکهاتبوو، هەندێك جار( بەنایری NAIRI) ناوی هاتووە ، بەڵام ناوهێنانی ئۆرارتۆ بۆ یەکەمجار لەلایەن ئاشوریەکانەوە بۆسەردەمی شلمانسەری یەکەم(١٢٧٣-١٢٤٤پ.ز) دەگەڕێتەوە، ئۆرارتۆییەکان خۆیان بە(بیاینیلیBIANILI)ناوبردووەو،ئارامۆ وەك یەکەم پاشای یەککەری دەوڵەتە بچوکەکانی ئەومیللەتە ناسراوە بڕوانە: جباغ قابلو وعيد مرعي: الموسوعة العربية ( دمشق: ٢٠٠٥)،مج١،ص١-٣ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە عماد شاكر احمد:مملكة اورارتو ٨٨٠-٧١٤ق.م دراسة سياسية حضارية، رساله ماجستيرغيرمنشوره، مقدمه الى كليه الاداب ،جامعه صلاح الدين،٢٠٠٩.

[17] هايد ماري كخ : از زبان داريوش ،ص١١؛محمد ابوالمحاسن عصفور:معالم التاريخ الشرق الادنى القديم،(بيروت:١٩٨١)،ص٤٠٨.

ئوراتوریەکان بەتەنیا هۆکاری کۆچکردنیان دەزانیّ، ئەو پێی وایە لەدەوروبەری ٨٠٠ پ.ز لە هەرێمی (پارسوا) ڕووە و باشوور ڕۆیشتون و لەناوچەی سەقز (Saqax) (کە کەوتۆتە کوردستانی ئێرانی ئێستا) نیشتەجێ بوون[١٨]، ئەوەشی پشتی ڕای دووەم دەگرێ، ئاماژەکردنی سەرچاوەکانی ترە، بۆ پتەوی پەیوەندی نێوان پارس و مادەکان لە تێکڕای قۆناغەکانی کۆچکردن بەتایبەت لەناو بانی ئێراندا، بەشێوەیەك سەربەخۆیی ناوخۆ و نەیاری هەندێك لەسەرکردەکانیش نەبۆتە کۆسپ لەبەردەم فراوانی و بەردەوامی ئەو پەیوەندییەدا[١٩].

بەپێی ئەو زانیاریانەی لەبەردەستدان، دەبێ لەدەوروبەری٧٠٠ پ.ز . بەدرێژایی چیای بەختیاری لەپێدەشتەکانی نزیك ناوچەی عیلامیەکان[٢٠] نیشتەجێ بووبن[٢١] لەگوزارشی سەنحاریب (٧٠٤-٦٨١پ.ز) ی پادشای ئاشووریش لە ٦٩١ پ . ز دا دەردەکەوێت کە پارسەکان شانبەشانی عیلامیەکان دژی ئەوان شەڕیان کردووە[٢٢] بۆیە سوود وەرگرتن لەهێزی پارسەکان دژی ئاشوریەکان لەپاڵ ململانێ ناوخۆیان[٢٣] ڕەنگە وای لەعیلامیەکان کردبێ کە لەهەمبەر هاتن و نیشتەجێ بوونیان لەناوچەکەدا، ڕێگری نەکەن، تاوای لێهاتبوو بەپێی تابلۆیەك ، کە لەشوش دۆزراوەتەوە پارسەکان لەدەوروبەری سالّی ٦٨٥پ.ز بەسەرانسەری ولاّتی عیلامدا بلاّو ببنەوە[٢٤] ئەوکاتەش عیلامیەکان (سەدەی حەوتەمی پێش

[١٨] طه باقر واخرون :تاریخ ایران القدیم ،ص٤٥.

[١٩] عبدالحسین زرین کوب: تاریخ مردم ایران،(تهران:١٣٨١) ، ج١ ، ص٨١-٨٢ ؛ محمد مەردۆخی کوردستانی: مێژووی کورد وکوردستان، وەرگێڕانی عبدالکریم محمد سعید،(سلێمانی:٢٠٠٧)، ص٦٨.

[٢٠]ناوچەی عیلامیەکان ئێستا بەخوزستان ناو دەبرێت و لە باشوری ڕۆژئاوای ئێران و لەسەر سنووری نێوان عێراق و ئێران هەڵکەوتووە، شوش(Susa) سوسە سەرەکیترین شار و پایتەختی ئەو هەرێمەیە. کلین دانیال: موسوعة علم الاثار، ترجمة: لیون یوسف، (بغداد: ١٩٩٠)، ج٢، ص٤١٠-٤١١.

[٢١] طه باقر و اخرون: تاریخ ایران قدیم ،ص٤٥

[٢٢] هایدماری کخ: از زبان داریوش ،ص١٣ ؛طه باقر و اخرون: تاریخ ایران قدیم ،ص٤٦

[٢٣] عبدالحسین زرین کوب : تاریخ مردم ایران،ج١ ، ص٩٧.

[٢٤] هایدماری کخ : از زبان داریوش، ص١٣.

زاین)بەهۆی هێرشی بەردەوامی ئاشوریەکان لەلاوازیدا بوون بەرەو هەڵوەشان دەچوون[٢٥].
دواتریش ، کە لەسەردەمی ئاشور پانیپاڵ (٦٦٨-٦٢٧پ.ز) پادشای ئاشوردا دەست بەسەر قەوارەی ڕامیاریان داگیرا[٢٦]، دەرفەت لەبەردەم ئەخمینیەکان کرایەوە تادەسەڵاتیان لەناوچەکەدا بچەسپێنن ودەوڵەت پێکبهێنن[٢٧].

واتا ئیتر بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی ڕامیاری هیچ بەربەستێکیان لەپێش نەبوو[٢٨] ئەوەبوو لەناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی بنەماڵەیەکی پادشایەتی دەرکەوت ،کە لەلایەن پیاوێك بەناوی (هاخمانیش) ڕێبەرایەتی دەکرا کە هەموو پادشاکانی بنەماڵەی ئەخمینی لەو کەوتوونەتەوە[٢٩].
ڕایەکیش هەیە پێی وایە، کە فارسەکان تیرەیەك بوون لەبەر پەیوەندی بەهێزیان بەمیدیەکانەوە تاکەکانیان لەلایەن ئەوانەوە وەك فەرمانڕەوا بەدەشتەکانی عیلامدا بلاوکرانەتەوە دواتر سەرۆکەکانی ئەوتیرەیە ،کە بەئەخمینیەکان ناسراون ، بوونە دەسەلاتدار بەسەر ئەو ناوچەیەدا ، کە (ئەنشان) یان (فارسی) پێگوتراوە، واتا دوای یەك پێگرتنی هۆزە فارسەکان لەدواداواکانی( سەدەی هەشتەمی پ.ز.)دا ئەخمێنس (Achaimenes) وەك

---

[٢٥] عامر سليمان: العراق فى التاريخ القديم (موجز التاريخ السياسى)،(موصل:دت) ،ج١ ، ص٢٦٠.
[٢٦] سامی سعيدالاحمد و جمال رشيد احمد : تاريخ الشرق القديم، (بغداد:١٩٨٨)،ص٣٦٤.
[٢٧] عامر سليمان : العراق في التاريخ القديم،ج١، ص٢٦٠
[٢٨] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١ ، ص٥٧٣؛ سامي سعيدالاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم ، ص٣٦٤؛ عبدالرزاق محمد اسود: موسوعة العراق السياسية،ج١، ص١٩٤.
[٢٩] سير برسي سايكس: تاريخ ايران ،ترجمه محمد تقى فخرداغى گەيلانى، (تهران:١٣٤٣)، ج١، ص١٨٥؛ رضاشعبانى: مرور كوتاه بر تارخ ايران از اغاز عصر ماد تاپايان دوران قاجاريه،(تهران:١٣٨٠)، ص٣٠ ؛طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، ج١، ص٥٧٣ ؛ عبدالرزاق محمد اسود: موسوعة العراق السياسية، ج١، ص١٩٤

یەکەمین پادشا[٣٠]. بەسوود وەرگرتن لەسەرقاڵی عیلامیەکان بە بەرگریکردن لەهێرشەکانی ئاشوری تارادەیەکیش دووریان لەناوەندی دەسەڵاتی میدیەکان[٣١] یەکەمین دەوڵەتی بۆ فارسەکان بەناوی (بارسوماش) دروستکردووە و وردە وردەش دزەیان کردۆتە ناو عیلامیەکان و توانیویانە ملکەچی دەسەڵاتی خۆیانیان بکەن و واش پێدەچێ، کەماوەی دەسەڵاتی ئەو پادشایە لەنێوان چارەکی کۆتایی سەدەی هەشت و سەرەتایی سەدەی حەوتەمدا بووبێ و بارەگای حوکمڕانیشی لەپێدەشتەکانی چیای بەختیاری بە دووری (٤٠)کیلۆمەتر لەشوشتر هەڵکەوتبوو[٣٢].

هەموو سەرچاوەکانیش لەسەر ئەوە کۆکن ، کە لەناوی ئەوەوەیە فارسەکان بە (ئەخمینی) ناوزەدکراون[٣٣]، بەڵام لەبارەی ناوهێنانیان بەفارس یان پارس یان برسیس ئەوە هەندێك پێیان وایە لەناوی کۆنی ئەو هۆزەوەیە کە ئەخمینیەکانی بۆ دەگەڕێنەوە[٣٤] و هەشە پێی وایە ، کە رەنگە لەناوی بارسوای باشوری رۆژئاوای دەریاچەی (ورمێ) وە هاتبێ و ناونانی گەلانیش بەپێی شوێنی زیندەگانیان شتێکی ئاسایی بووە ، لەمێژووی کۆندا[٣٥] ، یەکەمین ئاماژەی مێژوویش لەباسی هۆزی فارسدا بۆسەدەی نۆیەم و نووسراوەکانی شەلمانسەری

---

[٣٠] طه باقر و اخرون: تاريخ ايران قديم،ص٤٦,٤٥؛سيربرسي سايكس: تاريخ ايران ج١، ص١٨٥ .

[٣١] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة،ج٢،ص٢٩٨؛حسن كريم جاف الوجيز في تاريخ ايران دراسة في التاريخ السياسي،(بغداد:٢٠٠٢)، ج١، ص٣٨.

[٣٢] طه باقر و اخرون: تاريخ ايران قديم، ص٤٦.

[٣٣] سايكس: تاريخ ايران، ج١، ص١٨٥ ؛عامر سليمان واحمد مالك الفتيان: محاضرات في التاريخ القديم، ص٢١١؛ البرت تن آيك اومستد: تاريخ شاهنشاهى هخامنشى، ترجمة محمد مقدم، (تهران:١٣٨٣)، ص٣٢ .

[٣٤] عامر سليمان : العراق في التاريخ القديم ، ج١، ص٢٦٠.

[٣٥]جمال رشيد احمد و فوزى رشيد: تاريخ الكرد القديم، (اربيل:١٩٩٠)، ص١١٢.

سێیەم(٨٥٨-٨٢٤پ.ز) پاشای ئاشوری بۆ ساڵی ٨٤٣ پ.ز دەگەڕێتەوە، کە ئەو هەواڵی هێرشی خۆی لە(٨٤٤ پ.ز) بۆ وڵاتی پارسوا، تێدا تۆمارکردووە[٣٦].

دوای ئەخمینیش چشبش یان (تسبس)ی کوڕی جێی گرتۆتەوە ، کە ماوەی فەرمانڕەوایەتی لەنێوان ٦٧٥( - ٦٥٠ پ.ز)دا بووە[٣٧] یان ( ٦٧٥ – ٦٤٠پ.ز ) نازناوی پادشای ئەنشان[٣٨]ی لەخۆی ناوە[٣٩] کاتێ تێبینی فراوان بوون و پایەدار بوونی دەسەڵاتی فراورتیس Fravartish (خشاثریتا)ی پادشای میدی کردووە، دانی پێداناوە و گوێڕایەڵی خۆی پێشانداوە[٤٠]، بەڵام بەمردنی ئەو پادشایە وهێرش کردنی ئەسکیسەکان[٤١] بۆ سەر وڵاتی ماد پێگەی چشبش بەهێزتر بوو و دوای مردنیشی مەملەکەتەکەی لەنێوان دوو کوڕەکەی ئاریامنا (٦٤٠-٥٩٠ پ.ز) و (کورشی یەکەم ٦٤٠-٦٠٠ پ.ز) دابەش بوو[٤٢] کۆرش بەڵای

---

[٣٦] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٨١ ؛سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ شرق القديم، ص٣٦٤؛ جابر خليل ابراهيم: منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاخميني والسلوقي والفرثي، موسوعة الموصل الحضارية، (الموصل:١٩٩١)، مج١، ص١٢٨.

[٣٧] طه باقر و اخرون: تاريخ ايران قديم، ص٤٦ .

[٣٨] ئەنشان: ناوچەیەکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای سوسە لەسەر ڕووباری (کرخە)، ئەم ناوە لە نووسراوەکانی سەردەمی پاشایەکانی دۆڵی ڕافدەیندا هاتووە بەتایبەت هەندێك پاشایانی ئەکەدی ودواتر .

[٣٩] سامي سعيد الاحمد و رضاجواد الهاشمي: تاريخ الشرق الادنى القديم، ص٩٦ ؛ عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٩٧؛ سامي سعيد الاحمد وجمال رشيداحمد: تاريخ شرق القديم، ص٣٧١ .

[٤٠] سامي سعيد الاحمد و جمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم، ص٣٧١؛ عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران،ج١، ص٩٧ ؛ طه باقر: تاريخ ايران قديم، ص٤٦.

[٤١] Scythians سکیس ، سکیث(سیث)،کە (ئەشقۆنی)یشیان پێ دەڵێن: گروپێکی سەر بەگەلانی ئاری، نیشتەجێی باشوری ڕوسیا و ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست بوون بەردەوام لەگەل ئەخمینیەکان لە شەڕدابوون و ڕەچەڵەکی ئەو ڕوسیانەن ، کەئێستا لە ڕوسیا دەژین: جمس بيكنغام: رحلتي الى العراق سنه١٨١٦، (بغداد:١٩٦٨)، ص١٤٧-١٤٨،هامش ٦.

[٤٢] سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ شرق القديم، ص٣٧١ ؛ البرتن ايك اومستد: تاريخ شاهنشاهى هخامنشى، ص٣٣ ؛ بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتریش بڕوانە: طه باقر و اخرون، ايران قديم ،ص٤٦ – ٤٧ ؛عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٩٧-٩٨.

ئاشوریەکاندا دایشکاند و وەك نیشانەی نیەت پاکی و گوێ لەمستی بۆیان( ئارکۆ)ی کوڕە گەورەکەی بەهەندێك دیارییەوە بۆ پادشای ئاشوری نارد[٤٣]، بەڵام کە ماد لەژێر فەرمانڕەوایەتی کیاکسار (هوخشترە)دا وەك یەکێك لەدەوڵەتە بەهێزەکانی ئەو سەردەمە دەرکەوت[٤٤] و ململانێی لەگەڵ ئەسکیسەکان یەکلایی کردەوە و بەهاوپەیمانیەتی بابلیەکان لە(٦١٢ پ.ز) نەینوای گرت و کۆتایی بەدەسەڵاتی ئاشوری هات [٤٥]، بارودۆخ گۆڕا و ئیتر پادشاکانی ئەخمینی بوونە (تابعی)پاشکۆی دەوڵەتی میدی[٤٦] لەدوای (ئاریامنا) (ارسام)ی کوڕی جێی گرتەوە ئەویش بۆ (قەمبیز)ی یەکەمی کوڕی (کۆرش) وازی لەدەسەڵات هێنا ، کە لەجێی باوکی دانیشتبوو[٤٧] دوای ئەویش کورشی دووەم (٥٥٩ ـ٥٣٠ پ.ز) دەسەڵاتی وەرگرت ، کە بەکورشی گەورە ناسراوە ، ئەو بەئاواتی (طموح) بەرز و توانای ڕامیاری و سەربازی لە پادشا یەکەمینەکانی ئەخمینی جیادەکرێتەوە و ئەو بارودۆخەش ، کە هێزە گەورەکانی دراوسێی وەك بابل و ماد ، تێی کەوت بوون ، یارمەتیدەری بەدیهاتنی ئاواتە ڕامیاری و سەربازیەکانی بوون[٤٨]، کۆرش لەکاتێکدا دەرکەوت ، کە دەوڵەتی ئاشوری ڕووخابوو و بابل گرفتاری ناکۆکی ناوخۆ بوو و ئۆراتۆر و عیلام ڕۆڵی خۆیان لەدەستدابوو، جولەکەکانیش ، کە لەلایەن بابلیەکانەوە گیرابوون و دوورخرابوونەوە،کەمێکیانی لێ دەربکەی کەلەبەرتزیکیان لەدەسەڵات دەرفەتی خۆشگوزەرانیان بۆ ڕەخسابوو باری ژیانیان ناهەموار

---

[٤٣] بڕوانە : ادوین اریدویچ گرانتوسکی و دیگران: تاریخ ایران، ترجمە کیخسرو کشاورزی، (تهران:١٣٨٥)، ص٦١ ؛ سامي سعيد الاحمد ورضى جواد الهاشمي: تاريخ شرق الادنى القديم ،ص ٩٦؛ سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ شرق القديم، ص٣٧١ ؛طه باقر و اخرون: تاريخ ايران قديم، ص٤٧ ، عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٩٨

[٤٤] ادوین اریدویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران ، ص٦٩ .

[٤٥] البر مالة : تاريخ البرمالة (تاريخ ملل شرق و يونان) ترجمة عبدالحسين هژير ،(تهران:١٣٨٣)، ج١ ، ص١٢٤

[٤٦] سامي سعيد الاحمد و جمال رشيد احمد: تاريخ شرق القديم ، ص٣٧١

[٤٧] البرت تن ایك اومستد: شاهنشاهی هخامنشی ،ص٤٦ ؛ سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم ،ص٣٧١؛محمد ابوالمحاسن عصفور:معالم تاريخ الشرق الادنى القديم، ص٤٠٨.

[٤٨] سامي سعيد الاحمد ورضا جواد الهاشمي: تاريخ شرق الادنى القديم، ص٩٧ .

بوو و فیرعەونی میسریش سنووری دەسەلاتی دابوویە کەمی، ئیتر دنیای ڕۆژهەلات هەر لەماد و مانای تاسەر زەمینی یەهود و بابل و میسر ،هەموو شوێنەکان هێزێکی تازەیان دەویست، کە ڕێساو شوێنی دروست لەبەرچاو بگرێت و جیهانی مرۆڤایەتی لەبندەستی ستەم و درندایەتی و سنوور بەزاندنی ولاتەکانیان رزگار بکات[٤٩] هەرچی پەیوەستیشە بەبارودۆخی دەولەتی ماد ئەوە(استیاکز - استیاغ ) پادشابوو ، کە سەرگەرمی هەواو هەوەس و ڕابواردن بوو[٥٠] وتراوە کە ((بە سبب بعض احوال و معاملهی گەلێ پیاو ماقولانی خۆشی لێ عاجز بوو))[٥١].

لەپشێوی بارودۆخی ماد، هەروەها نارەزایی خەلك بەتایبەتی سەرانی دەولەت و سوپا سوودی بینی، بەکۆمەکی ئەوان (هگماتانە-هەمەدان- ئەکباتانە[٥٢]) ی گرت و بەمشێوەیە حکومەتی میدیا بەکۆتایی کاری خۆی گەیشت[٥٣]، چونکە کۆرشی گەورە پێش مردنی باوکی لە ولاتی میدیا ژیاوەو لەهەندێ چالاکی سەربازیش بەشداری کردووە[٥٤]، بۆماوەی هەشت سالێش پاشکۆ (تابعی) دەسەلاتی ئەستیاکز بوو، دواتر بەرەو ڕووی وەستایەوە و لە( ٥٥٠ پ.ز ) توانی ولاتی میدیا داگیر بکات[٥٥]. بەگشتی دەتوانین بلێین لەو هەلومەرجە نێوخۆیی و ناوچەییەی کەدەرنجامی کاردانەوەو هەلقولاو لەدیدو هەلوێست و هەلسوکەوتی دەولەت بەرامبەر میللەت و دەولەت و دەسەلاتەکانی ناوچەکە و خوێندنەوەی لەلای ئەوان لەوێ ڕۆژێ وەرزی تەمەنی دەولەتی مادا ، گۆڕانکاری لەسیستەمی فەرمانڕەوایەتی ببوو بەشتێکی

---

[٤٩] عبدالحسین زرین کوب: روزگاران تاریخ ایران( ازاغاز تاسقوط سلطنت پهلوی )، (تهران:١٣٨٣)، ص٦٨.

[٥٠] جمال رشیداحمد وفوزي رشید :تاریخ کرد القدیم ، ص١١٤.

[٥١] محمدامین زەکی: کورد و کوردستان،(بەغدا:١٩٣١)، ج٢، ص٢٢.

[٥٢] ناوی ئەکباتانا لەدەقە ئاشوریەکاندا بە(کارکاسی Kar-Kassi) واتا (شاری کاشیەکان)، هاتووە.

[٥٣] منصور مخدوم: اهمیت کرد و کوردستان در ادوار تاریخی ایران( تا افشاریة )، (سنندج:١٣٨٢)، ص٤٢ ؛ دەربارەی نارەزایی و چۆنیەتی یارمەتیدانیان بە کورش بروانە مردوخی: ص٢١٢ -٢١٣

[٥٤] سامی سعیدالاحمد جمال رشید احمد: تاریخ الشرق القدیم، ص٣٧٢

[٥٥] طه باقر واخرون: تاریخ ایران القدیم، ص٤٧.

پێویست و کۆڕشیش بەو توخمانەی لە هەگبەی کەسایەتیدا هەڵگیرابوون ، کە دواتر بەپراتیزەکردنیان لەمزەینی کەسانی وەك دۆناڵد ولبردا وەك ((پاڵەوانێکی جیهانی و ڕێکخەرێکی بەڕێوەبردنی زرنگ))[٥٦] وێناکرا، ڕەنگە لەهەموو کەسانی دەرباری مەملەکەت زیاتر شیاوی گێڕانی ئەو ڕۆڵە بووبێ بەتایبەتیش ئەگەر ئەوەی باسکراوە لەبارەی نزیکایەتی لەپادشا بەوەی کوڕی مەندانەی کچیەتی و مەحکومکردنی بەمردن بەدەستی هەرپاك و مەسەلەی پوش بەسەرکردنی پرۆسەی کوشتنەکە و دواتر گەورەبوونی و تێگەیشتنی لەدێرۆکی بەسەرهاتەکە[٥٧] ڕاست بێ، یان بەوەی، کە کوڕی (کمبوچیە) (قمبیز)ی ئەخمینیەکە هیچ کام لەدەسەڵاتە ناوچەییەکانی ژێر سایەی دەوڵەتی ماد، هێندەی ئەوان ئاوێتەی دەسەڵات نەبووبوون و لەڕووی ڕەگەزیشەوە دەچنەوە سەر یەك ڕەچەڵەك ،کە وای کردبێ پێی وابێ کە بەرپرسیاریەتی لەگرێژەنە نەچوونی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و میللەت و بەپایەدار مانەوەی زیاتر لەهەر کەس ئەرکی سەرشانی ئەوە و ئەو گۆڕانکاریەش کەچاوەڕوان دەکرا ببێ، لەنێو مادەکانیشدا کەس لەو نزیکتر نەبوو کە ئەو چاوەڕوانیەی لێ بکرێ .

مادەکانیش نەك هەروەك خۆسەپێن و بێگانە سەیریان نەدەکرد، بەڵکو پێیان وابوو فریادڕەس و چاکەخوازە[٥٨] ئەویش ((... لەگەڵ نەتەوەی ماد وەك برا ڕەفتاری دەکرد...))[٥٩] بەدەست بەسەرداگرتنی هەمەدان (هگماتان)ی پایتەخت و گرتنی (ئەستیاکز)ی پاشا کۆتایی بە دەسەڵاتی ماد هێناو زنجیرەی دەسەڵاتداریەتی زانایانە بۆ بنەماڵەی ئەخمینی گواستەوە[٦٠]، ئیتر((دەوڵەتی فارسی ئەخمینی بەتایبەت لەو وەختەدا لەچاخی، تاریکی کە چاخی پاشکۆیەتی بوو هاتە دەرو لەسەر شانۆی مێژوو دەرکەوت))[٦١] ئەو پێکەوە هەڵکردنی بە پێویست دەزانی

[٥٦] ایران ماضیها و حاضرها ، ترجمة عبدالنعیم محمد حسین ، مراجعة ابراهیم امین الشواربی، (القاهرة:١٩٥٨)، ص٢٩

[٥٧] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو بەسەرهاتە و وردەکاریەکانی بڕوانە:محمود زنجانی: تاریخ تمدن ایران باستان، (تهران:١٣٨٠)،ج١، ص١١٩ -١٢٧ ؛ حسن کریم جاف: الوجیز في تاریخ ایران، ج، ص٣٧-٣٨.

[٥٨] عبدالحسین زرین کوب: روزگاران، ص٦٣ .

[٥٩] البرمالة: تاریخ البرماله، ج١، ص١٢٥.

[٦٠] سیر برسي سایکس: تاریخ ایران ، ج١، ص١٢٦ ؛طه باقر واخرون: ایران القدیم، ص٤٨.

[٦١] طه باقر واخرون: تاریخ ایران القدیم، ص٤٨.

بۆ ئیمپراتۆریەت ، پێشی وابوو ، کەئیمپراتۆیەت بەبێ هەوڵی فراوانخوازی ناچار بەهەرەس و لەناوچون دەبێ[٦٢]. مەحمود زنجانیش دەڵێ (( کورش بەگوێرەی بڕواو بۆچوونی خۆی هەرگیز جەنگی هەڵنەدەگیرساند پاش پێشنیاری پێویست ئەگەر دوژمن پێشوازی لێ کردبا کاری بەکاری ئەوان نەبوو، بەڵام ئەگەر پێشوازی لەئاشتی نەکردبا ئەوە دەستی بەجەنگ دەکرد ))[٦٣] جیاوازیش لەزۆربەی پادشاکانی ئیمپراتۆریەتەکانی پێش خۆی لەرۆژهەڵات، لەگەڵ ژێرکەوتووەکان نەرم و نیان و لەگەڵ دوژمنان گونجاو بوو، لەگەڵ هەڵگرانی باوەڕ و نەریتی جیاواز لەسەر بنەمای لێبوردەیی کردن ڕەفتاری دەکرد[٦٤]. بۆیە (( ... لەلای ئێرانیەکان و خەڵکی وڵاتە داگیرکراوەکان (المفتوحە) بە دادگەرو چاکەکارو بەسۆز لەبەرامبەر ژێردەستە (رعیە) کانی و نەرم و نیان، ڕەوشت بەرز ناسرابوو )) [٦٥].

ئەو دوای گرتنی هەر وڵاتێك ئازادی تەواوی بیروباوەڕ ڕاوبۆچوون و کۆبوونەوەی دەدایە خەڵکەکەی و لێرەوەش مێژوونوسە تازەکان لەگەڵ یەکەمین کەسانی هەژماردەکەن ، کە مافی مرۆڤیان ناسیبێ و بانگەوازیان بۆ کردبێ، بۆیەش خەڵکی ئێران و وڵاتە داگیرکراوەکان نازناوی پاشای باوکیان پێدابوو [٦٦]. و لەکتێبی پیرۆزیش بە ناونیشانی فریادڕەس و پەیامبەر، ناوی هاتووە [٦٧] لەکوشتنی کرزوس (قارون)ی پادشای لیدیاو ڕێزگرتنی ڕێباوەڕ(مـژهب) هاوشاریانی بابل وەڕێگەدان بەجولەکەکان، کە بگەڕێنەوە ئورشەلیم[٦٨]، مشتێکی نموونەی خەرمانی هەڵسوکەوتەکانی ئەون.

چونکە ئەو هەر بەگرتنە دەستی دەسەڵات لەمیدیا ڕانەوەستا، بەڵکو دەست بەسەرداگرتنی هەموو هەرێمەکان و وڵاتانی دەوروبەر، یەك لەئامانجەکانی ئەو و پادشاکانی دوای ئەویش

---

[٦٢] عبدالحسین زرین کوب: روزگاران، ص٦٨.

[٦٣] محمودزنجانی: تاریخ تمدن ایران باستان، ج١، ص١٢٨.

[٦٤] عبدالحسین زرین کوب: روزگاران، ص٦٧ ؛ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ،ج١، ص٥٧٤.

[٦٥] صادق نشاة و مصطفی حجازی: صفحات عن ایران، (دم:١٩٦٠)، ص٤٠ .

[٦٦] نفس المرجع، ص٤٠-٤١

[٦٧] العهدالقديم: سفر أخبار الايام الثاني: ٣٦: ٢٢؛ رضا شعبانی : مرورکوتاه بر تاریخ ایران، ص٣٦.

[٦٨] بڕوانە: البرمالە: تاريخ البرمالة، ص١٢٥

بوو[٦٩]. هەنگاو و قۆناغەکانی فراوانخوازیش بەخێرایی بەدوایەك دادەهاتن[٧٠] پەلاماری لیدیایدا، چونکە کروزس(قارون)ی پاشای ویستی لەباری ناهەمواری میدیا کەلك وەربگرێت هەندێك ناوچەی لێ دابڕێ ، کۆرش ئەمەی بەدەست درێژی بۆ سەر مافی شەرعی خۆی دەزانی[٧١] و لەساڵی (٥٤٦پ.ز) سوپای لیدیای تێکشاندو (ساردیس)ی پایتەختی داگیرکرد[٧٢] دواتر ڕووی کردە داگیرکردنی شارە یۆنانیەکانی هەڵکەوتوو لەئاسیای بچووك لەنزیك لیدیا[٧٣]، کە لەڕاستیدا داگیرکردنیان بەهۆی پارچە پارچەییانەوە شتێکی قورس نەبوو[٧٤].

ئیتر تەواوی ئاسیای بچووك کەوتە ژێر قەڵەمڕەوی کۆرش[٧٥]، ئینجا ڕووی کردە ڕۆژهەلات و توانی لەماوەی (٥٤٥ -٥٤٠/٥٣٩پ.ز ) زۆر هەرێمی وەك (باکتریا و صغد[٧٦]-سغد- و اراشوز[٧٧] و قەندەهار و خوارزم) و شوێنی دی داگیر

---

[٦٩]عامر سليمان :العراق في التاريخ القد يم،ص٢٦٠؛جابر خليل ابراهيم :منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاجنبي، موسوعة الموصل الحضارية ، م١٢٨.

[٧٠] جلال يحيى: التاريخ الاوربى الحديث و المعاصر، (الاسكندرية:١٩٦٥)، ص٦٢.

[٧١] بڕوانە: سامى سعيد الاحمد ورضا جواد الهاشمى :تاريخ الشرق الادنى القديم، ص٩٨ ؛ البرت تن ايك اومستد: تاريخ شاهنشاهى هخامنشى، ص٥٢ .

[٧٢] سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم، ص٢٧٢ ؛ و بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بڕوانە: سير برسى سايكس: تاريخ ايران، ج١، ص١٨٧-١٩١ ؛ عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ص١١٦ -١١٧ ؛ البرت تن ايك اومستد: تاريخ شاهنشاهى هخامنشى، ص٥٤-٥٥

[٧٣] طه باقر و اخرون: تاريخ ايران القديم، ص٤٨.

[٧٤] لطفى عبدالوهاب يحيى: اليونان مقدمة في التاريخ الحضاري، (بيروت:١٩٧٩)، ص١٥٥-١٥٦.

[٧٥] عبدالحسين زرين كوب: روزگاران، ص٧٠

[٧٦]بلاد الصغد: بە هەرێمی دەورووبەری سیحون وجیحون لەڕۆژهەلاتی دەریاچەی قەزوینی هەڵکەوتوو لەناوەڕاستی ئاسیا دەگوترێت: سامى سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم، ص٢٧ .

[٧٧] اراشوز (تورکستان و افغانستان ئەمرۆ دەگرێتەوە ) البرماله: تاريخ البرماله، ج١، ص١٢٥ .

بكات، بەوەش دەسەڵاتی ئەخمینی گەیشتە سغد رۆژئاوا وڵاتی هند[٧٨]، گرتنی میسریش یەکێ لەو ئامانجانە بوو، کە کۆرش دەیویست پێی بگات، بەڵام سەرقاڵبوونی بسەرکوتکردنی جموجۆڵی هەندێك هۆز لەرۆژهەڵات وباکوری رۆژهەڵات ونزیك روباری سیحون وکوژرانی لەمیانەی لەشکرکێشیەکە، نەیهێشت بەو ئامانجە بگات،[٧٩] دوای ئەو کامبوزیا (کمبوچیە - قمبیز)لە ( ٥٣٠پ.ز )بوو بەپادشا، کە بەهەوڵدانی بۆ داگیرکردنی سودان و حەبەشە بەناوبانگە،[٨٠] کە دووەمین پادشای گەورەی بنەماڵەی هەخامنشی و لەڕاستیدا سەردەمی دەستپێکردنی بەرفراوانی ئیمپراتۆریەتیان بوو[٨١]، پێنج ساڵ دوای هاتنە سەرتەختی رووەو گرتنی میسر، کە بیرێکی چەسپاوی ناو پلانی باوکیشی بوو، رۆیشت، واشزانراوە، کە بڕیاردانی ئەو هێرشەی دوای زانینی چالاکی ئەمازیس(٥٦٩/٥٧٠-٥٢٧/٥٢٦پ.ز)ی فیرعەونی ئەو وڵاتە لە وروژاندنی یونانیەکانی ئاسیای بچووك دژ بە فارس، بووبێ،[٨٢] کە گەیشتە ئەوێش بەماتێکی سێیەم (٥٢٦-٥٢٥پ.ز) ،کە دوای مردنی ئەمازیس بە دەسەڵات گەیشتبوو ، نەیتوانی بەربەرەکانی بکات و خۆی ڕا دەستکرد و ئەخمینیەکان سەرکەوتن[٨٣] ساڵی( ٥٢٥پ.ز ) بە رێورەسمێکی ئاینی کە بۆ لەسەر تەخت دانیشتنی فیرعەون رێکدەخرا، بوو بە پادشای میسر و بنەماڵەی (٢٧)ی فیرعەونی پێکهێنا[٨٤]، لەگەڵ خەڵکەکەیدا هەمان سیاسەتی باوکی پەیڕەو کرد، کە لە(بابل ) لەسەری دەڕۆیشتن[٨٥].

ئینجا بەئامانجی ژێردەست خستنی بەرقە و تەرابلوس و قرتاجە لەشکرکێشی رێکخستو خۆشی سەرکردایەتی هێزێکی لەرێی(سودانەوە)بۆ (حەبەشە) کرد، بەڵام

---

[٧٨] بڕوانە: ادوین اریدویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران، ص٧٧ ؛ طە باقر واخرون: تاریخ ایران القدیم ، ص٤٨؛ البرمالە: تاریخ البرمالە ، ج١، ص١٢٥ .

[٧٩] بڕوانە: عبدالحسین زرین کوب: تاریخ مردم ایران،ج١، ص١٢٩.

[٨٠] صادق نشأة ومصطفی حجازي: صفحات عن ایران، ص٤١.

[٨١] رضا شعبانی: مرورکوتاه برتاریخ ایران ، ص٣٦ .

[٨٢] صادق نشأة مصطفی حجازی: صفحات عنایران، ص٤١.

[٨٣] رضا شعبانی: مرور کوتاه بر تاریخ ایران، ص٣٦

[٨٤]طە باقر وآخرون: تاریخ ایران القدیم، ص٥١ .

[٨٥] رضا شعبانی: مرورکوتاه برتاریخ ایران، ص٣٧.

سـەركەوتوو نـەبوو و گەڕایـەوە میـسر[٨٦]، دەڵێـن دوای مایـەپووچ بوونـی لەشكركێشیەكەی كەوتۆتـە وبـزەی خـەڵك وپەرسـتگای تێكـداون و گـای پـیرۆزی كوشـتووە و بەیەكـەوە هـەڵكردنی دینـی(لێبوردەیـی= تـسامح )نەهێشـتووە، جوڵانەوەكەی بەشێوەیەك بووە، كە خەڵكی بەجۆرێـك لەشـتیان لێكداوەتـەوە [٨٧] لـە( ٥٢٢ پ.ز ) هەواڵی پێگەیشت كە (بردیا ) [٨٨]بەناوی كوڕی كوڕش خۆی وەك پادشای ئێـران ناسـاندووەو ئـەویش بڕیـاری چـوونەوە ئێرانـیدا و لـەڕێگاش گیـانی لەدەسـتدا و لـەبارەی مردنیشەوە ڕای جۆراوجۆر هەیـە[٨٩]. پادشـای تـازە دوای حـەوت مـانگ لەدەسـەڵات تـوانی سەرنجی خەڵك ڕابكێشێ و بەڵێنی بەخشینی لەباج بۆ مـاوەی سـێ سـاڵ پێـدان[٩٠]، لەلایـەن داریوشی هستاسپس،كە سەر بەلقێكی تری بنەماڵـەی ئەخمینیەكانـە[٩١] بـە هاوكـاری شـەش لـەیارانی لـە ٥٢٢ پ. ز لـە نـاوبرا[٩٢]، داریـوش (٥٢٢ - ٤٨٦ یـان ٥٢١ - ٤٨٥ ق .م)

---

[٨٦] بۆ زیاتر ڕوونكردنەوە بڕوانە: طه باقر : مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، ج٢ ، ص٤٥ ؛ طه باقر وآخرون: ايران القديم، ص٥٢ ؛ حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، ص٤٣.

[٨٧]طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢ ، ص٤٠٦

[٨٨]بڕوانە:هايدماری كخ: اززبان داريوش، ص١٤-١٥؛ طه باقر وآخرون: تاريخ ايران القديم، ص٥١. هەروەها لەمەڕ بردیا كوڕی كورش یان گئوماتا كە یونانیەكان (ساردوس ، سمردیس ، مارڤیوس ، مرڤیس ، تنااوكسادس، تانیوكسارس) یشی پێ دەڵێن، واتە ڕاستی ئەو كەسەی كە لەسەردەمی قەمبیز خۆی بەكوڕی كوڕش و پادشای ئەخمینی ناساند ئامانجی ئەو پیاوە و ئەو هۆكارانەی لەدوای كوشتنەوە بوون گفتوگۆی زۆری لەسەرەوزیاتر باسكردنی بەپێویست نازانین، دەكرێ بڕوانینە هەریەك لەعبدالحسین زرین كوب: تاريخ مردم ايران، ص ١٣٩-١٤٢؛ عبدالحسين زرين كوب: اشنائى باتاريخ ايران،(تهران:١٣٨٥)، ص٦٧-٧٧" رضاشعبانی: مرور كوتاه بر تاريخ ايران، ص٣٨ -٥٢؛ طه باقر وآخرون: ايران القديم، ص٥٢.

[٣] بڕوانە: دونالد ولبر : ايران ماضيها وحاضرها، ص٢٩ ؛ طه باقروآخرون: ايران قديم، ص٥٢ ؛ حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران ، ص٤؛ نيناويكتورونا پيگولوسكايا: تاريخ ايران باستان، ترجمة مهردادايزد پناه، (تهران:١٣٨٥)، ص٤٧.

[٤]ادوين اردوبچ گرانتوسكى: تاريخ ايران ، ص٨٠.

[٥]سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم، ص٢٣٧.

[٦]هايد مارى كخ : اززبان داريوش ، ص١٥

جڵەوی کاروباری گرتەدەست[٩٣] و بەهەڵبژاردن لەلایەن زۆر پیاوی گەورە،کە دژی یەك دوژمن یەکیان گرتبوو، بۆیە پادشا[٩٤] لەگەڵ دەست بەکاربوونیشی رووبەرووی جۆرەها دژواری و شەڕو شۆڕشی نەیاران لەسەرانسەری وڵات بووە وە، کەناچاربوو ماوەیەکی زۆری سەرەتای دەسەڵاتی بەسەرکوت کردنیانەوە خەریك بکات[٩٥]، لەوبارەیەوە، وتراوە کەدوای مردنی قەمبیز، ئیمپراتۆریەت دابەش بووە بۆچەند ولایەتێك ،کەهەموڵی سەربەخۆییاندەدا، بەلاّم دارای یەکەم دوای نۆزدە شەڕ توانی ئیمپراتۆریەتەکە رزگاربکات وئارامیش بۆ ناوچە جیاوازەکان بگێڕێتەوە[٩٦]، ئەوەش وەك زەنگی هەڕەشە وابوون و پووچ کردنەوەیان (جوامێری و لەخۆبوردوویی) پیاوانەی گەرەك بوو[٩٧] لەبەرئەوە یەکەم ئیش (مهمَە)ی داریوش بریتی بوو لە سەر لەنوێ رێکخستنەوەی وڵات (اعادة النظام) ودەست رۆیشتوو کردنەوەی دەوڵەت بەسەر هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتدا[٩٨] یەکەمین شۆڕش (هەڵگەڕانەوە) لە عیلام روویداو لەگەڵ شۆڕشی بابل بوون بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕش و هەڵگەڕانەوە لەگشت ناوچەکانی تر، کە بابل ترسناکترینیان بوو، چونکە جیابوونەوەی ئەو لە جەستەی ئیمراتۆریەت جیابوونەوەی گشت ولایەتەکانی رۆژئاوای لێدەکەوتەوە[٩٩]، توانی لەماوەی زیاتر لە سالێك سەرهەڵداوەکان سەرکوت بکات و پایەی حکومەت و پێگەی خۆی بچسپێنێت و پانتایی

---

[٧] حسن کریم الجاف: الوجیز في تاریخ ایران، ج١، ص٤٧.

[٨] اندریەایمارو جانین اوبوایة: تاریخ الحظارات العام (الشرق والیونان القدیمة)، ترجمة فریدم . داغر و فؤاج . ابوریحان ، (بیروت:٢٠٣)، مج١ ،ص٢١٧

[٩] بروانە: البر مالة: تاریخ البرمالة،ص١٢٧؛ عبدالحسین زرین کوب: روزگاران، ص٨٩؛ هیأت مؤلفان: تاریخ جهان لاروس (روزگاری باستان و قرون وسطی ) ترجمةجلال الدین المعلم، (تهران:١٣٧٨)، ص١٢٤ .

[١٠] محمد ابوالمحاسن عصفور: تاریخ شرق الادنی القدیم، ص٤١١. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر سنووری ئیمپراتۆریەتی ئەخیمینی و زۆر لەو شار و هەرێمانەی لە میانەی باسەکەمان ناویان هاتووە بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١).

[١١] عبدالحسین زرین کوب: تاریخ مردم ایران، ج ١، ص١٤٤

[٩٨] سامي سعید الاحمد و رضا جواد الهاشمي: تاریخ شرق الادنی القدیم، ص١٠٤؛جابر خلیل ابراهیم: منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاجنبي، موسوعة الموصل الحضاري، مج١، ص١٢٩ .

[٩٩] طه باقرواخرون: تاریخ ایران القدیم، ص٥٤.

شانـشینی بگەیەنێتـەوە سـنوری پێـشووی سـەردەمی کـوڕش وە کـامپێز[١٠٠]، هـەموو ئـەو سەرکەوتنانەش بەزمانی خۆیان و بەزمانی عیلامی و بابلی لەگەڵ ئارمی ئاهورامزداو وێنەی خۆی و دوژمنەکانی لە کێوی بێستونی نێوان هەمدان و کرمانشان نـەخش کـردووە[١٠١]. بـۆ زیاتر فراوانکردنـی دەسـەڵات مـسۆگەرکردنی ئـارامیش لـەڕێگای ئەفغانـستانەوە پـەلاماری دۆڵی ڕووبـاری هنـدی دا[١٠٢]، سـەرکوتکردنی سـەرهەڵداوانی شـارە ئەیونیـەکانیش تووشـی تێکهەڵچوون لەگەڵ یونانیەکانی کردو دارای والیکرد، کە سووربێ لەسەر داگیرکردنی یونان، ئەمەش زنجیرەیەك شەڕی نێوانیانی بەدوای خۆیـدا هێنـا[١٠٣]، ئەمـە جگـە لـە هێـرش کردنـی بۆسەر ئەسکیسیەکانی نیـشتەجێی ناوچـەی نێـوان دەریـای ئـۆڕال و دەریاچـەی قـەزوین، کـە ببوونـە هەڕەشـەی بـەردەوام لەسـەر ئاسایـشی بەشـی بـاکوری ڕۆژهـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی ئەخمینـی[١٠٤]، سەرچـاوەکان نووسـیویانە داریـوش زیـاتر لەسـاڵێك لەراگەیانـدنی دەسـەڵاتی تەمەنی لەبەربەرەکانیدا گوزەراند ۆزدە جەنگی ئەنجامداو نۆیاشای تێکشکاند.[١٠٥]

دارا سنوری بەرفراوانی وڵات بۆ چەندین (زیاتر لەبیست) ولایەت دابەشکرد[١٠٦] لەسەر هەر ولایەتێك والیەکی دانا، بەڵام بۆ ئـەوەی هـیچ پێـشهاتێکی نـەخوازراو ڕوونـەدات و والیـەکان بەسوود وەرگرتن لەدەسەڵاتی ڕەها نەیاری نەکەن، بۆ ئەوەش کە ڕەوشی گوزەرکردنی ژیان لـە

---

[١٠٠] ادوین اردویج گرانتوسکی: تاریخ ایران ،ص٨١.

[١٠١] بروانە: طە باقر: مقدمة في التاریخ الحضارات القدیمة، (بغداد:١٩٥٦)،ج٢ ،ص٤٠٧ ؛ سامي سعید الاحمد و رضاجواد الهاشمي: تاریخ شرق الادنی القدیم ، ص١٠٤ .

[١٠٢] طە باقر: مقدمة في التاریخ الحضارات القدیمة، ج٢ ، ص٤٠٨ .

[١٠٣] بـۆ زانیـاری لەسـەر شـەڕەکان بڕوانـە بەشـی دووەم ،باسـی یەکـەم، تـەوەرەی یەکـەمی توێژینەوەکە.

[١٠٤] طە باقرواخرون:تاریخ ایران القدیم، ص٥٥؛ هـەروەها بـۆ زیاتر زانیاری لەسەر شـەڕەکانی داریوش بڕوانە: رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ترجمة محمد معین، تصحیح مترا مهرابادي، (تهران:١٣٨٤)، ص١٩٩-١٩١ .

[١٠٥] هایـدماری کـخ: از زبـان داریـوش،ص١٥؛رمـان گیرشمـن: تـاریخ ایـران از اغـاز تااسـلام، ص١٨٥.

[١٠٦] وڵاتـی نێـوان دوو ڕووبـار (عێراقـی ئێـستا)بەباشـور و باکوریـەوە ولایـەت یـان مـەرزەبانی نۆیـەمی لـەو ئیمپراتۆریەتـەدا پێکـدەهێنا کەشـەڕی گۆگـامێلاش هـەر لەسـنوری ئـەو ویلایەتـەدا ڕوویدا:جورج رو: العراق القدیم ، (بغداد:١٩٨٦)، ص٥٥٠.

ولایەتەکان، بە ئاراستەی ویستی دەوڵەتدا بڕوات و دەوڵەت ئاگای لەبەڕێوەچوونی کاروباری ولایەتەکان بێت، لەهەریەکێکیاندا چەند دەسەلاتێکی ڕاستەوخۆی پەیوەست بە دەرباری دانا، لەوانە سەرلەشکرێك، کە سوپای ناوچەکەی بەڕێوەدەبرد لەگەڵ بەڕێوەبەرێك وفەرمانبەرێکی دارایی بۆ کۆکردنەوەی ماڵیات و چاودێری ئاشکراو نهێنیی کۆکردنەوەی زانیاری[١٠٧]، کە بەچاو و گوێچکەی پادشا ناسراون[١٠٨]، واتە ئیمپراتۆریەتەکەی بەشێوەی داوی تۆڕ ڕێکخستبوو و زیرەکانە بەدەستیەوە گرتبوو و بەڕێوەی دەبرد[١٠٩].

ئەگەرچی پادشا دەسەلاتی ڕەهای هەبوو و بۆ هیچ تاك و کۆمەڵێك نەبوو لەدەسەلاتی کەم بکاتەوە یان چاودێری چۆنیەتی بەکارهێنانی بکات، بە گوتەی خۆی خۆی ئاهورامزدا هەڵیبژاردووە و ئەو دەسەلاتەی پێدراوە[١١٠]... بەلام جۆراوجۆری ئاستی پێشکەوتویی ئابوری وکۆمەلایەتی، هەندێکیان پێشکەوتوو وەك بابل و عیلام و هەندێك دواکەوتوو و تا ئەوکات کۆچەری، دامەزراندنی سیستەمێکی چوون یەك بۆ هەمووناوچەکان ڕووبەڕووی دژواری دەکردەوە[١١١] و هەوڵیشیدەدا خەڵك بۆ خۆی پەیدابکات، خۆی لەوێرانکردنی شار و ڕاگواستنی دانیشتوان دەبوارد یەکسانی لەمافدا لەنێوان ڕەعیەتەکاندا ڕەچاوکردو لێگەڕا هەرێمەکان پەیڕەوکاری دابونەریتی خۆیان بن و خواوەندی خۆیان بپەرستن وفەرمانبەری خۆیان هەبێ[١١٢]، بەڕای زرین کوب ڕێپێدانی ئاینی یان لێبووردەیی (تسامح) سەردەمی

---

[١٠٧] بڕوانە: هەریەکە لەرمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تااسلام، ص١٨٨-١٨٧ ؛ عبدالله رازی: تاریخ کامل ایران، ص٢٥ ؛ ادوین اردویچ گرانتوسکی: تاریخ ایران، ص٨٥-٨٣ وو ص٩٥-٨٢ بەدرێژی باسی چاکسازیەکانی دەکات ؛ طه باقر واخرون: تاریخ ایران القدیم ، ص٦٠-٥٦ باسی ڕێکخستنی بەڕێوەبردن دەکات.

[١٠٨] حسن کریم الجاف: الوجیز في تاریخ ایران، ج١، ص١٢٩ .

[١٠٩] اندری بارو: بلاد اشور نینوی، بابل، ترجمة وتعلیق عیسی سلیمان و سلیم طه التکریتی، (بغداد: ١٩٨٠)، ص٢٠٥.

[١١٠] اندریة ایمار و جانین اوبویة: تاریخ الحضارات العام، ج١، ص٢١٨.

[١١١] بڕوانە: ادوین اردویچ گرانتوسکی: تاریخ ایران، ص٨٢.

[١١٢] جلال یحیی: تاریخ الاوروبی، ص٦٤ - ٦٥

داریوش لەباوەڕەوە نەبوو، بەڵکو پێویستی یەکگیری نەتەوە جیاوازەکان لەچوارچێوەی یەك ئیمپڕاتۆریەتدا ناچاری ئەو هەڵوێستەی کرد[113] .

لەسەردەمی ئەودا، ئاینی زەردەشتی هاتە ناوەوە و گەشەی کردو بووبە ئاینی فەرمی دەوڵەت[114]، بۆ پارێزگاری کردن لەپەیوەندی مەڵبەندە جۆراوجۆرەکان بەپایتەختەکانی دەوڵەت و ئاسانکردنی جموجۆڵی بازرگانی و پەرەسەندنیشی گرنگی بەچاککردن ودروستکردنی ڕێگاوباندا[115]، لەسەردەمی ئەودا یەکەم دامەزراوەی پۆستە دروست بوو لەجیهاندا و پارەو کێشانەو پێوانە یەکخرا، یەکەم کەس بوو کە بیری لە هەڵکەندنی کەناڵێك کردەوە لەنێوان دەریای سوور و نیلدا[116]، بەهاوکاری ئەندازیارێکی یۆنانی بەناوی (ماندروکلس) پردێکی بۆ سوپاکەی لەسەر بسفۆر دروستکرد بەهۆیەوە بۆ یەکەمجار قارەی ئاسیای بەئەورووپا گەیاند[117]. لەڕووی بیناسازی و ئاوەدانیش گەورەترین کۆشك لەسەردەمی ئەودا دروستکراون لەنێویاندا (پرسیپۆلس[118])[119].

---

[113] عبدالحسین زرین کوب: اشنائي با تاريخ ايران، ص١١٣.

[114] بڕوانە: طه باقرواخرون: تاريخ ايران القديم، ص٦٠.

[115] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: رمان گیرشمن: تاريخ ايران از اغاز تاامروز، ص١٨٩ -١٩١.

[116]صادق نشأة ومصطفى حجازي: صفحات عن ايران، ص٤٣ هەروەها مرتضى راوندی: تاريخ اجتماعي ايران، (تهران:١٣٧٨) ، ج١، ص٤٤٩ ئاماژەی پێداوە شوێنەکەشی دەست نیشان کردووە لەوەی فردنیاند دلسبسی سەردەمی ناپلیۆن جیای کردۆتە و هەر بەناوی کەناڵی سوێس نوسیویەتی.

[117]طه باقر واخرون: تاريخ ايران القديم، ص٥٥ ؛ حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، ج١، ص٤٧.

[118] (پەرسیپولس Percpolic) اصطخر، تخت جمشيد)یشی پێ دەگوترێت، مەڵبەند و پایتەختی سەرەکی دەوڵەتی ئەخمینی بوو لەدوری( ٢٥)میلی باشوربارزاگادا و(٥٠)میل لەرۆژهەڵاتی شاری شیراز هەڵکەوتوە لە٥١٨یان٥٢٠پ.ن)لەلایەن داراوە دەست بەدروستکردنی کراوە ولە(٤٦٠ پ.ن) تەواوکراوە، کۆشکەکانی نموونەی هونەری بیناسازی ئێران پیشاندەدات.: كلين دانيال: موسوعة علم الاثار،ج١ ، ص١٤٢؛ نخبة من العلماء: الموسوعة الاثرية العالمية، محمد عبدالقادر محمد وزكي اسكندر، مراجعة عبدالمنعم ابوبكر، ط٢، (القاهرة: ١٩٩٧)، ص٦٧-٦٨؛ سامي سعيد الأحمد و رضا جواد الهاشمي: تاريخ الشرق الادنى القديم ،ص١١٤-١١٨

[119] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص١٩٦

(طه باقر) وتویەتی((فەرمانڕەوایەتی دارا بەترۆپکی هێزی فارسە ئەخمینیەکان و بەرزترین پلە دادەندرێت کە ئیمپراتۆریەتی فارسی لەبەڕێوەبردن و ڕێکخستن و یەکانگیری پێبگەیشتووە، نمایشی لوتکەی ڕۆشنبیری فارسە ئەخمینیەکانمان بۆ دەکات))[120].

داریوش لە ٤٨٦ پ.ز مردو دوای ئەویش ئەحشویرشی یەکەم (xerxes) (٤٨٦ – ٤٦٥پ.ز) یان خشایار شای کوڕی جێی گرتەوە پاش ئەوەی (١٢) ساڵ لەبابل وەك جێگری پادشا فەرمانڕەوایەتی کرد[121]، لەتەمەنی ٣٥ ساڵیدا[122] هاتە سەر تەخت، ئەو لەئاتووسای کچی کورشە و[123] لەلایەن باوکیەوە وەك جێنشین دیاریکراوە.[124]یەکەم کاریشی کۆتایی پێهێنانی ئەو شۆڕشە بوو کە لەمیسر سەری هەڵدابوو ئینجا ئەخمینی برای کردە فەرمانڕەوا بەسەریداو ڕوویکردە بابل بۆ سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکان[125] لەدامرکاندنەوەی شۆڕشەکانیش بەدڵڕەقی و توندوتیژی ڕەفتاری دەکرد تەنانەت بابلی وێران کرد،[126]ئینجا ڕوویکردە شەڕکردن لەگەڵ گریکەکان، کەدواتر دێینە سەری.

---

[120]طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٤٠٨.

[121]طه باقر و آخرون: ايران القديم ،ص٦٨ ؛ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، ج٢ ، ص٤٠٨

[122] رضا شعباني: مروركوتاه برتاريخ ايران، ص٦٣ ؛ عبدالحسين زرين كوب: روزگاران، ص١٠٣.

[123] عبدالله رازي: تاريخ كامل ايران ، ص٢٨؛عبدالحسين زرين كوب: روزگاران، ص١٠٣ ؛ رضاشعباني: مروركوتاه برتاريخ ايران ، ص١٦٢ ؛ حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، ج١ ، ص٥١.

[124] عبدالله رازي: تاريخ كامل ايران ، ص٢٨ ؛ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة،ج١ ، ص٥٧٧.

[125] رضا شعباني: مروركوتاه برتاريخ ايران، ص٦٣؛ طه باقر وآخرون: تاريخ ايران القديم، ص٦٨ ؛ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ج١ ، ص٥٧٧.

[126] بڕوانە هەریەك لە: سامي سعيد الاحمد وجمال رشيد احمد: تاريخ الشرق القديم، ص٣٧٤ ؛ حسن كريم الجاف : الوجيز في تاريخ ايران، ج١، ص٥١ ؛ عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص١٦٢ .

دوای ئەو ئەرتەخشتای ٤٦٥-٤٢٤پ.ز(Artaxrex) ، کە ناوی بە ئەردەشێریش هـاتووە و بە (دەست درێژ) ناسراوە[١٢٧]. دواتر خشایار شای دووەم (ئەحشویرش)ی کوڕی جێی گرتـەوە دوای (٤٥) ڕۆژ لە فەرمانڕەوایەتی لەلایەن سغدیانی زڕبرایەوە کوژرا ئەویش بەدەسـتی دارای دووەم کـــوژرا[١٢٨] ، داریوشـــی دووەم (٤٢٤ و ٤٥٤ ق .م) ســـەرەتای دەســـەڵاتی لـــە هەلومـــەرجێکی پـڕ لـە پیلانگێـڕی و شـۆڕش و گەندەڵیـدا دەسـتپێکردو دیـارترین ڕووداوی سەردەمەکەش خەرجکردنی پارە و تێکۆشان بوو بۆ دەست خستنە ناو شـەڕی نێـوان ئەسـیناو سپارتە[١٢٩]. دوای ئەو ئەرتحش شای دووەم (ئەردەشیر) ،کەلـەلای یۆنانیـەکان بـە(مـن مـن = قویي الذاكرة) ناسراوە، هاتەسەر تەخت و کوڕشی برای ویـستی بیکـوژێ، بـەڵام سـەرکەوتوو نەبوو دواتر لەپاش بەخشینی جارێکیتردژی ڕاپەڕی، بـەڵام لەشـەڕی کۆناکـسای[١٣٠] نێوانیـان بەدەستی ئەردەشیر کوژرا. هەر لەوسەردەم دابوو دەهەزار یونانیەکە بەسـەرکردایەتی زەینـەفۆن گەڕانـەوە، کەبڕیارمەتیـدانی کـورش دژی ئەردەشـیر هـاتبوون[١٣١] دواتـر ئەرتخـشنای سـێیەم (ئەردەشێری سێیەم (٣٥٩- ٣٣٨ پ .ز) هاتە سەرتەخت کە وادەردەکەوێ لەگەڵ هاتنـە سـەر کاری ئەو قەدەر دەرفەتێکی تری دابێتە ئێران تاڕزگاری ببێ چونکە کەسێکی سیاسی خـاوەن ئیرادەیەکی پۆلایین بوو[١٣٢]).

---

[١٢٧] عبدالله رازی : تاریخ کامل ایران : ص٢٩؛حسن كريم الجاف : الوجيز في تاريخ ايران، ج١ ، ص٥٣ .

[١٢٨] بڕوانە :عبدالله رازی : تاریخ کامل ، ص٣٠ ؛عبدالحسين زرين كوب : روزگاران، ص ١١٤- ١١٥

[١٢٩] بڕوانە: رمان گیرشمن : تاریخ ایران از اغاز تااسلام ، ص٢٥٣- ٢٥٤ .

[٢] کوناکسا لەکەناری دیجلە بەدووری(٩٠) کم هەڵکەوتووە: ادوین اریدویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران، ص١٠٥

[١٣١] بۆ زانیاری لەبارەی شەڕی نێوان کورش ئەردەشێری سێیەم و ناکۆکی نێوایان ، بڕوانە: زەینفـون : حملـة العـشرة الاف (الحملـة علـى الفـارس) ، ترجمـة يعقـوب افـرام منـصور، (موصل:١٩٨٥)، ص٣٥-٧٨.

[١٣٢] بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بڕوانە: رمان گیرشمن : تاریخ ایران از اغاز تااسلام ، ص٢٥٩.

ئەو ناوی ڕاستی (ئەخس)ە بەدڵڕەقی و توندوتیژی بەناوبانگە[133] و لەسەرەتای دەسەڵاتیدا بەئامانجی کۆتاییهێنان بەدەسەڵاتخوازان زۆر کاربەدەست و سەرکردەکانی دەرباری کوشت[134]. هەموو خوشك و براکانی لەناوبردو توانی هەندێك ولایەتی میسر بخاتەوە ژێر دەستی خۆیەوە . دواتر ژەهر خواردوو کراو دارای سێیەم جێی گرتەوە[135].

---

(133) طه باقر : مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، ج١، ص٥٧٩

(134) حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران ،ج١، ص٥٤.

(135) طه باقر :مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، خ١، ص٥٧٩؛ بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئەردەشیر بڕوانە: گیرشمن: تاريخ ايران ازاغاز تااسلام، ص٢٥٩ -٢٦٤ .

## تەوەرەی دووەم: گـــریکـــەکان

لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە، کەئەو وڵاتـەی ئێـستا بـە یۆنـان ناسـراوە، لـەپێش هـاتنی هـۆزە یۆنانیـەکان، کـە مێژوونوسـان بەگریکـە هیلینیـەکان[١٣٦] ناویـان دەبـەن، ئـاوەدان بـووەو دانیشتوانەکانیـشی، کـە خـەڵکی ڕەســەنی ناوچـەکەن لەچـەند ڕەگـەزێکی مرۆیـی تێکـەڵ پێکهـاتبوون[١٣٧]، کـە بوونیـان بۆچـاخەکانی بـەر لەمێـژوو دەگەڕێتـەوە و بەتێکـەڵێش لەگـەڵ کۆچەرە نوێیەکان، کە توانیـان زمـان ونـەریتیان بەسـەر هەمووانـدا زاڵ بکـەن، وەك کۆمـەڵێك بنەمـاڵـەی مرۆیـی، کـە هەلومـەرجی جوگرافیـایی وڵاتـی یۆنـان کێـشی کـردن، گـەلی گریـك پێکدێنن[١٣٨]. بەلای کۆمەڵێك مێژوونوس هۆزە تازەهاتووەکان یەك ڕەگەزنین[١٣٩]، هەشە پێی وایە، کە ئەوان سەرەڕای جیاوازی شێوەزار و هەنـدێك نـەریت، لەیـەك ڕەچـەڵەکن و یـەك زمـانن ونەریت و بیروباوەڕی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە، خۆشیان ئەوکاتە هەسـتیان بـەو پەیوەسـتە کـرد،

---

[١٣٦] بڕوا وایە ئەوناوە لەناوی هیلینی کوڕی (دونالیۆن)هاتبێ ئەوپیاوەی، کە لەگەڵ (بیریا)ی هاوسەری لەبەر پاکی،(زیوس)ی خواوەند لەو لافاو( طوفان) ە رزگاریکرد کەبۆ لەناوبردنی مرۆڤایەتی بەرپای کرد،لەناوی (دوروس ویولوس)ی کوڕانی هیلین و (ئەیون وئەختیوس)ی نەوەشیەوە، ناوی چوار هۆزەکەی گریك پێکهاتبێ: عبداللطیف احمد علی: تاریخ الیونانی ،(العصر الهلادی)، (بیروت: ١٩٧١)، ص٨؛ علي عكاشة واخرون: اليونان والرومان، ( الاربد: ١٩٩١م )، ص٥٢.

[١٣٧] علی عکاشه و اخرون: الیونان والرومان، ص٥١.

[١٣٨] عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد رشاد: الیونان والرومان (دراسة فی التاریخ الحضارة)، (الموصل: ١٩٩٣)،ص١٢.

[١٣٩] طه باقر: مقدمة فِي تاریخ الحضارات القدیمة، ج٢، ص٥٢٧؛ مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق، (دمشق: ١٩٧٩-١٩٨٠م)ص٣٤.

که تێکەڵی گەلانی تری جیاواز لەزمان‌و نەریت و بیروباوەڕبوون[١٤٠]. بەپێی زۆربەی لێکۆڵینەوە نوێییەکان دەچنەوە سەر نەتەوە هیندۆ- ئەورووپییەکان وماوەی نێوان سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و کۆتاییەکانی سەدەی یازدەهەمی پێش زاین لەناوچە جۆربەجۆرەکانی حەوزی دانوبەوە بەشێوەی شەپۆلی کۆچی یەك لەدوای یەك بەرەو یۆنان هاتوون[١٤١]، بەئاواتی دەستکەوتنی نیشتیمانێکی نوێ لەنێو پێشینەکاندا، بەرەو ناوچەکە خزیون و لەماوەی یەك دوو هەزار ساڵ بەگریکی کردنی نیوە دورگەی بەلقانیان بەئاستی خۆی گەیاند، کەبێگومان خاڵی نەبوو لەشەڕو ململانێ[١٤٢].

چونکە کۆچکردنەکەیان چەندین سەدەو بەپلەی جیاواز لەتوندوتیژیدا بەردەوام بووە[١٤٣].یۆنانیەکان بەخۆیان دەڵێن(هیللینی Hellenes)، رومانیەکان بە گریك Graeci ناویان بردوون وخەڵکی رۆژهەڵاتی کۆنیش بە(یەڤانیەکان yavani) و یوانیەکان yauna) و عەرەبیش بە یۆنانی ناویان دێنن[١٤٤]. ئەوان بەوڵاتەکەیان دەڵێن (هیلاس)،کە مەبەستیان هەموو ئەو ناوچانەیە کە تیایدا نشتەجێبوون، نەك تەنها خاکی یۆنانی ئێستا[١٤٥].

ئەو ناوچەیەش، کە بەنیوەدورگەی یۆنان ناسراوە تاکە پانتایی نەبووە، کە بابو باپیرانی گریکەکانی ئێستای تێدا جێگیربوون، بەڵکو ئەوان بەهەموولایەکی نیوەدوورگەی بەلقان و گشت دورگەکانی دەریای ئیجە و لێوارەکانی ئاسیای بچوك و دەریای ڕەش بەگشتی وهەندێك

---

[١٤٠] محمد كامل عياد: تاريخ اليونان، (دمشق:١٩٨٠)، ص٨٦، علي عكاشه: اليونان والرومان،ض٥١، رجب عبدالحميد الاثرم: دراسات فی تاريخ الاغريق وعلاقته بالوطن العربی، (بنغازی:١٩٩٦)، ص١٧-١٨.

[١٤١] مفيد رائف العابد: دراسات فی اتاريخ الاغريق، ص٣٥.

[١٤٢] رجب عبدالحميد الاثرم: دراسات فی تاريخ الاغريق ، ص٧٩.

[١٤٣] طه باقر: مقدمة فی تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص ٥٢٨.

[١٤٤] عبدالطيف احمد علی: التاريخ اليونانی، ص٨٨.

[١٤٥] عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان و الرومان، ص ١٢؛ رجب عبدالحميد الاثرم :دراسات فی تاريخ الاغريق ، ص١٧. بۆ زانیاری لەبارەی وڵاتی گریك و زۆر لەو شارانەی لە میانەی باسەکەدا ناویان هاتووە بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢).

ناوچەی فەرەنساو ئیسپانیا...نشتەجێبوون. ئەفلاتوون وتەنی ((ئێمە گریکەکان بەلێواری دەریای ناوەڕاست بڵاوبووینەوە وەك بڵاوبوونەوەی بۆق لەقەراغ زۆنگاوەکان))[146].

لەبارەی دابەشکردنی مێژووی وڵاتەکەش بەگوێرەی ئەو سەردەمانەی پێدا گوزەری کردووە، گرنگە ئەوە لەبەرچاوبگرین، کە مێژوونووسان مێژووی یۆنانیان بەزۆری تادەرکەوتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی ئاماژە پێکردووە، کە ڕاستیەکەی لەوێ تەواو نابێ، بەڵکو دەرکەوتنی ئەو سەرەتای دەست پێکی سەردەمێکی نوێی مێژووی یۆنانە کەبەسەردەمی (هیلینیستی) ناسراوە و باس نەکردنیشی لەگەڵ سەردەمەکانی تری یۆنان هۆکاری بابەتی خۆی هەیە[147] دابەشکردنەکەش شێوازی جۆراوجۆری وەرگرتووە، کە ڕەنگە شیاوترینیان ئەمانەبن:

١- سەردەمی بەرایی(مبکر) کە تاساڵی (١١٠٠پ.ز)ی خایاند.

٢-سەردەمی سەرهەڵدان وگەشەکردنی دەوڵەتە شارەکان لە(١١٠٠پ.ز) وە تاکۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زاین.

٣-سەردەمی کلاسیکی، کە هەموو سەدەی پێنجەم وسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی پێش زاین دەگرێتەوە[148].

بۆئەوەی لەمەبەستی خۆمان دوورنەکەوینەوە، کە دیاریکردنی زەمینەی مێژووی یۆنانە پێش دەرکەوتنی ئەسکەندەر، خۆمان لەباسکردنی مێژووی هەرە کۆنی ئەو وڵاتە دەبوێرین و زۆرتر لەسەر قۆناغی سێیەم هەڵوەستە دەکەین.

لەماوەی نێوان سەدەیی (١٢ تا ٦ پ. ز) قۆناغێکی گواستنەوە لەدەوارنشینی (البداوە) بۆ شارنشینی (الحضری) دەستی پێکردو دانیشتوانی شارەکان وەك یەکەیەکی ڕامیاریو ئابووریو سەربازی دەرکەوتنو دانیشتوانەکانی لەدەوری پەرستگاو خواوەندی شارو پاڵەوانە پیرۆزەکان کۆبوونەوەو هەریەك لەو شارانە یان کۆمەڵێکی بچووك، دەوڵەتێکی سەربەخۆیان

---

[146] محمدکامل عیاد، الیونان، ص١٨؛علي عكاشه و اخرون: الیونان والرومان، ص٣٣؛ روبرت ج.لیتمان:التجربة الاغريقية ،(حركة الاستعمار والصراع الاجتماعي٨٠٠-٤٠٠ ق.م)، ترجمة منيرة كروان،(دم: ٢٠٠٠)، ص٤٠.

[147] لطفى عبدالوهاب يحيى: اليونان(مقدمة فى التاريخ الحضارى)، (بيروت: ١٩٧٩م)، ص٧٣.

[148] حسين الشيخ: دراسات فى تاريخ حضارة اليونان والرومان، (الاسكندرية: ١٩٨٧م)، ص٧٣.

پێکدەهێنا[149]. دیرۆکی فەرمانڕەوایەتی کردنیش تێیاندا ڕستێك ڕژێمی یەك لەدوای یەکدا هاتوو جۆراوجۆری گوبجاو لەگەڵ قۆناغی گەشەکردنی هەمەلایەنەی کۆمەڵگای لەخۆگرتبوو، کە لەپادشایەتیەوە بۆ پیاوماقوڵان ئولیگارکی(کەمینە) و ستەمکاران بەدەستەڵاتی گەل (دیموکراتی) کۆتایی دێت و مەرجیش نییە هەموویان لە دەسەرکردنی ئەو قۆناغانە وەك یەك بووبن و هەموو ڕژێمەکانیان تاقی کردبێتەوە، بەڵکو هەیانبوو تەنها بەجۆرێکیان ئاشنابوون، لەهەندێکیشیاندا ڕوخساری چەند ڕژێمێك چوونەتە ناویەك[150]، ئەمەش لەبەرئەوە بوو، کەبەزۆری دەوڵەتە شارەکان یەکێتیەکی جیۆسیاسیان پێکدەهێناو و بارودۆخی تایبەتیان هەبوو، کە شێوە و ڕەوتی ئەو پێشکەوتنە و پێدا ڕەتبوونی پێشکەوتنەکەی پێوە بەندبوو[151].

بەکورتی ئەو قۆناغانەی کە سیستەمی سیاسی گریکی پێدا تێپەڕیوو ئەمانەن:

سەردەمی پاشایەتی: ئەمە یەکەمین ڕژێمە کە دەوڵەتە شارەکان بینیویانە دوای ئەوەی کۆمەڵگا یۆنانیەکان بەشێوەی شار پێشکەوتن[152]، بەکۆنترین سەردەمەکانی مێژوویی گەلانی یۆنانیش دادەنرێت، لەدوای کۆچکردنیان لەوڵاتی خۆیان ودەست گرتنیان بەسەر ناوچەکەدا، و ڕەنگە ئەو سیستەمە یەکێ لەوشتانە بێت، کە لەئیجیەکان وەریان گرتبێت[153]، چونکە ئەوان دوای دەست گرتنیان بەسەر ئیجەدا بۆماوەیەکی دوور ودرێژ هەر بەدواکەوتوویی مانەوە تەنها خەریکی ئاژەڵداری بوون، هەموو لایەنەکانی تری ژیانی شارستانیان فەرامۆش کردبوو و حکومەتی ڕێکوپێکیشیان نەبوو، چونکە مەسەلەی گشتی وا لەئارادا نەبوو، کە کەشێکی لەو جۆرەی پێویست بێ و واش پێدەچێ کە بیریان لەدیاریکردنی پادشا بەسەریانەوە نەکردبێتەوە، تا لەئیجە تێبینیان کرد، پادشاکان لەسەرەتادا زۆر سادەبوون و زۆرتر لە سەرۆك هۆز دەچوون، ئەو سیستەمە کاتێك پراکتیزە کرا کەدانیشتوان دەستیان کرد بەکشتوکاڵ و لەگوندەکان جێگیربوون[154].

---

[149] محمد كامل عياد: اليونان، ص١١٩؛ على عكاشة واخرون: اليونان والرومان، ص ٥٧.

[150] على عكاشه واخرون: اليونان والرومان، ص٨٠.

[151] نفس المرجع، ص٩٧.

[152] حسين الشيخ: دراسات فى تاريخ حضارة اليونان والرومان، ص ٧٩.

[153] طه باقر: مقدمة فى تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٥٣١.

[154] عامر سليمان و احمد مالك الفتيان: محاضرات فى تاريخ القديم، ص٣٩١-٣٩٢.

هەنگاوی یەکەمی جێگیربوونیش لەکۆبوونەوەی خێڵەکیانەی زەویدارە گەورەکان سەریهەڵدا، کە دارایترینیان دەبوو بەسەرۆك و چەقی دەستەڵاتی یاسادانانو دینیو سەربازی و نازناوی پاشای هەڵدەگرت، لەگەڵێشیدا ئەنجوومەنی پیاوماقووڵان ( Baule الاعیان) کەلەسەرۆك هۆزەکان بوونو بەپێی توانا بەشداری دەسەڵاتیان دەکرد- و ئەنجوومەنی گشتی (Agora) هەبوون[١٥٥].

سەرچاوەیەك کە پاشا بەبنەمای ئەو سیستەمە دادەنێت، پێیوایە پادشا دەسەڵاتی جێبەجێکردنو دینیو سەربازی هەبوو و یاسادانانیش، لەنێوان ئەو و گەورەی هۆزەکاندا دابەش دەبوو یەکلایکردنەوەو چەسپاندنی یاسای هەر لایەکیش لەسەر کەسایەتی ئەو لەبەرامبەر ئەواندا وەستابوو[١٥٦].

یۆنانیەکان بڕوایان وابوو، کە پادشاکان لەرەچەڵەکی خواوەندانن و لەژێر چاودێری و گرینگی پێدانی زیوس[١٥٧] دان وسەرچاوەی کارەکانیان سروش و ئاگادارکردنەوەی خواوەندە، دوای خۆشیان دەسەڵاتیان بۆ کوڕەکانیان دەمایەوە[١٥٨].

ئەو سەردەمە پڕبوو لەگۆڕانکاری، کە بۆ دانیشتوان دەبوونە کێشە سەرچاوەی زۆربەشیان گیروگرفتی کشتوکاڵ و پەیوەندیە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتیەکانی دوای نیشتەجێبوون وپێکهاتنی کۆمەڵگە شارستانیەکان بوون[١٥٩]. ئەو رۆڵەش، کە لەهۆزەکانی ناوچەی چیا ودەشت وکەنارەکانی هەر هەرێمێك دەیانتوانێ بیگێڕن و ئەو چالاکیە ئابوریەی تیایاندا ئەنجام دەدراو

---

[١٥٥] بڕوانە: أ. بتری: مدخل الی تاریخ الاغریق وادبهم وآثارهم، ترجمة یوئیل یوسف عزیز، (الموصل:١٩٧٧)، ص١٢؛ لطفی عبدالوهاب یحیی: الیونان، ص١٠١- ١٠٢؛عبدالوهاب مروان: النظریة السیاسیة بین الیونان و الاسلام، (دمشق:٢٠٠٠)، ص٧١.

[١٥٦] حسین الشیخ: دراسات فی تاریخ حضارة الیونان والرومان، ص ٧٩.

[١٥٧] زیۆس گەورەی خواوەندانی یۆنانە وبەرپرسی ناردنی هەورە تریشقە و(خواوەندی ئاسمان وچیاوجەنگ و باران) بووە، لەلای ڕۆمانەکان بە(ژوپیتێر)ولای میسریەکان بە(ئامون)ناسراوە:مجموعة من کبار الباحثین :موسوعة عالم الادیان (کل الادیان والمذاهب والفرق والبدع في العالم)،ج١، ص٢٠٩؛ نسطورماتساس :مذکرات اسکندر الکبیر عن مخطوط بابل، ترجمة الطاهر ڤیڤه،(تونس :١٩٨٩)،ص١٥٦هامش٥٤.

[١٥٨] أ. بتری : مدخل الی تاریخ الاغریق، ص١٢.

[١٥٩] طه باقر: مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، ج٢، ص٥٣١-٥٣٢.

پێداویستی لایەکیش، کە ئەویتر توانای پڕکردنەوەی هەبوو. ئامـانجێکی گشتی هێنایـە گۆڕێ، کە بەدیهاتنی مـامەڵە و گفتوگۆی (التعامل وحوار) نـەرم یـان توندوتیـژی بەخۆیـەوە دەبینـی، هـەوڵی یەکیـەتی ئابوریـشی بـۆ هـۆزە جیاوازەکـان لەڕووخـسارێکی ڕامیاریـدا ڕەخـساند ودەوڵەتانێك لەیەکگرتنی هەرسێ ناوچە جیاوازەکە پێکهاتن(١٦٠).

بـەوەش کـە هـاتن و ونیـشتەجێبوونیان لەناوچـەکان هـەر لەسـەرەتاوە بـەپێی لێـك نزیکـی و خێلایەتی بوو، سروشتی خواستی تاکەکانیش بـۆ ئـازادی و مومارەسـەکردنی لەدەوڵەتـە شـاری بچوکی تەواوی ئازاد دا(١٦١) یەکگرتنەکەی ئاسانتر کرد.

ئیتر ڕۆڵی پادشا بەدرێژایی ئەو ماوەیە، کە وڵات پێویستی بوو، بەردەوام بـوو کـە بـارودۆخیش گۆڕا ولەو چوارچێوەیە دەرچـوو، کـە بنەمـاڵـەی فـەرمانڕەوا بتوانـێ دەرەقـەتی بـێ، سیـستەمی پادشایەتی شاش بوو وجێی بۆ ڕژێمێکی تر خـۆش کـرد، کـە ببێتـە دەسـتەڵاتدار(١٦٢)، چـونکە لەگەڵ پێکهاتنی قەوارەی ڕامیاری خێڵەکان لەسـەدەی (٨ پ.ز) هـەم پاشـا وەك مولکـدارێکی گەورە دەرکەوت، هەمیش لەدواداواکانی سەردەمەکەدا چینێك پەیدابوو کـە لـەڕێی قـۆرخکردنی زەوی زەویدارە بچووکەکان سـامانێکی زۆریـان وەسـەریەك نـابوو، بـەپێی ئـەوەش، کـە ئـابووری لەدوای پێکهاتنی شار ببوو بەیەکەمین پاڵنـەری گۆڕانکـاری سیاسـی، ئـیتر پاشـایەتی پاسـاوی بوونی خۆی لەدەستداو و وەك سەرەتای قۆنـاغی گـۆڕانی چـۆنایەتی لەسیـستەمی پێـشکەوتنی شـاردا، ئـەو چـینە بـەناوی پیاومـاقوڵانی یـان مـیرە دەرەبەگـەکان(Eupatrids) گەیـشتنە دەسـەڵات(١٦٣). سـەرەتا لـەڕێی دیـاریکردنی حـاکم(ئـەرخۆن Archon) و (سـەرکردە Polinarch) وەك دوو فەرمانبـەری هاوبەشـکی حـوکمڕانی، بەرەبـەرە لـەهێزی پاشـایان کـەمکردەوەو ئەسـپارتە نـەبێ، لـەهیچ شـوێنك سـەربەخۆی جـارانی نـەما، دەسـەڵات بـۆ ئەرستۆکراتەکان بەهۆی شارەزایی و پێگەیان لەدەروونی گەلو بوونی سامان، گواسترایەوە، ئیتر

---

(١٦٠) بڕوانە: حسين الشيخ: دراسات في تاريخ حضارة اليونان والرومان: ص ٧٩-٨٠. و لطفي عبدالوهاب يحيى، اليونان، ص١٠٢-١٠٣. و محمد كامل عياد: اليونان، ص ٣٢-٣٣.

(١٦١) غانم محمد صالح: الفكر السياسي القديم والوسيط، (بغداد: د.ت)، ص١٣-١٤.

(١٦٢) حسين الشيخ: دراسات في تاريخ حضارة اليونان والرومان،ص٨٠.

(١٦٣) طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٥٣٣؛ عبدالوهاب مروان: النظرية السياسية بين اليونان و الاسلام، ص٧٢.

ئەنجوومەنی پیران، کە لەوان پێکدەهات بەهێز بوو، کۆمەڵەی گەل (الجمعیە العامە) ڕۆڵی نەما[١٦٤]، و لەساڵی (٧٥٠پ.ز) سەردەمی پیاوماقوڵان دەستی پێکردو تا ساڵی (٦٢٥پ.ز) خایاند[١٦٥]. و ناوی (ئەرستۆکراسی Aristocracy) یان لەحوکمەتەکەیان نابوو، کە مانای حکومەتی باڵاترەکان (برترها)ی دەگەیاند[١٦٦].

گۆڕانی سیستەمەکەش کە فەرمانڕەوایەتیکردنی لەتاکەوە گواستەوە بۆ کۆمەڵێکی زەویدار، کە تیایدا لەبری سەپاندنی ئیرادەی و ویستی تاکەکەس لەحوکمڕانیدا یاسایەك بۆ پێڕەوکردن هەبوو، ئەوەش ئەوکاتە دەستی پێکرد، کە ئەرستۆکراتەکان هەستیان بەبەهای خۆیان لەئابووری نەتەوایەتیدا کرد، ئیتر یەك لەدوای یەك دەسەڵاتەکانیان لێدارنیو تاوای لێهات بێدەسەڵات مایەوە[١٦٧].

سیستەمی پیاوماقوڵان لەسەرسێ پایە وەستابوو یەکیان ئابووری کە قۆرغی دەستی خۆیان بوو وکۆنتڕۆڵی توانستی گۆمەڵگەیان پێکردبوو، دووەمیش سەربازی، ئەویش بۆجێبەجێکردنی ئەرکی بەرگریو هێرشی پێویست، کە هەر خۆیان بەڕێوەیان دەبرد، ئەویتریش یاسا تا لەجێی مافی خودایی، کە چیتر وەڵامی پرسەکانی کۆمەڵگای پێنەبوو، پەیوەندییە تازەکانو ئەرکو مافی هاوڵاتیان دیاریبکات[١٦٨]. لەبەرئەو پێگە کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئیداریەش، کە هەیانبوو و زۆرجار بەرژەوەندی خۆیان لەسەر حیسابی چینەکانی تر پەرەپێدەدا[١٦٩]. بۆیە دزیو جەردەیی ببووە دیاردەیەکی زەقو خەڵکی لەهەژاریو نارەحەتیو نالەباریدا دەژیان[١٧٠].

لەبەر دیاردەی کۆچیش بۆ دەرەوەی شوێنی نشتەجێبوون، وەك بەرئەنجامی ئەو بارودۆخە و داگیرکردنی شوێنی ترو دروستکردنی شار تیایاندا ، کە بەدیارترین و گرنگترین ڕووداوی

---

[١٦٤] علی عکاشه و اخرون : الیونان والرومان، ص٩٨-٩٩.

[١٦٥] طه باقر: مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، ج٢، ص٥٣١.

[١٦٦] .فئودور. ب. کوروفکین: تاریخ یونان باستان، ترجمة غلامحسین متین ،(تهران:١٣٧٨)، ص٥٥.

[١٦٧] حسین الشیخ :دراسات فی تاریخ حضارة الیونان والرومان: ص٨٠-٨١

[١٦٨] لطفی عبدالوهاب یحیی: الیونان، ص١٠٩- ١١٠؛ عبدالوهاب مروان: النظریة السیاسیة بین الیونان و الاسلام، ص٧٢-٧٣.

[١٦٩] مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق، ص٦٢.

[١٧٠] طه باقر: مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، ج٢ ، ص٥٣٣.

مێـژووی ئـەو سـەردەمە دادەنرێـت[١٧١]، بـە سـەردەمی کۆلۆنیـالیزمی یۆنـانی ناسـراوە . کـە گۆڕانکـاری گـرنگ‌و جێـی سـەرنجی لـە دامودەزگـای دەوڵـەت و پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی‌و دابوردوشـتی یۆنانیەکانـدا بـەدیهێنا[١٧٢]. لەڕێگـەی ئەوەشـەوە بەنەتـەوەکانی ڕۆژهـەڵاتی کـۆن گەیشتن و ڕەگـەزی شارسـتانیەتیان لێـوەرگرتن[١٧٣]و کـەناڵی گەیانـدنی ژیـاری بـوو بەهـەموو کەنارەکانی دەریای ناوەڕاسـت‌و دەریـای ڕەش و هـەنگاوێکیش بـوو بـۆ بـەرەو پـێش چوونـی ژیاری ئەورووپـی و فراوانکردنـی پانتاییەکەی[١٧٤]، بواریشـی ڕەخساند تا لەوە دەربـچـن، کـە لەژیانـی ئابوورییـاندا تـەنها پـشت بـەزەوی ببەسـتن، چونکـە ئـەوان بـۆ پڕکـردنەوەی پێداویستییە زیندەگیـەکان هـەر بەئـەو پـشـت ئەسـتوور بـوون‌و بەرهەمەکەشـی تـەنها بـۆ خۆبـژێوی بـوو[١٧٥]، بـەڵام بـەم پڕۆسـەیە بازرگانـی‌و جولانـەوەی دەریاوانیـش گەشـەی کرد[١٧٦].

گەشەکردنی بازرگانی‌و ڕۆڵی لەدابینکردنی پێداویستی ژیانی ڕۆژانە، وەك دەرامەتی سـەرەکی، پێکهاتنی چینی بازرگانانی لێکەوتەوە، کە وێڕایی هەستکردن بە سەنگ‌و قـەوارەیان ژمارەیـان زیادیدەکردو بۆ پارێزگاری بەرژەوەندیشیان خوازیاری بەشداری حوکمڕانیکردن بـوون، کرانـەوەی دەرفـەتیش بـۆ چینی گـشتی بـۆ بـەئازادی کـارکردن هەڵکـەوتنی زیـاتری بـواری ئیـشکردن‌و وەستانی کاری بازرگـانیش لەسـەر شـانی ئـەو چـینە، هەسـتی پـشتگیری بـۆ بەشـداری کردنـی

---

[١٧١] محمد كامل عياد: اليونان ص١١٩؛ عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان و الرومان، ص ٣٧، بۆ زانیاری هەمەلایەنە لەسەر ئەودیاردەیە بڕوانە: ڕۆبرت .ج.ليتمان:التجربة الاغريقية:تێکرای کتێبەکە.

[١٧٢] ا. برگر وديگران: جهان باستان(يونان)، ترجمه صادق انصارى وديگران ،(تهران :١٣٨٦)، ج٢، ص٩٧.

[١٧٣] بۆڕوونکردنـەوەی زیـاتر بڕوانە : رجب عبدالحميد الاثرم: دراسات فى تاريخ الاغريق، ص١٢٤- ١٣٩.

[١٧٤] عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان و الرومان، ص٣٧ ؛ اندرية ايمار وجانين اوبواية: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص ٢٨٤-٢٨٧.

[١٧٥] ارنولد توينبى: تاريخ البشرية، ترجمة نيقولا زيادة،(عمان:دت)،ج ١، ص ١٧٢؛ ابو اليزيد على المتيت: تطور الفكر السياسى، (القاهرة: ١٩٧٠)، ص١٥.

[١٧٦] ا. بترى : مدخل الى تاريخ الاغريق ، ص١٢

بازرگانەکان لەدەسەلآت لای چینی گشتی، دروستکرد، بەمەش لەسەرەتای سەدەی (٦پ.ز) جۆرێکی نوێ لەحوکمەت دەرکەوت کە لەهاوپەیمانی بازرگانو ئەرستۆکراتەکان دروست بوو، کە بەحوکمەتی ئۆلیگارکی ناسراوە[١٧٧].

هەروەها داگیرکاری وتێبینی کردنی جیاوازی نێوان خۆیان وخەلکی تر، کە ئەوان بە(بەربەر) ناویان دەبردن، گەشەی بەگیانی نەتەوەیی لای یۆنانیەکاندا[١٧٨]. بەشێوەیەك کە سەرەرای ناکۆکی ئابوری نێوانیان هۆشی یەکێتی ژیاری و هاوکاریان لەناودا بلاوبۆوە، کە خۆی لەژمارەیەك دامەزراوەی بانهیلینیدا نمایش دەکرد. ئەگەرچی گەوهەری یەکیەتیەکە رێکخراوەیی نەبوو وسایکۆلۆژی (دەروونی) – ئەگەر دەربرینەکە راست بێت – بوو، بەلآم بنەمای سایکۆلۆژی هیلینیش تێروانین وئاوات و نەریت و مەینەتی هاوبەشە[١٧٩].

ئەمەش پاش سەرهەلدانی دووبەرەکی وململانێی توندی نێوخودی چینی خانەدانان، کە کپ نەدەکرایەوە، هەندێکیان لایان بەلای جەماوەردا کردەوە و توانیان بگەنە سەرکردایەتی و جوتیارو بازرگان و خەلکی رەش و رووت لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە، کاتێکیش خۆیان بەو هەموو هێزەوە بینی کەوتنە لێخستن و دەرکردنی خانەدانە دوژمنەکانیان لە ولآت و گرتنە دەستی فەرمانروایەتیەکی بێ دووبەرەکی[١٨٠].

طە باقر پێی وایە لەناوبردنی سیستەمی پیاوماقولآن یەکێ لەئەنجامەکانی گەشەکردنی بازرگانی و پیشەسازیە، چونکە دەسەلآتی ئەوان لەسامانی کشتوکالّ و ئاژەلّەوە پەیدابوو و رۆلّی ئەو جۆرەش لەئابوری بەهۆی گەشەکردنی بازرگانی و پیشەسازیدا یەکەمی چینێکی تری تەیار بەسامانێکی نوێ، کە بەزۆرداران یان خۆسەپێنان (الطغاة) ناسراون جێی پیاوماقولآنیان گرتەوە[١٨١]. بەکورتی دەتوانین بلێین رژێمی ستەمکاران لەژێر کاریگەری گەشەی زۆر و جێی تێبینی دەولەتی شار و فراوانی بازرگانی و پێگەیشتنی بیری و دەرکەوتنی بانگەوازی

---

[١٧٧] لطفی عبدالوهاب یحیی: الیونان، ص١١٣؛ حسین الشیخ دراسات فی تاریخ حضارة الیونان والرومان: ص٨١-٨٤ ؛ عبدالوهاب مروان: النظریة بین الیونان و الاسلام، ص٧٤

[١٧٨] محمد کامل عیاد: الیونان ص١٢٨.

[١٧٩] بۆ زانیاری زیاتر بروانە: ارنولد توینبی: تاریخ البشریة، ج١، ص١٧٧-١٧٨.

[١٨٠] عامر سلیمان واحمدمالك الفتیان : محاضرات فی التاریخ القدیم، ص٤٠٩.

[١٨١] مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، ج٢، ص ٥٣٥-٥٣٦.

کۆبوونـەوەی دەسـەڵات لەدەسـتی یـەك كـەس هەمـەكارەو ڕوخـساری لاواز و كەمایەسـیەكانی سـیـستەمی ئەرسـتوكراتی، كەدەرفـەتی دایـە دەسـت تاكـە بـەهێزەكان بێنـە دەسـەڵات[182].

هەتەكایەوە.

دەسـەڵاتی شـارە یۆنانیـەكان گەڕایـەوە دۆخـی تاكەكەسـی — وەك سـەردەمی پادشـایان و هەولیشیاندا، بۆ ماوەیـەكی كـورت بـەزیاتر لەشـێوازێك فـشاری فەرمانڕەوایـەتی تاكەكەسـی خۆیكەنەوەو تەوەرەی سەرەكیشیان بۆ ئەو مەبەستە، ڕازیكردن و بۆلای خـۆ كێـشكردنی چینـی گشتی بوو، ئەوەش بەهاندانی زیاتری داگیركاری تا بـواری گـەڕان بـەدوای دەرامـەت لـەدەرەوەی وڵاتی خۆیان بۆ ئـەو چینە بڕەخـسێنن، لـە بـواری كۆمـەڵایەتیـشدا تـا ئەوپـەڕی سـنوور هـانی چالاكی هونەری و ڕۆشنبیریاندا، بەڵام لەبواری ڕامیاری سەرنەكەوتن وتاسەر نـەیانتوانی لەسـەر ئەو ڕووخسارە گەلییە بمێننەوە، بەمشێوەیە ڕژێمی زۆرداران (خۆسەپێنان=الطغاة) دامـەزرا[183] خۆسـەپێن ( سـتەمكار)یـش بەهەركەسـێك دەوترێـت كـە بـەڕێگای ناشـەرعی دێتـە سـەركار یردەوردەش قاڵبی چەمكی ئێستای وەردەگرێت، كاتێـك لـەپیادەكرنی حوكمـدا پەنادەبەنـە بـەر ڕێگای ناشەریفانە[184]. مـەرج نیـە (زۆردار- طـاغی- تیرانـت) دڵـڕەق وسـتەمكاربێت بـەڵكو زۆریان پیاوی بـاش بـوون پـشتیوانی بەپەرۆشـی هونـەرو وێـژە بـوون، بـەڵام سروشـتی نـاڕەوای ناشەرعی) پایەكەی ودەسـەڵاتە ڕەهاكـەی، كـە لەبەرامبـەر گـەل وچارەنووسـەكەی دا هـەیبوو، وایكردووە كەسایەتیەكی بێزراو (مقوت)ی لەتێگەیشتنی ڕامیاری گریكدا هەبێ[185].

سەرچاوەیەك پێـی وایـە كەسیـستەمی سـتەمكاران (الاسـتبدادی) سروشـتێكی نـامۆی هەیـە لەزەینی یۆنانیەكاندا وپێچەوانەی چەمكی شارو بنـەمای دروسـتبوونیەتی[186]. بـەلای ئەوانـەوە مـرۆڤ لـەژێر وەهـا فەرمانڕەوایەتیەكـدا، ئـازاد نیـە وخـۆ فەوتاندنـە كەسـێك پێـی وابـێ ئـەوان

[182] غانم محمد صالح: الفكر السياسى القديم والوسيط، ص ١١.

[183] بڕوانـە: لطفى عبدالوهاب يحيى: اليونـان، ص١١٥؛ حسين الـشيخ: دراسـات فـى تـاريخ حضارة اليونان والرومان، ٨٥-٨٦.

[184] مفيد رائف العابد: دراسات فى تاريخ الاغريق، ص٦٩- ٧٠؛ حسين الشيخ: دراسات فى تاريخ حضارة اليونان والرومان، ٨٥ .

[185] أ. بترى: مدخل الى تاريخ الاغريق، ص١٢

[186] اندرية ايمار وجانين اوبواية: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص، ٢٨٩.

رزگاریـدەری گـەلن[١٨٧]. دەرکـەوتنی مـەیلی دەسـەڵاتپارێزیش بەوڕێگایـە، کـە بەپێـچەوانەی دادگەری دەزانرا، چالاکی بیری ڕامیاری بۆ پـشتگیری کـردنو ڕووبەڕووبوونـەوەی، لەقوتابخانـەی بیریدا بەدیهێنا تـا بـەپێی دەرخستنی شـێوە جۆراوجۆرەکـانی ڕژێـم وئاستی پێـڕازی بوونیـان، بیانوی بۆ بهێننەوە یان هێرشی بکەنە سەر[١٨٨].

سـەردەمەکە بەبارگۆڕانێکـی پیشەسـازی گرنگی ڕێگا خۆشـکەربۆ گەشـەکردنـی گریکـی سـەدەی پێنجەمـی پـێش زایـن، کـەپڕ بـوو لەداهێنـان و ئەفرانـدن لـە مـێژووی مرۆڤایەتـیدا، دادەنرێت.[١٨٩] پەیوەندی نێوان سـتەمکاران لـەپێناو ئاسـایش و هاوکـاری نێوانیـان بـۆ پاراسـتنی ڕژێمەکـەیان، لەهـەوڵی ئۆلیگارگیـەکان بۆگێڕانـەوەی پێگـەیان[١٩٠]، خەسـڵەتێکی تـری ئـەو سـەردەمەیە[١٩١] دەتـوانین بڵـێین سـتەمکاران وەك چـۆن دەسـەڵاتی ئەرسـتوکراتەکانیان کەمکـردەوە ورۆڵیـشیان هـەبوو لەیارمەتـیدانـی بەشـداری چینـی گشـتی لەژیانی کۆمەڵ و داڕشـتنی بنەماکانی سیسـتەمی دیموکـراسی بەتایبـەتیش، کـە لەو سـەردەمەدا یاسـادانەرەکان دەرکەوتن ودەسـتیان بەداڕشتنـی یاسـاکان کـرد[١٩٢]. کـە بەپێی ئاستی تێگەیشتن وئەو ژینگەیەی تیادا گەورە ببوون ڕۆڵی گرنگیان لەژیانی دانیشتواندا بینیوەو هەڵوێستی دانیشتوانیش لەبەرامبەریدا، بەگوێرەی شارەکان جیاوازبوو.

هەرلەو سەردەمە بۆ یەکـەمجار یاسـای نووسـراو لـەو وڵاتـەدا سەریهەڵدا، کـەئارەزووی خـەڵك وتێکۆشـانی بـەردەوامیـان بـۆی وتـرس لەڕەچـاونەکردنی دادگـەری لەبـەکارهێنانی دەسـتوری

[١٨٧] عامر سليمان و احمد مالك الفتيان: محاضرات فى تاريخ القديم، ص٤٠٩.

[١٨٨] غانم محمد صالح: الفكر السياسى القديم و الوسيط، ص ١١.

[١٨٩] طه باقر: مقدمة فى تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٥٣٥.

[١٩٠] على عكاشه واخرون: اليونان والرومان، ص١٠٣

[١٩١] بـەگوێرەی بەڵگەنامـەکان (سـیاجینس) لـەمیگارا لـەکۆنترینی سـتەمکاران و ڕژێمـی سیکونیش، کە(ئورشاغوراس) دایمەزراند، تەمەن درێژترین دەوڵـەتی ستەمکاری بوو. اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ترجمة محمد توفيق حسين،(بغداد:١٩٨٩)،ص١٠٤

[١٩٢] لیکۆرگۆس لەئەسپارتە لـەدەوری٦٠٠پ.ز؛ فاروندـاس دەوری٦١٠پ.ز لـە قاگینـای نیـوە دورگـەی سقلیا، زالیوقوس لـەلوکریس باشوری ئیتاڵیا لـەدەوری٦٦٠پ.ز. ودراکون لەئەسینا لە٦٢٠پ.ز. لە نموونەی ئەو یاسادانەرانە بوون مفید رائف العابد: دراسات فى تاريخ الاغريق، ص٥٢؛ محمد كامل عياد: اليونان ص١٧٨.

دەستاودەست کراوی کەڵەکەبوو لەدابونەریتی چەندین ساڵەی کۆمەڵگا، لەپشت ئەو پرۆسەیە بوو[١٩٣]، ئەوان لەماوەی نەوەی یەکەمدا بەربەرەکانی نەکران، بەلام لەلایەن نەوەی دووەم دژایەتی کران وکۆتایی بەدەسەلاتیان هێنرا[١٩٤].

چونکە گەل تائەوکاتە ستەمکاریان قبوولّ بووە، کە ئەوەی ویستویانە بۆیان بەدیهێناون، کاتێکیش لەئامانجی ئەوان لایانداو خوازیار و خەریکی پشتاوپشتکردنی حوکمڕانیکردن بوون و کەوتنە نواندنی توندوتیژی ولێیان ڕاپەڕین[١٩٥] بەمشێوەیە پێشکەوتنی هۆشیاری ڕامیاری لای چینەکانی گەل لەسەدەی(٦ی پ.ز) سەرهەڵدانی شۆڕشی جۆراوجۆر و سەرکەوتنیان قۆناغی دیموکراتی بەدیهێنا[١٩٦]، کەبەڕای هەندێك کۆتایی هاتنی حوکمی هیپاس - دواتر باسی دەکەین و دەرکردنی لەئەسینا وەك ڕوخانی دوا سیستەمی ستەمکاری لەخاکی یۆنان[١٩٧] کەلە(٥١٠پ.ز)و سەرکەوتنی کلیسپینس لەڕێکخستنەوەی ولاتو کۆتایهێنان بەئاژاوەی ناوخۆ لە (٥٠٨پ.ز) دەست پێکردنی سەردەمی دیموکراسی[١٩٨] چاوی لێدەکەن. هەرچەندە یەك لەسەرچاوەکان پێی وایە، کە دەسەلاتی ستەمکاران بەهۆی ئەوەی، کە لەبواری پێشکەوتنی ئابوریدا وەك یەك نەبوون، یەکسەرە لەناونەچوو و ئەوانەی دواکەوتووتر بوون ئەو ڕژێمەیان تێدا هەر بەردەوام بوو و لەزۆرترینی پێشکەوتنەکانیشدا قەرزداری ستەمکاران بوون[١٩٩].

لەسەردەمی ڕژێمی دیموکراسیدا، کەلەسەر فەرمانڕەوایەتی کردنی گەل ڕاوەستاوە ولەسایەیدا تاکەکان مافە ڕامیاریەکانیان بەدەستهێناوە،دوو دەزگای گشتی هەبوون، کە ئەوانیش بریتی

---

[١٩٣] طه باقر: مقدمةفي تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٥٣٦؛ عامر سليمان و احمد مالك الفتيان: محاضرات في التاريخ القديم، ص٤١٠.

[١٩٤] حسين الشيخ: دراسات في تاريخ حضارة اليونان والرومان، ص ٨٦.

[١٩٥] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٧٢-٧٤؛ ممدوح درويش مصطفى و ابراهيم السايح: مقدمة في تاريخ الحضارة الرومانية واليونانية (تاريخ اليونان)، (الاسكندرية:١٩٩٨-١٩٩٩) ج١، ص١ ٢٤-٢٥.

[١٩٦] عبدالوهاب مروان: النظرية السياسية بين اليونان والاسلام، ص٧٢.

[١٩٧] عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان و الرومان، ص٧٣.

[١٩٨] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٧٤؛ محمود فهمي :تاريخ اليونان،(الجيزة:١٩٩٩)، ص٥٢.

[١٩٩] هيأت مؤلفان: تاريخ جهان الاروس (روزگار باستان وقرون وسطى، كتاب يكم، ص١٢٥.

بوون له کۆمەڵە یان ئەنجومەنی گەل (الجمعیه الشعبیه= الاکلیریا) و ئەنجومەنی (بولی)، کە ئەرکەکانی بریتی بوون لەئامادەکردنی ئەو کاروبارانەی پێویست بوو بخرێتە بەردەم کۆمەڵەی گشتی و گرنگیدان بە وردترین کارە ئیداریەکان و جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەل، ئازادی بیرورا، وەك گرنگترین خەسڵەتی سەردەمی دیموکراسی، هانی بیریار و فەیلەسوفەکانیدا بۆ لێکۆڵینەوە لەرژێمە رامیاریەکان و بەراوردکردنیان و هەوڵدان بۆ دانانی تیۆری رامیاری، بۆ رێکخستنی کاروباری حوکمڕانی و پەیوەندی تاك وکۆمەڵ و تاك ودەوڵەت و چیەتی دەوڵەت و سروشتەکەی، ئەرکەکانی و ئەرك مافی هاولاتیان، زۆر شتی تر[٢٠٠]. دیارترین رووداوەکانی ئەو سەردەمەش بەکورتی بریتی بوون" لەگۆڕانەوەی ئەسینا وەك گرنگترین دەوڵەتی گریك لەستەمکاریەوە بۆ دیموکراتی و جەنگەکانی نێوان یۆنان و فارسەکان و شەڕی نێوان ئەسینا و ئەسپارتە و گەشەکردنی شارستانیەتی گریك (لەسەدەی ٥ی پ.ز) [٢٠١].

بەڵام چەندی وچۆنیەتی پراکتیزە کردنی ئەو رژێمە جۆراوجۆرە لەمێژووی دەوڵەتە شارەکاندا، لەدەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاواز بووە، ئاماژەکردنیش بەو هەموو دەوڵەتە شارانە کارێکی ئاسان نیە و باس وخواسێکی سەربەخۆی گەرەکە و ئەو لێکۆڵینەوەی ئێمە دەرفەتی بەئەستۆی خۆوە گرتنی نیە. بەڵام چونکە ئەسیناو سپارتە گرنگترین دوو دەوڵەت لەگەورەترین چوار دەوڵەتە شاری یۆنان (ئەسینا وسپارتە وئەرگوس و کورتنە) بوون و نزیکەی تەواو سەروەری ئەو ولاتەیان دابەشکردبوو[٢٠٢]. ولەگۆڕانکاریە ئابووری و کۆمەلایەتیەکان و جیاوازی چۆنیەتی گەشەکردنی ناوچە جۆربەجۆرەکان دەکرێ ئەسینا وەك نمونەی دەوڵەتە سیستەم جۆراوجۆر بینیوەکان وئەسپارتەش بەنوێنەری ناوچە نەگۆڕاو یان کەمگۆڕاوەکان، هەژمار بکەین[٢٠٣]. بەتایبەتیش، کە زۆربەی گۆڕانکاری و پێشکەوتن لەو ماوەیەدا تا نیوەی سەدەی (٤ پ.ز)، هەر لەدەوری ئەم دوو جەمسەرە وەك دوو نمونەی (عەبقەریەتی) یۆنان چڕببونەوە[٢٠٤] رەنگە

---

[٢٠٠] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: علی عکاشه واخرون: الیونان والرومان، ص١٠٢-١٠٥.

[٢٠١] طه باقر: مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، ج٢، ص٥٣٩.

[٢٠٢] علی عکاشه واخرون: الیونان والرومان، ص٥٩.

[٢٠٣] ا. برگر ودیگران: جهان باستان، ج٢، ص١١٠.

[٢٠٤] عامر سلیمان و احمد مالك الفتیان: محاضرات فی التاریخ القدیم، ص٤٠٦

بەئاماژەکردن بەو دوو شارە مەبەستەکەمان ڕوون بێتەوە بۆئەوەش لەئەسپارتەوە دەست پێدەکەین. کە بۆیەکەمین جار لەوێ دەوڵەتە شار پێکهات[٢٠٥].

ئەسپارتە لە هەرێمی لاکونیای باشوری ڕۆژهەلاتی نیوە دورگەی پیلوپۆنیزیا هەلکەوتووەو ئەیەکگرتنی پێنچ گوندی گەورە پێکدێت، ئەو چیایانەش، کە دەوریانداوە توانای خۆپاراستنیان پێداوەو پێویستی بەدروستکردنی( شورە) نەبووە[٢٠٦]. ئەو کە (لایکودیمونیش)ی پێدەوترێت، وردە وردە گەشەی کرد و بوو بەناوەندی سەرکردایەتیکردنی ناوچەکە[٢٠٧].

لەسەرەتای سەدەی (٦ی پ.ز) گەیشتە لوتکەی بەهێزی خۆی بوو بە گەورەترین و بەهێزترین شاری نیوە دوورگەی یۆنان[٢٠٨] بەوەش، کە لەڕەوتی گوزەرانیدا پێچەوانەی شارەکانی تر، کە دەرگای پەیوەندی ئابوری و ڕۆشنبیریان بەڕووی شارە گریك وناگریکەکاندا کردبۆوە ، ئەو دوورە پەرێزی و گۆشەگیری و ڕێگرتن لەهاتنی کاریگەری شارستانیەتی دەرەوەی بە بەرنامە گرتبوو، جیا لەهەموان لەچوارچێوەی سیستەمی پادشایەتیدا کە هاوکات دوو پاشا حوکمیان دەکرد، مابۆوە[٢٠٩] مانەوەو پارێزگاری کردنیشی لەو نەریتە کۆنە، لەدیدی مێژوونووسە هاوچەرخەکاندا ترۆپکی کۆنەپەرستی جیهانی گریك دەنوێنێ[٢١٠].

لەڕووی کۆمەلایەتیەوە دانیشتوانی ئەسپارتە لەسێ چین پێکدەهاتن و بریتی بوون لە:

---

[٢٠٥] عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان و الرومان، ص٤٥.

[٢٠٦] محمد كامل عياد: اليونان، ص١٦٩؛ ممدوح درويش مصطفى وابراهيم السايح: مقدمة في تاريخ الحضارة الرومانية واليونانية، ج١ ، ص٢٦ .

[٢٠٧] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٤٨؛ لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٣٦-١٣٧.

[٢٠٨] محمد كامل عياد: اليونان، ص١٦٩.

[٢٠٩] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٤٨؛ لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٦٩.

[٢١٠] مفيد رائف العابد: اليونان ، ص٤٨.

١- (ئەسپارتی) کە دوو بەرەباب بوونو دەسەڵاتداران لەوان دیاریدەکران لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە بە پلەیەك هەژماردەکرانو گشت مافێکی رامیاریو مەدەنییان هەبوو.
٢- (پیریوکی Perioce) یان دانیشتوانی دەورووبەر، کە دەچوونەوە سەرخەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەو تاڕادەیەك ئازادبوون لەکارکردن، بەڵام مافی ڕامیارییان نەبوو.
٣-چینی کۆیلەکان (هیلۆتس Helots)، کە بریتی بوون لەدانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە[٢١١]، بەڵام کرابوونە کۆیلە و هیچ مافێکی رامیاری و مەدەنیان نەبوو[٢١٢].

لەم وڵاتەدا جیاواز لەگشت ناوچەکانی تر دوو پاشای لەدەسەڵاتدا هاوتا، هەبوون، کە بەئامانجی بەرگرتن لە کێبەرکێی نێوان دوو بنەماڵە (ئەجیادیس و یۆریبۆتیدس)ی پاشایەتی، کە ڕیشەی خۆیان دەبردەوە سەر هەرقل[٢١٣] و هەردووکیان خۆیان بەشیاوی دەسەڵات دەزانی، پشتاوپشت دەهاتنە سەرتەختو لەگەڵیشیاندا ئەنجوومەنێکی پێنج کەسی بەناوی چاودێر یان ڕاوێژکار(Ephores) و ئەنجومەنی پیران(Geroasia) کە ئەندامەکانی سەر بە چینی ئەرستۆکرات بوون، کۆمەڵەیەکی گشتی کە بە(پیلا) ناسراوە، هەبوو[٢١٤].

---

[١] کۆیلەکان لە ماسینییەکانی خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بوون کەشارستانیەتەکەیان بەدەستی دوریەکان روخا.

[٢١٢] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: أ. بتری : مدخل الى تاريخ الاغريق، ص١٤؛ محمد كامل عياد: اليونان ص١٧٢-١٧٣؛ ا. برگر وديگران: جهان باستان ، ج٢، ص١١٥؛ غانم محمد صالح: الفكر السياسي القديم و الوسيط، ص ٢٥-٢٦. و عادل نجم عبو و عبدالمتعم رشاد محمد: اليونان و الرومان، ص٤٥-٤٦.

[٢١٣] بەناوبانگترین پاڵەوانی خوڕافی نیوە خوای یۆنانی وکوڕی زیوس وئافرەتێك بەناوی کیمینایە، هیرای خێزانی زیوس ڕقی لێی بووە، چونکە کوڕی ناشەرعی مێردەکەی بووە ئیشی زۆری لێداواکردوە وهەموویانی ئەنجامداوە دیارترینیان هەڵگرتنی ئاسمانە لەسەر پشتی:نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير،ص١٥٦-١٥٧هامش ٥٦.

[٢١٤] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر چۆنیەتی هەڵبژاردن و پێکهاتن و دەسەڵاتەکانیان بڕوانە: لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٤٠-١٤٦؛ محمد كامل عياد: اليونان ص١٨١-١٨٤؛ مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٥٣-٥٦ ؛ ممدوح درويش مصطفى وابراهيم السايح: مقدمة في تاريخ الحضارة

یەکێکی تر لەو شتانەی لەئەسپارتە جێی سەرنجە، سیستەمە پەروەردەکەیەتی، کە هیچی لە سیستەمە سیاسیەکەی کەمتر نیە. ئامانجی یەکەمیش تیایدا ئامادەکردنی سەربازی بەهێزە، کە لەگۆڕەپانی جەنگدا دڵڕەق و نەبەزبن[٢١٥]. ئەمەش لەبەرئەوەیە، کە سوپا گەورەیی و سەربەرزی ئەسپارتەی دەنویاند و سەلامەتی و مانەوەشی بە بەهێزی سوپا ئازایەتی سەربازان و زیرەکی و گیانی ڕێکخراوەیی و قوربانیدانەوە بەندبوو، گەورەترین شەرەفیش لای ئەسپارتاییەکان مردنیان بوو لەگۆڕەپانی جەنگ و نەنگیترین شتیش ئەوەبوو، کە لەدوای شکانی سوپا بەسەلامەتی بگەڕێنەوە[٢١٦].

هاوڵاتی ئەسپارتە سروشتێکی شەڕانی هەبوو، کە لە لەدایکبوونەوە بۆی ئامادە دەکرا، چونکە دوای پشکنینی کۆرپە و دڵنیابوون لەساغی لەشی بڕیاری ژیانی بۆ دەدرا[٢١٧] واتا نەخۆش و لاوازەکان دەکوژران و ساغەکانیش دەدرانەوە دایکیان، لەحەوت ساڵیەوە تا سی ساڵی، بەمەبەستی ڕاهێنان لەسەر گەرما و سەرما و پشت بەخۆبەستن بەرستێك ئەزموون مەشقی توندا ڕەتدەکران و فێری ئەوشتانە دەکران، کەپەیوەست بوون بە خۆشویستنی ڕژێم و نیشتمان، تا دوای بڕینی قۆناغەکانی مەشقیش نەدەبوونە هاونیشتمانی[٢١٨]. پرۆسەی هاوسەرگیریش زیاتر وەك پێویستی زاوزێ لەلایەن دەوڵەتەوە سەرپەرشتی دەکرا و لێی دەڕوانرا نەك لەپێناوی خۆشەویستی، تەنانەت ئەوان وێنەی (ئەفرۆدیت)ی خواوەندی خۆشەویستیشیان وەك جەنگاوەرێك کێشابوو[٢١٩]. هەموو گەنجێك دەبوایە بچێتە پاڵ یانەیەك، کە لەپانزە ئەندام

---

الرمانية واليونانية، ج١، ص٢٨-٣٠ ؛ رجب عبدالحميد الاثرم: دراسات في تاريخ الاغريق ، ص١١٢-١١٧

[*] ا.بتري:مدخل الى تاريخ الاغريق،ص١٦.

[٢١٦] بڕوانە: محمد كامل عياد: اليونان ، ص١٨٥؛ علي عكاشه واخرون: اليونان والرومان، ص٦٢ ؛ ارنولد توينبي: تاريخ الحضارة الهلينيية، ترجمة رمزي جرجس، مراجعة صقر خفاجة،(د.م:٢٠٠٣)، ص١٢١.

[٢١٧] غانم محمد صالح : الفكر السياسي القديم و الوسيط، ص ٢٧.

[٢١٨] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٣٨-١٣٩؛ محمد كامل عياد: اليونان ص١٨٦-١٨٧؛ مفيد رائف العايد : دراسات في تاريخ الاغريق، ص٥٦-٥٧.

[٢١٩] علي عكاشه واخرون: اليونان والرومان، ص٦٤-٦٥.

پێکدەهاتن و هەموو ئێواران لەسەر مێزێك بەشداری خواردنێکی سادەی بەکۆمەڵ گفتوگۆ کاروباری گشتیان دەکرد[220].

شایانی باسە ئەسپارتیەکان دارشتنی ئەو سیستەمە رامیاری و پەروەردەییە دەدەنە پاڵ یاسازانێکی گەورە بەناوی لیکرگوس[221].

مەبەستیش لەو دەستورە لەسەرەتادا بەیەکەوە پەیوەست کردنی کۆمەڵگەی ئەسپارتە بوو، کاریگەریشی بەرِوونی لەسەردەمی ململانێی لەگەڵ دراوسێکانیدا لەنیوەدورگەی پیلوپۆنیزیا بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچەکەدا دەرکەوت، کەوای کرد ئەسپارتە سەربکەوێت و لەو دەوڵەتانەش هاوپەیمانێك دروست بکات دژی ئەسیناو بەسەریدا سەربکەوێت[222].

هەرچی ئەسیناشە، کە لەهەرێمی ئەتیکا(Attika)ی ناوەراستی رۆژهەڵاتی نیوەدورگەی یۆنان هەڵکەوتووە بەقۆناغە یەك بەدوایەکدا هاتووەکان، کە بەدەسەڵاتی گەل کۆتایی دێت و ئاراستەی پێشکەوتنی سیستەمی رامیاری دەوڵەتە شارەکان دەنوێنێ، پێکهاتنی هەلومەرجێکی هەمەلایەنە، کە وایکردووە پشت بەزیاتر لەجۆرێك دەرامەت و بەرەبەرە ببەستێت، ئەو گۆرانکاریە بەردەوامەی بەدیهێناوە و هەڵکەوتنیشی وەك دورگەیەکی پێشکەتوو لەناو دەریاو نزیکی لەلا گرنگەکانی جیهانی یۆنانی، گشت مەرجە پێویستیەکانی سەروەری ئابوری و رامیاری و بیری بۆ فەراهەم کردووە[223].

هەرێمەکە لەرووی رامیارییەوە بۆ چەند میرنشینێك دابەش ببوو و دواتر وەك دەوڵەتێکی یەکگرتوو، کە پایتەختەکەی ئەسینابوو، دەرکەوت، بەپێی ئەفسانەکان ئەم یەکگرتنە دوانزە شاری لەخۆگرتبوو بەهۆی هەلومەرجێك بەئاشتی و لەسەردەستی (تیزیئوس= سیوس= تزە) یەکێك لەنەوەکانی (سیقرویس=cecrops کیکرویس= kekrops)، کە بەیەکەم پادشای

---

[220] أ.بتري: مدخل الى تاريخ الاغريق، ص١٦؛ مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٥٧؛ علي عكاشه واخرون: اليونان والرومان، ص٦٥.

[221] بۆ زانیاری زیاتر بروانە: محمد كامل عياد: اليونان، ص١٦٨-٢٠٧. و لەسەر کەسایەتی لیکورگوس بروانە: بلوتارك : السير، (اربيل:٢٠٠٥) ،ج١، ص ١٠٩- ١٤٨.

[222] رجب عبدالحميد الاثرم: دراسات في تاريخ الاغريق ، ص١١٧.

[223] لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٢١-١٢٢ ؛ محمد كامل عياد: اليونان، ص٢٠٩-٢١٠.

ئەسینا دادەنرێت و دروستکردنی شارەکەش هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، پێکهات، بەپێی ئاماژەی ناو ئەفسانەکان ڕەنگە سەردەمی دروستکردنی ئەو یەکێتیە بۆ دەوروبەری سەدەی(١٣پ.ز) بگەڕێتەوە ویۆنانیەکان پێی دەڵێن (سینویکزاموس synoikismos) [٢٢٤]. مێژوونووسان بەگرنگترین ڕووداوی ئەو سەردەمە و هۆکاری سەرەکی گەورەبوون و سەرکەوتوویی ئەسینای دەزانن[٢٢٥]. تەنانەت لەیادی ئەو پرۆسەیەدا لەوکاتەوە تائێستا ئەسینیەکان وەك جەژنی نەتەوەیی ئاهەنگ دەگێڕن.

چینە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای ئەسیناش بریتی بوون لەخانەدان (یوپاترىدایEuparidae) و جوتیاران (جیرموری یان جیورجیGeorgi)، پیشەوەران (دیمسیورجۆریDimirgi) بێبەشان (المعدمینThetes)[٢٢٦] وا پێدەچێ ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی ئەسینا لەسەرەتادا پادشایەتی ڕەهابووبێ، بەڵام پێداگری خانەدانەکان لەسەر ڕۆڵ بینینی ڕامیاری و پێکهاتنی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری، بواری بەردەوام بوونی نەدا[٢٢٧]. دواتر دەسەڵاتە پشتاوپشت کۆبووەکانی دەستی پادشاش بوو بەچەندین یەکە، کە لەلایەن گەورە فەرمانبەرانەوە بەناوەکانی(حاکمArchonئەرخۆن سەرۆکی دەزگای جێبەجێ کردن) و (سەرکردە= پۆلیمارخۆسPolemarchos) چاودێری کاروباری سەربازی، (پادشا archannbasileas سەرۆکی کاروباری ئاینی)، بەڕێوەدەبران و بۆ ماوەی یەك ساڵ لەلایەن ئەنجومەنی پیران (ئەریۆباخۆس) کە بە دەست ئەرستۆکراتەکانەوە بوو و لەڕاستیشدا هەرئەوان هەمەکارە بوون، هەڵدەبژێران[٢٢٨].

---

[٢٢٤] بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بڕوانە: مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق، ص٦٠-٦١؛ محمد کامل عیاد: الیونان، ص٢١٢-٢١٤؛ ا. برگر ودیگران: جهان باستان ، ج٢، ص١٢٠-١٢١.

[٢٢٥] علي عكاشة واخرون : اليونان والرومان ، ص٦٨.

[٢٢٦] بڕوانە: محمد کامل عیاد: الیونان، ص٢١٧-٢١٨ ؛مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق، ص٦٢؛ رجب عبدالحمید الاثرم : دراسات فی تاریخ الاغریق ، ص١٢٢؛ ا.برگر ودیگران: جهان باستان، ج٢، ص١٢١؛ علی عکاشه واخرون: الیونان والرومان، ص٧٠-٧١ .

[٢٢٧] مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق، ص٦١.

[٢٢٨] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : ا.بتری : مدخل الی تاریخ الاغریق، ص١٧-١٨؛محمد کامل عیاد: الیونان ص٢١٦-٢١٧؛مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق، ص١٢٢-١٢٣؛ علی عکاشه واخرون: الیونان والرومان، ص٦٩-٧١.

بەدەرکەوتنی بازرگانی وەك دەرامەتێکی نوێ و خراپی گـوزەرانی هاولاتیـان و بـەهێزی چـینی بازرگانــان و ئارەزوویــان بــۆ دەســەلات، فــشار لەســەر ئەرســتۆکراتەکان دروســت بــوو، دواتــر لەرێکەوتنی ئەرستوکرات و بازرگانەکان ڕژێمی ئۆلیکاری هاتەئاراوە[٢٢٩].

دەوروبەری ساڵی ٦٣٠پ.ز کیلـۆن وەك گـەنجێکی ئەرسـتوکراتی هەولّیـدا خـۆ وەك دیکتـاتۆری ئەسینا بسەپێنێ، بەلاّم سـەرکەوتوو نـەبوو و دراکـونیش بەئومێـدی چارەسـەرکردنی ململانێـی چینە جیاوازەکان و بـەرگرتن لـەخوێن ڕشـتن لـەرێگاداناني یاسـاو جێبـەجێکردنی لـە ٦٢١پ.ز هەلبژێردرا، بـەلاّم یاسـاکانی توندوتیـژبوون بەرادەیـەك وشـەی (دراکـۆنی) ببـوو بـەهاو واتـای سیفەتی توندوتیژی،لەزمانە ئەوروپییە نوێیەکانـدا[٢٣٠]. دمـاد (Demad) وتاریێـژی ئەسـینی سەدەی چوارەمی پیش زاین گوتەنی : دراکـۆن یاساکانــی خـۆی (بـەخوێن نـەك بەمەرەکـەب) نوســـــیووە[٢٣١]. دەکـرێ کـۆی یاساکانـــی لــە (هــەژمارکردنی هــەموو ئــازاردانێکی خــەلّك بەتاوانی گەورەو لەسێدارەدان سزای بچوکترین پێشێلکاری مـافی خـەلکی تـرو مـافی هـاولاّتی بەهەرکەسێکی چینەکانی خوارێ، کە توانـای خـۆ ئامـادەکردن بـۆ جەنگـــی هـەبێ) کــــورت بکەینەوە[٢٣٢] بەوەش نـەتوانرا چارەســــەری گرفتـەکان بکـرێ[٢٣٣]. و خرابتربـوونی بارودۆخـــی ئەسیناش ڕووبەڕووبونەوەی خوێـــناوی نێوان (دموس)[٢٣٤] وخانەدانەکانی لێکـەوتەوە[٢٣٥]. لەو

---

[٢٢٩] محمـد كامـل عيـاد: اليونـان، ص٢٢٢-٢٢٣ ؛ حسين الـشيخ: دراسـات فـي تـاريخ حـضارة اليونان والرومان، ص٩٧

[٢٣٠] محمد كامل عياد: اليونان، ص٢٢٤-٢٢٥.

[٢٣١] ا. برگر وديگران: جهان باستان ، ج٢، ص١٢٥.

[٢٣٢] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٦٥.

[٢٣٣] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محمد كامل عياد: اليونان، ص٢٢٦ ؛ مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص١٢٤ ؛ علي عكاشه واخرون: اليونان والرومان، ص٧٤

[٢٣٤] بـە پێـچەوانەی ئەرستۆکراتەکان و خانـەدانان بـە بـاقی خـەلّکی تـری ئـازاد لەئـەتیکا جگـە لەکۆیلکەکان دەگوترا دمۆسDemos : فئۆدۆر. ب.كوروفكين: يونان باستان، ص٥٧.

[٢٣٥] بـۆ هۆکارەکـان بـەکورتی بڕوانـە: عـادل نجـم عبـو و عبـدالمنعيم رشـاد محمـد: اليونـان و الرومان، ص٥٩.

سەروبەندەش سۆلون[٢٣٦] پایەی ئەرخۆنی وەرگرت کەدەبوایە ئەو دوو چینە ئاشتبکاتەوە ئەوەش چاکسازی لەکاری حکومەت باشکردنی گوزەرانی خەڵکی پێدەویست[٢٣٧].

ئەو لەساڵی ٥٩٤پ.ز هاتە سەر تەخت و بێ پەنابردنە بەرتوندوتیژی توانی دەوڵەمەندو هەژارەکان ڕازی بکات تا کاروبارەکانیان دوور لەئاژاوەی کۆمەڵایەتی چارەسەربکەن و سیستەمێکی ڕامیاری و ئابووری دانا کە لەمیانەیدا ئەسینای بەسەربەخۆی هێشتەوە[٢٣٨]، بەگوێرەی یاساکانی بناغەیەکی دەستوری بۆ ڕژێمێکی حوکمڕانی کردن لەسەر بنەمای سامان دانا و حکومەتێکی ئۆلیگارکی (کەمینە)، لەخاوەن موڵك و بازرگانەکان دروستبوو و بڕێك ماف بەچینی گشتیش، بەئەندازەی ئەو هۆشیاریەی کە پێی وابوو پێی گەیشتبوو، بەخشرا[٢٣٩] واتە سیستەمێك پێکهات کە تیایدا مافە ڕامیاریەکان بەگوێرەی سامان دابەشدەکران و بە(تیمۆکراسی) ناسراوە[٢٤٠].

سۆلون دەروازەی سەردەمێکی نوێی لەئەسینا کردەوە، لەوێ بەدواوە بەڕێوەبردنی وڵات لەبری ئەوەی وەك جاران بەفەرمانی سەرپێی و قابیلی گۆڕان بەڕێوە بچێ، ملکەچی یاسایەکی نووسراوە کرا[٢٤١]، بەڵام پلەبەندی دەسەڵات بەپێی سامان لایەنگری ونەیاری بەدوای خۆیدا هێنا، کە سەری کێشا بۆدابەشکردنی کۆمەڵگە لەچوارچێوەی پارتی جیاواز بەگوێرەی شوێنی نیشتەجێ بوون، لەئاکامیشدا بیستراتوس سەرۆکی پارتی چیا، کە کرێکارو هەژارو ئاژەڵدارەکانی دەگرتەوە دوای دووجار دەستگرتنی بەسەر ئەسیناو

---

[٢٣٦] بۆ زانیاری هەمەجۆر لە بارەی سۆلۆن بڕوانە بلوتارك: السير، ج١، ص٢٠٧-٢٤٣.

[٢٣٧] فئودور. ب. کوروفکین: یونان باستان، ص٥٨. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محمد کامل عیاد: الیونان، ص٢٢٧-٢٣٧؛ رجب عبدالحمید الاثرم: دراسات فی تاریخ الاغریق، ص١٣١-١٤٠.

[٢٣٨] عامر سلیمان و احمد مالك الفتیان: محاضرات فی تاریخ القدیم، ص٤١١.

[٢٣٩] لطفی عبدالوهاب یحیی: الیونان، ص١٣٠.

[٢٤٠] أ. بتری: مدخل الی تاریخ الاغریق، ص٢٠.

[٢٤١] محمد کامل عیاد: الیونان، ص٢٣٦.

دورخـــستنەوەی لــە(٥٨١- ٥٢٨پ.ز) بووبــە فــەرمانڕەوا و ڕژێــمــی تاکــە کەســـی ســـتەمکاری دامەزراند[٢٤٢].

ئەو ئەگەرچــی خۆی ستەمکار (طاغـی)بوو، بەڵام پراکــتیزەی دەسەڵاتــی سۆلۆنـــی دەکرد وســـوربوو لەســەرئەوەی، کە دەســەڵاتە باڵاکان بەدەست دڵســـۆزان و متمانە پێکراوەکانـــی بێــت[٢٤٣]. جێگــــیری بــاری ڕامیــاری و پێـشکەوتنـی ڕۆشــنبیری و گەشـەکردنی ئـابوری لــە خەسڵەتەکانی سەردەمی ئەوبوون[٢٤٤]. دوای خۆشی کوڕەکانی (هیــبارخوس وهیــباس) هاتنــە سەرکار و فەرمانڕەوایەتیکردنی ئەوان کۆتایی سەردەمی ستــەمکاران بوو[٢٤٥].

بەهاتنە سەرکاری کلیپسینس لە(٥٠٩پ.ز) kleisthenes سەردەمی دیموکراتی لە ئەسـینا دەستی پێکردو ویستی لـەڕێی دانـانی دەسـتورێك بەدابەشـکردنی دانیشتوان، بـۆ (دە خێڵ ) بەگوێرەی شوێنی نیشتەجێبوون و کاڵکردنـەوەی پەیوەنـدی خـوێن و دروستـکردنی ئەنجومــەنی پێنجسەد کەسی، کە گـشت چین وتوێـژەکان لـەخۆبگرێت و لابردنـی مـەرجی مولکداریـەتی و دیاریکردنی تـەرخون و کردنـی بەهەڵبـژاردن و دەرکردنـی یاسـای دوورخـستنەوەی ڕامیـاری (stakismos)[٢٤٦]، تاهۆکــاری دروستبونـــــی ناکۆکــی پارتایەتــی نەهێڵـــی و ڕێ

---

[٢٤٢] لطفـي عبـدالوهاب يحيـي: اليونـان، ص١٣٠-١٣١. بۆزیـاتر ڕوونکردنـەوە بڕوانـە: محمـد كامل عياد: اليونان ، ص٢٣٧-٢٤٦ ؛ رجب عبدالحميد الاثرم: دراسـات فـي تـاريخ الاغريـق ، ص١٤٠-١٤٨.

[٢٤٣] اندرو روبـرت برن: تـاريخ اليونـان، ص١٣٥-١٣٦.بۆچوونیەتی بەڕێوەچوونی حکومـەت و مامەڵە و چاکسازی زیزستراتوز (پیزسیترات) بڕوانە: البرماله: تاريخ البرماله ، ج١، ص٢١٣.

[٢٤٤]بڕوانە: عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد : اليونان و الرومان، ص٦٩-٧٠.

[٢٤٥]طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ص٥٣٧ ؛ عادل نجم عبـو و عبـدالمنعم رشـاد محمد: اليونان و الرومان، ص٧٠-٧٣.

[٢٤٦] بـەپێی ئەویاسـایە، واتـە دورخستنەوەی ڕامیـاری (النفـي الـسياسي) هــەر سـەرکردەیەك بیانویستایە لێی ڕزگاربن ساڵانە کۆبوونەوەی ئەنجومـەنی گـەل ناویـان لەسـەر پارچـە سوالەتێك دەنووسـی و دەیانخـستە نـاو دەفرێـك بەکۆبوونـەوەی ٦٠٠٠دەنـگ بڕیـاری دوورخـستنەوەی لەوڵات بۆ دە ساڵ پەسەند دەکرا. بەو یاسایە دەوترا: ostakimos یاستراکیسم astrcisme ئــەویش لەپارچــەی ســواڵەتەکەوە، کــەپێی دەوتــرا ostraoلەوشــەی (ostrco)یــشەوە ostracise بڕوانـە هەریـەك: ا. بـتری : مـدخل الى تـاريخ الاغريـق ، ص٢٢ ؛ لطفـي عبـدالوهاب يحيي: اليونان، ص١٣٥؛ عبدالوهاب مروان: النظريـة الساسية بين اليونـان والاسلام، ص ١٤٢؛

لەگەڕانەوەی تاکرەوەی بگرێت[٢٤٧].پاشان کەسایەتی تر وەك پیمستکلسThemistocles و سیمۆن[٢٤٨] یان کیمۆن وبرکلس[٢٤٩] دەرکەوتن، کە لەسەردەمی ئەوی دواییدا دیموکراتیەت پێشکەوتووترین قۆناغی خۆی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بینی و بۆماوەی (٣٠)سالّ لە٤٦٠ تامردنی لە ٤٢٩ پ.ز حوکمی ئەسینای کرد. ئەسینا لەسەردەمی ئەودا گەیشتە لوتکەی پێشکەوتن و گەشانەوە[٢٥٠] و دوای مردنیشی سەرکردەیەکی وا هەڵنەکەوت، کە لەئاستی پارێزگاری کردنی ئەو بارودۆخە دابێت و بتوانێ ئەو ئەنجامانە بێنێتەدی، کە برکلس بۆی تەواونەکران[٢٥١].

شایانی ئاماژە پێکردنە هەرچەندە دیموکراسیەتی ئەسینا تەواوترین سیستەمە کە مرۆڤایەتی تا ئەو کاتە پێی گەیشتبوو، بەلاّم لەناوەڕۆکدا زۆر لەسیستەمی ئەسپارتە جیاوازنەبوو، چونکە لەهەردووکیاندا مافی هاولاّتی بوون کەمینەی کۆمەڵگا لێی بەهرەمەندبوون، لەئەسیناش

---

البرماله: تاریخ البرماله ،ج١، ص٢١٥؛ أ.برگر ودیگران: جهان باستان ،ج٢،ص١٣٧.شایەنی باسە تەنانەت برکلیسیش خۆشی بەو یاسایە نەفی کرا: مفید رائف العابد: دراسات فی تاریخ الاغریق،ص١٢٤.

[٢٤٧] بڕوانە: أ. برگر ودیگران: جهان باستان، ج٢، ص١٣٢-١٣٨ ؛ رجب عبدالحمید الاثرم : دراسات فی تاریخ الاغریق ، ص١٤٨-١٥٥.

[٢٤٨] بۆ زانیاری لەسەر لەسەر کەسایەتی کیمون(سیمون) بڕوانە: بلوتارك، السیر ، ج٢، ص٩٣٣-٩٥٤.

[٢٤٩] بۆ زانیاری لەسەر برکلس بڕوانە: بلوتارك، السیر ،ج٢، ص٣٤٩-٣٩٤؛ تشارلز الکسندر رۆبنصن: اثینا فی عهد برکلس، ترجمة انیس فریحة ،(لبنان:دت).

[٢٥٠] محمد کامل عیاد: الیونان ص٢٨٨.بۆ زانیاری جۆراوجۆرو زیاتر لەسەر ئەسینا لەسەردەمی ئەودا بگەڕێوە بۆ: البرماله: تاریخ البر ماله ، ج١، ص٢١٣.

[٢٥١] عامر سلیمان و احمد مالك الفتیان: محاضرات فی التاریخ القدیم، ص٤٣٣؛ البر ماله: تاریخ البرماله ، ج١ ، ص٢٧٧.

کۆیلە و ئافرەت و پیشەوەر، کەزۆرینەی دانیشتوان بوون مافە رەواکانیان لێزەوت کرابوو[٢٥٢].
واتا ئەویش نەیتوانی وەلاّمی پرسی راستەقینەی کۆمەڵگابداتەوە[٢٥٣].
شتێکی حاشا هەڵنەگرە، کەدەوڵەتە شارەکان لەنێوخۆیاندا و لەگەڵ دەوڵەتەکانی تریش پەیوەندی جۆراوجۆری ئاشتی وشەڕیان هەبووە، هەندێك یان هەموویان لەشەڕی دەرەکی لەگەڵ دەوڵەتە بچووکەکانی وەك قرتاجە - شاری بەناوبانگی بازرگانی - و هی گەورە وەك بارسە ئەخمینیەکانەوە گلاون، هۆکاری ئەو تێکهەڵچوونانەش جۆراوجۆربوون، ئەسیناو قرتاجە[٢٥٤] کێبەرکێی سەربازی و ململانێ لەسەر رێگا دەریاییەکان، بەشەڕیدان، لێکدانی بەرژەوەندییەکانیشیان لەئاسیایی بچووك لەگەڵ ئەخمینیەکان و هەوڵی ئەسینایییەکان بۆ بەرگرتن لەفراوانخوازی ئەخمینیەکان بەرەو رۆژئاوا، هۆیەکی کاریگەری شەڕەکانیان بوو- دواتر بەردێژی لێی دەدوێین- هەرچی هۆکاری شەڕو ململانێ یان پەیوەندی باش، دەستەبەندی نێوان دەوڵەتە شارەکان بوو، بەپێی قۆناغەکانی ئەو تێکهەڵچوون و لێك نزیکبوونەوانە هەر لەبەرژەوەندیەکی دیاریکراوی ئابوری و رامیاری و بازرگانییەوە بگرە تا فراوانخوازی و دەست بەسەراگرتن و هەژموونی(هەیمەنە) بەسەر دەوڵەتەکانیتر، یان تێکراییی وڵاتی یۆنان، دەگۆڕا[٢٥٥]. سەرکەوتنی ئەسپارتە بەسەر دەوڵەتشارەکانی هاوسێی لەنیوە دوورگەی پیلوپۆنیز و پێکهاتنی پەیمانی (حلف)ی سەربازی پیلوپۆنز بەسەرۆکایەتی خۆی وەك یەکەم رێکەوتنی گەورەی مێژووی یۆنان[٢٥٦] و پەیمانی (حلف)ی دیلوس (٤٧٨-٤٧٧پ.ز)، کە ئەسینا

---

[٢٥٢] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مفید رائف العابد : دراسات فی تاریخ الاغریق، ص٧٦؛ ابو الیزید علی المتیت: تطور الفكر السیاسی، ص٢٠-٢٢.

[٢٥٣] بۆ هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی دیموکراسیەت بڕوانە ممدوح درویش مصطفى وابراهیم السایح:مقدمة في تاریخ الحضارة الرومانیة والیونانیة،(الیونان)، ج١، ص٥٢-٥٥.

[٢٥٤] لەسەر پەیوەندی ئەسینا وقرتاجە بڕوانە: محمد كامل عیاد: الیونان، ص٣٤٦-٣٨٦.

[٢٥٥] لطفی عبدالوهاب یحیی: الیونان، ص ١٤٩-١٥١ ؛علی عكاشه واخرون: الیونان والرومان، ص٨٠.

[٢٥٦] لطفی عبدالوهاب یحیی: الیونان، ص١٤٨.بۆ زانیاری زیاتر لەسەرئەوە و یەکگرتنە جۆراوجۆرەکان بڕوانە: محمد كامل عیاد: الیونان، ص٤٠٦-٤١٣.

سەرکردایەتی دەکردو زۆربەی شارە یۆنانیەکانی لەخۆگرتبوو[٢٥٧] و شەڕی پیلوپۆنیزیـای نێـوان ئەسینا و سپارتە، کە لـە (٥٣١پ.ز) دەسـتی پێکـرد ( ٣٠)سـاڵی خایانـد و نزیکـەی هـەموو دەوڵەتشارەکانی یۆنان وەك لایەنگری یەك لەو دوو دەوڵەتە بەشـداریان کـردو سـەرئەنجام یۆنـان دەسـەڵاتی لەدەسـتداو سـەردەمێکی نائـارام و پڕئـاژاوە سـەریهەڵدا[٢٥٨]. لەنموونـەکانی ئـەو پەیوەندییە باش و خراپانەی ئەو سەردەمەی نێـوان دەوڵەتشـارەکانن. لـەنێو دەوڵەتـە شـارەکانی تریش شەڕو شۆڕ ڕوویـدا و لـەهیچ جـۆرێکی توندوتیـژی و وێرانکـاری یـەکتر دریغیـان نـەکرد، هـەژاری پـەرەی سـەندو کـەس لـەموڵك ومـاڵی خـۆی دڵنیـانـەبوو تەنانـەت دەوڵەمەنـدەکان بـۆ پارێزگـاری کـردن لەسـامانیان ئامـادەی پێشوازی کـردن لەهـەر سـەرکردەیەك بـوون و چـاوی هیوایان زۆر لەمەکـەدۆنیابوو، کـە لـەو بارودۆخـە ناهـەموارە، وەك هێـزێك لـەنیوە دورگـــەی بەڵقانـــی هەڵکەوتوو لەباکوری ڕۆژهەڵاتـــی یۆنان، دەرکەوتبوو[٢٥٩].

هارڤی بورتر بـەوڵاتێکی تەنگبـەری شـاخاوی ناودەبـات کـەمزیاتر لـە(١٠٠)خێڵـــی تێـدا نیـشتەجێیە[٢٦٠] کەچـی لەسەرچاوەیەکـــی تـردا هـاتووە، کـە مەکـــدونیا ناوچەیەکـــی بەرفراوانـــی خـاوەن کانـــزا و زەوی کـشـتوکاڵـــی فـراوان و دارسـتانـــی چـڕو لـەوەڕگای

---

(٢٥٧) لطفي عبدالوهاب يحيى:اليونان،ص،١٦٣هەروەها بڕوانە: عادل نجم عبو و عبدالمنعم: اليونان و الرومان، ص٩٥-١٠٢.

(٢٥٨) فئودور. ب. کوروفکین: یونان باستان، ص١٤٩. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر شەڕی پیلۆپۆنیز بڕوانـە توکودیـدس(توسـیدید): تـاریخ جـنگ پلوپـونزی، ترجمـه محمـد حـسن لطفي،(تهران:١٣٧٧).

(٢٥٩) فئـودور. ب. کـوروفکین: یونـان باسـتان، ص١٤٩-١٥١ ؛ ج.م روبـرتس: مـوجز في تـاريخ العـالم، ترجمـة فـارس قطـان، (دمـشق:٢٠٠٤)، ج١ ، ص٢٥١-٢٥٢. بـەکورتی ئامـاژە بەسەرهەڵدانی دەوڵەتی مەکەدۆنی لەوهەلومەرجانەدا وهۆکارە یارمەتیدەرەکانی دەکات.

(٢٦٠)هـارڤی بـورتر: موسـوعة مختـصر التـاريخ القـديم، (القـاهرة: ١٩٩١م)، كتـاب الثالث،قسم الاول،فصل الاول، ص ٢٨٧.

زۆرە[٢٦١]. سەردەمــی هاتنــی بنەماڵــەی مەکدۆنــی لەباشــورەوە بۆدەوروبەری(٧٠٠پ.ز) دەگەڕێتەوە[٢٦٢].

گوایە ڕیشەیان دەچێتەوە سەر ئەرگۆسیەکانی پیلۆپۆنیزیا، سەرچاوەکان ناوی ژمارەیەك پادشایان هێناوە،کە لەپێش دەرکەوتنی فلیب حوکمی دەوڵەتی مەکدۆنیایان کردووەوباسکردنیان لێرە بەپێویست نازانین[٢٦٣]. گریکەکان وەك بێگانەو دواکەوتوو(بربر) سەیریان دەکردن و ئەسکەندەری یەکەم لە٤٩٦پ.ز ویستی بەدواندنی گریکەکان بەزمانی خۆیان بەشداری کردن لەیارییەکانی ئۆلۆمپی و خۆگێڕانەوە بۆ بنەماڵەی ئەرگوسی گریکی و بردنەوەی ڕیشەیان بۆ سەر هەرقڵ، گریگیەتی خۆیانیان پێ بسەلمێنێ[٢٦٤].

تێکشکانی فارسەکان لەبەرامبەر یۆنانیەکاندا دەرفەتیدایە ئەسکەندەری یەکەم تا لەسەر حسابی دراوسێکانی سنوری دەسەڵاتی فراوان بکات و لەرێی بەدیهێنانی دەستکەوتی ڕامیاری و سەربازی بناغە بۆ دەسەڵاتێکی چەسپاو و بەهێز دابنێ، بەشێوەیەك کە دەکرێ بەدامەزرێنەری مەملەکەتی مەکدۆنیا دابنرێت، هەرچی پەیوەندیە باش و ناکۆکیەکانیشیانە لەگەڵ ئەسینا یان وەك دەڵێن گریگە ئامۆزاکانیان بۆ سەردەمی بیستراتوسی ستەمکار(طاغی)ی ئەسینی ساڵی(٥٤٥ - ٥٢٧پ.ز) و سەردەمەکانی دواتر دەگەڕێتەوە[٢٦٥].

---

[٢٦١] علی عکاشە واخرون: الیونان والرومان، ص٩٢؛ ممدوح درویش مصطفی وابراهیم السایح: مقدمة فی تاریخ الحضارة الرومانیة والیونانیة، ج١، ص٣٩.

[٢٦٢] سەرەتا لەپیریا pieria دوای دەرکردنی دانیشتوانەکانی، نیشتەجێبوون دواتر سنووری دەسەڵاتیان بەگرتنی سالونیکی هەرێمی یوتایا، فراوانکرد. عبدالعظیم الراعی: دراسات فی التاریخ القدیم (مقدونیا و العصر الهلینستی)، (القاهرة: ١٩٧٨)، ص٣.

[٢٦٣] بۆ ناوی پادشاکانی پێش فلیپ وماوەی حوکمیان بڕوانە: هارقی بورتر:موسوعة مختصرالتاریخ القدیم، ص ٢٨٧-٢٨٨ .

[٢٦٤] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:عبدالعظیم الراعی: دراسات فی التاریخ القدیم، ص١٦-١٧؛ فوزی مکاوی: تاریخ العالم الاغریقی وحضارته، (القاهرة: ١٩٩٩)، ص٢١٥؛ ج.م. روبرتس : موجز تاریخ العالم، ج١، ص ٢٥١.

[٢٦٥] بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەو بابەتە و بارودۆخی ئابوری وکۆمەڵایەتی بڕوانە: عبدالعظیم الراعی: دراسات فی التاریخ القدیم، ص٥-١٧.

ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی لای مەکدونیەکان پادشایەتی پشتاوپشتی سەربازی بوو[٢٦٦]. کاتێك فلیپی دووەمی کوری ئەرخیلاوس بوو بە چاودێر(الوصی) لەسەر ئەمونتاسی سێیەمی کوری ئەسکەندەری یەکەمی برای و دواتر خۆی وەك پادشای مەکدونیا ڕاگەیاند، ئەو توانی لەماوەی دەسەلاتی خۆیدا لە (٣٥٩-٣٣٦ پ.ز) دووبەرەکی ولاتەکەی نەهێڵێ ولاتێکی بەهێزو یەکگرتووی دروستکرد پاشان هەولیدا هەموو ولاتی گریك یەکبخات و ناڕاستەوخۆ بیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، بۆئەمەش شێوازی جۆراوجۆری بەکارهێنا[٢٦٧]، دوای سەرکەوتنی بەسەر ئەسینادا لەشەڕی خیرونا(شیرونا)ی ساڵی ٣٣٨ بەلگەنامەی (میثاق) یەکیەتی شارە یۆنانیەکانی دانا و کۆرنسەی کردە پایتەخت و بارەگای ئەو یەکێتییە[٢٦٧] و لەساڵی( ٣٣٧پ.ز) لەلایەن کۆنگرەی کورنسە بەسەرکردەی گشتی بۆ هێرش کردنە سەر ولاتی ئەخمینی هەلبژێردرا، بەلام تیرۆرکرانی لە( ٣٣٦پ.ز) دەرفەتی ئەنجامدانی ئەوکارەی نەدا، کوڕەکەی ئەسکەندەری سێیەم (ئەسکەندەری گەورە) بوو بەجێنشینی[٢٦٨].

---

[٢٦٦] بڕوانە : ارنولد توینبی تاریخ الحضارة الهیلینیة، ص ١٩١- ١٩٢

[٢٦٧] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٣).

[٢٦٨] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی هاتنی فلیپ و ئەوکارانەی لەپێناو یەکیتی گریکدا ئەنجامی داون بڕوانە: أ. بتری : مدخل الی تاریخ الاغریق، ص٥٠-٥٥؛ نیقولا زیادە: الحکم السلوقی بلاد شام، مجلة فکر العربی، عدد٢٢ السنة الثالثة (بیروت: ١٩٨١)، ص١٨١؛ ف. دیاکۆف و س. کۆفالیف: الحضارات القدیمة، ترجمة نیسم واکیم الیازجی، (دمشق:٢٠٠٦)، ص٣٨٩-٣٩٢.

## باسی دووەم

### هۆیەکانی هەڵگیرسانی شەڕی گۆگامێلا (ئەربیلا)

### تـەوەرەی یەکـەم : ململانێی باو (الصراع التقلیدی )وحەزی فراوانخوازی

لەڕاستیدا، لەبەرئەوەی شەڕ تایبەتمەندی تەنها گروپێك یـان نەتەوەیـەك ورەگـەز ورەنگێـك نیـە و تێکڕای گەلانی پێشکەوتوو ودواکەوتوو، دەوڵەمەند و هەژار، بەپێی هۆکار و بیانو و تێـڕوانینی جیـاواز، تێـی کـەوتوون، بەگـشتی دەربـڕی زینـدەگی و پاکانـەی هەڵوێـستێك بـووە کـەوای خواستوە[٢٦٩]، ڕۆسۆ وەك پێشهات بۆ هەر دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری دەیبینێ[٢٧٠]، بەتایبەت لەوسـەدە دوورانـەدا کەتیایانـدا میللـەتان لـەحاڵی دورەپەرێزیـدا دەیانگوزەرانـد و بەچـاوی دوژمنایەتی دەیانڕوانیە یـەکتر، هەریەکـەیان دەیەویـست ئـەویتر تێکبـشکێنێت ، جـەنگ تاکـە ئامراز ودەرفەت بـووە کەمیللـەتێك بەمیللـەتێکی دیکـە بگەیـەنێت و زەمینـەی دروسـتکردنی پەیوەندی وئاشنایەتیان فەراهەم بکات[٢٧١].

هەر بۆیەشە کاتێك لەمیانەی بەڵگەنامە نووسراو و وێنە و پەیکەرە دروستکراوەکان، دەڕوانینـە مێـژووی ناوچـەیەکی وەك ڕۆژهـەڵات لەنێویـدا دەوڵـەتی ئـەخمینی، تـەژی لەشـەڕ و غـەزودا دەردەکەوێت، بەشێوەیەك کە مێژوونووسی[٢٧٢] وا هەیە دیرۆکی دەوڵـەتی ئـەخمینی بەزنجیرەیـەك لەشەڕو داگیرکاری (فتـوح) ودروسـتبوونی میرنـشین و هەرەسـهێنانی و سـەرهەڵدانی شـۆڕش و

---

[٢٦٩] عبدالله محمود حسین: دراسات في التاریخ العسکري ،ص٦٩.

[٢٧٠]نفس المرجع، ص٧٣.

[٢٧١] غلام رضاعلي بابائی: تاریخ سیاست خارجي ایران ازشاهنشاهی هخامنشي تا به امروز، (تهران :١٣٧٥ )،ص٩.

[٢٧٢] مەبەست لە (دەهیە )ی مێژوونوسی فەرەنسی پسپۆڕ لە مێژوی کۆنە.

دامرکاندنەوەی دەزانێ، تارادەیەك كەمپێی وایە دەكرێ بگوترێ لە زۆربەی سەردەمی میر و پاشاكان جگە لەشەڕ هیچی دیكە نەزانراوە وتیایاندا بوارێك بۆئاشتی نەماوەتەوە[٢٧٣].

لەئەسیناش لەسەرەتای سەدەی پێنجەم تا٣٣٨پ.ز ، لە (١٦٤)ساڵ (١٢٠)ی بەشەڕ بە ڕێكخراوە، بۆیەشە لای هەندێك، شەڕی جۆراوجۆر، بەسروشتی و وەك دەرەنجامی ناچاری دێتە بەرچاو[٢٧٤] ئەمەش وای لەهەندێك لێكۆڵەر كردووە كەژیانی مرۆڤایەتی بەگشتی بەشەڕی بەردەوامی نێوان كۆمەڵە ناكۆكەكان، بزانن وپێیان وابێ، كە چیرۆكی ژیان چیرۆكی شەڕە وپێچەوانەكەشی ڕاستە[٢٧٥] و وای بۆدەچن، كە بەدوای یەكداهاتنی شەڕو ئاشتی، ئەو كەرەسانەن كەڕابردوویان پێكهێناوە و شەڕیش بەدرێژایی مێژوو ڕێگایەكی ئاسایی یان سروشتی بووە، بۆ درێژەدان وخەریك بوونی ناكۆكی كۆمەڵە ڕامیاریەكان و چارەسەركردنی ئەوناكۆكیانە[٢٧٦] ، بەو پێیەش بوونی پەیوەندی شەڕ و ئاشتی ونائارامی و ململانێ هەڵقوڵاو لەهەلومەرج وهۆكاری تایبەتی نێوان دوو دەوڵەتی ئەخمینی، وەك دەوڵەتێكی گەورەی خاوەن دەستەلاتی ڕەها لەرۆژهەلات و یۆنانی پێكهاتوو لەسەدان دەوڵەتەشاری سەربەخۆ و خاوەن سەروەری، لەهەمانكاتیشدا هاوسێ -كەپێشتر لێیان دوایین-شتێكی ئاشكراوحاشاهەڵنەگربووە ودەرئەنجامی هەر شەڕێكیش وروژاندنی یەك لە لایەنەكان ئامادەسازی زیاتری هەردوولا وڕەخسانی زەمینەی شەڕێكی تری زۆر بەربلاوتری لێدەكەوتەوە، تادەشهات هیواوپێویستی و هەلومەرجی یەكلایی بوونەوەی مسۆگەرتر دەكرد ، كەبەهاتنە سەركاری دارای سێیەم لەئێران و بەدەسەلات گەیشتنی ئەسكەندەری سێیەم لەولاتی گریك، گەیشتە چڵەپۆپە و لەشەڕی گۆگمێلادا بەرجەستەكرا.

دە ستپێكی نائارامی نێوان ئەو دوو ولاتەش بۆ دەوروبەری ساڵی ٥٥٠پ.ز دەگەڕێتەوە، ئەو كاتە كەكۆرشی ئەخمینی(٥٥٩-٥٣٠پ.ز) ئاسیای بچوكی داگیركرد ودەولەتە شارە یۆنانیەكانی

---

[٢٧٣] فیصل عبدالله و عید مرعي :مدخل الى تاريخ الحضارة ، (دمشق: ١٩٩٩--٢٠٠٠م)، ص٧٨.

[٢٧٤] اندريه ايمار وجانين اوبوايه :تاريخ الحضارات العام، مج١، ص٣١٤.

[٢٧٥] عبدالله محمود حسين: دراسات في التاريخ العسكري ،ص١٢٢.

[٢٧٦]نفس المرجع، ص٧٣.

ئەوێی ناچاربەپێدانی باج بەولاتەکەی کرد[٢٧٧]. قینی باجی زۆر و بێزاری ئەوانەی کرابوون بەفەرمانڕەوا بەسەریانەوە لەساڵی ٤٩٩پ.ز شۆرشێکی لێکەوتەوە[٢٧٨]، ئەویش دوای پێکهاتنی هاوپەیمانیەتیەکی سەربازی لەژێر سەرکردایەتی شاری میلیتوس[٢٧٩] (ملاطیة)و ئەرستوگوراسی پادشادیکتاتۆرەکەی کەتا ساڵی ٤٩٤پ.ز خایاند، کاتێکیش لەمیانەی بەشداری پێکردنی شارەکانی نیوە دورگەی یۆنان لەوشۆرش وهاوپەیمانیەتیەدا ئەریتریا(Eritrea )[٢٨٠] وئەسینا بەهێزێکی کەم هاتنە ناوەوە بەشداریکردنیشیان بەتایبەت لەگرتن وسوتاندنی شاری (ساردیس)[٢٨١] لەئاسیای بچوك و ئەگەری دووبارە بوونەوەی هاوکاری لەوجۆرە، وەك زەنگی مەترسیەکی گەورە وابوو بۆسنوری ئیمپراتۆریەت بۆیە ویستیان لەرێی پەلاماری ولاتی یۆنان و تەمێ کردنی ئەو هێزانە، کۆتایی بەچاوگی ئەومەترسیانە بهێنن[٢٨٢].ئەمە هێندە جێی بەهەند گرتن بوو کە بەپێی سەرچاوەکان داریوشی پادشا لەکاتی

---

[٢٧٧] راس ئي دان وديگران: تاريخ تمدن وفرهنگ جيهان، ترجمه عبدالله حسين اذرنگ، (تهران :١٣٨٤)، ج١ ،ص١٩٧؛رجب عبدالحميد الاثرم: دراسات في التاريخ الاغريق، ص١٦٩نقلا عن Herodotus ,v٢٨ff.

[٢٧٨] اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ص١٧٧؛ هيات مؤلفان: تاريخ جهان لاروس روزگاری باستان وقرونی وسطی، ص١٣١؛ بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو شۆرشە بڕوانە محمد ا.دندامايف : تاريخ سياسى هخامنشيان ترجمه خشاير بهاری،(تهران:١٣٨١) ، ص١٩٩-٢١٤.

[٢٧٩]ملاطية: شارێکە لەناوەڕاستی کەناری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك هەڵکەوتووە:لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان ،ص١٥٦.

[٢٨٠]ئەريتريا: شارێکە لەهەرێمی یوبویە(Euboea)-یان نیگرۆپۆنت کەگەورەترین دورگەی ئەرخەبیلی یۆنانە.جمس بيكنغام: رحلتي الى العراق،ص١٤٩ هامش١٧- هەڵکەوتوە، لطفي عبدالوهاب يحيى : اليونان ، ص١٥٧.

[٢٨١] ساردیس : شارێکە لە ئەنادۆڵ لە باشوری چیای ئەتمۆلس هەڵکەوتوە و ڕووباری بەکتۆلمس دووکەرتی دەکات پایتەختی پاشایەتی مەملەکەتی لیدیای کۆن، یەك لەپاشاکانی ناوی بەقارون هاتووە لە قورئاندا بوو: نسطور ماتساس : مذكرات الاسكندر الكبير، ص١٦١هامش٦٢.

[٢٨٢] لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٥٧هەروەها بڕوانە محمد كامل عياد :تاريخ اليونان ، ص٢٦٣-٢٧١؛ مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق ، ص٨٠-٨٢؛ عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان والرومان دراسه فى تاريخ الحضارة ، ص٨٠-٨٣.

شۆرشی ئەیۆنیەکان، سوێندی خواردووە کە تۆڵە لە ئەسینا و ئەریتریە بکاتەوە بە تایبەت[٢٨٣]، دەڵێن داریوش یەکێك لەخزمەتکارەکانی ڕاسپاردبوو، کەهەموو ئێوارەیەك سێ جاردەستەواژەی (شاهانشائەسینیەکان لەیادمەکە )ی بۆدووبارە بکاتەوە[٢٨٤]. یەکەمین لەشکرکێشی دژی یۆنانیەکان لەساڵی ٤٩٢پ.ز بەرێکخستنی سوپایەك بەسەرکردایەتی ماردونیوسی زاوای داریوش، بەهەردوو ڕێی وشکانی ودەریاوە بە هلسپۆنت[٢٨٥] وتراقیا[٢٨٦] ومەکدۆنیادا دەستیپێکرد، کەسەرەڕای هەندێك پێشڕەویان، کەچی بەهۆی بەربەرەکانی هۆزە تراقیەکان وهەڵسانی لافاو ولێکەوتنی زیانێکی گیانی زۆر، ناچاربەکشانەوە بوون دوای کەمتر لەهەژدە مانگ وله(٤٩٠پ.ز) دووەمین لەشکرکێشی دەستی پێکرد[٢٨٧].

قۆناغی یەکەمی لەشکرکێشی دووەم بەهاری ئەوساڵە دەستی پێکرد کە لەسوپایەکی زیاتر لە (٥٠)هەزار کەس پێکهاتبوو، پەلاماری ئەریتریایانداو دوای حەوت ڕۆژ بەربەرەکانی، داگیرو وێرانکراو دانیشتوانەکەشی بەکۆیلەکران[٢٨٨].

قۆناغی دووەمیشی لەهاوینی هەمان ساڵدا دەستی پێکرد و ئەوە ڕوویدا، کە بەشەڕی ماراسۆن[٢٨٩] ناسراوە، تیایدا فەرماندەیەکی سەربازی بەسوپایەکی پێکهاتوو لە (١٠) هەزار

---

[٢٨٣] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٨٢؛ خليل ساره : دراسات في تاريخ الاغريق مقدمة في التاريخ الحضاري والسياسي،( دمشق:٢٠٠٠-٢٠٠١ )، ص٢٨٤.

[٢٨٤] محمد أ.دندامايف: تاريخ سياسي هخامنشي ، ص٢١٥.

[٢٨٥] هلسپونت: بە دەروازە(مدخل)ی دەردەنێلی ئێستا دەگوترا. زينفون: حمله العشره الاف، ص١٢٣، هامش(٣).

[٢٨٦] تراقيا : تراكياTharaceناوچەیەکی ئەوروپاییە و بەشێکی نیوە دورگەی بەلکانە لەباکوری ڕۆژهەلاتەوە درێژدەبێتەوە تادەریای ڕەش. حسين الهی : اسكندر مقدونی بچه تباه تاريخ، ص٥٦ هامش ١٣.

[٢٨٧] بروانە أ.برگر وديگران: تاريخ جهانه باستان (يونان )، ج٢، ص١٤٣-١٤٥؛ عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران ، ج١ ، ص١٥٨؛عبدالله محمود حسين : دراسات في التاريخ العسكري ،ص٢١٤.

[٢٨٨] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٨٣-٨٤؛خليل ساره : دراسات في تاريخ الاغريق،ص٢٨٥.

[٢٨٩] دەشتی ماراسۆن لەدووری ٢٠كم لەباكوری ڕۆژهەلاتی ئەسينا هەلكەوتووە:خليل ساره:دراسات في تاريخ الاغريق ،ص٢٨٥.

ئەسینی و هەزار خۆبەخشی شاری پلاتیە (Platea[290])و ژمارەیەك سەركردەی دیار، لەدەشتی ماراسۆن و لەدەروازەكانی ئەسینا بەسەر ئەخمینیەكاندا سەركەوتن سوپای ئەسپارتەییەكان بەبیانوی سەرقاڵی بەبۆنەیەكی ئاینی رۆژی دوای كۆتایی هاتنی شەڕەكە گەیشت[291] ، شەڕی ماراسۆن، پشتبەخۆبەستنی ئەسینیەكانی، گۆڕی بۆلەخۆبایی بوونی ڕەها بەئازایەتی وڕێكخراوەیی، خۆشەویستی خواوەندیش، بوو بەگرنگترین هۆكاری پاڵنەری بیركردنەوەیان لەدروستكردنی ئیمپراتۆریەت[292]،چونكە بەهۆیەوە لەنێودەوڵەتە شارەكانی یۆناندا ڕیزی پێشەوەی گرت ئەوەش كاریگەری هەبوو لەسەر سەركەوتن و بەدیهێنانی ئامانجەكان، رقی تۆڵەی ئەخمینیەكانیشی ئەستورتركرد[293]و ئەسینیەكانیش باش دەیانزانی كەسەركەوتنیان، لەماراسۆن لەهێرشی داخ لەدلآنەی ئێرانیەكان ئەرخەیانیان ناكات، بۆیە كەوتنە ئامادەسازی زیاتر[294] ، (مایكل لی لانغ) یەكلابوونەوەی ئەوشەڕە بەقازانجی ئەسینا، بەیەكەمین سەركەوتنی ئەوروپا بەسەر ئاسیاوخاڵی وەرچەرخانی گەورەی وەستاندنی هەوڵی پەلاماردانی رۆژهەلآت بۆ سەر رۆژئاوای دەزانێت [295].

تێكڕای ئەوشەڕانە، كەلەمیانەی دوو لەشكركێشیەكەدا ڕوویانداا بەگەڕی(جولە)ی یەكەمی شەڕی نێوان ئەخمینی وگریكەكان ناسراوە[296].

گەڕی دووەمی شەر بەهۆی باری ناهەمواری ناوخۆی ولآتی ئەخمینی، دوای دەساڵ لە (٤٨٠پ.ز) لەسەردەمی خشایرشا دەستی پێكرد، كەچوار شەڕی دەریایی وشكانی لەخۆ گرت،

---

[290]پلاتیە: شارێكە لەباشوری (بویوتیە )ی نزیك ئەتیكا هەڵكەوتووە:لطفي عبدالوهاب يحيى : اليونان، ص١٦٠.

[291] ادوين اردويج گرانتوسكي وديگران :تاريخ ايران ، ص٩٧-٩٨؛ مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق،ص٨٤-٨٦، هەروەها بۆزانیاری زیاتر لەسەر شەڕی ماراسۆن بڕوانە: محمد كامل عياد : تاريخ اليونان ،ص٢٨٢-٢٩٠؛ محمد ا.دندامايف : تاريخ سياسي هخامنشيان ، ص٢٢١-٢٢٦.

[292] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٨٥-٨٦.

[293] عبدالله محمود حسين: دراسات في التاريخ العسكري ، ص٢١٧-٢١٨.

[294]ادوين ايردويج گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران، ص٩٩.

[295] المعارك المائة، ترجمة صادق عبدعلي الركابي (القاهرة:٢٠٠٧) ، ص١٦٤.

[296] بڕوانە: محمد كامل عياد تاريخ اليونان، ص٢٧١ ولاپەڕەكانی دوایی .

بەوەش، کە ئەمجارە ولاَتی ئەخمینی سەرەڕای سستی نواندنی ئەسپارتە لەبەشداری کردن و لایەنگری (طیبە)ش لەفارس، ڕووبەڕووی یەکێتی دەوڵەتشارە یۆنانیەکانی بەری ئەورووپا بوەوە و تەنها لەناوچەیەکیش نەبوو پانتاییەکی فراوانی گرتەوە، لەگەڕی یەکەم (جولە الاولی)جیاوازبوو[٢٩٧]. شەڕی یەکەم لەترموبیلای کەناری ڕۆژهەلاَتی یۆنان ڕوویدا وتیایدا ئەخمینیەکان گەمارۆی هێزێکی ئەسپارتایاندا، کە(لیئونیداسی) پاشا سەرکردایەتی دەکردن وهەمووانیان لەناوبرد، دواتر بەرەو ئەسینا ڕۆیشتن، کەجگە لەپاسەوانەکانی قەلاَ کەسی تیادا نەمابوو و بەبەرنامە لەدانیشتوان چۆلکرابوو، دوای دووهەفتە گەمارۆدانی، وێرانیان کردو ئاگریاندا[٢٩٨]، شەڕی دووەمیش لە(سلامیس) وەك گرنگترین شەڕی نێوانیان لەباشووری ڕۆژئاوای نیوەدورگەی ئەتیکا لەهەمان ساڵی ٤٨٠پ.ز ڕوویدا، کەتیایدا ئەخمینیەکان شکان، بەمەش وەرچەرخانێکی سەرەکی لەڕەوتی شەڕی نێوان گریك وئەخمینیەکان بەدیهات[٢٩٩] و هەلوێستی گریکەکانی لەحالەتی بەرگریەوە گۆڕی بۆ هێرش بردن[٣٠٠].

لەساڵی (٤٧٩پ.ز) ئەخمینیەکان ویستیان سوود لەبارودۆخی ناوخۆی ئەسیناو ناکۆکی دەوڵەتە شارەکان وەربگرن وجارێکی دیکە بەرەو ناوچەکە هاتنەوە، دواتر پەلاماری ئەسینایان دایەوە، کەئەمجارەش چۆلکرابوو و سەرلەنوێ وێرانیان کردەوە، لەنزیك بلاتیە لەگەلْ سوپای یۆنان ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، ئاکامەکەشی بەتێکشکانی فارسەکان و

---

[٢٩٧] لطفي عبدالوهاب يحيى : اليونان ، ص١٥٨؛ علي عكاشه واخرون : اليونان والرومان ، ص٨٣؛ بۆ بارودۆخی یۆنانی پێش خولی دووەمی شەڕی یۆنان وئەخمینی وبەراوردی هەردوولا ونەخشەی شەڕ بڕوانە: محمد كامل عياد: تاريخ اليونان، ص٢٩١-٣١٢.

[٢٩٨] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مفيد رائف العابد؛دراسات في تاريخ الاغريق، ص٨٨-٩٠؛ محمد كامل عياد : تاريخ اليونان ، ص٣١٢-٣١٨؛ اندرو روبرت برن: اليونان، ص٢٠٣-٢١٠؛ محمد أ.دندامايف: تاريخ سياسى هخامنشيان،ص٢٤٧-٢٥٢.

[٢٩٩] لطفي عبدالوهاب يحيى : اليونان ، ص١٥٦.

[٣٠٠] علي عكاشة واخرون: اليونان والرومان ، ص٨٤ وە بۆ وردەکاری لەسەر شەڕی سلامیس بڕوانە: مايكل لى لانغ: المعارك المائة، ص٨٥-٨٨؛ محمد أ.دندامايف: تاريخ سياسى هخامنشيان ، ص٢٥٣-٢٦٠وە لەبارەی گرنگی و ئەنجامەکانی شەڕەکە بڕوانە : اندرو روبرت برن: اليونان، ص٢١٧-٢٢٣.

کوژرانی(ماردۆنیوس)ی سەرکردەیان کۆتایی هات[٣٠١]. فارسەکانیان بەرەو وشکانی ئاسیا لەئاسیای بچوك ناچاربەکشانەوە کردوکەشتی گەلی ئەسینی لەشەڕی میکالی[٣٠٢]کەشتی گەلی فارسەکانیان تێکشکاند[٣٠٣].

لەئەنجامی ئەو دوو شەڕەدا، بەکردار مەترسی ئەخمینیەکان لەسەردەوڵەتە گریگیەکانی بەرەی ئەوروپا دوورکەوتەوە[٣٠٤]، شتێکی ئاساییە، کەدەوڵەتی ئەخمینی لەئەنجامی ململانێی توندوتیژی لەگەڵ وڵاتی یۆنان و سەرهەڵدانی شەڕوشۆڕ لەناوچە جۆربەجۆرەکانی سنووری وڵات وهاتنە سەرکاری پادشای بێ تواناوناکۆکیان لەسەر دەسەڵات وکوشتوبڕی یەکتر بە قۆناغێکی ناهەموار و پەشێودا بڕوات وازیش لەبیری داگیرکاری یۆنان بهێنێت[٣٠٥]بەڵام مەرج نیە ئەوەی لەناوئەخمینیەکان دەگوزەرا یۆنانیەکانی ئەرخەیان کردبێ لەوەی، کەڕوویداوە دووبارە نەبێتەوە، بەتایبەت کەئەخمینیەکان، خاوەنی کەشتی گەلێکی بەهێزبوون، بابەتگەلی وەك بیری تۆڵەکردنەوە وئارەزووی ڕزگاربوونی شارە ئەیۆنیەکانی ئاسیای بچوك، هەوڵی هەندێ دەوڵەتە شاری یۆنانی بۆ ڕێبەرایەتی کردنی ناوچەکەش، کەلە جیهانی یۆناندا بابەتی کار لەسەر کردن بوون ولەئارادابوون، شتگەلێکن دەمانگەیەننە ئەو ڕاستیە، کە بابەتی ئارامی هەمیشەیی لەفەرهەنگی پەیوەندی ڕامیاری نێوان ئەودوو دەوڵەتەدا مانایەکی نەبووە، هەمیشە هەلومەرجی شەڕێکی دیکە لەئارادابووە و شەڕێك دەبوو بەهۆ بۆ شەڕێکی دیکە، پێکهێنانی هاوپەیمانیەتی دیلۆسی (Delos[٣٠٦]) –کە بەناوی دورگەیەکی سەر بەئەسینای ناوەڕاستی دەریای ئیجە

---

[٣٠١] مفيد رائف العابد : دراسات في تاريخ الاغريق، ص٩١.

[٣٠٢] ناوچەی میکالی(موکالی)(Mykale) لەنیوەی باشووری کەناری ڕۆژئاوای بچوك هەڵکەوتووە چیای سامسۆنی ئێستا هەمان چیای میکالیە، کەلەوناوچەیە هەڵکەوتووە بەرزیەکەی ١٢٦٩مەترە: لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٦٠؛ محمود فهمي: تاريخ اليونان، ص٩١ هامش ١.

[٣٠٣] علي عكاشة واخرون: اليونان والرومان، ص٨٤.

[٣٠٤] لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٦٠.

[٣٠٥] سامي ريحانا: شعوب الشرق الادنى القديم، (دم :٢٠٠٦ )، ص١٧٤.

[٣٠٦] ئە ویەکێتیە کە لەیەکگرتنی شارەکانی سەرەدەریا پێکهات و بەناوی (یەکێتی دەریایی)ش ناودەبرێت، بەڵام ئەو ناوەی پێی بەناوبانگە (یەکێتی دیلۆسە) ئەوەش لەبەرئەوەبوو، کە دەوڵەتە شارەکانی ناوی لەلایەك دەیانەویست لەڕێی پێدانی سیفەتێکی دینی پایەکانی بچەسپێنن بەتایبەت، کەدورگەی (دیلۆس) هەر لەکۆنەوە لای گریکەکان پیرۆزبوو– شوێنی سەرەکی پەرستنی خواوەند(ئەپۆلۆ)بوو و گەنجینەی ئەسیناو

ئـەوناوەی بەسـەردابراوە-سـالّی (٤٧٨-٤٧٧پ.ز)لـەو هەلومەرجـەدا بـۆ ئامادەباشـی و بەشـداریکردن لەبەرپەرچدانەوەی هەر مەترسیەکی ئـەخمینی کـە ڕوو لـەولاّتی یۆنـان بکـات، بەسـەرکردایەتی ئەسـینا وەك دەولّەمەنـدترین وخـاوەن گـەورەترین هێـزی سـەربازی و دووبارەبوونەوەی جموجوڵی شەڕ و هێرشکردنی ئەنجارەی یۆنانیەکان، بەرەو ڕۆژهـەلاّت یـان هـەر هـیچ نـەبێ بـۆ کـشانەوە دواوەی ئەخمینیـەکان لەکـەنارەکانی ڕۆژهـەلاّتی دەریـای ئیجـە و ڕووبەڕووبونـەوەیان، کەشـەڕی ڕووبـاری یوریمیـدونEurymedonی سـالّی (٤٦٨پ.ز) لـە پامفیلیەی (Pamphilia) کەناری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك ، یەکێکیانە و شـەڕەکانی تـریش ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن[٣٠٧].

دواتر کە هەندێك لە ئەندامـان پێیان وابوو بیانووی بەردەوامبوونی نەماوە، دەبوو ئەسـینا یـان لێگەڕێ بارودۆخەکە ڕەوتی ئاسـایی خـۆی وەربگرێـت دەوڵەتـە شـارەکان وەك چـۆن بـەئارەزووی خۆیان هاتنە ناوی، ئازادیش بن لەلێ دەرچوونی یاخود هێشتنەوەیان لەناویدا بکاتە زۆرەملـێ، کە ئەو دووەمیانی هەڵبژارد و لەژێر کاریگەری کۆمەڵێك هۆکار بەرەبەرە پەیمانی دیلـوس گـۆڕا بـۆ ئیمپراتۆریـەتی ئەسـینا ، کـە لەمیانەیـدا پێـشکەوتنی بەرچـاوی بـەخۆوە بـینی، بـەلاّم هەڵگیرسانی شەڕی پیلوپۆنیزیا لەنێوان ئەسیناو ئەسپارتە، کە ئـەویش هاوکـات سـەرکردایەتی یەکێتی پیلوپۆنیزی دەکرد کەدەوڵەتە شارەکانی ئەو هەرێمەی لەخۆ گرتبوو لەهەموو ڕوویەکەوە لەئەسینا جیاوازبوو کەلەبەشی یەکەمدا لێی دواین، بەدواشیدا ململانێی سەرکردایەتی کردنـی یۆنانی نێوان دەوڵەتـە شـارەکان و شـەڕە جۆراوجۆرەکـان وخراپبـوونی بـارودۆخی هەمـەلایەنـەی ولاّت، ململانێی دەوڵەتی فارس خرایە پەراوێز تا ئەوکاتە،کەمەکـدۆنیا وەك دەوڵـەتێکی بـەهێز دەرکەوت وتوانی ناڕاستەوخۆ کۆنترۆڵی تەواوی یۆنـان بکـات، لەیـەکێتی (کۆرنـسە)دا ڕێکیـان بخـات وبیریـان لەدژایـەتی کردنـی نـاوخۆ، بـۆ دژایـەتی دەوڵـەتی ئـەخمینی ناڕاسـتەبکات[٣٠٨]. زیادەڕەوی کردنی مێژوونوسە یۆنانیەکانیش لەپێشاندانی زۆری ژمـارەی سـەربازانی ئـەخمینی و باسی ستەمکاری وناشیرین پێشاندانی ڕووی ڕۆژهەلاّتیـەکان، پیاهەڵـدان بـەخۆڕاگری سەرەڕای

---

هاوپەیمانەکانیـشی، هـەر لـەو دورگەیـەدابوو-، لەلایـەکی تـریش لەناوچـەیەکی ناوەنـد هەڵکـەوتبوو لـەڕووی سیاسیشەوە سروشتێکی بێلایەنی(حیادی) هەبوو: خلیل سارە: دراسە في تاریخ الاغریق ، ص٣٠١.

[٣٠٧] بڕوانە: لطفي عبدالوهاب یحیی : الیونان ، ص١٦٣؛ خلیل سارە: دراسات في تاریخ الاغریق، ص٣٠٥.

[٣٠٨] بڕوانە: لطفي عبدالوهاب یحیی: الیونان ، ص١٦٠-١٦٦.

کـەمی ژمارەیـان لەچـاو ئەخمینیـەکان لەرۆژهەلاتـدا و کـاری ئەدیبـەکان لەدارشـتنەوەی ڕووداوەکاندا[309]، ڕۆڵی هەبوو لەجۆشدان وبزواندنی هەستی تۆڵە کردنەوەی خەڵك و پـشتگیری کردنی مـەکدۆنیەکان، بەتایبەت ئەسـکەندەرو متمانەپێدانیـشی لەلایـەن یـەکێتی کۆرنـسەوە - کەپێشتر لێی دواین-، بۆهێرش بەرەو ڕۆژهەلات وسەرکەوتنەکانیشی لەپێشرەویکردندا زەمینـەی هەڵگیرسانی شەڕی گۆگمێلای سازاند، کـە بـووە هـۆی ڕوخـانی دەوڵـەتی ئـەخمینی. هەرئـەوەش وایکرد، کەهەندێ مێژوونوس شەڕەکانی ئەسـکەندەر بـەخولی سـێیەمی شـەڕی نێـوان فـارس و یۆنانیەکان دابنێن[310].

[309] بۆ نموونە: محمد کامل عیاد: تاریخ الیونان، ص٢٠٤ولاپەڕەکانی دوایی

[310] سامي ریحانا: شعوب الشرق الادنی القدیم، ص١٧٤.

## تەوەرەی دووەم:
## هۆکاری سیاسی و زەمینەسازی کەلتوری

ئەگەر شەڕ هەوڵدان بێ بۆ بەدیهێنانی ئامانجی سیاسی و بەتەنها بەکارهێنانی هێز، بەشەڕ دانەنرێت ئەگەر بەو ئامانجەوە نەلکابێ[311]. ئەوە شەڕی گۆگمێلا زادەی هەلومەرجی سیاسی تایبەتە و لەپێناو ئامانجی زۆر گەورەی سیاسیشدا هەلگیرساوە.

ئاشکرایە، کەژیانی سیاسی گریکەکان لەسەر بنەمای بوونی شار وەستابوو، شار لەدیدی ئەواندا کۆمەلگا ودەوڵەت وشارستانیەتی دەگەیاند، لەخەیاڵیاندا دەوڵەتی شار تاکە چوارچێوە بوو، کەپێداویستیەکانی ژیانی شاریی بۆ هاولاتیانی، تێدا بەرجەستەدەبوو، بۆیە لەدیدی هەندێکدا شارو هاولاتیان هاوواتای یەکتریان دەگەیاند[312] لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی بوو بەرگری پالەوانانەی لێبکەن، واتا هەموو هاولاتیەکی گریکی خۆی بەئەندامی کارای خاوەن ئەرك لەشار دابنێ، کەدەبوو جێبەجێی بکات و کەمتەرخەمی کاریش بەدروستکراوێکی بێخێر بناسرێ.

بەلاّم چونکە هەرشارێك دەوڵەتێك بوو ئەندامەکانی خۆیان بەکەسی یەکتر وهاونیشتمانی و کەسی دەرەوەی خۆشیان بەبێگانە دەزانی -پێشتر باسمانکرد- بۆیە دەکرێ بلێین تاسەردەمی دەرکەوتنی مەکدۆنیا پەیوەندیەکی سنووردار لەنێوانیاندا هەبوو، لەمزەینی ئەواندا هیچ چوارچێوەیەکی گەورەتر لەشار، بوونی نەبوو کە جیاوازیەکانیانی تێدا فەرامۆش و ئایندەی پێوە پەیوەست بکەن و یەك گوتاری یەکگرتووی گریکی -ئەگەر دەربڕینەکەی ڕاستێ- لیبڕاوانە و تۆکمە لەنێو دەوڵەتەشارەکاندا نەبوو، تالەمیانەیدا بڕیار لەسەر چارەنوسی سیاسی هەموو گریك بدەن وبەتێکۆشانی هەمووان ئەوکەمایەسیانە نەهێلن کەبەرۆکی گرتبوون، لەنێویاندا

---

[311] عبدالله محمود حسين: دراسات في التاريخ العسكري، ص٧٣.

[312] بڕوانە: ڕوبرت ج .ليتمان: التجربة الاغريقية، ص٢١ .

کۆتایی هێنان بەمەترسی ئەخمینیەکان لەرۆژهەلات. کە بەهۆی دەست تێخستنی بەردەوامی لەکاروباری ولاتی گریك وهێرش وشەڕەکانی، هەر لەسەدەی پێنجەمی پ.ز وەك دوژمنێکی کلاسیکی (تقلیدی) وێناکرابوو کەبەردەوام مەترسی بۆسەر سنووری رۆژهەلاتیان دروستدەکرد[٣١٣] ئەمە وایکرد، کە دەولەتە شارە گریکەکان بیر لەدروستکردنی بەرەیەك بکەنەوە بۆ وەخۆگرتنی هەموو ئەوشارانەی دەتوانن بەرگری بکەن لەهێرشی ئەخمینیەکان.

ئەوبیری کۆمەلەی هیلینیە (الجامعة الهيلينية ) کەمێژوونوسە نوێیەکان بەبۆنەی شەڕەکانی ئەخمینی لێی دەدوێن و بەدەرئەنجامی هەستی یەکێتی نەتەوایەتی لەبەرامبەر مەترسی هاوبەش وەك یاسایەکی گشتی لێکی دەدەنەوە بەو واتایە کەفشاری دەرەکی گروپە لێك دابڕاوەکانی نەتەوەیەك هاندەدات، کەمیللەت یان یەکێتی پێك بهێنن و یەکێتی تەواو مانەوەشی لەدیدی ئەواندا بەندبوو، بەئاستی توندی فشارە دەرەکیەکە و بەردەوامیەکەی لەلایەك و هێزی ڕەمەکیانەی(غریزی) ویستی سەربەخۆیی تاکی (الاستقلال الفردي) -واتا ئەندازەی ویستی سەربەخۆیی یان یەکێتی-، کە ئێستاشی لەگەلدابێ ڕێگرە لەبەردەم تێکەلاوبوون و پێکەوە پەیوەستبوونی یەکە سیاسیەکان، ڕۆلی پێویستی یاری نەکرد، بۆیە کاتێك شارە ئەیۆنیەکان هەڕەشەی لەدەستدانی سەربەخۆییان لەسەربوو، پێشنیاری یەکێتی ئەیۆنی کرا، بەلام بەدی نەهات ، کاتێکیش، کە ئەوشارانە هەولیاندا لەدەستەلاتی ئەخمینیەکان ڕزگاریان بێت داوای یارمەتیان لەئەسیناو ئەسپارتەکرد، کەچی شۆڕشەکە بەهۆی بەربەرەکانی ناوخۆ لەناوچوو، یان کاتێك کە هەموویان هەستیان بەئامادەسازی ئەخمینیەکان کردبوو، کەدەیانەویست پەلاماری یۆنان بدەن،(کۆنگرەی هیلینی-المؤتمر الهيليني)[٣١٤]ش داوای لەگشت شارەکان کرد،

---

(٣١٣) محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي : الغزو اليوناني لبلاد الرافدين٣٣١-١٢٦ق.م ، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الاداب، جامعةالموصل ٢٠٠٣، ص١٧-١٨

(٣١٤) ئە وکۆنگرەیە دوای کۆتایی هاتنی گەڕی یەکەمی شەڕ و بالاکردنی پێگەی ئەسیناو ترسی ئەسپارتا لەوەی، کە ئەگەر لەشەڕەکانی داهاتوودا ئەخمینیەکان بیبەنەوەو ئەسینابگرن یان ئەسینا وەك لەشەڕی ماراسۆن ڕوویدا بەتەنیا سەرکەوتن بەدەست بێنێ ئەوا شوێن بەئەسپارتە لەق دەبێت، بەپێی ڕێککەوتنێکی نێوانیان،کە بەسترا بۆ گرتنە بەری ڕێوشوێنی گونجاو ی بەرگریکردن لەهێرشی چاوەڕوانکراوی تری ئەخمینی وکۆکردنەوەی گشت گریکەکان بۆ ئەنجامدانی کاری هاوبەش، داوا لەگشت شارەکان کرا یەکی دوو نوێنەر بنێرن کە تەنها ٣١ شار بەدەنگیەوە هاتن: محمد كامل عياد: تاريخ اليونان، ص٢٩٩-٢٣٠.

کەبەشـداری بـەرگریکردن بکـەن، کەچی بەشـێکی کـەم نـەبێ ئـەوانیتر هەریەکـە بەبیانویـەك بەدەنگیەوە نەهاتن، بیری کۆمەڵەی هیلینیش (الجامعة الهيلينيـة) یەکـە وەك دەرەنجـامی زەمـان ونەریت و بیروباوەڕی ئاینی وئاهەنگـە وەرزشـیەکان هەسـتی پێـدەکرا و پێـشتر هـەبوو، لـەکاتی شەڕەکاندا سیاسیانە خۆی نەنواند و رۆڵی پێویستی یـاری نـەکرد، هەرچـەندە دوای سـەرکەوتنی یۆنانیەکانیش بانگەوازی بۆدەکرا، بەڵام هیچ کاریگەری نەبوو، بەڵکو لەجیاتی ئەوە دووبـەرەکی لــەنێوان دەوڵەتــە شــارەکاندا پەیــدابوو، دواتــر پەرەیــسەند و ســەری کێــشا بۆشــەڕی ناوخۆ[٣١٥] بەتایبەت لەنێوان دەوڵەتە شارە سەرەکیەکانی وەك ئەسیناو ئەسپارتەو تیبـە، ئـەویش لەپێناوی هەژموون(هيمنة)و سەپاندنی دەسەڵات(بسط النفـوذ)و دەرکـەوتــــن وەك هێزێکـی گـەورە لەسـەر حیـسابــی ئـەوانی تـر، بەئامـانجـی دەسـتگرتن بەسـەر بەرووبومـــــی ئـابووری لەلایەك و تاکـــرەوی لەسەرکردایەتـــی کردنـــی ولاتـــی گریـك و رەواییـدان بەسەرکردایەتـــی کردنیان لە شەڕە چارەنوس سازەکاندا لەدژی دوژمنـی دەرەکـی[٣١٦] ، لەلایەکی ترەوە . ئەمـەش وایکــرد هەریەك لەدەوڵەتەشــارەکان پلانی بۆ دابرێژن و کار لەسـەر بەدیهێنانی بکـەن ، بـەڵام ئـەو شـەڕانە نـەك هـەر لەبەرژەوەنـدی هیـچکامیاندا نەبـوون، بـەڵکو بـارودۆخی سیاســـی و ئابـووری و کۆمـەڵایەتـــی خراپترکــــرد و ناکۆکـــی نەوەکانـــی یـەك نیـشتمانـــی قـووڵتر کردەوە[٣١٧] .

بۆیـە بەهـەموو ئـەوتیۆر و پێـشنیار و رێگەچـارانەی کەلەلایـەن بیرمەنـدان بۆچارەسـەرکردنی قەیرانی هەمەلایەنەی ولاتی یۆنـان خرانـەڕوو، لەبـەردەم خودگـەرایی (خۆویـستی)دەوڵەتـەکانی گریك و یەکتر قبووڵنەکردن وبۆ یەکتر دانەنواندن، بەتایبەتی کەساڵانی دوایی پـێش دەرکـەوتنی فلیپ زیاتر لەجاران دەهاتە بەرچـاو، ئـەنجامێکی نـەبوو، تـاوای لێهـات مەسـەلەی یەکخـستنی گریك لەژێر سایەی سیستەمی پادشایەتیدا کەزۆربەیان وەك رێگاچـارە، لەسـەری کـۆك بـوون و لەنێو دەوڵەتەشارەکانی یۆنان جێی ئومێد نەبوو و مەحاڵ دەهاتە بەرچاو، تەنها کەسێکی بەهێز

---

[٣١٥] نفس المصدر،ص٣٤٢-٣٤٤.

[٣١٦] محمد الأسعد بن بوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٧.

[٣١٧] ويل ديورانت: قصة الحضارة، مج٢ ، ص٣٤٢-٣٤٥؛ محمد الأسعد بن بوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٧.

دەیتوانی ئەو ڕۆڵە ببینێ، کەوابەستەی کۆت یاسای هیچ دەوڵەتشارێك (پۆلسPolis)نەبێت و کەلکەڵەی بەدیهێنانی بان هیلینی لەسەردابێت[٣١٨].

لەناوەڕاستی سەدەی چوارەمی پێش زایینەوە، باروودۆخێکی ناوخۆ و دەرەکی وا هاتەئاراوە، کەکارکردن لەسەر چارەنوسی ولاتی گریك و بڕیاری کۆتایی هێنان بمەترسی دەوڵەتی ئەخمینی، کردە خەمی خۆی و زەمینەی بۆ دروستبوونی هەستێکی هاوبەش بۆ گریکەکان هێنایە ئاراوە، واتا باروودۆخێك، کەتیایدا گشت خولیاوئامانج و وەلام بەپێداویستیەکانی خەلکی گریك، یەك ئاراستەیان وەرگرت پێویستی بەپالەوانێك بوو، کەبەدیهێنانیان وە ئەستۆ بگرێت.

لەساڵی ٣٥٩پ.زفلیپ هاتە سەرتەختی مەکدۆنیا و بەتوانا سەر و ئاسایەکەی خۆی توانی ولاتە لاوازەکەی، کەهەمیشە لەژێر هەڕەشەی دراوسێکانی دابوو، بکاتە دەوڵەتێکی بەهێزی وا، کەلە تەواوی یۆنان بەپێشکەوتو ودەسەلاتدار دیاربووە و ببوە جێی سەرنجی دەوڵەتەکانی تری گریك[٣١٩].

فلیپ کەسێکی شیاو و سەردارێکی لێوەشاوە و جەنگاوەرێکی بەتوانابوو، کەسیاسەتی بەرنامە ڕێژکراوی بۆ بەهێزکردنی مەکدۆنیا لەبەرچاو گرتبوو و دەیویست مەکدۆنیا، وەك دەوڵەتێکی بەهێز لەنیوەدوورگەی بەلکان دەربخات، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەشی سوودی لەهێزی سەربازی ودیپلۆماسی و گەندەڵی ئابووری وەرگرت، ئەو سیاسەتەشی هاوکات بوو لەگەڵ هەلومەرجی ناهەمواری ولاتی گریك دوای شەڕی پیلۆپۆنیزیا، کەدەرفەتی پێویستی بۆفلیپ ڕەخساند کە لەگەڵ ریفۆرمی مالی و سەربازی بناغەی دەزگای حکومەتێکیش بنیات بنێ، کەجگە لەسەرکوتکردن ودەستگرتن بەسەر کۆمەلانی زەحمەتکێشی مەکدۆنیا، ڕوشبکاتە سیاسەتی داگیرکارانەی دەرەکی[٣٢٠].

---

[٣١٨]اولریش ویلکن: اسکندرمقدوني، ویراستاریوجین بورزا، ترجمة حسن افشار، (تهران:١٣٧٦)، ص ٥٤و پەڕەکانی پێشتر

[٣١٩]أ.بتري: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٥٠؛ فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارته، ص١٧٦ولاپەڕەکانی دوایی؛ سیربرسي سایکس: تاریخ ایران، ج١، ص٣١٥-٣١٦؛ حسين الشيخ: دراسات في تاريخ حضارة اليونان والرومان، ص١٢٦.

[٣٢٠]حسین الهی: اسکندر مقدونی بچه تیاه تاریخ، (مشهد:١٣٧٩)، ص٤٠-٤١.

چونكه هەم فلیپ وهەم ئەسكەندەری كوڕیشی دەیانزانی، كە لـەناكۆكی نێـوان ئەخینیـەكان و گریكەكاندا، كەچەند چاخێك بەردەوام بووە(درێژەی كێـشاوە)،گریـك ڕیـسوایی زۆریـان بینیـوە، بۆیە لەشەڕی ئەخینیەكاندا ئامانجی گشتی بەدیدەكرد و پێی وابـوو كـەدەبێ هـەموو گریـك بـۆ ئەوكارە لەژێر سەركردایەتی مەكدۆنیا كۆبكرێنەوە[٣٢١].

بۆیە هەركە فلیـپ لەسـەر تـەختی پادشـایی جێگیربـوو خوازیـاری هێنانـەدی دووئامـانج بـوو، كەبریتی بوون لەیەكێتی ولاتی گریك وداگیركردنی هەموو جیهان[٣٢٢].

فلیپ دوای ئامادەسازی وهەڵسەنگاندنی بارودۆخەكە و بـەگونجاو بینـینی، كەوتـە پیـادەكردنی سیاسەتێك بۆداگیركردنی شارە یۆنانیەكان، بۆ ئەمەش سـوودی لەپـەرتی ونـاكۆكی بـەردەوامی نێوانیان وەرگرت، سیاسەتەكەی وابوو، كە كاتێك گەمارۆی شارێكی دەدا لەگەڵ یـەكی دیكـەدا پێكدەهات، تادواجار لەشەڕی خیرونای سـاڵی٣٣٨پ.ز لەبەرامبـەر ئەسـیناوتیبەدا سـەركەوت و دەستی بەسەر تەواوی یۆناندا گرت پەلاماری شارەكانی تری گریكیداو خستنیە پاڵ خۆی[٣٢٣].

ئـەو لـە نـاكۆكی بـەردەوامی خۆبـەخۆی دەوڵەتـە شـارەكان زۆر بێزاربـوو، بـڕوای وابـوو كـە بەهەدەردانی بیستوحەوت ساڵ چالاكی گریكەكان لەشەڕی پیلۆپۆنیزیا نەفامی وناتەواویە[٣٢٤].

شتێكی تر، كەدەكرێت لە پاڵ هۆكـاری سیاسـیدا ئامـاژەی پێبكرێـت زەمینەسـازی كـەلتوری بوو، بەتایبەت، كەلەولاتی گریكدا بزاڤێك هـاتبووە ئـاراوە، كەژمارەیـەك فەیلەسـوف و بیریـار، ئاراستەیان دەكرد داوای دانانی سنوورێكیان بۆ دەست ڕۆیشتنی دەوڵەتی ئەخینی بەسەر ولاتی گریكـداو بەسـەر ماڵـدادانیان، دەكـرد، هەنـدێكیان لـە نێویانـدا (ئیزوكـرات)[٣٢٥] پـشتگیری

---

[٣٢١] فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارته، ص٢١٩.

[٣٢٢] چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ترجمه فاروق حافظ القاضي، مراجعته وتقديم زكي نجيب محمود، (القاهرة:١٩٦٣)، ص٢٤.

[٣٢٣]لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٨٤؛محمودالسيد: التاريخ اليوناني والروماني، (الأسكندرية:٢٠٠٠)، ص٨٩.

[٣٢٤] جون جنتر: الاسكندرالاكبر، ص٢٥.

[٣٢٥] ئیزوكرات(ایسوقراط): وتاربێژ (خطیب) یەكی بەناوبانگی ئەسینی (٤٣٦-٣٣٨پ.ز) بوو، بـەناوبانگ بـوو بەهانـدانی گریكـەكان بـۆ بەربـەرەكانی ئەخمینیـەكان، بـسام العـسيلي: الاسكندرالكبير المقدوني (٣٥٦-٣٢٣ق.م)، (د.م: ١٩٨٠)، ص٥٩، هامش٩٦.

ئەوهەنگاو و پرۆژانەی فلیپیان دەکرد کەلە سیاسەتی خۆیدا بۆ ئەو دوو ئامانجەی پێشتر باسمانکرد ببەرنامە گرتبوو، بەتایبەتیش کە لەوەتەی ئەرتاخشتای سێیەم (ئەردەشێری سێیەم) لەساڵی ٣٥٩پ.زهاتبووە سەرتەخت لەدەوڵەتی ئەخمینیدا، مەترسیان لێی زیادیکرد بوو، ئیزوکراتیش بۆ ئەوەی هیمەت و وورەی پادشاکان بەرز بکاتەوە، بەناردنی چەند نامەیەك بۆ فلیپ بەوپێیەی بەهێزترینیان بوو کەوتە هاندان و پیرۆزبایی کردنی پرۆژەکانی[٣٢٦].

ئەو وتاربێژێکی گەورەی ئەسینابوو کاریگەری زۆریشی لەسەر ڕای گشتی ولاتی گریك هەبوو، شەیدای شکۆ و گەورەیی ئەسینابوو، بەدڵسۆزی خۆنیشاندانی فلیپیش قەناعەتی کردبوو، وای لێکردبوو، کەپێی وابێ ئەو ئەوکەسەیە، کەمەبەستەکانی دێنێتەدی، هەوڵیشیدا، کەهاولاتیان ڕازیبکات، کەنیەتیان بەرامبەری باش بێت[٣٢٧] ولێی بەگومان نەبن، بۆیە یەك لەسەرچاوەکان بیری هێرشکردنە سەر ولاتی ئەخمینی وەك بەدیهێنانی داواکاری ئیزۆکرات لەفلیپ دادەنێ، چونکە ئەو شەڕی لەگەڵ ئەواندا بەباشترین ئامرازی ڕزگارکردنی گریك دەزانی[٣٢٨].

نامەکانیشی بۆ فلیپ بەهای زۆریان هەبوو، چونکە تیایدا بیری گشتی یۆنانیەکانی بۆ جەنگێکی میللی (بان هیلینی) بەسەرکردایەتی ئەو، ئامادەکردبوو، ئەویش ویستی لەوبیرە بان هیلینیە سوود ببینێ ونیازە خودیەکانی مەکدۆنیای پێ پەردەپۆش بکات، بەسەرکردایەتی سوپاش سۆزی گریکەکان ونەیارەکانیش بەدەست بێنیت[٣٢٩].

ناوەڕۆکی بانگەوازەکەی ئیزۆکرات ئەوەبوو، کە باشترین ئامراز بۆ ڕزگارکردنی ولاتی گریك لەململانێ خوێناویەکەی و تۆڵەکردنەوە لەبەربەر –ناگریکەکان-، لەدەوری یەك کۆبوونەوەیان و دەست بەسەرداگرتنیانە، ئەویش بەپێی مافی شکۆی شارستانیەتی گریك لەچاو ئەوانی تر، و دروستکردنی شار لەو شوێنانەی دەستی بەسەردا دەگرن، ئەمەش نزیکبوو لەبیروڕای فەیلەسوفانی وەك ئەفلاتۆن، کە گوایە بەلای ئەوەوە، بەربەرەکان بەزگماك دوژمنن و پێویستە

---

[٣٢٦] N.G.L.HAMMOND,Ahistory of Greece,(London:١٩٦٧) ,p٥٥) محمد الأسعد بن بوبكر ؛ الحفصي: الغزواليوناني لبلاد الرافدين، ص١٨.

[٣٢٧] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير فتوحاته وريادة الفكر اليوناني في الشرق، (دمشق:١٩٩٩)، ص٢٤.

[٣٢٨] مفيد رائف العابد: دراسات فى تاريخ الاغريق، ص١٥١.

[٣٢٩] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ويرايستار يورجين بورزا، ترجمة: حسن افشار، (تهران: ١٣٧٤)، ص٨٥.

گریك شەڕیان لەگەڵدا هەڵگیرسێنێ، تاوای لێدێت دەیانکەنە کۆیلە یان لەناودەچن، ئەرستۆش شەڕ دژی بەربەرەکان، بەشتێکی سروشتی و دادوەرانە، دادەناو ئامۆژگاری ئەسکەندەریشی دەکرد، کەوەك کۆیلە مامەڵە یان لەگەڵدا بکات[330] ئەووای دەبینی، کەگەلانی بەستەڵەکی باکور وئەوروپا ئازان، بەلاّم بێبەشن لە چستی و وزرنگی و سیستەمی سیاسی باش، بۆیە ناکارن خۆیان بەسەر دراوسێکانیاندا بسەپێنن، هەرچی رۆژهەلاّتیەکانیشن زیرەك وچوستن، بەلاّم ئازانین بۆیە هەر ژێردەستەوکۆیلە دەبن، بەلاّم گەلی یۆنان هەروەکو چۆن ولاّتەکەیان لەناوەند هەڵکەوتووە،لەهەردووخەسلّەتی(ئازایەتی و زیرەکی)یش بەهرەمەندە، بۆیە پارێزگاری لەسەربەستی خۆی دەکات لەدەرفەت دەگەڕێ تاخۆی بەسەر هەمواندا بسەپێنێ، کەواتە یۆنانی گەورەو سەربەستن و بیانی (بەربەری)ەکانیش کۆیلەیانن.[331]

ئەمەجگە لەوەی کەهەندێك بیریار بەداخ بوون لەوەی، کەگەلی گریکی لەجیاتی کۆبوونەوە بۆ بەربەرەکانی کردنی دوژمنی هاوبەش کەوتوونەتە شەڕی خۆیەخۆ و هەندێك پێیان وابوو تاکە سەرچاوە، کەلە گشت نارەحەتیەکان دەربانبهێنێت پێکهێنانی سیستەمی پادشایەتیە، ئەو فیکرەیەش لەڕای گشتیدا بەرجەستە بوو و بیروڕایەکی لێ گەلاّڵە بوو، کەبەپێی ئەو لەسەریان بوو لەژێرسایەی سیستەمێکی پادشایەتیدا یەکبگرن، رووی شەڕەکانیشیان ئاڕاستەی دوژمنی هاوبەش بکەن[332].

ئەم زیندووکردنەوەی بیری حوکمڕانی پادشایەتیش هۆکارێك بوو بۆ هەمووارکردنی ڕێی سەرکەوتنی فلیپ وئەسکەندەر[333].

بەمشێوەیە لەسەر دەستی بەناوبانگترین فەیلەسوف و بیریار و وتاربێژی گریکی کەشی ناوخۆ بۆ قبوولکردنی شەڕ لەگەڵ ئەخمینیەکان، ئامادەکرا[334].

هەموو ئەوانەش دەریانخست کەپێش ئەوەی ئامادەسازی لەشکری بۆ هێرشکردن دژی ئەخمینیەکان ئەنجام بدرێت، ئامادەسازی فیکری و تیۆری بۆ کۆکرا بوو[335].

---

[330] بڕوانە بسام العسلي: الاسكندر الكبير(المقدوني)، ص٥٩.

[331]يوسف كرم: تاريخ الفلسفة اليونانية الطبعة الخامسة، لجنة التأليف و الترجمة، (القاهرة: ١٩٦٦).

[332] تشارلز الكساندر روبنصن الابن: اثينا في عهد بركلس، ص٢٥٦-٢٥٧.

[333] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص٤٦.

[334] بسام العسلي: الاسكندر الكبير(المقدوني)، ص٥٩.

نارەحەتی وئازار ونەهامەتی خەڵكی ناوخۆی شارەكانیش، بەهۆی دەركەوتنی پارتەكان و جیاوازی نێوانیان وململانێ و شەڕەكانیان، كەبەردەوام لەپەرەسەندندا بوو، چی لەنەهامەتیەكانی شەڕی نێوان دەوڵەتە شارەكان، كەمتر نەبوو[٣٣٦] واشی كرد، كەخەڵكی متمانەیان بەدەوڵەتە شار نەمێنێ و لەبری ئەو، بیریان لەپانتایی فراوانتری دەوڵەت دەكردەوە، كەتیایدا بواری بەسوودتر فەراهەم بێت و بەهۆیەوە، لەجیاتی سیاسەتی ناوچەیی بەرتەسك، لەسەر ئاستی جیهانیدا، بڕوانە داهاتوو[٣٣٧].

تاكگەرایش بەجێی خۆی، كەلەمیانەی ئامۆژگاری سۆفستاییەكان[٣٣٨] دا، كەلەسەدەی پێنجەمی پ.ز لەناوخەڵكدا بلآوكرایەوەو تیایدا مافی سروشتی تاك دەخرایە ڕوو یاساكانی بەبڕیارنامەی شێوازی كاری مرۆڤەكان دادەنا، هەڕەشەیەكی جدی بوو بەرامبەر ئەوهەستەی كەتائەوكات لەبەرامبەر شاردا، لە ئارادابوو، لەدیدی تاكگەراكاندا كەسی تەیار بەزانست ورەوشت پێویستی بەدەوڵەت نەبوو، یەك لەقوتابیەكانی سوكراتیش بەناوی (ئانتیسپنین)[٣٣٩]كەبناغە دانەری قوتابخانەی (كەلبی)[٣٤٠] بوو، هەوادارەكانیشی بەوەی

---

[٣٣٥] محمد الآسعد بن بوبكر الحفصي الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص١٨.

[٣٣٦] اولريش ويلكن: اسكندرمقدوني ، ص٤٣.

[٣٣٧] تشارلز الكساندر روبنصن الابن: اثينا في عهد بركلس، ص٢٥٦.

[٣٣٨] مەبەست لە سۆفستاییەكان گروپێك زانای گەڕۆك بوون لەبارەی زانستی جۆراوجۆر وانەیان دەوتەوە بەئامانجی فێركردنی مرۆڤ لە چۆنیەتی سەركەوتنی بڕینی ڕێگای ژیاندا، گەوهەری فێركردنەكەشیان توانای گفتوگۆ(الجدل)بوو بەڕێگای قەناعەت پێكردن بالەسەر حیسابی ڕاستیش با بناغەی گفتوگۆیەكەش گومانبوو،بروتاگۆراس ،گورگیاس، هیباس ناودارترینیان بوون . دەرسیان بە زۆرناوداری سیاسی ورتوە لەبری كارەكەشیان پارەیان وەردەگرت ،وشەی سفستەش هاو واتای وشەی (كاسبیە): لبیب عبدالساتر: الحضارات ، (بیروت: ٢٠٠٣)، ص١٦٦؛ روبرت جي ليتمان : التجربة الاغريقية، ص١٣٦ هامش ١؛ ف س نرسيسيان : مێژووی هزری سیاسی لەیۆنانی كۆندا، ل١١٣ ولاپەڕەكانی دوایی .

[٣٣٩] Antisthene: بناغە دانەری قوتابخانەی كەلبی بوو(اولريش ولكن: اسكنرمقدوني، ص٤٥) لە ساڵی ٤٤٥پ.ز لەئەسینا لەدایك بووە لە٣٦٥پ.زكۆچی دوایی كردووە لەسەر دەستی فەیلەسوفی سۆفستایی (گۆرگیاس) پیشەی فێركردن فێربووە پاشان بەسوقرات گەیشتووە و تامردن شاگردی ئەوی كردووە وخۆشی بەمیراتگری بیری ئەو زانیوە :غانم محمد صالح: الفكر السياسي القديم والوسيط، ص١٢٤ هامش١.

[٣٤٠] قوتابخانەی كەلبی (Cynics):بەووردی نازانرێت ناوەكەی لەچی یەوەهاتووە ڕەنگە لەناوی ئەوشوێنەوە هاتبێ كە ئەوقوتابخانەیە لەئەسینا بەكاریدەهێنا(Cynesarges)، یان لە وشەیەكەوە وەرگیرابێ كەماناى (كلب-سەگ)بدات ئەویش وەك ئامارە بۆ ئەوشێوازەی كەئەندامانی ئەوقوتابخانەیە لەمامەڵەكردنیان

کەکەمتر هەستی نیشتمانپەروەری وسووربوونیان هەبوو لەسەری، بەزۆری ئارەزوومەندی دەوڵەتی گەورەی وەك دەوڵەتی فرس و دەوڵە تی ئەسکەندەر بوون نەك نیشتمانێکی تەنگەبەری وەك شارە دەوڵەتەکانی یونـان[٣٤١] ، ئامـاژەی بەکۆمەڵگایـەکی مرۆڤایـەتی کردبـوو کـەجێی هـەموانی تێدابێتـەوە (شـولی هـەموان بکـات)و لەوێـشەوە چـەمکی (جیهـان نیـشتمانی) پەیـدابووە، لەلایـەن (دیـوجین)ی شاگردیـشیەوەو بەدەسـتەواژەی ( کۆسمۆپـۆلیتس Cosmopolites شهروندجهان) گوزارشی لێکراوە و بووە بەبیرێك، کەئێستاشی لەگەڵدابێ سەنگ وتوانـای خـۆی لەدەسـتنەداوە، بەهـەموو ئەوجیاوازیانـەش کەلەگـەڵ ئیمپراتۆریـەتی بـەدیهێنراوی دەسـتی ئەسکەندەری دوای شەڕی گۆگمێلا هەیبوو، یەکێ بـوو لـەو هۆکارانـەی، کـەزەینی یۆنانیـەکانی بۆپێشوازی کردن لەئیمپراتۆریەتیە جیهانیەکەی، ئامادەکرد[٣٤٢] .

شـاعیرو نوسـەرو ئەدیبـەکانیش لـەڕێی بەرهەمەکانیانـەوە، بـەوە بیرهێنانـەوەی نەهامەتیـەکان کەلەشـەڕەکاندا بەدەسـتی ئەخمینیـەکان، تووشـی هـاتبوون و بەپیاهەڵـدان بـە پاڵەوانیـەتی گریکـەکان کەلـەو شـەڕانەدا نواندویانـە، لـە وروژانـدنی هەسـتی گـشتی بـۆ پـشتگیری کـردن لەپرۆسەی ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆڵیان بینیوە[٣٤٣] .

لەهـەموو ئەوانـەوە دەردەکـەوێت کـەباروودۆخی ولاتـی گریـك تائاسـتێکی زۆر گونجـاوبوو بـۆ فلیپ،کەهەڵسێ بەلەشکرکێشییەك بەرەو ئاسیا، تـا لـەپاڵ ئاواتـەکانی خـەڵکی گریـك ئامانجـە تایبەتیەکانیشی بێنێتەدی[٣٤٤] . بەلاّم بۆئەوەی شاهانشای ئێران بێ پێگـە تورەنـەکات، ویـستی یەکەجار یۆنانیەکان یەکبخات ودەسەلاّتی دەریایی و وشکانی بگرێتە دەست، ئینجـا نەخـشەی جـەنگ لەگـەڵ ئێرانـدا ئاشـکرابکات[٣٤٥] ، بۆئـەوەش کـەبتوانێ بەئاسـانی سـەرنجی خـەڵك

---

پەیرەویاندەکرد،شایانی باسە ئەوان سەگیان بەهێمای خۆیان دانابوو: غانم محمد صالح: الفکر السیاسي القدیم والوسیط،ص١٢٣ هامش ٣.

[٣٤١] بڕوانە یوسف کرم: تاریخ الفلسفة الیونانیة ، ص٢١٣.

[٣٤٢] اولریش ویلکن: اسکندر مقدوني، ص٤٥–٤٦.

[٣٤٣] ل.لوکهارت:فارس في نظر الغرب،تراث فارس، ترجمة یعقوب بکر، مراجعة یحیى خشاب، ( د م:١٩٥٩)،ص٤١٢.

[٣٤٤] سیر برسي سایکس : تاریخ ایران،ج١،ص٣١٨؛ حسین الهی : اسکندر مقدوني بچە تباە تاریخ، ص١٣٨.

[٣٤٥] اولریش ویلکن: اسکندرمقدوني، ص٨٣.

بۆشـەڕکردن لەگـەڵ ئەخمینیـەکان ڕابکێـشێ، بـیری تۆڵـە کردنـەوەی هێنایـە ئـاراوە لەبەرامبـەر ئەوتاوانەی خەشایارشا بەرامبەر پەرستگاکانی یۆنان ئەنجامی داوە(٣٤٦).

هەربۆیە لە ساڵی (٣٣٨پ.ز)کۆنگرەیەکی بۆ نوێنەرانی تەواوی دەوڵەتە شارەکانی یۆنان جگـە لە ئسپارتە لەکورنسە(كورنثة) سازدا وتیایدا ڕایگەیاند، کەدەیەوێ یەکێتییەکی نـوێ دروسـت بکات، بەشێوەیەك، کەهەموو دەوڵەتەکان خاوەنی سەربەخۆیی خۆیان بـن ولـەژێر سـەرکردایەتی ئەودا بۆ بەربەرەکانی کردنی ئەخمینیەکان ڕێکبکەون، دەوڵەتەکانی یۆنـان هەرچـەندە لەوکاتـەدا زۆرترسـیان لەشاهانـشا نـەبوو، لەگەڵیـشیدا دوژمــن نـەبوون، بـەڵام لەهەڵبـژاردنی فلیـپ بەسەرکردەی گشتی لاریـان نـەبوو ئـەوەش هـەم لەبەرئـەوەبوو، کەناچـاربوون هـەم بڕوایـان پێـی هەبوو، یانیش دڵخۆشبوون بـەوە کـە ئەوپادشـایە هێزەکـانی بەشـەڕی ئاسـیاوە خـەریك دەکـات ولەیۆنان دوردەکەوێتەوە(٣٤٧).

واتــە فلیــپ نەیدەویــست ڕاســتەوخۆ کــۆنترۆڵی شــارە یۆنانیــەکان بکــات، بــەڵکو ئــەوانی لەهاوپەیمانیەتیـەك لـەژێرناوی پـەیمانی هیلـینی یـان کۆمەڵـەی هیلـینی(الحلـف الهيلـيني)دا یەکخـست، کەمەڵبەندەکـەی لـە(کۆرنـسە(٣٤٨))بـوو، ئەنجومـەنێکی هـەبوو کەنوێنـەری گـشت شارەکانی لەخۆدەگرت وئەرکـە سـەرەکیەکانی بـریتی بـوون لەیارمەتیـدانی پادشـای مەکـدۆنیا بە(هێز )ی پێویست بۆئەو پرۆژە سەربازیانەی دەخرێنـەڕوو وبڵاوکردنـەوەی ئاشـتی لـەنێو شـارە یۆنانیەکاندا،لەرێی دەرکردنی بڕیاری قەدەغە (حرام) کردنـی شـەڕی نـاوخۆ ودانـانی دادوەر بـۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکان(٣٤٩).

ئەمــەش لەناوەڕۆکـدا لەهــەمان ئـەو ئامانجانـە دەچــن، کـە (ئەسیناوئەسـپارتە) لەمیــانەی کۆنگرەی هیلینــــی -کەپێـشتر باسـکرا- دەریانخــست ودەیـسەلمێنــێ، کەهــەمووان هەســتیان بەوەکـــردبوو تـەنها ڕێگاچـارەی ســــەرکەوتن بەسـەر دوژمــــنان ودەرچـوون لەهەلومەرجــــی ناهەموار و بەدیهێنانی یەکێتــییە و گرفتــی ڕێی پێگەیشتنیشی، پەیوەســـتە بەشــێوازی هەوڵدان و بیرکردنەوەی شارەکان لەئایندەی هەڵوێستــی سەرپەرشتــی کاری یەکێتیەکـە، بـەڵام

---

(٣٤٦) نفس المرجع، ص٨٥-٨٦.

(٣٤٧) سير برسي سايكس:تاريخ ايران، ج١، ص٢١٧.

(٣٤٨) بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٣).

(٣٤٩) لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٨٤.

چونکە فلیپ بەپێچە وانەی ئەو دەوڵەتە شارانە لەکاتێکدا هەنگاوی هەڵێنا بۆ یەکێتی ئاشتیخوازانە، کەدەسەلاتی یەکەمی لەناوچەکەدا هەبوو، کەسنەبوو بەری پێبگرێت، ئەمەش دەرفەتی سەرکەوتنی ئەوی زیاترکرد و ئایندەی خراپیشی، لاواز خستە بەرچاو.

فلیپ لەرێی ئەمەوە جگە لەفەرماندەیی سەربازی یەکێتییەکە، دەسەلاتی سەرپشك بوونی تەواویشی لەسیاسەتی دەرەوەی گریکەکاندا بەدەستهێنا، بەوشێوەیە گشت گریکەکان جگە لەئەسپارتە، لە یەکێتیەکەدا، یەکخران و بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا دەوڵەتێکی یۆنانی یەکگرتوو پێکهات[٣٥٠].

لەکۆنگرەی کۆرنسە- دوای پازدەساڵ لەشەرکردن لەگەڵ گریکەکاندا-هەڵبژێردرا، تا وەك سەرکردەی گشتی سوپای گریك هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی ئەخمینی، بەلام کوژرانی لەساڵی(٣٣٦پ.ز) پەکی پلانەکەی خست، ئینجا ئەسکەندەری کوری هاتە سەرتەخت و هەموان رازیبوون لەجێی باوکی سەرکردایەتی گشتی سوپای گریك بکات[٣٥١].

ئەسکەندەر هەمان نیازی باوکی هەبوو بۆ شەرکردن لەگەڵ ئەخمینیەکان وئاواتەکانیشی زۆر لەوە ئەولاتر بوون، کەباوکی نەخشەی بۆ کێشابوون، بەلام کەهاتە سەرتەخت یەکسەر رووی نەکردە شەرکردن لەگەڵیاندا، بەلکو مەرگی ناوەختی باوکی وئەو بارودۆخەی بەهۆی ئەو رووداوەوە هاتە ئاراوەو ئەو ئالۆزی وئاژاوە و هەڵگەرانەوانەش کەلێی کەوتنەوە ومەکدۆنیا و دەوڵەتەکانی تری گریکی گرتەوە، کە کەم تەمەنیەکەی - هێشتا لە بیست ساڵی دابوو- هۆیەکی دنەدەریان بوو و ئەو راپەرینانەش، کە لەئەنجامی بلاوبوونەوەی هەواڵی ناراستی مەرگیدا، لەژێر سەرکردایەتی ئەسینا روویاندا وخەریك بوون بەسەرکوتکردنیان وسەرلەنوێ رێکخستنەوەی ولات و ئامادەکردنی سوپاو پێداویستیەکانی ئەو گەشتە سەربازیە، لەشکرکێشیەکەی دوو ساڵ دواخست، بۆئەوەش کەزیاتر دوانەکەوێ بەخێرایی و بەتوندی

---

[٣٥٠] اولريش ويلكن : اسكندرمقدوني، ص٨٣.

[٣٥١] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٤٣٩-٤٤٠.

ڕاپەڕینەکانی سەرکوت کرد و کۆنترۆڵی تەواوی بارودۆخی وڵاتی گریکی کردەوە و ئامادەی هێرشکردن بەرەو ڕۆژهەڵات بوو[٣٥٢].

ئەوەی زیاتر حەزی گریکەکانی بۆ فراوانخوازی لەڕۆژهەڵاتدا دەمەزەرد دەکرد، ئاگاداربوون بوو لە بارودۆخی ناهەمواری ناوئیمپڕاتۆریەتی ئەخمینی لەڕێی ئەوانەی کەلەوێ لەدایك بوون و ئەوانەی کەدەرفەتی چوونیان بۆ ئەوێ بۆ ڕەخسابوو یاخود ئەوانەی دیل، وبارمتەبوون لەلایان، یانیش پیشەوەران وسیخوڕان و بازرگانان وسەربازە بەکرێگیراوەکان، بەتایبەت ئەو دە هەزار سەربازە بەکرێ گیراوەی کەبەسەرکردایەتی زەینەفۆن، کە دەگەڕانەوە ئەوەی بینیبوویان باسیان دەکردو پەردەیان لەسەر لاوازی ئەخمینیەکان هەڵدایەوە[٣٥٣]، کەخۆی لەئالۆزی وخراپی بەڕێوەبردن وبەکارهێنانی فشار لەبەرامبەر نەتەوە جۆربەجۆرەکانی سنووری ئیمپڕاتۆریەت و نەچەسپاندنی پەیوەندی نێوانیان وتوندوتیژی وسەختی گوزەران وبێزاری هاولاتیانی هەرێمەکان لەدەسەلات و چاوەڕوانی هەلی ڕزگاربوون...هتدا دەنواند، کەسەرچاوەیان گرتبوو لەلاوازی ونەشیاوی و خۆپەرستی ونەکارایی پادشاکان وململانێی دەسەلات و پیلانگێڕی لەدژی یەکتری ولەناوبردنی یەکتری وملدانە ڕابواردن وفەرامۆشکردنی گوزەرانی خەڵکی وخراپ بەکارهێنانی سامانی نیشتمان...هتد لەئیمپڕاتۆریەتی ئەخمینیدا، مەسەلەیەکی تری هاندەر و بوار ڕەخسێنەر بوون، بۆ هەڵسانی ئەسکەندەر و پێشتریش فلیپ بە لەشکرکێشی وبڕیاری ئەنجامدانی شەڕێکی یەکلایی کەرەوە لەگەڵیدا، ڕیشەی ئەو بارودۆخەش بۆ سەردەمی دوای داریوشی یەکەم (٥٨٦-٥٢٢پ.ز) دەگەڕێتەوە و بەرەبەرەش تەشەنای کرد تا لەسەردەمی دارای سێیەم (٣٣٦-٣٣٠پ.ز)ی هاو سەردەمی ئەسکەندەر دەرئەنجامەکەی دەرکەوت[٣٥٤].

هەڵکەوتنی وەها دەرفەتێکیش بۆ گریکەکان لەسەرووی هەموویانەوە ئەسکەندەر و لەلوتکەی بەهێزیدا، کەبەرێزگرتنی گشت بیروباوەڕەکان بەهۆی ئەوشێوازەی پێی پەروەردەبوو، سنووردارێتی ئایدۆلۆژیای دەوڵەتەشاری، لەلا کۆتایی پێهێنابوو ڕێگاشی بۆ تێڕوانینی

---

[٣٥٢] بڕوانە: فوزی مکاوی: تاریخ العالم الاغریقی وحضارتە، ص٢١٧-٢٢٠؛ فوکس ویبرن: الاسکندر الاکبر، (الاسکندریة: د.ت)، ص ٢٣-٢٧.

[٣٥٣] ل. لوکهارت: فارس فی نظر الغرب،تراث فارس، ص٤١١.

[٣٥٤] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٢٤٣-٢٤٤.

جیهانیانەی خۆشکردبوو، سەرسامیشبوو بەیەکێتی ڕۆژهەلاّت ودەسەلاّتی ڕەها و یەکسانی ڕەگەزەکانی مرۆڤایەتی[٣٥٥].

ئەمە لەکاتێکدا، کەتوانای سەربازی و گەورەیی شاهانشای ئەو ئیمپراتۆریەتە وناوبانگی شارەکانیشی، لەبڕوای یۆنانیەکاندا، بەتایبەت دوای شکستی ئەیۆنیەکان لەساڵی ٤٩٤پ.ز، تاڕاستی ئەفسانە جێیگرتبوو وئەو بڕوایەی دروستکردبوو، کەفراوانی پانتایی ئەو ئیمپراتۆریەتە وسوپا بێشومارەکەی لەڕاستیکدایە، کەبەهیچ ڕێگایەك داگیر و تەنانەت پەلاماریش نادرێت[٣٥٦] شتێکی دانسقە بوو و خۆلێبواردنی نەشیاوبوو. لەبەرئەو بارودۆخە هیچ کات لەوکاتە بۆ شەڕکردن لەگەڵ دەوڵەتی ئەخمینی باشتر نەبوو[٣٥٧].

بۆیە دەشێ بووترێ، کەئەسکەندەر دوای دەست بەتاڵبوونی لەکاروباری ولاّتی گریك و ئاگاداربوونی لەبارودۆخی دەوڵەتی ئەخمینی، لەڕێی سیخوڕەکانیەوە، ناوچەکەی وەك دەسکەوتێکی جەنگی هەژمارکردو هێرشی کردەسەر[٣٥٨].

ئەوەش لەلای (یوزف یوسهوفر)ی مێژوونوس ئەوەدەگەیەنێ، کە ئەگەرچی پرۆسەی لەشکرکێشیەکەی ئەسکەندەر بەنسبەت یۆنان بۆ تۆڵەکردنەوە بووبێ لەبەرامبەر هێرشی خشایارشا بۆ سەر یۆنان، ئەوا مەبەستی ئەسکەندەرلێی، داگیرکردنی پادشانشینی ئەخمینیو جێگیرکردنی دەسەلاّتی بوو لەسەر ناوچەکانی نێوان یۆنان وهند[٣٥٩]،کەئەمەش بەڕوونی هۆکاری سیاسی دەردەخات و بە شەڕێکی یەکلاکەرەوە نەبێ مەیسەر نەدەبوو،بۆیەشە هەندێ

---

[٣٥٥] عبدالمجید عبدالملك: ساحل بلاد الشام والصراعات الدولیة، (بیروت:٢٠٠١)الکتاب الاول، ص٤٩هامش٢.

[٣٥٦] ل. لوکهارت: تراث فارس، فارس فی نظر الغرب، ص٤١٠-٤١١.

[٣٥٧]هرمان بنگسون: یونان وپارسان، ترجمه تیمور قادری، (تهران:١٣٧٦)، ص٣٠٧؛حسین الهی: اسکندر بچه تباه تاریخ، ص١٥٤.

[٣٥٨] محمد جواد مشکور: تاریخ ایران زمین از روزگار باستان تا انقراض قاجاریة، (تهران ١٣٧٨)، ص٣٤.

[٣٥٩] ایران باستان از ٥٥٠پیش از میلاد تا ٦٥٠پس از میلاد، ترجمه مرتضی ثاقب فر، (تهران:١٣٧٧)، ص١٤١.

مێژوونوس مەسەلەی تۆڵەسەندنەوە لەئێران وکۆتایی هێنان بەدەست تێخستنیان لەکاروباری وڵاتی گریکدا، بەتەنها دیوی ئاشکرای لەشکرکێشیەکە تێدەگەن[٣٦٠].

بێگومان سەرکردە سەربازیەکانیش، کەلەکاتی کوژرانی فلیپدا پێیان وابوو مەگەر دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی بارتەقای ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بتوانێ قەرەبووی مردنی فلیپ بکاتەوە[٣٦١] و شانازی کردنی پادشای ئەخمینیش بەوەی کە هاندەری کوشتنی فلیپ بووە[٣٦٢]، ڕۆڵی دنەدەریان بینیوە لەسەر سووربوونی ئەسکەندەر لەوبوارەدا،کەدەچنە ژێر کاریگەری هۆکاری سیاسی.

شایانی باسە هەموو ئەوانەی، لەوتەوەرەیەدا باسکران پرۆسەی لەشکرکێشی ئەسکەندەریان لێکەوتەوەوخودی پرۆسەکەش بەوجۆرە، کەپراکتیزەکرا وسێ ڕەگەزی مێژوو(کات،شوێن،مرۆڤ)ی تیادا هاوئاهەنگ بوون، بوو بە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی گۆگمێلا.

چونکە ئەسکەندەر لەسەر میراتی باوکی، بەدەستبردن بۆخاڵە هەستیارەکانی کۆمەڵگای گریک ، توانی ڕەوایەتی وجۆرێك لەپیرۆزی بەبەر پرۆسەکەدا بکات، ولەرێی بەدیهێنانی ئاواتە چاوەڕوانکراوەکانی ئەوان ومسۆگەری پشتیوانیان، بەوسیاسەتە جۆراوجۆرەش کەلەبەرامبەر شارەکاندا گرتیەبەر، لەئامانجە بالاکانی خۆی نزیك ببێتەوە، کەئەوان هەستیان پێنەدەکرد وبێ ئەوجۆرە زەمینەسازیەش کاری لەوجۆرە ئەستەم بوو بۆنموونە ئەسکەندەر ویستی وێرانکردنی ( تیبە[٣٦٣])وە مامەڵە کردنی دڕندانە لەگەڵیدا، بکاتە پەند بۆشارەکانی تری وڵاتی گریك[٣٦٤]و لەمەبەستەکەشیدا سەرکەوتووبوو.

---

[٣٦٠] حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل از اسلام(ایران قدیم) یا تاریخ مختصر ایران تا انقراض ساسانیان، (تهران:١٣٨٢) ،ص١١٦؛عبدالعظیم رضایی: تاریخ ده هزار ساله ایران،ویرایستار زین العابدین ازرخش، (تهران:١٣٨٢)، ج، ص٣٠٣.

[٣٦١] خەسرۆ گۆران:کوردستان لەمێژوودا چاخە کۆنەکان،وەرگێڕانی،ئاسۆکەریم،(هەولێر:٢٠٠١)،بەشی یەکەم،ص٩٩.

[٣٦٢] بڕوانە:

STARBO:THE GEOGRAPHY,Book III,p.٢٠١-٢٠٥; سامی ریحانا: المجتمعات العسكرية عبر التاريخ، ص١١٢-١١٣.

[٣٦٣] بۆ زیاتر زانیاری لەسەر وێرانکردنی شاری تیبە وهەڵوێستی ئەسکەندەر بڕوانە نسطور ماتساس مذكرات اسكندر الكبير،ص٤١؛ فوكس ريبن: الاسكندر الاكبر ،ص٢٨- ٣٢ تيبه، تبس

لەمــیانەی لەشــکرکێشــــیدا بەهــەندێك لەئامانجە دیارەکان گەیشت، کـــە بــوون بەهـــۆی ســــەلماندنــی زۆر ڕاســتـــی و کەوتنەوەی هــەندێ ئەنجامـــی تر، کــە هــەم کــاری کـــردە ســـەر ورەی هەردووبەرە و هەمیـــش ڕوودانــی شـــەڕی گـۆگامێـلای کـردە (ئەمری واقیع).

لەهەڵمەتە سەربازیەکەی بەهاری ٣٣٤پ.ز هلسپۆنتی( دەردەنێڵ )ی بـڕی و هاتــە نــاو ئاسـیای بچوك، شەڕی یەکەم لەکەناری گرانیکۆس[٣٦٥] ڕوویدا لەسەرەتادا واپێشبینی دەکرا ئەخمینیـەکان سەربکەون وتەنانەت سەرکردە سەربازیەکان لەپەڕینەوەی ڕووبارەکە و سەرکەوتن لەئەنجامدانیـدا، گەشـبین نـەبوون وتخـون نەکـەوتنیان بەپەســند زانــی ،کەچـی ئەســکەندەر قبـوولی نـەکرد و لەکۆتایـشدا شـەڕ لەبەرژەوەنـدی گریکـەکان کۆتـایی هـات[٣٦٦] وبەمــشێوەیە دەروازەی ئاسـیای بچوك بەڕووی ئەسکەندەردا کرایەوە[٣٦٧].

شایانی باسە پێش دەرچوون بۆ شەڕی گرانیکۆس ئەسکەندەر دەیزانـی، کـە گەنجینەکـەی بەتاڵـە وتــەنها بەشــی یــەك مـــانگیش خــواردن وکەلوپــەلیان پێیــە ودەشیوبــست دیــاری بداتــە هاوسەفەرەکانی، بۆیە لەبڕیارێکی خێرادا هەرچی هەبوو لەنێوانیاندا دابەشیکرد وتـەنها شـتێك کە بۆخۆی هێشتەوە وبەیەك وشـە دەربـڕی، هیـوا (الامـل) بـوو ئـەوەش ئـیرادەی سـەربازەکانی چەسپاند[٣٦٨].

لـەم شـــەڕەدا ســوپای ئــەخمینی زیــانی زۆری لێکــــەوت، ژمارەیەکـــــی زۆر لەســـــەرباز و ئەفـــسەرەکانیــش کــوژران، بــەلآم وەك دەردەکــــەوێت زیانـــی ســوپای یۆنانـــی ئەوەنـدە

---

Tebes شاریThivate ئێستایە لە یۆنان کە بە هۆی ئەفسانەی ئۆدیب ناوبانگی پەیداکرد: حسین الهی: اسکندر مقدونی بچه تباه تاریخ، ص١٤٧ هامش ٣٥.

[٣٦٤] ا. بتري: مدخل الى تاريخ الاغريق، Richard D.Goff and athers:World History Vol .١,p.١٢٤ (U.S.A:٢٠٠٢) ص٥٥ ؛

[٣٦٥] (کوجاسو)ی ئێستایە، کە ڕووبارێکی بچووکە لە نزیك کەناری باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دەڕژێتە دەریای مەرمەڕەوە. نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص١٦٠، هامش(٥٨).

[٣٦٦] حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل از اسلام،ص١١٦-١١٧؛چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص٦٢-٦٧؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبيرالمقدوني، ص٦١-٦٣.

(٣٦٧) The world BookEnyclopedia(chicago:٢٠٠١)vol.١Kp٣٤٩.

[٣٦٨] پلوتـارك: الـسير،ج٣، ص١٢٦٧؛ چـون جـنتر: الاسـكندر الاكبر، ص٥٧-٥٨؛ فـوكس ويـبن: الاسكندر الاكبر، ص٤١.

نـــــەبوو[٣٦٩] بــۆ بەشـــــداری پێکردنـــی گریکــەکانیش لەشــەڕەڤی ســـەرکەوتن، بەشــێك لەدەستکەوتەکانـــی بۆگریکـەکان نـارد بەتایبــەت بۆئەســـینیەکان، ســیٚ سـەد زرێـی نـارد کەلەسەریان نووسرابوو(اسکندر کوڕی فلیپ بەهاوکاری گریکەکان جگە لەئەسپارتیەکان ئەوانە یان لە بەربەرەکانی ئاسیا دەستکەوت)[٣٧٠].

ئـەوەی کەسـەرکەوتنی ئاسـانکرد ئـەوەبوو، کـە دەوڵـەتی ئـەخمینی لەئەوپەڕی ڕۆژئـاوادا (لـە کەنارەکانی ئایۆنیا) لەتێکهەڵچوونی بەردەوامدابوو، ئەوەش ببووە مایـەی شـڵەژاوی بـەردەوام و دانیشتوانی ئەو ناوچەیەشی دووچاری بێزاری دەکرد وخوازیاربوون ڕزگاریان بێت و کەس نـەبێت سەرۆکایەتی یان چاودێری کردارەکانیان بێت وبالآدەسـت بێـت بەسـەریانەوە، جگـە لـەخواکان و دەستوری شارەکانیان نەبێت، لەبەرئەوەش کەخۆیان بەگریك دەزانی، هـەرکاتێك پـشتگیریەکیان هەست پێکردبا لەلایەن شارە گریکەکانەوە، ڕادەپەڕین[٣٧١].

بەمەش بوون بەهۆکاری زنجیرەیەك شـەڕی ئـەخمینی وگریکـەکان، کـەدەیان سـاڵیان خایانـدووە، بۆیەش ڕزگـارکردنی ئەوشـارانە یـەکیٚ لەئامانجـە دیارەکـانی ئـەو لەشکرکێشیە بـوو، ئەوکاتـە ئەسکەندەر بوو بەڕابـەری یـەکێتی کورنـسە ئـەو بۆچـوونە هاتـەئاراوە وچەسـپا، کەئەوشـارانە - شـارەکانی ئاسـیای بـچوك-لـە ڕێکخراوێکـی بـان هیلینیـدا جێـدەگرن[٣٧٢]. خۆشـی وتویـەتی سەرکەوتنی گرانیکۆس بەرپرسیاریەتێکی گەورە و پیرۆزی خستۆتە سەرشان، کە پشت تێکردنـی نەکرێ و سەپاندویەتی بەسەریدا کەدەبیٚ هەموو شارەکان لەدەستی ئەخمینیان بێنێتەدەر[٣٧٣].

لەلای گریکەکانیش ئەسکەندەر وەك ڕزگارکەر سەیردەکرا، بۆیە دوای شەڕی (گرانیکـۆس) زۆر بەئاسانی داگیرکران و جگە لەگرانیکۆس هیچ نەبەردی تـر ڕوویـنـەدا، تـەنها لەهەنـدیٚ شـارنەبیٚ بەکرێگیراوە گریکەکان بەربەرەکانیان دەکرد بەهۆی ئـەم ئاسـان داگیرکردنـەش، شـارەکانی تـری

---

[٣٦٩] محمد الاسعد بن بوبکر الاحفصی: الغزو الیونانی لبلاد الرافدین، رساله ماجستیر، ص٢٩ ئامـاژە بـە بەلاپـەڕە ٤٥٧ بـتری دەکـات کـە خـۆی ١٢١ لاپەڕەیـە لەلاپـەڕە(٥٥) دا باسـی ئـەو شـەڕە دەکات.

[٣٧٠] بلوتارك: السیر، ج٣، ص١٢٦٩.

[٣٧١] ادون بڤن: ارض النهرین، ترجمه الاب انشتاس ماری الکرملی والاب لویس مرتین الکرملی، (بغداد:١٩٦١)، ص٦٦.

[٣٧٢] فلیب حتی: موجز تاریخ الشرق الادنی، ترجمة انیس فریحة، (بیروت:١٩٦٥)، ص٩١-٩٢.

[٣٧٣] نسطور ماتساس: مذکرات الاسکندر الکبیر ، ص٤٤.

دراوسێی ئاسیای بچوکیشی وا لێکرد ڕادەستی ئەسکەندەربن، بەتایبەتیش کەلەگەڵ هەرشارێکدا بەوجۆرە مامەڵەی دەکرد، کە پەسەندبوو لەهەندێکیاندا لەتوێژە دیموکراتەکان نزیك دەبۆوە لەهەندێکیتر لەگەڵ زیوان(کاهن)ی پەرستگاکان و لەهەندیکی تریش لەگەڵ پیروخانەدانەکان[٣٧٤].

جگە لەمانە ئەسکەندەر ڕاشیگەیاندبوو، کەهاتووە بۆ لەناوبردنی (ئۆلیکارکیە خۆسەپێنەکان) و گێڕانەوەی دیموکراتی و ڕێگەدان بەهەموو شارێك کەمافەکانیان لەئازادی وبەهرەمەندبوون لەدەستورە تایبەتیەکانیان، بەدەست بێننەوە، باجەکانیشی هەڵوەشاندەوە بۆیەش دەسەلاتەکانی شارە ئازاد نەکراوەکان یەك لەدوای یەك هەوڵیاندەدا ڕووی حکومەتەکانیان لەجیاتی ئەخمینیەکان بۆ لای گریکەکان وەربگێڕن[٣٧٥].

بەمەش شارە ئەیۆنیەکانی لەپاشکۆیەتی دەوڵەتی ئەخمینی دەرهێناو لەدانی باج و بەخشینی ودەرفەتی پێدان خۆیان حوکمڕانی خۆیان بکەن و بە(یەکێتی کورنسە) پەیوەستی کردن، یەکەم مادەی بەرنامەی بان هیلینی بەخێرایی بەدیهات و لەوێشەوە خولێکی نوێی فراوانخوازی دەستی پێکرد[٣٧٦] ئەم یەکەم ئەزموونی سەرکەوتنەش لەبەرامبەر ئەخمینیەکاندا و بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامانە، ئەسکەندەریان دڵخۆش و هیوادارکرد، کەبەتەمایان نەبوو بڕیاری نەخشەیەکی تریشیدا کە بەنسبەت سەربازەکان کتوپڕ(مفاجئە)بوو، ئەو لەبری ئەوەی بەشوێن دارا بکەوێ لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، پشتی لەئەخمینیەکان کردو ڕووی کردە کەنارەکانی ئاسیا لەباشور، تاپێگەی خۆی بەهێز بکات ومانەوەی پەیوەندیشی لەگەڵ گریك بەمسۆگەری بهێڵێتەوە، لەبەرئەوەش کە هەواڵی شەڕی پێشوو بەخێرایی بڵاوبۆوە زۆربەی شارەکان خۆیان لە بەربەرەکانی

---

[٣٧٤] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص١٣٢؛ هرمان بنگسون: يونان وپارسيان، ص٣١٦-٣١٧؛ فوكس ويبرن : الاسكندر الاكبر، ص٤٩؛ ف. دياكوف، و س.كوفاليف: الحضارات القديمة، ج٢، ص٣٩٤.

[٣٧٥] طه باقر: تاريخ ايران قديم، ص٧٧؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٦٣.

[٣٧٦] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص١٣٧؛ راس ئي دان و ديگران: تاريخ تمدن وفرهنگى جهان، ص٢٦٦.

پاراست[٣٧٧] وتووشیەتی کەگرتنی شارەکان و سەرکەوتنە یەك لەدوایەکەکانی وایکردوە کەبڕوای بەگەورەیی ئەوپەیامە هەبێ کە هەڵیگرتووە[٣٧٨].

بێگومان گرنگی نەدانی ئەخمینیەکان بەشەڕی (گرانیکۆس) وگەش بینیان بەسەرکەوتن، ترسی یارانی ئەسکەندەر و ڕەش بینیان بەرامبەر ئایندەکەی بەرەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە[٣٧٩]، وە ڕاستی گەرانی هەواڵی بێزاری خەڵکی ناوچەکەش لەهەمبەر دەسەلاتی ئەخمینیەکان وخۆ بەدەستەوەدانی زۆربەی شارەکان بێ شەڕ و وەك فریادڕەس بینینی ئەسکەندەر[٣٨٠]، کاریگەری پۆزەتیڤی لەسەر ئەسکەندەر و سوپاکەی ونێگەتیڤی لەسەر دارا و سوپاکەی هەبوو.

ئیتر دارای سێیەم هەستی بەڕادەی ئەو مەترسیە کرد، کە ڕەوتی لەشکرکێشی ئەسکەندەر دروستی دەکات ئەگەر بەردەوام بێت، بۆیە کەوتە کۆکردنەوەی سوپاو بڕیاریدا بەسەرکردایەتی خۆی لەشەڕێکی دیکەدا، بەربە پێشڕەوی ئەسکەندەر بگرێت[٣٨١]، ئەوەش شەڕی (ئیسوس)ی[٣٨٢] ساڵی( ٣٣٣پ.ز) لێکەوتەوە، ئەویشیان بەهۆی مەزەندەی هەڵەی داریوش بەدانانی ژمارەی زۆری سەرباز بەسەرەکیترین بنەمای سەرکەوتن وبەترساو هەژمارکردنی ئەسکەندەر وبەبێ ئیرادە زانینی لەبەردەوامی پێشڕەوی کردندا،-بەتایبەت لەبەر دواکەوتنی ڕووبەڕووبوونەوە بەهۆی نەخۆشی ئەسکەندەر و بێئاگاییشیان لەپێشڕەوی یەکتر ورەچاونەکردنی هونەری سەربازی وسوپای مەشقپێکراوی گریك وسووربوونیان لەسەر فراوانخوازی و هەڵەی دارا لەهەڵبژاردنی شوێنی شەڕو ڕێکخستنی نادروست ودابەشنەکردنی هێزەکان

---

[٣٧٧] چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص٦٨-٦٩؛مؤلف مجهول: الناجحون الاسكندر فاتح العالم، (بيروت: ١٩٧٩)، ص٦٢-٦٤.

[٣٧٨] نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص٤٦.

[٣٧٩] چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص٦٢-٦٥.

[٣٨٠] فوزی مکاوی: تاريخ العالم الاغريقی وحضارته، ص٢٢٣-٢٢٤؛ ادوين اريدويچ گرانتوسكی وديگران: تاريخ ايران، ص١٠٦-١٠٧.

[٣٨١] فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارته، ص٢٢٢-٢٢٤؛ پی ير بريان: تاريخ امپراتوری هخامنشيان، ازكورش تا اسكندر، (تهران: ١٣٨٢)، ج٢ ، ص١٧٠٠-١٧٠١؛ بسام العسلي:الاسكندر الكبير المقدوني، ص٦٧.

[٣٨٢] ئیسوس: شارێکە لە کەناری کەنداوی ئەسکەندرۆنە لە باکوری ڕۆژئاوای سوریا هەڵکەوتووە. حسين الهی: اسكندر بچه تباه تاريخ، ص١٩٦، هامش(٢٥).

ونەبوونی دەرفەتی بەشداری کردنی بەشێکی زۆریان، بەسەرکەوتنی گریکەکان کۆتایی هات[٣٨٣].

لەو شەڕەدا داریوش هەڵات، لەدوای خۆی تفاقی شەڕو قەڵغان وگالیسکەی تایبەتی خۆی وماڵ وخانەوادەکەی -دایك وژن ومنداڵەکانی کەهاوڕێیەتیان دەکرد-وکەلوپەلێکی زۆری بەجێهێشت، ئەو نەگبەتیەش وای لێکرد داوای ئاشتی لەئەسکەندەر بکات کەچی ئەو لوتبەرزانە وەڵامی دایەوە داوایکردبوو کەبێ مەرج خۆی ڕادەست بکات وخۆشی وەك گەورەی ئاسیاڕاگەیاند[٣٨٤].

جێی ئاماژە پێکردنە لەنێو نووسراوی مێژوونوسە کۆنەکاندا و لەمیانەی قسەکردن لەسەر کردنەوەی دەرگای گفتوگۆی نێوان شاهانشاهی ئەخمینی وئەسکەندەری مەکدۆنی لەبارەی ناوەڕۆکی نامەکان ومەسەلەی پێشنیارکردنی سنوور و هاوپشکی لەخاکی ئیمپراتۆریەت و چۆنیەتی تێگەیشتنی هەرلایەك لەهەڵوێستی بەرامبەر و٠٠٠هتد، ژمارە و کاتی ناردنیان، قسەوباسی جیاواز هەیە[٣٨٥].کەجێی باسکردنی ئێمە نیە، بەلآم ئەوەی گرنگە ئەوەیە لەکاتی پێشڕەوی ئەسکەندەردا دارا دەرگای بۆ پێکهاتن وکۆتایی هێنان بەشەڕ کردۆتەوە و لەو پێناوەشدا ئامادەی بەخشین بووە ، بەلآم مل نەدانی ئەسکەندەر[٣٨٦] ئۆقرە نەهاتنی بەوەی لەپێشنیارەکاندا هاتبوو بەهۆی باییبوون بەسەرکەوتن، پرۆسەی نەیگەیاندە ئەنجام، شتێکی ئاساییە، کەئەسکەندەر ئەوداوایەی، لەلاوازی وناچاری یان بەجۆرێك لە(ئیستیفزازی)زانیبێ، چونکە ئەوەی پێشنیارکردبوو، کە بیداتێ، لەبەردەستی خۆیدا بوو وەلآمەکانیش بەبێ ڕێزی وبێ وەڵآم لێکدرابنەوە کەغیرەتی دارای جولآندبێ، بەتایبەتی کەئەسکەندەر خۆی وەك پاشای ئاسیا ناساندووە و قبوولی نەکردووە وەك هاوتای خۆی بیدوێنێ، ئەمەش بووبێتە هۆی هاندانی هەردوولا بۆ شەڕێکی چارەنوسساز و یەکلایی کەرەوە، ئەویش پاشئەوەی ئەسکەندەر کۆنترۆڵی تەواوی ئاسیای بچوك سوریاوفینیقیە و میسری کردو لەچەند شەڕێکی بەناوبانگدا سەرکەوتنی

---

[٣٨٣] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص١٤٣-١٤٩.

[٣٨٤] ف.دياكوف، وس.كوفاليف: الحضارات القديمة، ج٢ ، ص٣٩٤؛ ا.برگر وديگران: تاريخ جهانN.G.L.HAMMOND:AHISTORY OF باستان، ج٢، ص٢٤٩؛ GREECE,p.٦١١-٦١٢

[٣٨٥] لەوبارەوە بڕوانە: پی یر بریان: تاريخ امپراتور هخامنشيان ، ج٢، ص١٧١٨-١٧٣٢؛ حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١١٨٨ولاپەڕەکانی دوایی.

[٣٨٦] لەوبارەوە بڕوانە: نسطورماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص٥١-٥٣.

بەدەستهێنا وسەرکەوتنێك بۆ سەرکەوتنێکی تر کێشی دەکرد[٣٨٧]، دواتر خۆی وەك پاشای ئاسیا ناساند ودەیویست تەواوی ئامانجەکانی بەدیبێنێ، کەبەندبوون بە کۆتایی هێنانی دەسەلاتی ئەخمینی ئەوەش دەبوو بە شەڕێکی چارەنووسساز یەکلابکرێتەوە هەرچی داراش بوو بەردەوام لەکزیدا بوو هەولی زۆریشیدا، بەلام دەرەقەتی نەهات و بەرێگای ئاشتیانە هیچی بۆنەکرا ، ئەو کە بەپادشای پادشایان ناسرابوو، بۆیە یان دەبوو خۆی بەدەستەوە بدات یان رازیبێت وەك رەعیەت گوێڕایەلی ئەسکەندەر بکات، کە ئەوەی بەشایەنی خۆی نەدەزانی و برواشی بەوە هەبوو کەئەگەر شوێنێکی گونجاو بۆ شەڕکردن هەبێت، سوپایەکی زۆریش ئامادەبکرێت، دەکرێت دوژمن بەبەزێنێت، بۆیە ناچاربوو ئەویش دواهێزی خۆی تاقی بکاتەوە و دوا شەڕی چارەنووسساز ئەنجام بدات.

---

[٣٨٧] بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ گرتنی ئەوناوچانە بڕوانە :

H.G.Wells ;Ashort History of the World(LONDON :١٩٣٦),p٢٢-٢٥

؛

J.BURY and others: The Cambridge Ancint History, (London: ١٩٦٤), Vol. VI,p٣٥٨-٣٧٩؛ پی یر بریان : تاریخ امپراتوری هخامنشیان، ج٢، ص١٦٨٧-١٧١٨؛ ا.بتري: مدخل الى تاريخ الأغريق ، ص٥٥-٥٧.

## تەوەرەی سێیەم
## هۆکاری ئابوری و کۆمەلاّیەتی

بەهۆی ئەوەی کەچالاکیە ئابوری ومادیەکان بەدرێژایی مێژوو پایەی سەرەکییان لەژیانی مرۆڤدا پێکهێناوە وئاستی ئەو رۆڵە کاریگەرەش، کەلەتێکرای رووداوە مێژووییەکاندا، ئامادەیی هەیە، وای لەزۆر بیریار و چاکەخوازی سیاسی کۆمەلاّیەتی و زانایانی کۆمەڵناسی وئابوری و مێژوو وفەیلەسوفان کردووە، کەهەڵوەستەی لەسەربکەن و بەکاریگەرترین یان هەندێکیان بەتاکە هۆکاری گۆڕانکاری مێژوویی دابنێن[٣٨٨].

لەیەك لەسەرچاوەکاندا هاتووە، کاتێك بارودۆخی مادی بۆ هەر کۆمەڵگایەك لەقۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا، بەپێویست، مەیدانخوازیەك (تحدیات)ێك دەسەپێنێت، بەناچاری دەبێ بیرێکی نوێی ڕەنگدانەوەی سروشتی ئابووری وکۆمەلاّیەتی کۆمەڵگایەکە، بۆ وەلاّمدانەوەی ئەو مەیدانخوازیە دەربکەوێت، ئەویش گواستنەوەی کۆمەڵگا بۆ قۆناغێکی تری مێژوویی مسۆگەر دەکات[٣٨٩]، ئەوە بیری لەشکرکێشی ئەسکەندەر بۆ ڕۆژهەلاّت وشەڕی گۆگامێلاش وەك لوتکەی ئەو زنجیرە شەڕانەی لە میانەیدا ولەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی ئەنجامیدا، بارودۆخی ئابوری و کۆمەلاّیەتی وەك مەیدانخوازیەك شوێن پەنجەی دیارە. بەتایبەتیش کەولاّتی گریك بەهۆی سروشتی هەڵکەوتنی ولاّتی گریك بەگوێرەی دەریاو ڕووبارەکان و بەرزی ونزمی ڕووی زەویەکەی و تەنگەبەری وهەژاری وخاکی هەرێمەکان وبوون ونەبوونی خاکی بەپیت، بۆچاندنی درەخت وجیاوازی پلەی گەرما وڕادەی باران بارینی لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی دی لێدەکەوتەوە، وای کردبوو بەرووبومی کشتوکاڵی کەمبێ، جارجارەش بازرگانی گرفتی بۆدروست ببێت

---

[٣٨٨] هاشم یحیی الملاح و اخرون: دراسات في فلسفة التاریخ، (الموصل:١٩٨٨)، ص١٤٢.

[٣٨٩] حسین الشیخ: دراسات في تاریخ حضارة الیونان والرومان، ص٣٩.

وبەگشتی چالاکی هاولاتیان سنووردار بێت و خراپ بوونی باری ئابوری وکۆمەلایەتیش بەدوای خۆدا بێنێت[٣٩٠]، بەتایبەت لەوسەردەمەدا کەکۆمەلگا لەهەموو ڕوویەکەوە گۆڕانکاری بەخۆوە بینیوە.

زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان یەکێکیتر بوو لەگیروگرفتەکانی سەدەی (٤ پ.ز) ولاتی گریک، وەك چۆن لەسەدەی هەشتەمەوە بەدەستیەوە گیرۆدە ببوو و کەتەنانەت داگیرکردنی کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاست ودەریای ڕەش وئەو شۆڕشە ئابوریەش، کەئەوکات بەدوایدا سەریهەلدا، بۆ فەراهەم کردنی خۆراك بەردەوام وتێرکردنی پێداویستیەکانیان بەس نەبوو[٣٩١].

وێڕای شەڕوکێشەی بەردەوامیان لەگەل ئەخمینی وململانێی خۆبەخۆی دەولەتەشارەکان لەسەر سەرکردایەتی کردنی ولاتی گریك وئەوشەڕ وشۆڕانەی لەئەنجامیدا ڕوویاندا، کە بارودۆخی ناوخۆی دەولەتەشارەکانی لێك ترازاندوو ئابووریەکەشی بەرەو داڕوخانبرد[٣٩٢]، گورزیشی سرەواندە دلی یۆنان، چونکە ریزەکان پەرتەوازە بوون ویەکێتی گەلیشی شەق کرد، هەندێکیانی کردە دوژمنی هەندێك، ولاتیشی کردە پارووەیەکی ئاسان لەبەردەم دەسەلاتێکی بەهێزی دەوروبەر، کەنیازی دەستبەسەرداگرتنی هەبێ[٣٩٣].

خراپ بوونی ڕۆژبەڕۆژی بارودۆخی رامیاری، قوولبوونی جیاوازیە کۆمەلایەتیەکان، دەرکەوتنی چینی جۆراوجۆری ئابووری وکۆمەلایەتی لێکەوتەوە، هەژاری ولاتی تەنیەوەو ململانێی چینەکانی کۆمەل توندوتیژبوو وکۆمەلگای نیمچە هەلوەشاوکرد، هەروەها بوو بەهۆی تێکچونی بازرگانی و(کەمبوونی)وتەشەنەکردنی بێ متمانەیی لەنێو هاولاتیاندا وبەرزبونەوەی ڕێژەی بێکاری بەتایبەت لەنێو ئەوکرێکارانەی کەپێشتر لەوەرشەکاندا کاریان دەکرد، کارگەی گەورەش لەئارادانەبوو تاهەلی کارکردن بڕەخسێنێ، لەبەرئەوەش، کەئابوری پایەی دەولەتە و ڕەگەزێکی سەرەکی سەقامگیربوونیەتی، پێویست بوو

---

[٣٩٠] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر کاریگەری ژینگەی ولاتی گریك بڕوانە: عبداللطيف احمد علي: التاريخ اليوناني(العصرالهلادي)، ص٢٠-٤٠.

[٣٩١] ارنولد توينبي: تاريخ الحضارة الهيلينية، ص١٣٥-١٣٧؛ محمد الاسعد بن ابوبكر الحفصي: الغز و اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص ١٥ .

[٣٩٢] لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٧٨-١٧٩.

[٣٩٣] مؤلف مجهول: الناجحون الاسكندر فاتح العالم القديم، ص٢٢.

لەســـــەر دەوڵەتەكانــــی یۆنـان بـواری دیكــــە بدۆزنـەوە بـۆ فراوانبـــوون ودەستكەوتنــی ســامان و بەدەستهێنانــی خۆشگوزەرانی، بەلاّم هیچ نـەكرا، بۆیـە بەشـێكیان بێكـار وسـامان كەوتنــە سـەر شــەقامەكان و هەنــدێكیش ڕوویــانكردە دەریــاو كەوتنــە جەردەیـــــی كـردن وئاسـایشـــی سـەر دەریایان تێكــــدا و وەك كۆمەڵێــــك جـەردە و دز و تاوانكــار بەنـدەر و كەنداوەكانــیان كــۆنترۆڵ كـــــردبوو، هەندێكیـــــش بوونــە ڕێگــر و ڕێیــان بەكاروانـــە بازرگانیـــەكان دەگــرت، كەدەهاتنـــە یۆنان، بەشێكـــی زۆریش كــەوتنە سـەربازی كـردن بەكــرێ (المــرتـــزقــة)[٣٩٤] واتــــا بەكــرێ ســـەربازی كــــردن بــــێ گـوێــدانـــە ئەولایـــەنـەی خزمـەتیان پێدەكـرد، لەنیـو یۆنانیــەكان بـلاّوبۆوە،كەپێشـتر نەبوو[٣٩٥].

پەیوەندی نێوان چینەكانی هەرشارێكیش لەوە دەرچوو، كە وەك سەدەی پێنجەم لەسـەر شـێوەی گفتوگـۆ (حـوار) یــان تێكۆشــان(كفــاح) یــان تەنانــەت ململانــێش لـەپێناوی بــەدیهێنانی سیستەمێكی سیاسی گشتگیر دابێ، بەڵكو بەشێوەی ململانێ لەپێناو دەستكەوتنی قازانجێكی كەموكورت مـەوداو ناپەیوەست بەهیچ بیروباوەڕێكی سیاسـی دیـاریكراو، دەركـەوت، كـە زیـاتر لەئاژاوەو بێسەرە و بەرەیی دەچوو تا گفتوگۆ(حوار) یان گۆڕانكاری سیاسی[٣٩٦]، فلیـپ تـوانی سوود لەو خاڵە ببینێ و لەمیانەی تێكۆشانیدا بۆ كۆنترۆڵكردنی یۆنان ، یەك لەشێوازەكانی بۆ ڕاكێـشانی سـەركردە و كەســایەتیە سیاســیەكان بــەكارهێنانی بـەرتیل وپاداشـت بـوو[٣٩٧]. بەتایبەتیش كە مەكدۆنیا لەوكاتەدا لەچاو ناوچەكانی تری ولاّتی گریك دەوڵەمەند بوو، چـونكە خاكەكەی لەڕووی زۆری وجـۆراوجۆری بەروبومەكانــی گونجـاو بـوو بـۆ دروســتكردنی بناغــەی دەوڵەتێكی بەهێـز و لەزەویەكانیدا گەلێــك كانگای دەوڵەمەنـد و پێویســت بـۆ پیشــەسـازی كانزایی هەبـــوون، هەروەها خودانـــی پانتایی بەرفراوانی داپۆشراو بەدارستانی چڕو كێڵگـەی بەپیت بۆ كشتوكاڵی گـەنم و لـەوەڕگای زۆربـوو بـۆدابینكردنی پێداویستی ڕۆژانـە و كاروبـاری

---

[٣٩٤] علی عكاشة واخرون: الیونـان والرومـان، ص٩١-٩٢؛ اولـریش ویلكن: اسـكندر المقدوني، ص٤٣-٤٤.

[٣٩٥] لطفي عبدالوهاب یحیى: الیونان ، ص١٧٩.

[٣٩٦] نفس المرجع ، ص٢٢٠.

[٣٩٧] سید احمد الناصري: قضیة التاریخ القدیم، ص١٣٤؛ فوزي مكاوي: تـاریخ العالم الاغریقی وحضارته، ص٢١٧.

سەربازی سوودیان لێدەبینرا[398] و دەشتێکی بەپیتی پڕ لەکانگای زێڕ لەباکوری مەکدۆنیا بەدەستەوە بوو[399].

فلیپ لەگەڵ ئەوەشدا کەئۆردوی تەواوی هەبوو، و هونەری سیاسی بەوپەڕی لێهاتوویی لەجەنگدا پەیڕەو دەکرد بەپەخشانکردنی زێڕ، دەیتوانی دوژمنانی خۆی فریو بدات وەك پاشاکانی ئەخمینی توانیبووی بیروباوەڕی زۆربەی خەڵکی یۆنان بکڕێ و لەتەواوی وڵات لایەنگری پەیداکردبوو، کەدەبوو هاولاتیانیشیان ڕازیبکەن، کەپادشای مەکدۆنیا دۆستیانە و پێشوازیکردن لەئۆردوی ئەو بەقازانجیانە[400]، بۆیە دەرفەت وەرگرتنیش لەململانێی ناوخۆی وڵاتی گریك، توانی کەنارەکانی دەریای ئیجە داگیربکات بەتایبەتیش، کە وڵاتی ئەخمینیان ئەوکاتە لەچاوی گریکەکاندا مەڵبەندی زێڕو زیو و سامانی ئەفسانەیی و ئەسپی باش وخاکێکی بەپیت بوو بۆ خەڵکی گریکی هەژار و بێنەوا، -واتا ناوچەکانی تری گریك جگە لەمەکدۆنیا- کەجەنگی ناوخۆی نێوان دەوڵەتە شارەکان ئابووریەکەیانی ئیفلیج کردبوو، ببوو بەئامانج ومەبەستێك کە دەتوانرا بکرێتە سەرچاوەی باج ودارایی[401].

ئەو بارودۆخە و وێناکردنی ڕۆژهەلات وەك ناوچەیەکی خاوەن سامان ودەوڵەمەند دەرفەتی دایەدەست فلیپ کەپشتیوانی یۆنانیەکان بۆئامادەکردنی سوپایەکی باش وهێرش کردنە سەرئەوناوچەیە، مسۆگەربکات، ئەوەش خەونێك بوو، کەیۆنانیەکانیش ئاواتەکانیان لەسەری هەڵچنی بوو، بەرژەوندیەکانیان یەکی دەگرتەوە، چونکە ئەوپلە و پایە و شکۆ و کەسایەتی گەرەك بوو، ئەوانیش سامان ودەوڵەمەندی بەهەر شێوەیەك بێ، تەنانەت ئامادەی شەڕکردن بوون لەگەڵ هاوخوێنەکانیشیان، کەوەك کرێگرتە لەریزی سوپای ئەخمینی، لەژێردەستی دارادا خزمەتیان دەکرد[402].

---

[398] لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان، ص١٨٢-١٨٣.

[399] لبيب عبد الساتر : الحضارات، ص١٧٦.

[400] البرماله: تاريخ البرماله، ص٢٩٢.

[401] سموئيل كندي ادي: ايين شهرياري درشرق، ترجمه فريدون بدره اي، (تهران:١٣٤٧)، ص٤؛ حسين الهي: اسكندر مقدوني بچه تباه تاريخ، ص١١٨، ص١٢٢.

[402] ابراهيم محمود السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، (القاهرة: ٢٠٠٠)، ج٣، ص٩.

هەروەها ئەوپرۆسەی لەشکرکێشیە لەگەڵ بیروڕای زۆر سیاسەتمەدار و ئایدۆلۆژیستەکان، دەهاتەوە، کە بۆ گفتوگۆ لەبارەی ڕێگاچارەی دەرچوون لەبنبەست بوونی ئەو قەیرانە کۆمەلآیەتیەی سیستەمی کۆیلایەتی یۆنان لەسەدەی چوارەم تێی کەوتبوو، دەستگرتن بەسەر ولآتانی ڕۆژهەلآتیان بەتەنها ڕێگەچارە دەزانی، بەتایبەت (سوکرات= Socrates ٤٦٩-٣٩٩پ.ز)ی فەیلەسوف لایەنگری ئەوتیۆرە بوو گشت دەوڵەتە بچوکەکانی یۆنانی بانگهێشت کرد، کە لەپێناو لەشکرکێشی هاوبەش بۆ داگیرکردنی خاکی تازە، یەکبگرن وپێی وابوو یۆنیانی هەزار کەهۆکاری سەرەکی هەڵگەڕانەوە و شۆڕش بوون لەنیشتمان، هەڕەشەیان لەئارامی وسیستەمی گریکی دەکرد، پێویستە لەوناوچانە جێی خۆیان بکەنەوە[٤٠٣]،(ئەرستۆ٣٨٤- ٣٢٢ پ.ز) (Aristole)ش پشتگیری ئەو بۆچوونەی دەکردو بڕوای وابوو کە چارەنوسی سروشتی(بەربەرەکان)ی ڕۆژهەلآت جگە لەبەندایەتی هیلینیەکان هیچی ترنیە[٤٠٤]،ئیزۆکراتیش لەو بڕوایە دابوو، کەبەدەستگرتن بەسەر زەویەکانی ئاسیا، سەروەت وسامانی ئەوان دەگاتە یۆنان وهەژاری کە ڕیشەی زۆربەی کێشەکانە چارەسەر دەبێت[٤٠٥]، سەرەڕای هەموو ئەوانەش دەوڵەتی ئەخمینی توانیبووی هێڵەکانی ئازوخە گەیاندن بەگریك ببڕێت بەتایبەت گەنم کەدەمێك بوو لەمیسرەوە پێیان دەگەیشت بەوەش تەواوی گریکەکان ڕووبەڕووی هەڕەشە بوونەوە[٤٠٦].

بەسەرنجدان لەوانەی باسکران وتێبینی کردنی ئەوەی، کەپیاوماقولآنی مەکدۆنی داگیرکاریان بەشانازی ودەستکەوت دەزانی، هەندێ یۆنانیش خوازیاری کشانی بازنەی بازرگانی بۆ بازاڕە دەوڵەمەندەکانی ڕۆژهەلآت، بوون و هەنگاوەکانی لەشکرکێشییەکەش بەداگیرکاری لەژێر دروشمی ڕزگاری بۆ گریکەکان لەژێر ستەمی ئێرانیان ئەنجامدرا، (گیرشمن) وایدەبینێ کەڕەنگە

---

[٤٠٣] ادوين اردويج گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران، ص١١١.

[٤٠٤] نفس المرجع، ص١١٢.

[٤٠٥] اولريش ويلكن: اسكندرمقدوني، ص٥٤.

[٤٠٦] جابر خليل ابراهيم: منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاجنبي، الاخميني والسلوقي والفرثي، مج١، ص٣٣.

ئەسکەندەر تەنها کەسێك بێ لەسەردەمی خۆیدا، توانیویەتی داخوازی یان هیلینیزم بەدی بێنێ[٤٠٧].

هەروەها دانەوەی قەرزەکان وچارەسەرکردنی بەتاڵی خەزێنەکانی دەوڵەت، کەفلیپ لەمیانەی شەڕەکانی بۆمەل پێ کەچکردن و یەکخستنی گریکەکان خەرجی کردبوو، ببون بەگەورەترین گرفتی بەردەم ئەسکەندەر[٤٠٨]، ئەمە جگە لەوەی کەئەو بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی بارودۆخەکە و پاراستنی پێگەی خۆی وەك سەرکردەی یەکێتی کۆرنسە و مسۆگەرکردنی خەرجی زۆرخایەنی لەشکرکێشیەکەی وباربۆ و یارمەتیدانی سەربازەکانیش، بەئومێدی هاندان وساردنەبوونەوە وبەدڵسۆزمانەوەیان، پێویستی بەدۆزینەوەی سەرچاوەی دیکەی سامان هەبوو.

ئەسکەندەر لەبەرئەوەی دەیزانی کەفلیپ لەسەرکەوتنەکانیدا، سەرەڕای ئەوکانگا زێڕانەی لەبەردەستیدا بوون، کەمەرد (٥٠٠)تالنت[٤٠٩] قەرزداربوو ئەو پارەیەش کە لەخەزێنەکانی دەوڵەتدا هەبوو هەر بەشی هەڵمەتێکی مامناوەندی هاوینەی دەکرد و لەتواناشیدا نەبوو ئەوسوپایە بەوشێوەیە بهێڵێتەوە، تەنها بە پرۆسەیەکی داگیرکاری فراوان نەبێ، تا لەدەسکەوتەکانی، خەرجی هێرشە داگیرکاریەکانی ڕابردووی بداتەوە،بەتایبەتیش کەئەو هەموو زەویەکانی پادشایەتی کردە بارمتەی قەرزەکانی، بۆیە هەلومەرج گونجاو بوو بۆ بەدیهێنانی ئەوەی بیری لێدەکردەوە[٤١٠]بە پێداتگرتنیشی لەسەر کشان بەرەو ڕۆژهەلات،

---

[٤٠٧] تاريخ ايران ازاغاز تااسلام، ص٢٦٩.

[٤٠٨] حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان يا تاريخ مفصل ايران قديم، (تهران:١٣٨١)، چ٢، ص١١٩؛ مؤلف مجهول: الناجحون الاسكندر فاتح العالم القديم، ص٤٠.

[٤٠٩] تالنت: گەورەترین یەکەی نەختینەیە کەگریك ناسیویەتی بەناوی (وزنة)کراوەتە عەرەبی بەهاکەی ٣٦٠٠لیرەی سوریە (بسام العسلي :الاسكندر الكبير المقدوني ،ص٨١،هامش )محمود فهمی بە(٥٦٠٠)فرەنك ی لێکداوەتەوە: اليونان، ص٨٤، هامش ١،سەرچاوەیەکی تریش بە(٢٥٠یان٣٤٠)جونەیهی نووسیوە، کە یەکەمیانی بەلاوە گونجاوترە: زينفون: حملە عشره الاف، ص١٦٥ هامش ٢؛(حسن پيرنياش )له تاريخ ايران قبل ازاسلام ، ص١٢١هامش٢ ، بۆ هەر تالنتێك ١٢٠٠ تمەنی دیاریکردووە.جێی باسە کە کێشی ( ١تالنت=٦٠منا=٣،٣٠كلغم): حسن النجفي: الشيقل اُصله واستعمالاته، (سويسرا:١٩٨١)، ص٥٥.

[٤١٠] اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ص٤٣١-٤٣٢.

دەردەکەوێ کە دەستگرتن بەسەر خەزێنەکانی ئەو ناوچەیە کرابێتە ئامانج، سەرچاوەیەکیش ئاماژە بەوە دەکات کەیەك لەئامانجەکانی ئەسکەندەر بەهرەمەندبوون بووە لەداهات ودەوڵەمەندی ناوچەکە[٤١١]. وتراوە کە دەوڵەمەندی ئەوێ (دڕکی چاوی گریکەکان بوو)[٤١٢] ئەمە لەکاتێکدا کەهەم گریکەکان لەکۆنەوە بەتایبەتیش دوای پێشکەوتنی دەریاوانی ، لەڕێی داگیرکاریەکانیان لەئاسیای بچوك وپەیوەندیە بازرگانیەکانیان، بەگەلانی ڕۆژهەلآت گەیشتوون وشارەزای بارودۆخی ولآتە بیانیەکان ببوون و هەستیان بەبوونی پێدەشتە فراوان وبەروبومە زۆرەکەیان کردبوو[٤١٣]، هەم ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیش هەڕەشە بوو بۆ سەر بەرژەوەندییە بازرگانیەکانی گریك[٤١٤].

مادام فاکتەری ئابوریش لەجیهاندا ڕۆڵی پاڵپشتی فاکتەری سیاسی دەبینێ هەردووکیان کار لەیەکتر دەکەن [٤١٥]، لەبەرئەوەش کە ئامانجەکانی داگیرکەر بریتیە لەدەستبەسەرداگرتن و زاڵبوون بەگشت واتایەك کەلێی دەخوێنرێتەوە، جا ژێردەست کردنەکە هەر جۆرێك بێت..ئەوە دەستبەسەرداگرتن ودادۆشینی ئابووری، دەبێتە بنەمای ئەو پرۆسانە و لەکۆتاییدا وەك ئامانجێکی زەقی داگیرکاری خۆی نمایش دەکات.

ڕەنگە دەستکەوتی زۆر و گرانبەهای شەڕەکانی گرانیکۆس وئیسۆس -دواتر لێیان دەدوێین-و داگیرکردنی ناوچەکانی تر و لاوازی بەرگری ئێرانیەکان، بووبێتە هۆیەکی دنەدەر بۆ شەڕێکی یەکلاکەرەوە و دەستکەوتنی سامانی زیاتر[٤١٦]، هەروەك چۆن هەندێك مێژوونوس بڕوایان وایە، کەهۆکاری ڕاستەقینەی هاندەری ئەسکەندەر بۆ ئەو هێرشە، لەدەستکەوتنی زەوی تازەدا خۆی حەشارداوە[٤١٧].(بلوتارك)یش وتویەتی یۆنانیەکان کە بۆ یەکەمجار تامی موچەی زێڕ و زیو و جوانی ژنانی ڕۆژهەلآتیان چەشت، لەوەودوا بەشەوق وگەرموگوڕی و بەهەموو ڕێگایەکدا

---

[٤١١] محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج٣، ص٩.

[٤١٢] حسين الهي: اسكندر مقدونی بچه تباه تاريخ، ص١٢٢.

[٤١٣] محمد كامل عياد: اليونان، ص١٢٤.

[٤١٤] حسين فهد حماده: موسوعة الاثار التاريخية، الاسكندر الكبير، (عمان: ٢٠٠٣)، ص١٠.

[٤١٥] سيد احمد الناصري: قضية التاريخ القديم، ص٤٧.

[٤١٦] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر دەستکەوتەکانی شەڕی ئیسۆس ودەستگیرکراوەکان بڕوانە: حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١١٨٦-١١٨٧.

[٤١٧] بڕوانە: عبدالمنعم الهاشمي:تاريخ العرب العصر الجاهلي، (بيروت: ٢٠٠٦)، مج١، ص٣٥.

دەچوون، تاسەرێك لەسەروەت وسامانی ئەخمینیەكان هەڵكەن[٤١٨].بەتایبەتیش كە دەستكەوتی یەكەم شەڕی ئەو لەشكركێشیەیان بۆ وڵاتی گریك بەڕێكردەوە و ئەسكەندەر و تەواوی میللەتانی گریك، جگە لەسپارتە، دەستكەوتی جەنگی ئاسیایان وەرگرت[٤١٩].گوتراوە كە دارای سێیەم لەشەڕی ئیسۆسدا باری شەش سەد ئێستر و سێ سەد وشتری شت لەگەڵ خۆیدا هێنابوو[٤٢٠] سوپای ئەسكەندەر دەستیان گرت بەسەر بڕی سێ هەزار كوپەی پڕ لەزێڕ، لەكاتێكدا، كە كۆی بەرهەمی ساڵێكی دوكانی زێڕی یۆنان، هەزار كوپە زیاتر نەدەبوو[٤٢١] و سوپاكەشی لەچاو سوپای ئامادەكراو بۆ شەڕی گۆگمێلا وئەزموونی شەڕیشی لەگەڵ گریكەكان، كەمتربوو و پێشی وابوو سەردەكەوێ، دەبێ لای یۆنانیەكان ئەوجارە گومانی چەند شت كرابێ كە لەگەڵ خۆیدا هێنابێ ؟

لەلایەكی تریشەوە ملكەچ كردنی وڵاتی شام لەنێویشیدا دیمەشق، بارگرانیەكانی ئەسكەندەری چارەسەركرد، چونكە دیمەشق زۆر كۆگای جەنگی ئەخمینی لێبوو[٤٢٢].ئەمەجگە لەوەی كەئەسكەندەر لەداگیركردنی میسر سامانێكی وای دەستكەوت، كەزیانی شەڕەكانی پێ پڕكردەوە دەرفەتیشی دایە، كەبەدوای تەواوكردنی داگیركاری ئاسیا بكەوێت[٤٢٣].واتا ئەو بە(سامانی میسر)و(ڕێگای ئازاد)ی نێوان ئەو سەرزەمینە و وڵاتی هیلاد(گریك)ومەكدۆنیا، لەڕۆیشتن لەسوریاوە بۆ وڵاتی میسۆپۆتامیا (دۆڵی ڕافدەین) لە(٣٣١پ.ز) پشت ئەستور بوو[٤٢٤].

پێدەچێ نەریتی پادشاكانی فارس وخانەدانەكانیش، كە لەڕازاندنەوەی خەیمەكانیان بەزێڕو زیوو ومێز و تاقم وكەلوپەلی خۆشتن وكاسە و كەلوپەلی خواردنی بەنرخ وجۆرەها فەرشی گرانبەها ،

---

[٤١٨] السير :ج٣، ص١٢٧٦؛ هەروەها بڕوانە: حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١١٨٧.

[٤١٩] البرماله: تاريخ البرماله، ص٣٠٢.

[٤٢٠] ويل ديورانت: قصة الحضارة، (القاهرة:١٩٦٥)مج١، ج١، ص٤٥٨.

[٤٢١] هارولد لمب: ئەسكەندەری مەكدۆنی، وەرگێڕانی عەلی ئەكبەر مەجیدی ، (سلێمانی :٢٠٠٦)،ل١١٠.

[٤٢٢] طه باقر: ايران قديم، ص٧٨.

[٤٢٣] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ص٢٠٩.

[٤٢٤] ا. برگر وديگران: جهان باستان، ج٢، ص٢٥٠.

بەدیاردەکەوت، و لەگەڵ خۆیاندا بۆ هێرشە سەربازیەکان دەیانبرد[٤٢٥] بەشی خۆی کاریگەری هەبوویێت لەسەر ئیرەیی بردن وئارەزووی ئەسکەندەر وفەرماندەکان بۆ گەیشتن بەو سەڵتەنەتە.

وتراویشە، کەچادری شاهانشای ئێران پڕبوو لەکەلوپەل وشتومەکی (اثاث)ی گرانبەها، کەلەجەنگی ئیسوس کەوتە دەست ئەسکەندەر کاتێك گەنجینە و گەرماو و دەفەر وعەتردان وقاپ و قاچاغی جوانی بینی و لەبلندی و گەورەیی و شکۆ و شتی ڕازاوە و فەرش ومێزی نانخواردن ڕاما، سەریسوڕماو وتی (پادشایەتی ئاوا دەبێت!)[٤٢٦].

بۆیە هەندێك لەمێژوونوسان مەسەلەی تۆڵەسەندنەوە وکۆتایی هێنان بەدەستێخستنی ئەخمینیەکان لەکاروباری گریکدا، بەلایەنی(دیار)ی لەشکرکێشیەکە دەزانن، کرۆکی ئارەزووی گرتنی جیهان لەلایەن ئەسکەندەرەوە، سەرچاوەی سەرەکی ئەو ئارەزووە، بەزێڕی گەنجینەکانی ئێران وسامانی مەمالیکەکانی ڕۆژئاوا دەزانن[٤٢٧].

ئەگەرچی مێژوونوسە هاوچەرخەکانیش، لەبارەی ئاستی بەهەندگرتنی پاڵنەرەکانی هێرشی ئەسکەندەر بۆ ڕۆژهەلات ڕای جیاوازیان هەیە، بەلام هەموویان هاوڕان لەپێشخستنی دووپاڵنەر کەیەکیان مادی ئەویتریان زانیاری (مادی ومعرفی[٤٢٨])یە[٤٢٩].

لەنووسینی مێژوونوسەکانی سەردەمی ئیسلامیشدا، لەمیانەی چەند گێڕانەوەیەکی جۆراوجۆر بەچاوپۆشین لەتێکەلاوبوونی بابەتە مێژووییەکان بەشتی هەڵبەستراو و ئەفسانەوی، بەدیوێکی تردا جەخت لەسەر هۆکاری ئابووری کراوەتەوە و وەك تاکە هۆکاری شەڕی یەکلاکەرەوەی نێوان داراو ئەسکەندەر سەیری دەکەن، ئەوان وایان نوسیوە، کەوا باوبووە پادشاکانی پێش ئەسکەندەر سالانە مالیاتیان داوەتە دەوڵەتی ئەخمینی، بەلام کەئەسکەندەر هاتۆتە سەرتەخت ئەومالیاتەی بڕیوە و لەسەر ئەوەش نێوانیان تێکچووە و لێیان بۆتە شەڕ، بلاوترین زانیاری باس لەوە دەکات،

---

[٤٢٥] جماعة من علماء الاثار السوفيت: العراق القديم دراسة التحليلية للاحوال الاقتصادية والاجتماعية، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، (بغداد:١٩٧٦)، ص٤٥٧.

[٤٢٦] البرماله: تاريخ البرماله ص٣٠٢-٣٠٣.

[٤٢٧] حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل از اسلام، ص١١٦ عبدالعضيم رضائى: تاريخ ده هزار ساله ايران، ج١، ص٣٠٢.

[٤٢٨] مەبەست لە زانیاری پشکنینی جوگراف و گەشەکردنی زانست وشارەزابوون بوو لە بارەی بیروباوەڕ و دابونەریت ومێژووی ژیان و...هتد،ی خەڵکی ناوچەکانی دەرەوەی گریك.

[٤٢٩] حسين فهد حماد: موسوعة الاثار التاريخية، ص٢٣-٢٤.

کەماڵیالتی ولاّتی ئەسکەندەر هێلکەیەکی زێڕ بووە و ئەسکەندەر لەوەلاّمی داوای دارادا، بۆ ناردنی هێلکە وەك پێشوو بوتوویەتی کەئەو مریشکەی هێلکەکەی دەکرد مردووە، پاشان دارا لەگەڵ گۆچانێك و تۆپێك و هەندێك کونجی دەنێرێت و کە مەبەستی پێی ئامۆژگاریکردن و هەڕەشە دەبێ، دەیەوێ پێی بڵێ کەئەوجارێ منداڵە پێویستە لەجیاتی سیاسەت، یاری بەتۆپ و گۆچانەکە بکات، کونجیەکەش ئاماژەبوو بۆ سوپای زۆر کەلەکاتی سەرپێچی ئەسکەندەر بەکاریدەهێنێت، کەچی ئەو کونجیەکە بەنیشانەی بەپیتی ئێران وگۆچان وتۆپەکەش وەك نیشانەی وەرگرتنی دەسەلاّتی هەموو جیهان لێکدەداتەوە، ئیتر پەیوەندیان تێکدەچێت ودەبێتە شەڕیان، دارا لەلایەن دوو هاوکاری خۆیەوە دەکوژرێت و ولاّت دەکەوێتە ژێردەستی ئەسکەندەر[٤٣٠] ژیاننامەنوسێکیش ئاماژەی بەشتێکی لەوجۆرە کردووە[٤٣١] هەرچەندە ئەم زانیاریانە لەسەرچاوە کۆنەکانی یۆناندا نین، هیچ ئاماژەیەکی مێژووییش لەگۆڕێدا نیە، ڕاستی ئەم گێڕانەوانە وەکو باسکراون بسەلمێنێ، بەلاّم بەگشتی دەرخەری ڕۆڵی ئابووری وکۆمەلاّیەتیە لەهەلگیرسانی شەڕی گۆگامیلادا.

(علي ظريف الاعظمي)یش لەمیانەی باسکردنی هەلکەوتنی عێراق وچاوتێبڕینی لەلایەن داگیرکەرانەوە دەیەوێ پێمان بلێ، کەباردۆخە ئابووریەکەی عێراق هۆیەکی کاریگەری شەڕی گۆگمێلا بووە[٤٣٢].

---

[٤٣٠] الطبري: تاريخ الطبري تاريخ الرسل والملوك، مراجعة وتقديم صدقي جميل العطار، ج٢، ص٩-١٠؛ ابن الاثير: الكامل في التاريخ، تحقيق ابي ال فداء عبدالله القاضي، (بيروت:٢٠٠٣)، مج٢، ص٢١٥؛ ابن المستوفي القزويني، تاريخ گزيده، (تهران:١٣٦٢)، ص٩٦.

[٤٣١] فوكس ويبرن: الاسكندر الاكبر، ص٤٢-٤٣.

[٤٣٢] تاريخ الدول اليونانية والفارسية في العراق، (پورسعيد،الظاهر:دت)، ص٤.

## تەوەرەی چوارەم

## هـۆکاری تـر

لەپاڵ ئەوشتانەی باسکران، گەلێك مەسەلە وهۆکاری تریش هەبوون کە وەك کارەکتەری گرنگ ڕۆڵیـان هـەبوو، لـەوەی پەیوەنـدی نێـوان گریـك وئەخمینیـەکان بـەو ئاماجـە بگەیـەنن،یانیش هاندەربوون بۆ زیـاتر سـووربوونیان لەسـەر بـەدیهێنانی خواسـتە بـەئامانج گیراوەکـان، زۆرتـری ئەوانەش کەدەمانەوێ لەو تەوەرەیەدا لێیان بدوێین، یان پەیوەندیان بەدنیابینی وتێڕوانینی خودی ئەسـکەندەرەوە هەیـە، یـانیش دیـد و بۆچـوون ونـەریتی بـاوی کۆمەڵگاکـە لێـی خواسـتوە و ئەسـکەندەریش لـەپێناو گەیـشتن بەئامانجـەکانی، لـێ لادانـی بەپەسـند نـەزانیوە و لەمیانـەی ملدانیش بۆ خواستەکانی ئەوان، نیشانەکانی خۆی پێکاوە بۆیە پێویـستە بەر لەهەر شت بـزانین کەئەسکەندەر دایك وباوکی شازادە بوون بەهۆیەوە لەژینگەیەکی خۆشدا پێگەیـشتوە و باشـترین ڕێگای ژیـان و پـەروەردە و چـاودێری و باشـترین ڕێگـای فێرکردنـی بـۆ فەراهـەمکراوە، لەسـەر دەستی ئەرستۆ، بەناوبانگترین فەیلەسوفی سەردەمی خۆی خوێندویەتی و لەباوکیشیەوە هونـەری جەنگی وەرگرت ولەتەمـەنی شانزە ساڵیشەوە لەوبوارەدا تاقیکراوەتەوە[٤٣٣].

واتا پەروەردەی گریکی لەسەردەستی فلیپی باوکی، کـەپیاوێکی زۆر ڕۆشـنبیر بـووو ئەرسـتۆی مـامۆستای وەرگرت، کەئەو هەر بەوەندە وازینەهێنا کەزانیاریەکانی پێببەخشێ، بـەڵکو لەسـەر خۆشویـستنی شارسـتانیەتی هیلـینی وهـەژمورنی (هیمنـە)ی بەسـەر گـشت وڵاتـی گریکـدا، ڕایهێنـاو چـاو لـەدووی (طمـاع)ی ئیمپراتۆریـایش وەك پەتایـەك دەوری فلیپـی گرتبـوو ئەسکەندەریشی گرتەوە و بوو بەئاواتێکی گەورە بۆی[٤٣٤]

لـەوبارەوە وتـراوە کەهـەر لەگـچکەییەوە بەپەروەردەیـەکی تایبـەتی وا پـەروەردەکرا، کـەهیچ پاشـایەکی مـەکـدۆنی نـەیبینیوە بەتایبـەتی لەلایـەنی زانـستیەوە[٤٣٥]، ئەمـەش وای لێکردبوو

---

[٤٣٣] خالد عبداللاه: عظماء ومشاهير صنعوا التاريخ، (الجيزة:٢٠٠٤)، ص٩٦.

[٤٣٤] ف.دياكوف و س.كوفاليف: الحضارات القديمة، ج٢، ص٣٩٢.

[٤٣٥]محمد كامل عياد: تاريخ اليونان، ص١٤٩؛ حسين فهد حمادة: الاثار التاريخية، ص٢٣.

کەهەموو تواناکانی خۆی ئاراستەی شەڕ وحکومەت و دۆزینەوەکان بکات[٤٣٦]. هێندە متمانەی بەتوانست و باڵاتری شارستانیەتی یۆنان لەچاو شارستانیەتەکانیتر هەبوو، کەهیچ کەمایەسیەکی تێدا نەبینیوە، بۆیە نیازی وابوو کە" ڕەنگی گریکیانە بکاتە بەر هەموو جیهان ولەڕێی بڵاوکردنەوەی خەڵکی یۆنانی ومەکدۆنی، ئەوروپا و ئاسیا تێکەڵ بەیەك بکات[٤٣٧].

هەر ئەو سەرسامیەی دەستگرتنی بەرۆشنبیری و زانستەکانی ئەو شارستانیەتە و هەوڵی بڵاوکردنەوەی لەهەموو ناوچە داگیرکراوەکاندا، بوو بەئامانجێکی جێگیر، خۆشویستنیشی بۆ زانست کەلە سەرچاوەی ڕوونەوە(صافی)وەریگرتبوو، وایلێکردبوو، کە فەیلەسوف وزاناو مێژوونوس وشاعیر وکارزان (خبیر)لەزانستە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتی بەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوە، بۆیە ئەگەر داگیرکاریەکە، سروشتی زانستی لەهەندێك ڕواڵەتدا پێوە دیاربێ، چاکیەکەی بۆ ئەرستۆ دەگەڕێتەوە، کە ئاسۆی بیری فراوانکرد[٤٣٨].

دەگوترێ ئەسکەندەر بوێر و ئازا بووە، حەزی بەسەرکەشی کردووە، هەردەم لەهەوڵدا بووە لەپێناوی دۆزینەوەی زانیاری وشارەزایی لەبارەی جوگرافیاو ناسینی میللەتە نەناسراوەکانی سەردەمی خۆی[٤٣٩].

هەڵبژاردنی دەستەیەك لەفەیلەسوف ومێژوونوس وئەندازیار و هونەرمەند و پیاوانی تری زانست وئەدەب، تابەشداری لەشکرکێشیەکە بکەن[٤٤٠]و ماندوونەبوون لەپێشڕەوی کردن وهەوڵەکانی پشکنین و زانینی نهێنی دیاردە سروشتیەکان،- کەلەمیانەی ئەنجامەکان لێی دەدوێین- بەڵگەن لەسەر پێداگری و هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی شارستانیەتی گریك وفراوانکردنی زانیاری و دۆزینەوەی زانستی، کەئەوانەش ئامانج گەلێکن، لەژێر سایەی دەسەلاتێکی یەکجەمسەریدا نەبێ نایەنەدی، ئەو دەسەلاتەش

---

[٤٣٦] اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ص٤٣١.

[٤٣٧] جايمس هنري برستد: العصور القديمة وهو تمهيد لدرس التاريخ القديم واعمال الانسان الاول، ترجمة داود قربان، (بيروت: ١٩٢٦)، ص٣٠٥.

[٤٣٨] الاب متوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٣٩.

[٤٣٩] موعتەسەم ساڵەیی: تێپەڕینی لەشکری ئەسکەندەری مەکدۆنی بە کوردستاندا، گۆڤاری کرکوك٣٠ژمارە(٢)، ساڵی هەشتەم، ٢٠٠٦، ل١٠٦.

[٤٤٠] البرت تن إيك اومستد: تاريخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٦٨٤؛بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٥٨-٥٩.

بەلابردنــی کۆسـپەکانی ســەر ڕێ، فەراهـەم دەبێت کـەخۆی لەمانـەوەی دەوڵـەتی ئەخمینیـدا دەبینێتەوە، لەناوبردنــــی ئەودەوڵەتەش شەڕێکی یەکلاییکەرەوەی گەرەك بوو.

لەسەرچاوەکاندا هاتووە، کەبەدەگمەن وابوو ئەسکەندەر بۆ ڕێکخستنی کاروباری مەملەکەتێکی نوێ بوەستێ و پشتگیری بکات، بەڵکو هەروەك حەزێکی خۆش بۆ گەیشتن بەوپەڕی جیهان پاڵی بنێ، پێشڕەوی دەکرد ودەیەویست بگاتە ئـەو شـوێنانەی بـۆ گریکـەکان نـامۆبوون، تۆمـارێکی وردیشی دانابوو بۆ تۆمارکردنـی زانیـاری جۆراوجـۆر لەســەر ژیانــی دانیشـــتوان و ڕووەك و ئاژەڵی ناوچـەکان و ناردنەوەی بـۆ وڵاتــی گـــریك[441]، خۆشـــــی لـە بیرەوەریەکـــانیدا بـاس لەئارەزووی پشـــکنینی ئۆقیانوســەکان و گەیشـــتن بە دوورتریــــن ئـەو خاڵانــــە دەکـــات، کــــە مـــرۆڤ دەتوانــــێ پیـــێ بگـــات[442]، واتــا حــــەزی بەدۆزینــــەوە و پـەیبردن بەشتە نادیارەکـــان کـردووە و وەکـو دۆزینـــەوەی نــوێ لەداگیرکاریيـــەکانـــی ڕوانیـــوە.

ئەوخۆی بەهەڵگری پەیامی فەرهەنگی یۆنـانی بـۆ جیهـان دەزانـی، ئـەو فەرهەنگـە کەئاسـۆی زۆربەی یۆنانیەکانی لەچوارچێوەی دەوڵەتـە شـاردا، سـنووردار کردبـوو[443] و ئـەو ژمـارە زۆرەی زانایانی یۆنانی کەلەگەڵ ئەسکەندەر ڕۆیـشتنە ئاسـیاو لـەبینینی هەلومـەرج و بـارودۆخی ئـەو پانتاییـەی دنیـا ئاگـایی نوێیـان بەدەسـتهێنا، وەك چـۆن ئاسـۆی بـیری ئەوروپایـەکان، پـاش دۆزینەوەی ئەمریکا فراوان بوو[444].

یەکێکی تر لەوانەی هانی ئەسکەندەریاندا بۆ سووربوون لەسـەر کۆتـایی پێهێنـانی دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـــەتی ئـــەخمینی، کەلـــە شـــەڕی گۆگـــامێلادا بەرجەســـتە کـــرا، دروســـتکردنی ئیمپراتۆریەتێك- بوو کە تائەوپەڕی سنوور، درێژببێتەوە و، هەموو گـەلان لـەژێر سـێبەری یـەك تـالآدا ڕێکبخـات[445]، ئـەوەش لـە بـیری جیهـان نیـشتمانی(کۆسمۆپۆلۆتیـك)ی (دیـوجین)ی فەیلەسـوف و بـەکردەوە نیـشاندانی کۆتـایی هـاتنی ئایـدۆلۆژیای دەوڵەتـە شـار وتێـڕوانینی

---

[441] هارولد لمب: الاسكندر المقدوني، ترجمة عبدالجبارالمطلبي ومحمد ناصر الصائغ، مراجعه محمود الامين، (بغداد:١٩٦٥)،ص١٥١؛ دونالد ولبر: ایران ماضيهاوحاضرها، ص٣٧.

[442] نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص١٣٦.

[443] راس.ئي دان وديگران: تاريخ تمدن وفرهنگ جهان، ص٢٦٩.

[444] سير برسـی سـايكس: سـفرنامه يـا دههـزار ميـل درايـران، ترجمـه حـسين سـعادت نـوری، (تهران:١٣٣٦)، ص١٩٨-١٩٩.

[445] مؤلف مجهول: الناجحون الاسكندر فاتح العالم القديم، ص٩٠.

جیهانیانـەی خۆیـدا، سەرچـاوەی گرتبـوو کەپێـشتر ئاماژەمـان پێـدا. بەمـەش لەدیـدی یـەکێك لەنووسەرەکاندا بووەتە یەکێ لەیەکەمین پیاوانی دەوڵەتی، کە بەبیرکردنەوەیەکی جیهانیانە بـیری کردۆتەوە[٤٤٦].

بێگومان سەرهەڵدانی وەها بیرکردنەوەیەکیش، بێ ڕیشە نیـە و سەرچـاوەی جۆراوجـۆری هەیـە، لەوانە، بیری پاڵەوانیەتی، لەڕاستیدا بەسەرنجدان لەوباس و تێبینیانەی لەبارەی خولیـاو تێـڕوانین لەهەوڵ وتواناکانی ئەسکەندەر، کەلەلایەن مێژوونووس وژیاننامە نووسانەوە ،ئامـاژەی پێکـراوە بەبەراوردکردن لەگـەڵ بیـروڕای ئەوانـەی جـەخت لەسـەر ڕۆڵـی تاکەکـەس (پاڵـەوانان) دەکەنـەوە لەدروسـتکردنی مێـژوو و یەکلاکردنـەوەی ڕووداوە مێژووییەکانـدا ، بۆمـان دەردەکـەوێت، کەفیکرەی پاڵەوانانەی لەسەردا بـووە وەك پاڵـەوانێك لـەخۆی ڕوانیـوە ئەمـەش وەك هۆیـەك بـۆ شەڕکردن –لەنێویاندا شەڕی گۆگامێلا-هانیداوە.

لەتـــەوەرەکانی پێـــشتر باســـی ئەوزەمینـــە لەهـــەموولا ڕەخـــساوەمانکرد ،کەوەك پێویستیەك(ئەسکەندەر) پێشتریش (فلیپ)ی باوکی، تیایدا جڵەوی دەستەلآتیان گرتەدەست و لەشکرکێشیەکەش، کە بڕیاری ئەنجامدانی درا، وەك خواستەکانی خـەڵکی گریـك دەردەکـەوت، بۆیە پشتگیریان دەکـرد، کەبەگوێرە یـەك لەسەرچاوەکان دەستپێکردنی پرۆسـەیەکی لـەوجۆرە پێشتر نموونەی نەبووە[٤٤٧] بۆیە داهاتوویەکی ڕوونی لێ چاوەڕوان دەکرا.

لای(تۆمـاس کارلایـل[٤٤٨])پاڵـەوان دەرەنجامێکی سروشـتی و پێویـستی ڕەگـەزی پاڵـەوانیتی شـاراوەی نـاو ئـەو گەلەیـە، کەتیایـدا سـەرهەڵدەدات و شـێواز و پێـشوازی و وەلآمدانـەوەی (اسـتجابە)ی ئـەو گەلـەش بـۆ کـردەوەی مێـژوویی پاڵەوانەکـە، ئاماژەیـە بـۆ ڕادەی بـەتوانایی لەبـەدیهێنانی دەسـتکەوتە شارسـتانیەکاندا[٤٤٩]. ئەوکەسـایەتیە قارەمـان بەدەسـتپێکەران ناودەبات ...پێی وایە کەسێکی گەورە دەستپێکەرێکە، چونکە لەوانیتر دووربینترە، لەدیدی ئەودا

---

[٤٤٦] الاب میتودیوس زهیراتی: الاسکندر الکبیر، ص٧٩.

[٤٤٧] چون جنتر: الاسکندر الاکبر، ص٥٥.

[٤٤٨] تۆمـاس کارلایـل ١٧٩٥-١٨٨١ بەیـەك لـەدیارترین ئـەو نووسـەر و بیریارانـە دادەنرێـت کـە بە(حماس )وزیادەڕۆیی لە ڕۆڵی پاڵـەوان وپیـاوانی گـەورە لـە دروسـتکردنی ڕووداوی مێژووییـدا داکۆکی و پێداگری دەکات: هاشم یحیی الملاح واخرون: دراسات في فلسفه التاریخ، ص١١٩.

[٤٤٩] گیـــورگی بلیخـــانوف: ڕۆڵـــی تاکەکـــەس لـــە مێـــژوودا، وەرگێڕانـــی ســـەلام مارف،(سلێمانی:٢٠٠٥)، ل٨٣.

پیاوی گەورە کەسێکە، کە بە تواناکانی، داهێنانی میللەت دەتەقێنێتەوە و لەژیانیدا، بەکاری گەورە هەڵدەستێت، کەلەبیری خەڵکیدا دەمێنێتەوە[٤٥٠].

ئەوەشی لەدروستکردنی ئەو ئیمپراتۆریەتە بەدیدەکرد، کەبە لەناوبردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەخمینی مەیسەر، دەبوو لەشەڕی گۆگمێلادا خۆی نواند.

بۆیە دەبینین تەنانەت بەدابەشکردنی وڵاتی ئەخمینی لەگەڵ دارا، کە لەپێشنیارەکانی ئەودا بۆ ئاشتی ئاماژەی پێکرابوو -پێشتر قسەمان لێکرد-ڕازینەبوو، تەنانەت پارمنیون بۆ سوپاکەی ڕوونی کردەوە، کە ئەگەر ئەسکەندەر ئەو پێشنیارە باشەی قبووڵ کردبا بەدڵخۆشی لەتێشکانێك کەرەنگە توندوتیژبێ ،خۆمان دەپاراست ، کەچی ئەسکەندەر ڕەتی کردەوە[٤٥١].

تۆماس کارلایل وێنەی مرۆڤی شێوە خوایی بەپاڵەوانەکەی بەخشیوە و بڕواشی وابوو، کە هەڵبژێردراوی چاودێری خودایی (العنایە الالهیە)یەو ئامرازێکیشە بەدەست ئەوەوە[٤٥٢]. ئەوەش بەزەقی لەمەسەلەی خۆ بەخوازانینی ئەسکەندەردا بەدیدەیکرێ کەلەشوێنی خۆی لێی دەدوێین، لەزۆر هەڵوێستیشدا، ئاماژەی بەچاودێری خودایی (العنایە الالهیە)کردووە.

بەگوتەی (یوزف یوسهوفر)ی مێژوونوس" ئەسکەندەر لەئاسیای بچوك خۆی وەك بەرگیرکار و پارێزەری ئاشتیو ڕێکوپێکی ناساند، لەونامەیەش کەپاش نەبەردی ئیسۆس بۆداریوشی ناردووە خۆی وەك داواکاری تاج وتەختی ئەخمینیان، داناو(دارای سێیەم)ی بانگکرد کەئەگەر شایەنی تەختی پادشایەتیە، با بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی بجەنگێ، ئەو دارای تاوانبارکرد بەوەی کە بەناهەق هاتۆتە سەر تەخت و بەپاشایەکی نایاسای لەقەڵەمدا سەرکەوتنی خۆشی بەبەدیهاتو لەئیرادەی خواوەند زانی، ئەویش بەمەبەستی پشتگیری خودایی شاهەنشایی خانەوادەی ئەخمینی[٤٥٣].

لەسەرچاوەکانی تریش داهاتووە، کەئەسکەندەر هەمیشە وابیری دەکردەوە کە کەسایەتی ئەو بەهرەمەندە لەپشتگیری وچاودێری ئاسمانی تایبەت (العناية السماوية الخاصة)، وایدادەنا

---

[٤٥٠] مفيد كاصد الزيدي: المدخل الى فلسفة التاريخ، (عمان:٢٠٠٦)، ص٧٥.

[٤٥١] ويل ديورانت: قصة الحضارة، ترجمة زكي نجيب محمود،مج١، ج١، ص٤٥٩.

[٤٥٢] توماس كارلايل: الأبطال،ترجمة محمد السباعي ،(القاهرة:د.ت)ص١٣-٢٥؛ هاشم يحيى الملاح واخرون: دراسات في فلسفة التاريخ، ص١٢٠.

[٤٥٣] ايران باستان ، ص١٤١.

کەپەیوەندیەکی تایبەتی بە(ئامون)[٤٥٤] ەوە بەستویەتەوە و هێرشەکەشی جۆرێك لەڕاسپاردەی خودایی وچاودێری خودایی (العنایە الالهیە)یە، ئەو بۆ جێبەجێ کردنی، ڕەوانەی کردووە[٤٥٥].

ماکس فیبەر(١٨٦٤-١٩٢٠)یش پێی وایە، کەمێژوو لەڕەوتی بەرەو پێشچوونی خۆیدا هەمیشە لەسەر هێڵێکی ڕاست ناڕوات، کەخەڵکی بێگرفت مومارەسەی ژیانی ئاسایی خۆیان بکەن، بەڵکو حاڵەتی وای تێدەکەوێ کەگەل دوچاری ناهەمواری ژیان وستەم وناجێگیری وبێ بەشبوون و ئیستیغلال کردن دێت وچاوەڕوانی فریاد ڕەسێك دەکات، تالەو بارودۆخە ناخۆشە ڕزگاریان بکات، لەوجۆرە حاڵەتانەدا چاودێری خودایی (العنایە الالهیە) پاڵەوانێك ڕەوانە دەکات کەئەو ( بەکاریزما ) ناویدەبات و مانای (دیاری خوا) دەگەیەنێت و بۆ ڕزگارکردنی میللەتەکە هاتووە، پاڵەوان لەدیدی ئەودا کەسێکی بەهرەمەندە لە کۆمەڵێك تایبەتمەندی کەلەخەڵکی تردا نین،خەڵکی لەدەوری کۆدەبنەوە و پشتگیری دەکەن وخۆیان دەکەنە قوربانی ئەو بەهای بالاَ (قیەمی بالاَ)یە کەئەوبۆی هاتووە، ئەویش پێویستی بەپشتگیریان هەیە، پشتگرتنو لەدەورکۆبوونەوەی خەڵکیش بۆ پاڵەوان بەندە بەئەنجامدانی کاری گەورە و سەرسوڕهێنەر و بەردەوام بوون لەگەیاندنی ئەونامەیەی بۆی هاتووە[٤٥٦].

ئەوەش ڕێك ئەو بارودۆخەیە، کەگریك ومیللەتانی ژێردەسەلاَتی ئەخمینی تێیدا دەژیان ئەسکەندەریش وەك فریادڕەس، کەهەم گریکەکانی لەوقەیرانە هەمەلایەنە ڕزگارکرد کەبەهۆی کۆتایی هاتنی دەوری سیستەمی دەوڵەتەشار و ئەو شەڕانەش کەتووشی هاتبوون و...هتد هاتبۆ ئاراوە، لەنێو دەوڵەتەشارەکانی ئاسیای بچوك و لەمیسر و بابلیش وەك ڕزگارکەر، لەستەمی

---

[٤٥٤] الخفي –پەنهان – واتای ناوەکەیەتی لەبنچینەدا خواوەندی باشوری میسر بوو، بەلاَم کەپادشاکانی طیبە دەستیان بەسەر ولاَتدا گرت ئامونیش بوو بەخواوەندی پلەیەك کاهنەکانی بەشای خواوەندان (ملك الالهـە)ناویان دەبرد ودەیان ووت نوێنەرایەتی هێزێکی شاراوە دەکات، کەجیهانی دروستکردووە وپارێزگاری لێدەکات خۆریش کەجگە لەهێما بۆ ئەوهێزە هیچی ترنیە، پاشان ناوەکەی خرایە پاڵ ناوی( رع ) بەشێوەی (ئامونرع) ناوی کەوتە سەرزاران و بەرەبەش بوو بەخاوەنی خەسڵەتودەسەلاَتی خواوەندە گەورەکان. بەگەلێك ناوی وەك (الاله القدوس ،رب جميع الاله ،امون رب عروش العالم ... هیتر ) ناوی هاتووە : واليس بدج:الديانة الفرعونية، ترجمة نهاد الخياطة، (دمشق:٢٠٠٠)، ص١١٠-١١٤.

[٤٥٥] سير هارولد ادريس بيل: الهيلينية في مصر، ترجمة زكي علي، (د.م: د.ت)، ص٤٧-٤٨.

[٤٥٦] هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، (بغداد:٢٠٠٥)، ص٢٧١-٢٧٢.

ئەخمینیەکان پێشوازی لێکرا - لەباسی هۆکاری سیاسی ئاماژەی پێدراوە-و ئەویش خۆی بەرزگاریکەر دادەنا، نەك داگیرکار[٤٥٧].

ژمارەیەك لەمێژوونوسان جەخت لەسەرئەوە دەکەنەوە، کە(ئەرستۆ) حەماسەتی یەکێتی گریك وداگیرکاریە سەربازیەکانی خستۆتە عەقڵەوە[٤٥٨] و جگەلەوە خۆشی ئارەزووی ئەنجامدانی چالاکی گەورەی هەبوو، مێژوونوسەکان ئاماژەیان بەوەکردووە، کەئیرەیی بەباوکی دەبرد، کاتێك شوێنێکی داگیرکردبێ یان سەرکەوتنێکی بەدەستهێنابێ، بەگازەندەوە وتوویەتی کەئیتر کارێکی دیارو درەخشان بۆ من نامێنێتەوە کەئەنجامی بدەم .یان بەشێوەیەکی تر (باوکم هەمووشوێنێکی گرت ئیتر جێگایەك نەماوە کەمن بیگرم)[٤٥٩].

ئەوەی زیاتر حەزی بەپاڵەوانبوونی لەناخی ئەسکەندەردا پەرەپێدا تێگەیەنرانی بوو، لەلایەن دایکیەوە بەوە کە دەچێتەوە سەر ڕەچەڵەکی(ئەخیل[٤٦٠])ی پاڵەوانی یۆنانی داستانی جەنگی تەڕوادە، لەباوکیشیەوە بۆ سەر هرقلی نیوە خوای گریك دەگەڕێتەوە[٤٦١]. بەوەش کە لەڕێی مامۆستایەکەوە جیهانی گەورەی کتێبی بەڕوودا کرایەوە، فێری شێوازەکانی (چێژ)بوو کەلەڕێی عەقڵ و بیرکردنەوەوە بەدەست دێت، سەرنجی چووە سەر کتێبی (ئیلیادە)[٤٦٢]ی

---

[٤٥٧] بڕوانە: یان اسمان: مصرالقدیمة تاریخ الفراعنة علی ضوء علم الدلالة الحدیث، ترجمة حسام عباس الحیدري، (کولونیا:٢٠٠٥)، ص٤٣٥.

[٤٥٨] سامی ریحانا: المجتمعات العسکریة عبر التاریخ، ص١١١.

[٤٥٩] فئودور.ب.کورفکین:تاریخ یونان باستان،ص١٦٥؛راس ئي دان ودیگران:تاریخ تمدن وفرهنگ جهان،ص٢٦٤؛ چون جنتر:الاسکندر الاکبر،ص٢٨.

[٤٦٠] ئەخیل یەکەم پاڵەوانی ناوداستانی ئیلیادەیە و چەقی گشت ڕووداوەکانە،لای گریکەکان،بە بچوکترین پاڵەوان لە ڕووی تەمەن وبەڵام بەهێزترینیان دەزانرێت:نسطور ماتساس،مذکرات اسکندر الکبیر ،ص١٥٠ هامش ٢٢.

[٤٦١] حسن پیرنیا:تاریخ ایران باستان ،ج٢،ص١٠٩١.

[٤٦٢] گەورەترین داستانەلای گریکەکان ولووتکەی شیعر و بەناوبانگترین نموونەی شیعری داستانی(ملحمی)یە:نسطور ماتساس:مذکرات اسکندر الکبیر ،ص١٤٩هامش٢٢؛ ممدوح درویش مصطفی وابراهیم السایح :مقدمة في تاریخ الحضارة الرومانیة والیونانیة،ج١،ص٦٩.

هۆمـــیرۆس[٤٦٣] و زۆر کـاری تێکـرد، هـەموویان زۆربـەی ئەزبەرکـرد و سـەرسام بـوو بـە پاڵەوانەکانـی شـەڕی تەڕوادە و هەمیشە لەبیر و ئەندێشەیدا بـوون، بـەردەوام بەداستانەکانیدا دەچـووەوە و بەعیـشـقەوە دەیخوێنـدەوە، لەگـەڵ خـەنجەرەکەی لەژێرسـەری خـۆی دایـدەنا خەوخەیاڵیـشی هەرئـەوەبوو، کەببێـتە هاوتـای ئەخیلـی پاڵـەوان[٤٦٤]. تەنانـەت لـەنێو-دەستکەوتەکانـی شـەڕ لەگـەڵ داریـوش سـندوقێکی گـرانبەهای دەسـتکەوت و ویـستی باشـترین شـتی گرانبـەهای تێـدا هـەڵبگرێت و هەریەکـە لەدەوروبەرەکـەی شـتێکیان پێشـنیارکرد کەچی ئـەو تـەنیا بەشایەنـی ئیلیـادەی زانـی کەتێیـدا هـەڵبگرێت[٤٦٥]. ئیتر ئەخیـل لەزەینی ئەسکەندەردا نموونەی باڵای کردەوە پاڵەوانیەکان بوو، ئۆلمپـیای دایکیـشی بۆ بەردەوام بوون لەسەر کارەکـانی بـەوە هانیـدەدا کەئـەخیلی بـاپیری بەتێکۆشـانی لەڕادەبـەدەر گـەورەیی بەدەسـتهێنا[٤٦٦].ئەسـکەندەر ئیرەیـی بەئەخیلـەوە دەبـرد کەکەسێکـی وەك هۆمیرۆسـی دەسـتکەوتووە تـا چـیرۆکەکەی بهۆنێتـەوە[٤٦٧]. بۆیـەش دەبیـنین لـە میانـەی لەشـکرکێشیەکەیدا کاتێـك لـە هلـسـپۆنت (دەردەنێـلْ) دەپەڕێتـەوە لـەنزیك شوێنـی تەڕوادە دادەبەزێ و ڕێوڕەسمی شایستە لەسـەر گـۆڕی ئەخیـل و پاڵەوانـەکانیتر ئـەنجام دەدات و قوربانـی بـۆ گـیانیان پێشـکەش دەکـات[٤٦٨]. وتراوەکـە ئەسـکەندەر لەڕۆیـشتنی بـۆ

---

[٤٦٣] شـاعیرە ونووسـەری یەکـەمین و بـەناوبانگترین وکـۆنترین داسـتانەکانی مێـژووی گریکـە و بەرهەمـەکانی (ئیلیـادە و ئۆدیـسا) ڕوخـساری قۆناغـەکانی یەکـەمی مێـژووی گریـك نیشاندەدەن:ممدوح درویـش مـصطفى؛ ابـراهيم الـسايح :مقدمـة في تـاريخ الحـضارة الرومانيـة واليونانية،ج١،ص٥٦.

[٤٦٤] البرماله: تاريخ البرماله، ص٣٠٠؛ چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص٢٩-٣٠.

[٤٦٥] بلوتارك: السير،ج٣، ص١٢٧٨.

[٤٦٦] هارولد لمب: الاسكندر المقدوني، ص٣٩.

[٤٦٧] ويل ديورانت: ابطال من التاريخ، ترجمة سامي الكعكي وسميركرم، مراجعة عمـر الايـوبي، (بيروت:٢٠٠١)، ص١٢٩.

[٤٦٨] حـسن پيرنيا: تـاريخ ايـران باسـتان، ج٢، ص١١٢٠- ١١٢١؛ البـرت تـن ايـك اومـستد: تـارخ شاهنشاهی هخامنشيان، ص٧٠٧-٧٠٨؛ فوكس ويبرن: الاسكندر الاكبر، ص٤٥.

پەرستگای ئامون لەمیسر بەمەبەستی وەرگرتنی ڕێنمایی- کەدواتر دێینە سەری- ویستویەتی لاسایی ڕەفتاری هەرقل بکاتەوە کەئەویش پێشتر هەمان کاری کردووە[٤٦٩].

هەموو ئەو بیانەو ڕەنگە ئەوەی باوکیشی کە پێی وتبوو، مەکدۆنیا زۆر بچوکە بۆ تۆ کوڕم، بۆ ئیمپراتۆریەتێکی فراوانتر دەگەڕێم کەشایەنی تۆبێ یان مەکدۆنیا بۆ تۆ کەمە بگەڕێ بەدوای شانشینێکی فراوانتر کەشایەنی تواناکانت بێت، کاریان کردبێتە سەرعەقڵی ئەسکەندەر و سەرەڕای کەم تەمەنی، خولیای داگیرکارێکی (فاتح)ی گەورەیان لەناخیدا چاندبێ[٤٧٠].

یەکێکیتر لەوانەی کاریگەری هەبوو لەسەر جۆشدانی ئەسکەندەر و سەربازەکانی بۆ دەستگرتن بەسەر ڕۆژهەلاّت ودروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی، بیری خورافی وئەفسانەیی لەچوارچێوەی مەراسیمی ئاینیدا بووە، مەسەلەی بەخواوەندبوونی ئەسکەندەر بەگوێرەی ئەوەی مێژوونووسان باسی دەکەن لەگەڵ لەدایك بوونیەوە بگرە پێش لەدایك بوونیشی هاتۆتە ئاراوە، چونکە باوبووە خەڵکی لەبارەی پیاوانی سەرو ئاسایی، داستان وئەفسانە وخەونیان دەهۆنیەوە و ئەسکەندەریش لەوحاڵەتە بەدەرنەبوو، چ لەسەر ڕەچەڵەك یان لەڕووداوی سەرسامکەر لەگەڵ پەیدابوونیدا ...ئەوە هیچ، کەبنەماڵەی مەکدۆنیەکان خۆیان دەگێڕنەوە سەر پاڵەوانی بەخودابوویان(نیوەخوای گریکی )، بەنسبەت ئەسکەندەر لەوسنوورەش تێپەڕیکرد بەکوڕی زیۆسی خواوەندی گەورەی گریکەکان کرا، کەلەلای ڕۆمەکان بە(ژوپیتەر) ولەلای میسریەکان بەئامون ناسراوە، ئەویش بەوە کەدەگوترا ژوپیتەر لەسەر شێوازی مارێك لەگەڵ ئۆلّمپیا نوستووە لەجوتبوونی ئەوانیش ئەسکەندەر پەیدابووە، ڕاڤەکارانی خەونیش بەلێکدانەوەی خەونی بینراو لەوسەردەمەدا بوونی وەها شتی سەرسامکەریان پەسندکردووە.

ئاماژەش بەچەند ڕووداوێکی سەرنجڕاکێش کراوە، کەگوایە لەگەڵ لەدایکبوونیدا، پێشهاتوون وەك ئاگرگرتنی پەرستگایەك، کەهەموو ڕۆژهەلاّتی ڕووناك کردۆتەوە، هەڵنیشتنی دوو هەڵۆ لەسەر گوێسەبانەی ئەوخانووەی، کەئەسکەندەری تیادا لەدایك بووە، هەرلەبەیانیەوە تائێوارە

---

[٤٦٩] حسن پیرنیا:تاریخ ایران باستان، ج٢،ص١٢١٤؛ فوکس ویبرن: الاسکندر الاکبر، ص٧٠-٧١.

[٤٧٠] RICHARD D.GOFF and others :WORLD HISTORY,vol.١,p.١٢٤.
سامي ريحانا: المجتمعات العسكرية عبر التاريخ، ص١١١؛ ويل ديورانت:الابطال التاريخ، ص١٢٩.

کەوەك هێمای ئیمپڕاتۆریەتی ئەخمینی وگریکی لێکدراوەتەوە، پاشان ڕوودانی زەمین لەرزەو هەورەبروسکە هەر لەوشوێنە، کەهەموو ئەوانە بەبڕوای گریکەکان نیشانەی نائاسایی کەسایەتی ئەسکەندەربوون وپاڵپشت بوون بۆ بڕوای بەکوڕی خوادانانی ئەسکەندەر[٤٧١]. خۆشی باسی ئەوەی کردووە، کەبڕوای بەپێشبینی کاهینەکان بووە، بەتایبەت سووتانی ئەو پەرستگایە، کەبەهێمای ئاگاداریەکی شومیان لێکداوەتەوە، بۆیەش لەدوای پەرینەوە بۆ ڕۆژهەلات بڕیاری چاککردنەوەی ئەو پەرستگایە دەدات وگێڕانەوەی هەیبەت و ڕێزگرتنی خواوەندان، بەپێویست دەزانێ[٤٧٢]. هەرچەندە ئەو جۆرە ئەفسانانە، زۆربەیان دوای باڵادەست بوونی کەسایەتیەکان ڕێکدەخرێن ڕەنگە لەبنەڕەتدا نەبن، ئەوە بەنسبەت ئەسکەندەریش لەوحاڵەتە بەدەرنیە، ئەگینا ڕەنگە لەوکاتەدا زۆر منداڵی تریش لەدایك بوون، بەلاّم نەگەیشتونە دەسەلاّت ودەرنەکەوتن لەو شت دانە پاڵەش، بێبەش بوون و کەس باسیان ناکات خۆئەگەر ئەسکەندەریش وەك کوڕەکەی یان براکەی پێش گەیشتنە دەسەلاّت کوژرابا هیچ یەك لەوشتانە بوونیان نەدەبوو.

دەڵێن ئۆڵمپیا بەفلیپی وتووە، کە ئەسکەندەر کوڕی ئەونیە ولەمارێکی گەورە پەیدابووە، فلیپیش بەر لەمردنی ڕایگەیاندبوو، کەکوڕی ئەونیە وهەرئەوبەد گومانیەشیان بۆتە هۆی جیابوونە وەیان سەردانی ئەسکەندەریش بۆ پەرستگای (ئامون) لەمێرگی (سیوە) لەمیسر بۆ ئەوە بوو، کە نهێنی لەدایك بوونی بزانێ[٤٧٣].

لەلای میسریەکانیش وابوو، کەئەسکەندەر بەهۆی لاقەی ئەفسانەیی (جماع الاسطوري) ئامون لەسەر شێوەی نکتانیوسی دووەم، فیرعەونی میسر کە لەسەر دەستی ئەخمینیەکان لەمیسر دەرکرابوو و ڕێی کەوتبووە ولاّتی گریك لەگەڵ ئۆڵمپیا، پەیدابووە و ئەسکەندەر بەسێ باوکەوە پەیوەستە" ئاموون وەك باوکی خوایی وفلیپ وەك باوکی یاسایی وفیرعەون وەك باوکی جەستەیی[٤٧٤]. دەڵێن دایکی پێی گووتوە کوڕی

---

[٤٧١] بلوتارك: السير، ج٣، ص١٢٥٥-١٢٥٧ ؛ حسن پیرنیا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٠٩٢-١٠٩٥.

[٤٧٢] نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص٤٥-٤٦.

[٤٧٣] حسن پیرنیا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٢١٧.

[٤٧٤] يان اسمان: مصر القديمة، ص٤٣٤.

خوایــە و دووپەرســتگای یۆنانیــش، کە لەئاســیای بچوك بوون دانــیان پێداناوە وخۆشــی دڵنــیابووە، کەقســەی دایکی ڕاستە[٤٧٥].

بــەلاَم لەسەرچــاوەیەکدا هــاتووە، کەئەســکەندەر تاماوەیەکــیش گاڵتــەی بەئاشکراکردنــی ئەفســـانەی خودایەتـــی دەهــات، کەلــە شەڕیــشدا بریـنـداربوو، بینـــــی خوێنەکەی هــەمان ڕەنگـــی خوێنی مرۆڤە هــیچ شتێکی خودایــی تێدانیە، گوتویەتی هاوڕێیان ئــەوە خوێنـــــی ڕاستەقینەیە کە لەبەر من دەڕوات و(ایخور) نییە[٤٧٦]، بەلاَم بـەهۆی بـەردەوامی قـسەکردنـــی مەرایـــــی کــاران- بەمەبەستــی نزیکبوونــەوە لێـــی- لــەبارەی خوایــەتی (الالوهیــە)کــاری تێکرا[٤٧٧] ویستویەتی ئەو پڕوپاگەندەیە بکاتە ئامرازێك بۆ پارێزگاریکردن لەبالاَیی دەســەلاَت بەسەر خەڵکی تردا. یانیش دەڵێن بەو گەشتەی ویستویەتی ڕەچەڵەکی خودایی خۆی بسەلمێنێ و پــشتگیری خواوەنــدی بــەناوبانگ (ئــامون )بــۆ پــرۆژەی دەســتگرتنەکەی بەســـر جیهانــدا، بەدەستبێنێت و ڕایبگەیەنێ[٤٧٨]. وتراویشە کەگریکەکان بۆ هاندانی زیاتری ئەسکەندەر لەســەر کارەکانی بەکوڕی زیوس لەریزی خوداکاندا، دایان ناوە[٤٧٩].

هەرچۆنێك بێــت ئەسکەندەر پێـــی وابــووە کــوڕی خوایــە و بەپــشتیوانی خواکــانیش لەســەر پرۆســەی لەشکرکێشـیەکەی بـەردەوام بـووە ، ئــەوەش لەمــــیانەی پاڕانەوەیەکــدا کــە پێـــش شــــەڕی گـــــۆگامــــێلا ڕووە و ئاســـمان ئەنجامــــیداوە، دەردەکــەوێ کــە تـــیایدا هــاواری کردبوو(ئەگەر من بەڕاســـتی کوڕی ژوپیتەرم، پێویســتە یارمەتـــی گـریك بدەی ....)[٤٨٠].

---

[٤٧٥] حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل الاسلام، ص١١٩، هامش٢.

[٤٧٦] لــە ئەفسانەکانی یۆنانیــدا هــاتووە، کــە(ایخـور )شـلەیەکە لــەجیاتی خــوێن بــەدەمارەکانی خواوەنداندا دەڕوات. بلوتارك: السیر ، ج٣، ص١٢٨١.

[٤٧٧] چون جنتر: الاسکندر الاکبر، ص٨٢.

[٤٧٨] چون جنتر: الاسکندر الاکبر، ص٨٠، هامش ١

[٤٧٩] محمود زنجانی: تاریخ تمدن ایران باستان، ج١، ص٢٤٨.

[٤٨٠] بلوتارك: السیر، ج٣، ص١٢٨٦. شایانی ئاماژەیە ڕەنگە لەبەرئەوەی( زیوس) و (ژوپیتەر) بەپێی ئەرك و سیفاتەکانیان هەریەکن بلۆتارکیش خۆی رۆمانیە، لەویش بەژوپیتەر ناسراوە، پێی ئاسایی بووبێ بەوشێوەیەی بنوسێ ، دەنا لەلای گریکەکان بەزیوس ناسراوە و دەبێ ئەسکەنەریش وەك گریکیەك هەر بەزیوس ناوی بردبێ.

ڕەنگە ڕای فەیلەسوفەکانیش لەو بوارەوە بێ کاریگەری نەبووبێ، کەیەکێك لەوان[٤٨١] پێش لەشکرکێشیەکە بلاوی کردبۆوە، کەخوداوەندەکانی ئۆلەمپ لەڕاستیدا پالەوانانی کۆن بوون و ئەرستۆش پێی وابوو هیچ بەربەستێك نامێنێتەوە بۆ پیاوی گەورە، کەببێتە خودا ئەگەر توانی هەموو ئەوشتانە بێنێتەدی، کە ویستویەتی و بگاتە گشت ئەوانەی بەئاواتی پێگەیشتنیان بووە و کاریان پێبکات[٤٨٢] فەیلەسوفێکیتر[٤٨٣] بە ئەسکەندەری وتووە خواپاشای مرۆڤەکانە لەسەر ئەو بنەمایەش هەر بوونێك(مەوجودێك) فەرمانڕەوایەتی بەسەر خەلك دابکات ئەوە هەبوویەکی خودایی(وجودالهی)یە، ئەسکەندەریش بۆ خۆی دیدێکی لەو جۆرەی هەبووە و پێی وابوو، کە خودا باوکی هەموو مرۆڤەکانە و کەسانێکیش کە باشترینن و پارێزگاری لە خەلکی تردەکەن، بە مندالی تایبەتی خۆی دەزانێت[٤٨٤].

کەوابێ لای کەسێکی وەك ئەسکەندەر، کە وەك پالەوان سەیری خۆیدەکردو دەشیزانی لە ڕێی ئیسپات بوونی وەها باوەڕێك-باوەڕی خۆبەخواکردن- کە بەلای خەلکەوە کاری نەکردە نیەو لە فەرمانڕەوایەتی کردنی جیهاندا، بەربەستی بۆ دروست نابێ، بەتایبەتی کە بەخواکردنی پالەوانان و پاشاکان وەك چۆن گریکەکان پێی نامۆنین پێشتریش شتی وا ڕوویداوە لەمیسر و لەلای هەندێ گەلانی ڕۆژهەلاتیش، نەریتێکی باوبوو، تارادەیەکیش وەك کوڕی خوا، دانی پیانراوە بەتایبەتی لە میسر وەك فیرعەون هەژمارکراوە و فیرعەونەکانیش بە کوڕی خوا دادەنرێن[٤٨٥]. بەوەش مێژوونوسان هەریەکە بەجۆرێك باس لە وەلامی لە خۆباییانەی ئەسکەندەر بۆ دارا دەکەن، هەیە پێی وایە کە دارا زانیویەتی هیچ ڕێگایەك بۆ مانەوەی مولکەکانی نیە تەنها شەڕێکی لەناوبەر نەبێ[٤٨٦]. بۆ نموونە لە هەندێك سەرچاوەدا هاتووە کە ئەسکەندەر بۆ دارای نووسی" پێویستە وەك پاشای گەورەی ئاسیا بمدوێنێ نەك هاوتای خۆت،

---

[٤٨١] مەبەست لەو فەیلەسوفە (بوثیوس) فەیلەسوفی گومانکار (المتشکك)ی سەقەلیە، اندرو روبرت برن: تاریخ الیونان، ص٤٤٣.

[٤٨٢]نفس المرجع، ص٤٤٣.

[٤٨٣] مەبەست لە پەسامونی فەیلەسوفە. بلوتارك: السیر، ص١٢٨٠.

[٤٨٤] حسن پیرنیا: ایران باستان،ج٢، ص١٢١٦؛ بلوتارك: السیر، ج٣، ص١٢٨٠.

[٤٨٥] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٠٦.

[٤٨٦] هارڤی بورتر: موسوعه مختصر التاریخ القدیم، ص٢٩٣.

دەبێ لە پێناوی موڵکەکانت شەڕبکەی و ڕانەکەی، چونکە لەهەر کوێیەك بی پێتدەگەم[٤٨٧].
بێگومان ڕقی دارای جولاندووە بەدەربڕینی دەستەواژەی( من سەرکەوتن نادزم)[٤٨٨] یان (سەرکەوتن بەدزی، نەنگی تێدایە) و لە وەڵامی پێشنیاری (بارمنیون)-بەتەمەن و بەئەزمونترین ئەفسەر و سەرکردەی لابالی ڕاستی سوپای ئەسکەندەر لە شەڕی گۆگامیلا- کە بە شەو بەسەردادانی لەشەڕی گۆگمێلا پێ باشتر بوو[٤٨٩]، دەردەکەوێ کە لەخۆی ڕادەبینێ سەربکەوێ، بۆیە شتێکی ئاسایی بوو کە بەشەڕێکی یەکلاییکەرەوە نەبێ ڕازی نەبێ.
هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەی خوڕافی وئەفسانەیی لەچوارچێوەی دابونەریتی ئاینی باوی ئەو سەردەمە بەدرێژایی لەشکرکێشیەکە ئامادەیی هەبووە، و بەقەدەر بڕوابوونی خەڵك پێی وشوێن گرتن لە زەینیاندا، کاری کردۆتە سەر ورە و چالاکی وئاستی گەرموگوڕیان لەئەنجامدانی ئەرکەکانیان و وەك یەك هاتنەوەی تێڕوانین وفاڵ و پێشبینی وخەون و بیرە خوڕافی و ئەفسانەییەکان، لەگەڵ ئەوئەنجامانەی لێی دەکەوتەوە، کاریگەری لەسەر پێشهاتەکانی دواتر، پەیدا دەکرد، ئەوەش بەجوانی لەمیانەی لەشکرکێشیەکەی ئەسکەندەر وئاستی بەرەو پێش چوونیدا دیارە، دەکرێ وەك هۆکارێکی زۆر کاریگەر و دنەدەری ئەسکەندەر و سەربازان بۆ پێشڕەوی کردن و جۆشدانیان بۆشەڕی گۆگامێلا، لەبەرچاو بگرین بەتایبەت کە ئەفسانە وخوڕافە نەخشی هەرە گرنگی لە ژیانی ئەوسای کۆمەڵگادا هەبووەو ئێستاش هەیەتی.
وتراویشە کە ئەسکەندەر تا کۆتایی بەندەی خوڕافات و قسەی بێسەرەوبەرە بوو، باوەڕی زۆری بەئەستێرە ناس وفالگرەوە هەبوو، کە ولاتیان پڕکردبوو[٤٩٠] ستراب‌ۆش جەخت لەسەر بڕوابوونی بەبەخت دەکاتەوە[٤٩١] و پێدەچێ، کە لە هەموو ئەوانەدا کاریگەری دایکی لەسەر بووبێ[٤٩٢].

---

[٤٨٧] H. D .Amos and A .G .Pilong :These were the Greeks (ENGLAND:١٩٨٧),p.١٠٩.

[٤٨٨] بلوتارك: السير، ج٣، ص١٢٨٥؛ البرماله: تاريخ البرماله، مج١، ص٣٠٢.

[٤٨٩] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص١٨٣.

[٤٩٠] ويل ديورانت: ابطال من التاريخ،ص١٣٠؛ حسين الهي: اسكندر مقدونىبچه تياه تاريخ، ص٨٦-٨٧.

[٤٩١] THE GEO GRAPHY OF STRABO,book v,p.٣٢١.

[٤٩٢] الاب مينوديوس زاهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٨٠.

پـــێش دەســـت پێکردنـــی هێرشـــەکە، ئەســـکەندەر بڕیاریـــدا ســـەردانی پەرســـتگای دلفی[٤٩٣](پەرستگای بەناوبانگی پێشبینی وسروش )بکـات، بۆ داوای (استیخارە)ی زانـینی سەرکەوتن لەوجەنگەی دەستی پێکردووە، ئەوەش لەبەرئـەوەی کەخـەڵك پێیـان وابـوو هەرشـتێك پێشبینی بکـات هەردێتـە جێ، لەرۆژێکیـشدا چـوو، کـە گونجاونـەبوو بـۆ پێشبینی کـردن و زیوانـــی پەرستگاش ئامادە نەبوو فاڵ بگرێتەوە، تائەسکەندەر بـە زۆر هێنایـە نێـو پەرسـتگا، کاتێکیـــش پێـــی وت، کە تۆ هەرگـــیز تێناشـــکێی، قسەکەی بەهەندگرت و ڕایگەیاند کـە وەلاّمـــی سـەرکەوتنی وەرگرتووە و ئیتر پێویستی بە(ئیستیخارە )ی خواوەند نیە[٤٩٤].

لەگەڵ ڕێکردنی سوپاش پەیکەری لەدار سەر و دروستکراوی یەك لەپاڵەوانەکان عـەرەقی زۆری دەرکردبوو، کەوەك نیشانەی نەهامەتی سەیردەکرا و زۆربەشیانی خستبۆ دوودڵـی ونیگـەرانی کردبوون، بەلاّم ئەربستاندەری زیوان (کاهن)و هاوسەفەری سوپا پێی وتن، کـە ئـەوە نـەك هـەر نیـشانەی نەهامـەتی نیـە، بـەڵکو ئـەوە دەگەیـەنێ، کـە سـوپا سـەرکەوتنی گـەورە و بەشـکۆ بەدەستدێنێ کە شاعیر و موزیك ژەنەکانی داهاتوو لەبەر پێهەڵگوتنیان مانـدوو دەبـن وعـەرەق دەردەکەن، بەوەش هێوری کردنەوە[٤٩٥].

بـەلاّم بەسـەرنجدان لەمامەڵـەکردنی هەنـدێك نموونـە، کـە لەلایـەن هەنـدێك نووسـەر ئامـاژەی پێکـراوەو دەردەکـەوێ، کـە ئەسـکەندەر توانیویـەتی نـاخی کۆمـەڵگا بخوێنێتـەوە و زانیویـەتی کەچەندە گیرۆدەی داوی خورافاتن، ئەوەش وایلێکردوە کە لەکاتی دابـەزینی ورەی سـوپاکەی وەك جۆرێك لە سیاسەت پەنای دەبردە بەر زیوان وئەستێرەناس وفالـچی و بـەختگرەوە، ئەمـەش بـەو مانایە نیە کە ئەو هـیچ پێـی کاریگـەر نـەبووبێ، بـەلاّم نـە بـەو شـێوەیەی ویـل دیورانـت بـۆی دەچێ[٤٩٦]، ئەگەر وابوایە دەبوایە گوێڕایەڵی ئەوانە بایە کە بەوکارانە هەڵدەستن کەچـی زۆرجـار

---

[٤٩٣] دلفی: شارێکی پیرۆزە لـە هـەرێمی مۆکسی ناوەڕاستی وڵاتی یۆنـان هەڵکەوتووە. نـسطور ماتساس: مذکرات الاسکندر الکبیر، ص١٧٢، هامش(١١٧).

[٤٩٤] نـسطور ماتـساس: مـذکرات الاسـکندر الکـبیر، ص١١٢؛ بلوتـارك: الـسیر،ج٣، ص١٢٦٦؛ هارولد لمب: الاسکندر المقدوني ،ص١٠٥؛ چون جنتر: الاسکندر الاکبر، ص٤٨ ؛ بەلاّم فوکس ویـبرن پێـی وایـە دوای وێرانکردنـی تیبـە سـەردانی (دلفـی )کـردوە و زیـوانی پەرسـتگا دڵنیـای کردووە کە ئەو هەرگیز ناشکێت: الاسکندر الاکبر، ص٤١.

[٤٩٥] بلوتارك: السیر، ج٣، ص١٢٦٦؛ چون جنتر: الاسکندر الاکبر، ص٤٨.

[٤٩٦] ویل دیورانت: ابطال التاریخ، ص١٢٩.

وا دەرنەچووە، لەلایەکی تریش کەسێك لەسەردەستی بەناوبانگترین فەیلەسوف و زانای سەردەمی خۆی پێگەیشتبێت کە پێشتر ئاماژەمان پێیداو و وەك خۆشی ئاماژەی پێدەکات، کە زۆر تینوی زانیاری وفێربوون بووە، لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاریش هۆگری بۆی زیاتر بوویێ ڕەنگە ئەو بیرە زیادەڕۆیی تێداکرابێ.

لە کەناری ڕووباری گرانیکۆس کە لەبەر تیژڕەوی ئاوەکە و بڵندی لێوارەکانی ئەوبەری و بەشوم زانینی مانگەکە کە لەشکرکێشی تێداکراوە، سەردارەکان پەڕینەوەیان بەباش نەزانیوە، ئەو وتی کە دەتوانین وا دابنێین لە مانگێکیتردایین وناوی مانگەکە دەگۆڕین و پاشان فرمانی بە(ئەریستاندەر)ی زیوان(کاهن)دا کە قوربانی بکات، تا بڕوای خودایان بزانن ودەستوری پێدا، کە کارێك بکات وەلامی خوداکان وابێت (کە سەرکەوتنیان بە ئەسکەندەر بەخشیوە)، زیوان وایکرد و هەواڵەی بلاوکردەوە، بەمەش کاریکردە سەر وورەی جەنگاوەرەکانو هاواریانکرد (ڕاوێژ پێویست نیە،چونکە ئێمە سەرکەوتووین و با زووهێرش بکەین)، ئەسکەندەریش باروودۆخی دەروونی سەربازەکانی بەهەلزانی و بڕیاری پەڕینەوەی داو دواتریش سەرکەوتن[٤٩٧].

بێگومان لەشەڕێکی وادا، کە ئەو هەموو ترسەیان لێی هەبوویێ و لەسەرەتاشدا هەلومەرج لە بەرژەوەندی ئەخمینیەکاندا بوویێ، ئەوانیش بتوانن تیایدا سەربکەون ودەروازەی گرتنی هەموو ئاسیای بچوکیشی بۆ کردنەوە، دەبێ چ کاریگەریەکی هەبوویێ بۆ سەر وورەی جەنگاوەران چۆن لەوفالەیان ڕوانیبێ؟

هەروەها زۆربەی سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە پێش شەڕی ئیسۆس ئەسکەندەر بیستی لە شارێك بەناوی گوردیۆم گالیسکەیەك هەیە بەگرێ کوێرەیەکەوە بەستراوەتەوە، گرێیەکە هێندە قایم ببوو کەس نەیتوانیبوو بیکاتەوە وئەفسانەیەکیش لەو بارەیەوە دروستکرابوو، کە دەوترا هەرکەس ئەو گرێیە بکاتەوە دەبێتە فەرمانڕەوای ئاسیا یان(جیهان)، دەوروبەرەکەی دەترسان بۆی نەکرێتەوە، کەچی شمشێرەکەی دەرهێناو گرێیەکەی بڕی، کە کاریگەری زۆری کردە سەر وورەی ئەسکەندەر و سەربازەکانی لە شەڕی ئیسۆس، کە زۆر لە گرانیکۆس ئەستەم تربوو، ڕاستی ئەوئەفسانەیەی بۆ سەلماندن بە داگیرکردنی میسر ودۆڵی ڕافیدەین و ئێران وئاسیای ناوەڕاست،

---

[٤٩٧] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١١٢٣.

ئەرزشـی زۆری پەیـداکرد[٤٩٨] ویـستویەتی بەهۆیـەوە خـۆی بەسـەر هەمواندا بـسەپێنێ و ڕازی بەسەرکردایەتی کردنی، بن و تێیانبگەیەنێ کـە توانـای کردنـەوەی هـەموو گرێیەکـی سـەر ڕێـگای هەیە[٤٩٩].

نووسەرێك پێی وایە، کە ڕەنگە تەلسمـی گوردیوم ئەسکەندەری بەگرتنـی ئاسـیا هیـوادار کـردبێ[٥٠٠] دەڵێن، لـەو شـەوەدا بارانێکـی زۆر تونـد بـاریوە، کـە بەنیشـانەی ڕازیبـونی خواوەندیان لە هەمبەر ئەو ڕەفتارەی ئەسکەندەر لێکداوەتەوە[٥٠١]. لە ڕووداوی مـانگ گـیرانی پێش شـەڕی گـۆگمێلا سـاڵی ٣٣١پ.ز، کـە وورەی سەربازەکانـی تـەواو هێنابویـە خـوار وبـە نیشانەی نەهامەتـی سەیریان دەکـرد، خەریك بوو ئاڵۆزی لێـپەیدابێ کەچـی ئەسـکەندەر لـە ڕێی کاهینەکانەوە ویستـی چارەسـەری بارودۆخەکە بکات، کە ئەریستاندر ڕایگەیاند مـانگ گیرانەکە بەقازانجیانە، چونکە خۆر هی گـریکەکانە و مـانگ وئەستێرەش هـی ئەخمینیـەکان و زیوانـە میـسریەکانیش پـشتیانگرت وتیـان کەبـەپێی نموونـەکانی ڕابـردوو هـەرکاتێك مـانگ گیرابێت نەهامەتیەك بۆ ئەخمینیەکان هاتۆتە پێش، هەر جارەی ئەوە ڕوویدابێ پادشـایەك لەگـەڵ خودایەك کە دژیان بووە جەنگاون بەمەش نائومێدی سـەربازەکانیان بە ئومێد ودڵنـیایی گـۆڕی پێشدەچێ ئەسکەندەر وای لەزیوانەکان کردبـێ وا وەلاّم بدەنەوە دەنـا هـەر لـە کۆنـەوە ئێرانـی وبابلی خۆر بە هـی خۆیان دەزانن[٥٠٢].

شتێکـی تـریش کـە ئامـاژە بـۆ کاریگـەری ئەفسانە لەسـەر کەسایەتـی ئەسـکەندەر وئاڕاسـتەکـردنی بـەرەو ڕۆژهـەلاّت دەکـات، دۆزیـنەوەی سـێ دەسـت نووسـە لەلایـەن نووسـەرێك بەناوی( کارل مولەر ) لەساڵی (١٨٤٦ )دا لە کتێبـخانەی نیشـتمانی لـەپاریس کە لەبارەی ژیانی ئەسکەندەر دەدوێن، لە یەکێـکیاندا هاتووە کە ئەسـکەندەر بـۆ دایکـی و

---

[٤٩٨] پلوتارك: السير،ج٣، ص١٢٧٠-١٢٧١؛ البرمالـه: تـاريخ البرمالـه، ص٣٠٢؛ سـيتون لويـد: الرافدان، موجز تاريخ العراق منذ اقدم العصور حتى الآن، ترجمـه: طـه باقر وبشير فرنيس، (بغداد: د.ت)، ص١٢٦-١٢٧؛ راس.ئی.دان و دیگران: تاریخ تمدن فرهنگ جهان، ص٢٦٦.

[٤٩٩] نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص٤٩.

[٥٠٠] اولريش ويلكن: اسكندر مقدونی، ص١٥٠.

[٥٠١] فوكس ويبرن: الاسكندر الاكبر، ص٥٢.

[٥٠٢] حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ص١٢٣٢-١٢٣٣.

ئەرستۆی مامۆستای گێڕاوەتەوە، کە لەدەریای تاریکستاندا، کە دەکەوێتە لای هیندستان، کانیاوێك هەیە کە هەر کەس ئاوی لێبخواتەوە بە نەمری دەمێنێتەوە[٥٠٣].

جگە لەمانە شتی تریش هەبووە، کە هاندەر بوون لەسەر سوربوونی ئەسکەندەر بەرەو ڕۆژهەلات لەوانە گوێڕایەڵی سەربازان و ورەبەرزیان، هەروەها ڕاکردنی کەشتیە جەنگیەکانی فارسیش لەدەریای ئیجە و ئەویش دوای زانینی هەواڵی ڕا دەست بوونی شارەکانی فینیقیە و هی تر و بەشداریکردنیان لە گرتنی شاری صور[٥٠٤]. ئەمە و سەرکوتکردنی شارە بەربەرەکانیکەرەکان، کە بوون بە دەرس بۆ شارەکانی تر، کە هەڵەی لەو جۆرە ئەنجام نەدەن، وایکرد خەمی پشتەوەیان نەبێت وهەوڵی بەرە و پێشچوون بدەن.

سەرەڕای هەموو ئەمانە بەڕای یەك لەنووسەران، ئەسکەندەر لە بەدەستهێنانی کەسی نزیکی بەوەفا، بەختی باشی هەبوو، ئەگەر فەرماندەی بەئەزموون و ڕاستگۆ وهاوڕێکانی یارمەتی ئەسکەندەریان نەدابا مێژوو بە جۆرێکی تر دەگۆڕا[٥٠٥].

تێکڕای ئەوانە ئەسکەندەریان دنەدا، کەدەبێ خۆی ببێتە سەرداری بێ کێبەرکێی ناوچەکە، ئەوەش، کە بەشەڕەکانی گرانیکۆس وئیسۆس نەهاتەدی، پێویستبوو لەشەڕێکی یەکلایی کەرەوەدا بەیەك بگەن، بۆیە شەڕی گۆگمێلا ببوو بەڕووداوێك، کە هەر دەبوو ڕوویدات.

---

(٥٠٣) موعتەسەم ساڵەیی: تێپەڕبوونی لەشکری ئەسکەندەری مەکدۆنی بە کوردستاندا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٢،ل١٠٧ لەد.نبیله ابراهیم: اشكال التعبير، (مصر:١٩٧٤)،ص٥١.ی وەرگرتووە.

(٥٠٤) اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ص٤٣٣.

(٥٠٥) هرمان بنگسون: يونان وپارسان، ص٣١٢.

# بەشـــی دووەم
# شـــەڕی گۆگامـــێلا(ئەربیلا)
# و
# هۆکارەکانـــی یەکلایـــی بوونەوەی

باسی یەکەم: لەشکرسازیەکانی بەرایی و ڕوودانی شەڕەکە

باسی دووەم:هـۆکارەکانـــی یەکلایی بوونەوەی شەڕەکە

## بەشی دووەم

## شەڕی گۆگامێلا(ئەربیلا) و هۆکارەکانی یەکلایی بوونەوەی

### باسی یەکەم/ لەشکرسازیەکانی بەرایی و ڕوودانی شەڕەکە

### تەوەرەی یەکەم: ئامادەکاری و لەشکرەکانی شەڕ

### ١- ئامادەیی بۆ شەڕ:

دوای هەژموونکردنی ئەسکەندەر بەسەر ئاسیای بچوك ورووکردنە کەنارەکانی سوریا و فەلەستین ومیسر داگیرکردنی ناوچەکە بەتەواوی، بۆ بەردەوامی شەڕکردن لەگەڵ ئەخمینیەکان بەتایبەت دوای ڕێکخستنی کاروبارەکان، لە(٣٣١پ.ز) بەرشاری (صورTyre[٥٠٦] و صیدا[٥٠٧])، ئەسکەندەر میسری بەجهێشت و پاش مانەوەی ماوەیەك لەوێ و ڕێکخستنی ناوچەکە و بە ئامانجی ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئەخمینی ئامادەی ڕێکردن بەرەو ڕۆژهەلات بوو[٥٠٨]. داریوش(دارای سێیەم)یش کە بینی نامەکان ئەنجامیان نەبوو[٥٠٩]،تێگەیشت کە جگە لە جەنگ هیچ چارەیەکی تر نیە، بۆیە سەرگەرمی ئامادەکاری

---

[٥٠٦]شاری صور: شارێکی بە ناوبانگی فینیقیە کۆنەکانە و لەسەر چیایەکی ناو دەریاو لە نزیك کەناری لوبنانی ئێستا بە دووری (٢٥میل–٤٥کم)لە باشوری صیدا هەڵکەوتووە. نخبة من العلماء: الموسوعة الاثرية العالمية، ص٢٨٦.

[٥٠٧] صیدا: شارو بەندەرێکی گرنگی فینیقیە لە باکوری صور هەڵکەوتوە و لە دەقەکانی هەزارەی (٢پ.ز) ناوی هاتووە. كلين دانيال: موسوعة علم الاثار، ج٢، ل٣٦٠.

[٥٠٨] جابر خليل ابراهيم :منطقة الموصل في فترة الأحتلال الاجنبي، موسوعة الموصل الحضارية، مج١، ص١٣٤؛بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٥-٧٦.

[٥٠٩]TheNewCaxton encyclopedia(London:١٩٧٤)Kvol.١p١٢٤. (٤) بروانە:

شەڕ بوو، بۆ ئەو مەبەستەش دەستوری بە سەردادانیدا، کە لەبابل کۆببنەوە و فرمانی بەبسوسی والی باکتریا کرد، کە بە ئوردوی خۆیەوە پەیوەندی پێوەوە بکات و باکتریایەکان لەو سەردەمەدا بە ئازاترین کەسانی ئاسیا، دەژمێردران[510].

سوپای ئەسکەندەر لە مانگی هیکاتومبیون[511]، گەیشتە تفساح( ئابثاکوسThapsacus) نزیك دیرالزور، کە لەباشوری ڕۆژئاوای حەلەب لەسەر ڕووباری فوڕات، هەڵکەوتووە[512] بێ بەربەرەکانی کردن بە بەرچاوی سێ هەزار سەرباز کە بۆ چاودێری سوپای ئەسکەندەر ڕەوانەی ناوچەکە کرابوون، لە فوڕات پەڕیەوە و لەبەرە و ڕۆژهەڵات ڕۆیشتنیدا ڕێگای بەرەو بابلی نەگرتەبەر و بڕیاریدا بەداوێنی چیاکانی باکوردا بڕوات، ئەویش بۆ سوود بینین لەهەوای فینك و دۆزینەوەی ڕێگەیەکی ئاسان بۆ ڕێکردنی سوپاکەی و دەستکەوتنی ئالیك و خواردەمەنی، ئامادەی ڕۆیشتن بوو، پێدەچێ بەکاروانە ڕێی حەڕان[513] و ئەدیسا[514]، لەباکوری نێوان دوو ڕووبار پێشڕەوی کردبێ و لەوێوە بە داوێنی باشوری چیاکانی ئەرمەنستاندا بەرەو ڕۆژهەڵات لەنسیبینەوە بەگوندی جفتکی ئێستای کوردنشیندا، کە ناوی(تل ابو ظاهرة) لەدەوڵەتی عێراقدا، ڕەت بووبێ و ڕوویانکردبێتە دیجلە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دارای سێیەم، کە لەڕێی

---

(510) حسن پیرنیاه: تاریخ ایران باستان، جلد دوم، ص١٢٢٧؛ اولرش ویلکن: اسکندر مقدوني، ص١٧٨-١٧٩.

(511) وەرگێڕی کتێبی فیلافیوس اریانس:ایام الاسکندر الکبیر في العراق، (بغداد: ٢٠٠٧)، ص٨، هامش (٣)، بە(تموز- آب)یی نووسیوە و لە:آ.بتري: مدخل الی تاریخ الاغریق، ص٥٧. بە(آب)هاتووە و بسام العسلي: الاسکندر الکبیرالمقدوني(٣٥٦-٣٢٤ق.م)، بە(تموز)ی نووسیوە، پێدەچێ ئەوەی یەکەمیان بێت واتا کۆتایی تەموز وسەرەتای ئاب بگرێتەوە .

(512) فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٩، هامش (٢).

(513) حەڕان: شارێکی گەورە و بەناوبانگ بوو لە جزیرەی ئاقور ،مەڵبەندی دیارمضربوو،بەدووری ڕۆژە ڕێیەك لەو ڕوهاو دوو ڕۆژە ڕێ لە ڕەقە لەسەر ڕێگای موسڵ وشام و ڕۆم هەڵکەوتووە،یاقوت الحموی ،معجم البلدان، (بیروت:١٩٩٥)، مج٣، ص٢٣٥-٢٣٦.

(514) ئەدیسا: شارێکە لە جزیرە لە نێوان موسڵ وشام بەدوری شەش فەرسەخ هەڵکەوتووە؛ عەرەب بەروهاو عوسمانیەکان بە ئورفە ناویان بردووە: یاقوت الحموي: معجم البلدان، مج٣، ص١٠٦؛ اولرش ویلکن: اسکندر مقدوني، ص١٨٠، هامش(١٥٤) .

سوسەکاری ئێرانی دەستگیرکراو، وا زانرابوو کە بەسوپایەکی زۆرەوە لەنزیك کەنارەکانیدا، هەڵیانداوە، کەچی وا دەرنەچوو و تەنها دژواریەك کە تووشی هاتن، تیژڕەوی ڕووبارەکە بوو[٥١٥].

وتراوەکە دوای ڕەتبوون لە ڕووباری دیجلە بەشەش ڕۆژ بەپشوودان و ڕۆیشتنەوە، گەیشتنە نزیك ئوردوی دارای سێیەم لە کەناری ڕۆژهەلاتی ڕووباری گومل و لە نزیك گۆڕەپانی شەڕ، بارگەیان، لێخست پێشتریش داریوش بەرەو ڕۆژئاوا لە ئەربیل دەرچوو بوو و پاش ڕەتبوونی لە زێی گەورە، لە کەناری ڕۆژئاوا لای سەروی ڕووباری خازر(بومودوس[٥١٦]) لەلای ڕۆژهەلاتی هەمان دەشت، هەڵیدابوو. و لەلای سەرەوەی هەردوو لقە ڕووبارەکە لەو شوێنە کە سەربازگەی هەردوو بەرەکەی لێ بوو نزیکەی بیست کیلومەتر دەبوو، هەردوو سوپا بە گوتەی مێژوونووسان (٦٠ ستاد[٥١٧] = ١١میل) لەیەکەوە دووربوون، کە بە هۆی گردو تەپۆلکە یەکتریان نەدەبینی، دواتر سوپای ئەسکەندەر پێشڕەویان کرد و لە دووری پێنج کیلۆمەتر ونیو لە یەکتر دەرکەوتن و ڕۆژی یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی(٣٣١پ.ز) بەپێی ڕۆژمێری ئێستا، شەڕ دەستی پێکرد[٥١٨]، کە بە گوێرەی تێك کردنەوە و حیساباتی مانگ گیران، بەروارێکی دروستە[٥١٩].

شوێنی شەڕەکە لەلایەن داریوشەوە هەڵبژێردراوە مەبەستیش لێی، ئەوەبوو کە بتوانێت تەواوی هێزەکانی بەکاربهێنێت و وەك ئیسوس تەنگەبەر نەبێت، کە سوود لە بەشێکی زۆری

---

[٥١٥] فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٨-١٠؛ اولرش ویلکن: اسکندر مقدوني، ص١٨٠؛ البرت تن ایك اومستد: تاریخ شاهنشاهي هخامنشي، ص ٧١٣ ؛جابر خلیل ابراهیم: منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاجنبي، موسوعة الموصل الحضاریة ، مج١، ص١٣٤.

[٥١٦]ڕووباری خازر لەنووسینی مێژوونوسە ڕۆمانەکاندا ناوی بە(بومدوس) هاتووە: فیلافیوس اریانس: الاسکندرالکبیر في العراق، ص١٤-١٥.

[٥١٧]ستاد stadium پێوەر(مقیاس )ێکی گریکیە بۆ پێوانەکردنی دووری و دەکاتە١٨٥م یان٢٠٠یارد؛ فیلافیوس اریانس: ایام اسکندر کبیر فی العراق، ص١٥، هامش٢؛ الفرید فن گوتشمد بە ٢٦٠کم لێکداوەتەوە کە ڕەنگە مەبەستی پێ ٢٦٠م؛ تاریخ ایران، ص٤٩ هامش ٨؛ جمس بکنغام بە(٢٠٣)یاردی نووسیوە، رحلتي الی العراق، ج١، ص١١١ ، هامش ٥.

[٥١٨] عبدالله امین آغا: معرکة اربیلا، ص٩-١١.

[٥١٩] بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: مایکل لي لانغ: المعارك المائة، ص١٠٩.

ئوردووەکەی نەبینرا[٥٢٠]. یان وەك وتراوە بۆ ئەوەی گالیسکەکان بەئاسانی ڕێ بکەن و سوارەکانیش بە باشی جموجۆڵ بکەن و لەبەر ئەوەش کە کەوتۆتە نێو هەرێمە سەختەکانەوە ئەوە سوود وەرگرتن لەو توانایەی سوارە وەك هێزێکی دەست وەشێن، دەیهێنێتە بەرکار، کەم دەکاتەوە و بواری دەست وەشاندنی بەشێوەی سەرەکی، نابێ کە لەلایەن هێزەکانی ئەسکەندەرەوە لە شەڕدا پشتی پێ دەبەستراو نزیکیش بوو لە موڵك و ماڵ(مومتلکات)ە کانی دەوڵەت و سەرچاوەکانی ئازوخە[٥٢١].

پێش لێنەگرتنیشی لە بڕینی فورات و دیجلە، کە گوایە هەموو لێکۆڵینەوە و پشکنینەکانی سەردەم جەختی لێدەکەنەوە[٥٢٢] هەر لەبەرئەوەبوو کە ئەسکەندەر پەلکێشبکات بۆ ئەو شوێنەی خۆی هەڵیبژاردبوو و لە ڕواڵەتدا بە قازانجی دیاربوو[٥٢٣]، بۆ ئەوەش کە زەویەکە بە تەواوی گونجاوبێ بۆ ڕێکردنی گالیسکە و ئەسپەکان و هیچ گرفتێکیان نەیەتەڕێ، بەر لەدەستپێکردنی شەڕ ئەخمینیەکان کەوتنە یەکسان کردنی و تەختکردنی ئەو چاڵ و چۆڵ و تەپۆلکانەی لە ناوچەکەدا هەبوون[٥٢٤].توێژەرێك لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر ئەو ڕاستیانەی سەرەوە، هەڵبژاردنی شوێنەکە بەنیشانەی (لێزانی جەنگی) دارا لەقەڵەم دەدات[٥٢٥].

ئەسکەندەر دوای وەرگرتنی زانیاری زۆر لە دەمی سوسەکارانی(سیخوڕ) ئەخمینی، کە لەلایەن پێش کاروانانی سوپای گریك دەستگیرکرابوون، بۆ ماوەی چوار ڕۆژ وچانیدا بە سوپاکەی و کەوتە قایمکردنی سەربازگە و لێدانی خەندەك بەدەوریدا و قیتکردنەوەی (داهۆڵ) لەسەریان و بە سەربازە چالاکەکانی، کە جگە لەچەك هیچی تریان پێ نەبوو، ئامادەی پەلاماردان بوو،

---

[٥٢٠] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص ١٢٢٩؛جمس بکنغام: رحلتي الى العراق، ج١، ص١٢٩، هامش .

[٥٢١] محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا(٣٣١پ.ن)، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ساڵی(١٩٩٢)، ل٥٧.

[٥٢٢] بڕوانە حبیب حنونا: تاریخ کرملیس، مراجعة النص واعداد التراثي بهنام سلیمان متي، تقدیم یوسف حبي، (بغداد:١٩٨٦)، ص٣٣.

[٥٢٣] اولرش ویلکن: اسنکدر مقدوني، ص١٨٠.

[٥٢٤] فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الاکبر في العراق، ص١٥؛ حسن پیرنیاه: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٢٩؛ جمس بکنغام : رحلتي الى العراق، ج١، ص١٢٩، هامش .

[٥٢٥] حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاریخ، ص٣١.

نیوەی دووەمی شەو ڕۆیشت، تاکو لە بەرەبەیان بە دوژمن بگات، داراش کە هەستی بە هاتنی سوپای ئەسکەندەر کرد سوپاکەی بۆ شەڕ ئامادەکرد. بەڵام دوای نزیکبوونەوەیان لەیەکتر ئەسکەندەر سوپاکەی وەستاند و کۆنگرەیەکی جەنگی سازدا بۆ وەرگرتنی ڕای سەرکردەکان و هاندانیان بۆ بەرزکردنەوەی وورەی جەنگاوەران، پێشنیاری بەشەو بەسەردادانی ڕەتکردەوە و بڕیاری دابینکردنی خواردن و خەوێکی ئارامی بۆ سوپاکەی دەرکرد سەربازەکانی بە ئاسودەیی خەوتن، خۆشی دوای دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەکی زۆر و هێنان و بردن شەوەکەی دە سەربرد و بەرەبەیان خەوی لێکەوت[٥٢٦]، دەڵێن ((ئەسکەندەر گومانی وابوو، کە سەرکەوتنی بەسەر دارا، نادیار لە شەودا، ئەوە ناسەلمێ، کە لە ڕووی سەرکردایەتیەوە لە دارا باشترەو سەرکردایەتی سەربازانێکیش دەکات کە لەهی ئەو چاکترن))[٥٢٧]

داراش فرمانیدا، کە بۆ جەنگ لەسەرپێ بن و ئەسپەکانیان زین بکەن و بە وردی چاودێری دوژمن بکەن و بۆ ئەوەش کە لەکاتی پەلاماردا لە تاریکیدا نەبن و بڕیاریدا مەشخەڵ هەڵبکەن و ئاگربکەنەوە[٥٢٨] بەیانی ئەو شەوە سوپای داریوش لە پێشوازیدا ئامادەبوو سوپای ئەسکەندەریش بەرەو گۆڕەپانی شەڕ ڕۆیشت و لە بەرامبەر یەکتردا، ئامادەی شەڕکردن بوون، بەمشێوەیە دەبینین هەڵگیرسانی شەڕ لە ئانوساتی خۆیدا بوو و یەکیانی دەویست دەستپێشخەری بکات، بۆ ئەو مەبەستەش هەردوولایان کەوتنە ڕێکخستنی بەرەکانیان و ئامادەی شەڕکردن بوون .

## ٢- لەشکرەکانی شەڕ:

لەنێو ئەو کتێب و نووسراوانەی باس لە شەڕی گوگامێلا دەکەن، جیاوازی زۆر گەورە لە ڕووی ژمارەوە لە نێوان سوپای دارای ئەخمینی و سوپای ئەسکەندەری مەکدونیدا، بەرچاودەکەوێت کە لەهەندێکیاندا، بەتایبەت لە بارەی سوپای ئەخمینیدا، زیدەڕۆیی(مبالغە)ی زۆری پێوەدیارە و

---

[٥٢٦] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: فيلافيوس اريانس: ايام الاسكندر الكبير في العراق، ص١٥-٢٠؛ هارولدلمب: الاسكندر المقدوني، ص٢١٢-٢١٣؛ جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، (سلێمانی:٢٠٠٣)، ل٢٣٥-٢٣٦.

[٥٢٧] فوكس ويبرن:الاسكندر الاكبر، ص٧٧.

[٥٢٨] حسن پيرنياه: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٢٤٠-١٢٤١.

ئــەوەش پێــشتر ئاماژەمــان پێــداوە کــە لەباســکردنی هــەموو شــەڕەکانی نێــوان گریــك و ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیدا بەدی دەکرێ و لەسەر ئەو ژمارەیەش، کـە بـۆ بـەراورد لەگـەڵ ژمـارەی سەربازانی گریك نیشانی دەدەن، کۆك نین و لەسـەر ژمـارەی سـەربازەکانی ئـەخمینی جیاوازیـان هەیـە، کـە ئەمـە کـەمتر لـەبارەی سـوپای گریـك بەرچـاودەکەوێت. دەکـرێ بوترێـت لـەتێکڕای نووسراوەکاندا ژمارەی سوپای ئەسکەندەری مەکدونی بە چل هەزار پیادە و حەوت هـەزار سـوارە خراوەتە ڕوو[٥٢٩] کـە هـەمان ئـەو ژمارەیەیـە لـە ڕاپـۆرتی دوو لـە ئەفـسەرەکانی ئەسـکەندەردا هاتووە[٥٣٠]، گومانی تێدانیە کە مێژوونوسـەکانیش بەڕاسـتترین سەرچـاوەیان زانیـوە و هـەمان ژمارەیان لە نووسراوەکانیاندا دووبارەکردۆتەوە، بۆیە جیاوازیان لەنێواندا نییە و ئەگەر هەشبێ، لەچەند هەزارێك تێپەڕناکات بۆ نموونە سەرچاوەیەك تێکڕای سوپا بە پەنجا هـەزار سـەرباز[٥٣١] و لەشوێنێکی تریشدا بەچل وحەوت هەزار و پێنج سەد سەرباز نیشاندراوە[٥٣٢].

هەرچی سوپای ئەخمینیەکانیش لەنێو سەرچاوەکاندا جیاواز نیشاندراوە، ئاریان ژمارەکەی بە چل هەزار سوارە و دووسەد گالیسکە و پانزە فیل[٥٣٣] و دیۆدۆر[٥٣٤] بەهەشت سـەد هـەزار پیـادە و

---

[٥٢٩] J.BURY and others: The Cambridge Ancint History, VOL.VI, p.٣٨٠.

– حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص١٠٨؛ الفيلد مارشال فيكونت مرنتجميري، الحرب عبر التاريخ، ترجمة وتحقيق فتحي عبدالله النمر، (القاهرة:١٩٧٠)، ص١٠٥.

[٥٣٠] بڕوانە: فيلافيوس اريانس: ايام الاسكندر الكبير في العراق، ص٢٥؛ حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص٣١؛جابر خليل ابراهيم: منطقة الموصل في فترة احتلال الاجنبي، موسوعة الموصل الحضارية، مج١، ص١٣٤.

[٥٣١] الادب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير ، ص٥٦.

[٥٣٢] طلال عامر المهتار: التاريخ العسكري(٤٧٠–١٩٤٥م)، دار اقرا، (بيروت: دت)، ص٤٤.

[٥٣٣] ايام الاسكندر الكبير في العراق، ص١٤.

[٥٣٤] دیـۆدۆر سـقلی: مێژوونوسـێکی یۆنانییـە لەشـاری جیریـۆمی دورگـەی سـەقلیە لـە (٩٠–٢٠پ.ز) لـەدایك بـووە سـەردەمی( یۆلیـۆس قەیـسەر و ئۆغـستس )ئیمپڕاتـۆرانی ڕۆمـانی بینیـوە ،لـەکتێبێکی (٤٠)بەرگـدا کـە(٩)بـەش لـە(١٤)ی دۆزراوەی بـاس لەشـەڕی گریـك وئـەخمینی و مێژووی جێنشینانی ئەسکەندەر دەکات، (حسن پیرنیا) نووسینەکانی بەڕێکوپێك دەزانێ پی یر بریان: تاريخ امبراطوري هخامنشيان از كورش تا اسكندر، ج٢، ص١٨١٨؛ جمس بكنغام : رحلتي الى العراق، ج١، ص١١١، هامش ٣.

دوو سەد هەزار سوارە و دوو سەد گالیسکە، (جستن)[٥٣٥]یش بە (٤٠٠)هەزار پیادە و سەد هەزار سوارە و پانزە فیل کۆرتیۆس[٥٣٦] بەدووسەد هەزار پیادە و چل و پێنج هەزار سوارەی نووسیوە[٥٣٧]، بەلاّم هەندێك سەرچاوە گەیاندویانەتە ملیۆنێك[٥٣٨]. کەچی( بسام العسلی) هەموو سوپاکەی بەهەشت هەزار سوارە و پیادە و دوو سەد گالیسکە و پانزە فیل خەملاّندووە و پێشی وایە کە هەندێك سەرچاوە، کە ئەو سوپایەیان بە دوو سەد هەزار و چوار سەد هەزار لە قەڵەمداوە، زیادیان پێوەناوە، بەپێچەوانەی ڕاستی جولاّونەتەوە[٥٣٩]. (مایکل لی لانغ)یش ژمارەی سوپاکەی بە دووسەد هەزار سەربازی پیادە و سوارە و دوو سەد گالیسکەی شەڕ و پانزە فیل نووسیوە، ئەو خەملاّندنانەش، کە ژمارەکە دەگەیەننە نیو ملیۆن سەرباز، بەپێوەنان(مبالغە) داناوە و گومانی هەیە، کە سەرەڕای کۆسپی تفاقی جەنگی توانرابێ ئەو هەموو ژمارەیە کۆبکرێتەوە[٥٤٠].

جا ئەگەرچی ڕاستیەکی جێی ئاماژەپێکردنە، کە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بەو سنوورە بەرفراوان و نەتەوە جۆراوجۆرانەی لەژێر قەڵەمڕەوی دابوون، بە بەراورد لەگەڵ مەکدونیا، کە پێشتر وتمان

---

[٥٣٥](جستن)ناوی یۆنانیۆس یۆنستی نیۆسە مێژوونوسێکی لاتینی سەدەی یەکی زاینیە لەسەردەمی ئیمپراتۆری یۆنانی ئەنتۆنیۆس ژیاوە دانەری کتێبێکی مێژوویی (٤٤)بەرگیە پیرنیا لە بارەی ئەو وتویەتی کە شێوازی خراپ نیە و هەندێکیان زۆر بالاّن، بەلاّم نازانرێ ئەوانە بۆ خۆی نوسیوونی یان لە (تروگ پومپی) وەرگرتووە. پی یر بریان: تاریخ امراتوری هخامنشیان، ج ٢، ص١٨١٩؛جمس بکنغام: رحلتی الی العراق، ج١، ص١٤٨، هامش ١٠.

[٥٣٦] کوینتوس کورتیوس(quintus Cortius): کۆنترین مێژوونوسی ڕۆمانیە بە ولاّتی میسر و فەلەستین وعێراق داگەڕاوە و جوان وەسفی بابلی کردووە کتێبەکەی بەسەرچاوەیەکی گرنگی مێژووی عێراقی کۆن دادەنرێ . جمس بکنغام : رحلتی الی العراق، ص، ٢٩٦، هامش٦.

[٥٣٧] فلافیوس اریانوس: ایام الاسکندر الکبیر فی العراق، ص١٤، هامش ٢؛ جمس بکنغام: رحلتی الی العراق، ج١، ص١٢٨-١٢٩، هامش .

[٥٣٨]بلوتارك: السیر، ج٣، ص١٢٨٤؛ ویل دیورانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٤٦٠؛ ستیون لوید: الرافدان، ص١٣٠.

[٥٣٩] الاسکندر الکبیر المقدوني، ص٧٨، هامش ١٢٨.

[٥٤٠]: المعارك المائة، ص١٠٩. هەروەها بڕوانە:

GreatSoiet Encyclopedia,atranslation ofthird edition(New york:١٩٧٤),vol.٥,p١٦٨.

زۆرتــرین بەشــی ســوپای لەشکرکێــشیەکەی پێکــدەهێناو ئەســکەندەر زیــاتر وەك هەڵوێــست سەرکردایەتی میللەتی گریکی دەکـرد، زیـاتر بـوو، چـونکە لـە توانایـدا هـەبوو سـوپای زیـاتر کۆبکاتەوە و کۆشی کردۆتەوە، بەڵام نەك بەو ڕادەیەی مێژوونوسە گریکـەکان باسـی دەکـەن، بـە تایبەتیش کە دەوڵەت سامانێکی زۆری لەبەردەستدابوو کە بواری دەدایە سەرباز بەپارە(المرتزقە) بەکرێ – لەنێویاندا خەڵکی گریك-بگرێت و کەلوپەلی جەنگی بکڕێت[541] .

ئـەو سـوپایەی، کـە ئەسـکەندەر بـۆ لەشکرکێـشیەکە ئامـادەی کردبـوو و لەمیانەشـیدا شـەڕی گۆگامیلای پـێ ئەنجامـدا، لـە ڕووی قـەوارە و ئـەرك و پاشـکۆکانیەوە سـوپایەکی هەمەچەشـنە تەیارکراو و هەمەجۆر پێکهێنراوبوو[542]، کە لەلایەن فلیپـی باوکیـەوە دروسـتکرابوو لـە ڕووی ڕێکخستن و چەکدارکردن[543] و ڕاهێنانەوە وەك باشترین سوپا بەشێوەیەك، کـە پێـشتر لـەگریك نەبینرابوو، ڕێکخرابـوو[544] ئەسـکەندەر دوای مردنـی بـاوکی بـەدوو سـاڵ سـەرلە نـوێ ڕێکـی خـستەوە، ئـەو سـوپایە جگـە لـە گروپـی جۆراوجـۆری ناسـەربازی، لـە کەسـانی سـەر بەچـین و توێـژەکانی هەرێمـە جیاجیاکـانی مەکـدونیا و جـەنگاوەرە هەڵبـژێراوەکانی ناوچـەکانی دەوروبەر[545]، کە ڕوخساری گریکیان بە لەشکرکێشیەکە دەداو نوێنەرایەتی ئەندامانی پـەیمانی کۆرنسەیان دەکرد و هاوپەیمانە گریکەکان، پێکهاتبوو، کە لە(یەکە)و(گروپ)ی هەمەچەشـندا، ڕێکخرابوون و ڕوخسارێکی گریکیان بە لەشکرکێشیەکە بەخشی بوو ڕۆڵی جۆراوجۆریشیان پێ سپێردرابوو[546] لەگەڵ گـرتنی ناوچـەکانی ئاسیاشـدا، بەتایبـەت ئەوانـەی، کـە وەك ڕزگارکـەر لەدەستی ئەخمێنیەکان سەیریان دەکردن، خەڵکی تریان هاتە پاڵ.

---

[541] فوکس ویبرن: الاسکندر الاکبر، ص٤٤.

[542] محمد الاسعد بن بوبکر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٢٣.

[543] بۆچاکسازی سوپا لەلایەن (فلیپ)ەوە بڕوانە:

Sarah Pomeroy and others: Ancient Greece, p.٢٧٨-٢٨١.

[544] بڕوانە: الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص٩٦-٩٧.

[545] ئەوانە بریتی بوون لە جەنگاوەرانی بەلقانی و تسالیای و تراقی و ئەغریانی و تریبالی و ئۆجیسیی و ئیلیۆنی ئەلبانی : محمد الاسعد بن بوبكر الحفص: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٢٣-٢٥.

[546] بسام العسلي: الاسکندر الكبير المقدوني، ص٥٦-٥٩؛ محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٢٣-٢٥.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی گریکەکان هەر لەسەدەی حەوتەمەوە و بەر لە شەڕ بایەخیانداوە بە ڕێکخستنی هێزەکانیان و بنەڕەتی ئەو ڕێکخستنەش (ترتیب)(ڤالانج = ڤالانگس = ڤالانژ) بووە، ڤالانکسیش ریزکردنێکی لەیەکدانەبڕاوی سفتە، لە پیادەی قورس، کە لەچەند ریزێکدا ڕێکخراون، قوڵایی لە نێوان(٨-٢٥)ریزە ماوەش لە نێوان هەر ریزێك و ریزێکی تردا، لەسنووری یەك مەتردا دەبێت، درێژیەکەی بەستراوە بەیەکتر، جاری وا هەیە دەگاتە(٥٠٠م) ماوەی نێوان جەنگاوەرێك و یەکیتر دەگاتە نیومەتر[٥٤٧]، بریتییە لەسیستمی کۆکردنەوەی سەربازانی پیادە لەسەر شێوەی ریز ریزی پتەوی بەدوایەکدا هاتووی تەیارکراو بە چەکی قورس، ڕێکدەخرێن کە هەندێ جار ژمارەیان دەگاتە(٣٠٠٠٠)پیاوی چەکدار، کە سەرەڕای شمشێر و زرێ و قەڵغان ڕمێکی(٢٠)پێ درێژیان پێیە و لەسەر شەڕکردن لە(١٦)ریزی یەك بەدوای یەکدا ڕاهێنراون[٥٤٨]، لە سەرچاوەیەکی تردا هاتووە، کە ڤالانکس لە ڕووی ژمارەوە هەندێ جار دەگاتە(١٦٣٠٤) سەرباز بە هەموو پلەکان کە لە(١٠٢٤)(قیستاردا یەکدەخرێن)[٥٤٩] واتە بەپێی شەڕەکان دەگۆڕا.

یەك لە شارەزایانی بواری سەربازی پێی وایە، کە گریکەکان سەرەتا ئەو سیستەمەیان لە میسریەکان وەرگرتووە برەویان پێداوە، سەرەتا لە(٤٠٠٠)سەرباز پێك دەهاتوو فلیپ کردیە دوو هێندە و ئەسکەندەر چوار هێندەی لێکرد -بەڵام ئەم بۆچوونی گێڕانەوەی سیستەمی سەربازگیریە بۆ میسر لەسەرچاوەکاندا پاڵپشتی نیە- و هاوتای سەرچاوەکانی تریش ئاماژەش بەدرێژی ڕمەکانیان دەکات پێی وایە هەندێکیان گەیشتونەتە(٢٤)پێ و ڕمەکانیش وەك یەك نەبوون و ریز لەدوای ریز درێژتربوون[٥٥٠] .

ڤالانکس وەك بەسەردادانێکی یەکگرتووی کتوپڕ دەجەنگا، کە پارچە پارچە نەدەکرا، سیفەتی چاکیشی ئەوەبوو، کە لە زەبر و زەنگی یەکەمدا دەستی خۆی دەوەشاند و

---

[٥٤٧] محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٥٧.

[٥٤٨] فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص١٦، هامش ١.

[٥٤٩] محمدعبدالفتاح ابراهیم: الحرب بین الماضي والحاضر، (القاهرة: دت)، ص١١٩-١٢٢. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٨).

[٥٥٠] محمود شیت خطاب: جیش الروم ایام الفتح الاسلامي، مجلة المجمع العلمي العراقي، مج(٢١)، ١٩٧١، ص١٣٣؛ فنودور.ب.کروفکین: تاریخ یونان باستان، ص١٥٢؛ بسام العسلي: الاسکندر الکبیر المقدوني، ص٥٣.

لەدوژمــن نزیـك دەبـۆوە[٥٥١]، بـەڵام نەبوونـــی هێـزی یـەدەگ و نادەسـتوبردی لەجوڵانـەوەدا (الافتقـــار في خفـــة الحركـــة)و مەســـەلەی فراوانـــی و تەختـــی زەوی کـە هەمیـشـە بـۆ پێکـــهاتن و ڕێکردنـــی پێویـسـت بـوو، لـە کەمایەســـیەکانی دروســـتکردنی(ڤـالانکس) بوون[٥٥٢].

خواسـتی داپۆشـین(التغطیـة) و کەمکردنـەوەی ڕۆڵـی خراپـی ئـەو کەمایەسـیانە، هـەنگاوی چاکسازی بەدوای خۆیدا هێنا، کە لە زیادکردنی ژمارەی سوارانی قورس بەرێژەی حەوت یـەکی هێزەکـان و ڕێکخـستنیان لەسـەر شێوەی سـێ ڕیـز، تـاوەك ڤالانکسـەکان توانـستی هەڵـسان بەهێرشکردنی بەشێوەی خێرا، تا دوورترین مەودا هەبێت، یەك لەو گۆڕانکاریانە بوو کە لەسـەر دەستی فلیـپ بـەدیهات[٥٥٣]، ئەسـکەندەریش ئـەم هێـزەی کـردە هێزێکـی بـەزەبری سـەرەکی و مانۆڕی بنەڕەتی لەباڵاکانی ڤالانکسەوە بەکاری دەهێنـان، لەوێـشەوە شـاڵاوی دەبـرد و دەسـتی دەوەشاند و دوای شکانی دوژمنیش دەکەوتە ڕاوەدونـانی و نەیدەهێـشت پـشوویدات، سوارەشـی دابەشکردبوو بۆ قورس و سوك و مـامنـاوەندی[٥٥٤].

واتە ئەم چاکســازیەی مـەکدۆنیـەکان و گرنگـــی دانیان بە ئەسپ ســواری دەشـێ وا دابنـرێ، کە ڤالانکسێکی سـوارەی لێکەوتۆتەوە، کە تائەوپـــەڕی مەودا بەقووڵـی هێرشـی دەکـرد[٥٥٥]، بەگشـتی دەکـرێ بڵێین سـوپای ئەسـکەندەر لەشـــەڕی گۆگـامێلادا پێکهـاتبوو لـە " پیـادەی قـورس یـان پیـــادەی ڕمهاوێـژ، کـە چـــەکەکانیان بریتـی بـوو لـەڕمی(١٨)پـێ درێـژ و شمشـێری کورت و ئامـــرازی خۆپاراسـتنی وەك قەڵغان و (مەقاڵ) زرێ و بەرگەپارێـز، پیـادەی مـامنـاوەند کە نێــزە و قەڵغانیان پێ بوو، پیادەی سوك، کە چەکەکانیـان بریتی بـوون لـەتیر و

---

[٥٥١] محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا ٣٣١،گۆڤاری ڕۆشـنبیری نوێ، ژمـارە(١٢٩)، ل٥٧.

[٥٥٢] محمد عبدالفتاح ابراهیم: الحرب بین الماضي والحاضر، ص١٢٤.

[٥٥٣] اریـك مـوزیر: مـدخل إلى التـاریخ العـسكري، ترجمـة اكـرم دیـري وهیـثم الایـوبي، (بیروت:١٩٧٩)، ص٢٩٥.

[٥٥٤] محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٥٨.

[٥٥٥] اریك موزیر: مدخل إلى التاریخ العسكري، ص٣٠٤.

نیـــزەهاوێژ و بــەردەقانێ(قۆچــەقانی ) هــەروەها ســـــوارەش بــە هەرســێ جــۆری قــورس و مـامناوەندی و سووك[٥٥٦].

بەپێی یەك لەسەرچاوەکان پۆلی پیادەی چەکدار بەچەکی قـورس لـەو سـوپایەدا قـەڵغانی خـڕی مەکدۆنی و هەڵبژێردراوە باشەکانیشیان قەڵغانی زیویان پێبوو، بەدوای ئەوانـدا پیـادەی خـاوەن قـەڵغانی دیکـە دەهـاتن، پاشـان شـت هاوێـژەران(القـاذفون)ی گـەلانی تـر، هەرچـی پاسـەوانە تایبەتیەکانی ئەسکەندەریش بوون، بریتـــی بـوون لەپیـــــادەی هەڵــبژێردراوی خانەدانـەکان و ئەسپ ســـوارە هاوەڵەکانی ، لەدوای هەموویان گالیسکەکان دێـــن، کـە ئەســـپی زرێ پـۆش رایاندەکێشان[٥٥٧].

لەچوارچــێوەی بــەرەی گریکــدا، هێزەکــانی داپۆشــین(تغطیــة)و هێڵــی پێــشەوە و هێڵــی دوومــاهی(سـپێر)و رێکخرابـوون، کـە هێـزی داپۆشـین لـەپیادەی سـووك و سـوارەی سـووك پێکـدەهات، ئامـانج لەبوونیـشی پاراسـتن و داپۆشـینی بەشـی هـەرە زۆری هێـزی شـەڕکەر و بەگژداچوونی گالیسکە جەنگیەکانی ئەخمینیەکان بوو لـەکاتی نزیـك بوونەوەیانـدا[٥٥٨]، هێڵی پێشەوە کە پێکهاتبوو لەناوجەرگە و(دڵ) هەردوو لابالی ڕاسـت و چـەپ، لای ڕاسـت دابەشـکرا بوو بۆ سەر هەشت تیپ (کتیبە) سوارەی قـورس، هەرکەتیبەیـەکیش بـەگوێرەی ڕێکخـستنەکە لەوپەڕی لابالەوە تا ناوچەی دڵ لەلایەن چەند سەرکردەیەکەوە، سـەرکردایەتی دەکـرا، کـە بـریتی بوون لە(کلیتۆس کوڕی درۆبیداسن، جیلـۆس یـاس، ئەریـستۆن، سـۆبۆلیز کـوڕی هرمـۆدۆرس، هیراقلیـــدس کـــوڕی ئـــەنتۆخیوس، دیمتریـــۆس کـــوڕی تـــامینس، میلیگـــر(ملیـــاجر)، هیگیوخس(هیجوخس) کوڕی هێبۆسترانس) سەرکردەی گشتی سوارەکانیش، فیلۆتـاس کـوڕی پـارمینیۆن بـوو، کـە هێـزی بنـەڕەتی و بـەزیپك و توانـابوون بـەدوای سـوارەکاندا پیـادە زرێ هەڵگرەکان دەهاتن، کە سەرکردەکەیان نیکاتۆر کوڕی پارمنـیۆن بوو و ئەسکەندەر خۆشـی لـەو لابالەدابوو، ناوچەی دڵیش(ناوجەرگە) فیکتۆر سەرکردایەتی دەکـرد، کـە لەڤالانکـسی پیـادەی قورس پێکهاتبوو، بریتی بوو لەشەش کەتیبە(الایات) هەر کەتیبەیەکیش لەسێ سـریەی هـەزار جــەنگاوەری ســازدرابوو، کــە ســەرکردەکانیان ئەمانــە بــوون: کــانوس(کۆمینــۆس) کــوڕی بۆلیمۆکراتیس)، بێردیکاس کوڕی ئۆنتـەر، میلیگـر کـوڕی نیوبتـۆلمس، بـولیس یـرکن(بـریس برخـون)و ئـەمیانیاس و ئـەمینیاس)، ئـەرکی ئـەو بەشـەی سـوپا(ناوجەرگـە) خـۆ ڕێکخـستن و گونجاندن بوو لەتەك هێزەکانی بـالی ڕاسـت لەپـەلاماردانی بەرەییـدا، لـەو دەمـەدا، کـە هێـزی

[٥٥٦] محمد نجم الدين نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩) ،ل٥٨.

[٥٥٧] فيلافيوس اريانس: الاسكندر الكبير في العراق، ص٢٥، هامش ١.

[٥٥٨] محمد نجم الدين نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٥٨.

سەرەکی بەزەبروزەنگ پەلامار دەباتە سەر دوژمن. پارمنیۆن کوڕی فیلۆتاس سەرکردایەتی گشتی باڵی چەپی دەکرد و بەهێزێکی سوارە[٥٥٩] کە لەتسالیەکان[٥٦٠] سوار چاکتر بوون دەورەدرابوو، پێکهاتبوو لەکەتیبەی پیادەی سووك بەسەرکردایەتی کلوتیسروس یان کروتیرس یان کراتۆر کوڕی ئەسکەندەر، کە ئەرکی ڕاگرتنی شالاو و هاتنە پێشەوەی گالیسکەکانی ئەخمینی بوو، هەروەها کەتیبەی سوارەی گریکی بەسەرکردایەتی ئەریجیوس یان ئەریغیوس کوڕی لاریاکس و سوارەی تسالیەکان، بەسەرپەرشتی فلیپ کوڕی مینیالوس کە هەردوو کەتیبەکە سوارەی ناوەندی بوون، ئەرکیان بریتی بوو لە داپۆشینی ڤالانکس و بەکارهێنانی هێز بەپێی گۆڕانی شەڕەکە و ئەو گردکاریانەی پێویستی بەگورجی و خێرایی هەبوو[٥٦١]، هەرچی هێڵی دوماهی(یەدەگ)یشە لەناو جەرگەکەیدا (ڤالانکس) پیادەی ناوەند هەیە، کە ئەرکی ڕاگرتن و بەربەستکردنی ئەو زەبر و زەنگانە بوو، کە سوارەی ئەخمینی دەیان نواند و ئەمەش بەئاگاداری و ئاوڕدانەوە لە هەردوو لا چ لەو کاتەدا کە ڤالانکسی قورس دڕی بەهێزی بەرامبەر، دەدا یان دوای سەرکەوتنی ئەخمینیەکان لەجێبەجێکردنی دەورەدان (أحاطة)دا، ئامادەی بەهاناوەچوونی هەر(یەکەیەك)ی لاوازبوون لەبەرەدا، لەلای ڕاستیشیاندا یەدەگی پیادە هەبوون، کە دەکەوتنە پشتی سوارە پاسەوانەکان، هەر لەو هێڵەدا سێ کەتیبەی سوارەی ناوەند هەبوون، کە منیداس و ئەریتس و ئەریستۆن سەرکردایەتیان دەکردن و ئەرکیان بەربەستکردنی شالاوەکانی سوارە و گالیسەکاکانی ئەخمینی بوو، لەوپەڕی لای چەپی ئەو هێڵەی پشتەوەشدا ئەندۆماخۆس هەبوو[٥٦٢]، لە پشتەوەی بەرەش کەلوپەل و پێداویستی سوپاو دیلەکان

---

[٥٥٩] مەبەست لەو هێزە فرسالیەکان بوون .

[٥٦٠] مەبەست لە تسالیەکان خەڵکی هەرێمی تسالیای باکوری یۆنان بوون کە ناوچەکەیان بە دەشتی بە پیت بۆ دانەوێڵە بەناوبانگە و ناودارترین شارەکانی (لاریسا)یە، سەربازەکانیان بە سوارچاکی و ئازایەتی ناسراون. زینفون:حملە عشرە الاف ،ص٩٢ هامش٥؛ بسام العسلي: اسكندر الكبير المقدوني، ص٥٤، هامش ٦٩.

[٥٦١] فیلافیوس اریانس: ایام الاسكندر الكبير في العراق، ص٢٢-٢٣؛ حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص٣٣-٣٤؛ محمد نجم الدين نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٥٨.

[٥٦٢] حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص٣٤؛ نەقشبەندی، محمد نجم الدين: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٥٨.

لەژێر پاسەوانی سەربازە پیادەکانی تراقیا دانرابوون و بەدوری شەش میلیش سەربازگەی گریك هەڵکەوتبوو[٥٦٣].

ئامرازەکانی گەمارۆدانی مەکدۆنی بریتیبوون لەبورج و مەنجەنیق و بەردەقانێ (قۆچەقانی)و (سەیوانی خۆپاراستن)، هەروەها ئەسکەندەر، یەکەم کەس بوو، کە لەهەموو هێرشەکانیدا تۆپی گۆرەپان(مدفعیە میدان)ی بەکارهێناوە، کە پارچە پارچە دەکراو لەئاژەڵ باردەکرا[٥٦٤]-زانیاریان لەسەر شێوە وپێکهاتەکانی وچۆنیەتی کارپێکردنی دەست نەکەوت-، هەرچی ئەخمینیەکانیش بوون لەماوەی (٢٠)مانگی دوای شەڕی ئیسوس، بەتایبەت کە لەوەڵامدانەوەی نەرێنی ئەسکەندەر بەپێشنیارەکانی داراو ڕاوێژکارانی خۆشی بۆ بەئاشتی پێکهاتن هیوابڕاوی کردن، تێکۆشانی زۆریان کرد لەپێناو پێکهێنانی سوپایەکی بەهێز[٥٦٥]، سەرلەنوێ دەستکرا بەڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی و دروستکردنی هێزێکی سەربازی ئامادە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی سوپای گریك لەشەڕێکی تری یەکلاکەرەوەی چاوەڕوانکراودا[٥٦٦]. سروشتی پێکهاتنی سوپا لەدەوڵەتی ئەخمینیدا باوبوو وا، کە لەنێو هەموو گەلانی ژێردەستیاندا، سەرباز گیریان دەکردو لەچەندین تیپدا ڕێکدەخران، هەموو تیپێکیش بەزمانی خۆیان دەدوان و بەشێواز و چەکی خۆیان دەجەنگان بەمەشێوەیە سوپایەك پێکهات، کە تێکڕای ڕەگەزەکانی[٥٦٧] ناو ئیمپراتۆریەتی دەنواند[٥٦٨]، کە تەیارکرابوون بە تیرو کەوان نێزەو ڕم و زرێ[٥٦٩] و ئەسپ و فیل و گالیسکەی شەڕ[٥٧٠]یان پێ بوو[٥٧١]، ڕێکخستنی ڕووبەڕووبونەوە(الترتيب القتالي) لە سوپای ئەخمینیدا

---

[٥٦٣] الفيلد مارشال فيكونت مونتجيري: الحرب عبر التاريخ، ١٠٦. بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتر بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٧) بەرەی گریك لە نەخشەی شەڕی گۆگامیلادا.

[٥٦٤] الفيلد مارشال فيكونت مونتجيري: الحرب عبر التاريخ، ص٩٧.

[٥٦٥] نفس المرجع، ص١٠٢-١٠٣.

[٥٦٦] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٦؛ محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٤٥.

[٥٦٧] لەنێو پێکهێنەرەکانی سوپای ئەخمینیدا فارسە ئەخمینی ومیدی وبابلی وسوری وئەرمەنی وکەپەدۆکی و بەڵخی وسەغدی وئەرگۆسی وهیندی وهیتر هەبوون :اولريش ولكن : اسكندر مقدوني ، ص١٧٩.

[٥٦٨] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٧.

[٥٦٩] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٩).

[٥٧٠] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١٠).

لەسەر بنەمای دابەشکردنی کەرتەکان بوو، کە سوپایان لێ پێکهاتبوو هەروەك باو بوو ، هێڵی یەکەم ئەو هێزانەی تێدابوو کە توانای جوڵانەوەی باشیان هەبوو لەسوارە و تیرهاوێژ پێکدەهات، بەدوایاندا هێڵی ناوەند دەهات، کە فیل و گالیسکەی بەداس چەکدار کراوی تێدابوو. بەشی زۆریان لە فارس و سەرباز و بەکرێگیراوە گریکەکان بوون... هێڵی دووەمیش کەرتە دووەمیەکانیان دەنواند کە لە ڕەگەزو یاریدەدەرەکانی فارسی سەر بە نەتەوەکانی تر بوون، بەلآم ڕەنگ ڕشتن و پلانی شەڕەکە (تصميم المعركە) لەسەر هێزی سەرەکی ناوجەرگە و هێزی پارێزگاری لاباڵەکان وەستابوو[٥٧٢]. کە سوپایان لێ پێکهاتبوو هەروەك باوبوو پێکدەهات لە هێڵی یەکەم کە ئەو هێزانەی لەخۆ دەگرت کە توانای جوڵانەوەی باشیان هەبوو بریتی بوون لە سوارە و تیرهاوێژەکان بەدواشیدا هێڵی ناوەند هەبوو کە لەلاباڵی ڕاست وچەپ پێك دەهاتو تیایاندا گالیسکەی داسدار و پیادە و سوارە و تیرهاوێژ بە یەکسانی دابەشدەبوون،دوای ئەویش هێڵی کوشتاری کۆتایی دەهات و تیایدا سوارە و پیادە بەدەوری پاشادا قەراریان دەگرت، کە چەقی سەرکردایەتی کردنی خۆی لە پشتی هێڵی ناوەنددا جێگیر کردبوو[٥٧٣]، لە شەڕی گۆگامیلاشدا بەهەمان شێوەی سەردەمی خەشایرشا سەربازەکانی ئەخمینی بەپێی ویلایەت دابەش بووبوون و هەر ویلایەتێکیش لەلایەن والیەکانەوە سەرپەرشتی دەکران[٥٧٤] .

بەڕێوەبردنی یەکەکانی سوپاش وەك ئەوەی فلافیوس ئاریانس بەسەریەکەوە نیشانیداوە، لە نێو سەرچاوەکانی تریش لە میانەی وردەکاریەکانی ڕێکخستنی بەرەی شەڕدا ئاماژەی پێکراوە بەمشێوەیەی خوارەوەیە[٥٧٥]: (هیندی وباکتری وسەغدیەکان) لەلایەن (بەسوس)ی والی بەکتریا سەرپەرشتی دەکران سکیسی (Ccythian –السيثيون)کان لەلایان سەرکردەیەك بەناوی مافاسس (Mavaces) سەرکردایەتیدەکران و وبارسنتس (Barcaentes)یش هەریەك لەئارخوسی (Archotians)و ئەوسەربازانەی بە هیندیە چیاییەکان ناودەبران بەڕێوەدەبرد، سات بارزانس (Satibarzanes)یش ئاریاییەکان و(فەرتافرنس Phrataphernes)

---

[٥٧١] ویل دویرانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٣٦٠؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٧؛ اولرش ويلكن: الاسكندر مقدوني، ص١٧٩.

[٥٧٢] محمد نجم الدين نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٦٩.

[٥٧٣] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني ،ص٧٧؛ محمد نجم الدين نقشبندی، شەڕی ئەربیلا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ژمار١٢٩، ل٥٧.

[٥٧٤]البرت تن ايك اومستد:تاريخ شاهنشاهي هخافشي،ص٧١٥؛رمان گريشمن:تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٢٧٤.

[٥٧٥] بۆ ناسیتی هەموو ئەو میللەتانەی کە هێزەکانیان پێکهێناوە لە بابەتەکەدا ناویانهاتوە بەگوێرەی شوێنی نیشتەجێبوونیان بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٢٥).

پارت (الفرث Phartthians) یەکان وهێرکـانی و تابوریـەکان کەئـەوانی دوایـی هـەموویان سوارەبوون، بەڕێوەدەبرد ئەتڕۆپاتیش سـەرکردایەتی میـدی وکادۆسـی وئەلبانـەکان و ساسیـسی نیـۆن وسـەربازانی ناوچـەکانی نیـشتەجێی نزیـك دەریـای سـوری دەکـرد، بـەڵام ئۆکـسیەکان وسوسـیەکان پەیوەنـدیانکرد بەئۆکـسارتس کـوڕی ئـەبولێتس کـە سـەرکردایەتیان بکـات، فەرماندەی بابلیەکانیش (بوبارس )بوو، کاریەکانیش کەدوورخرابونـەوە بـۆ ئاسـیای ناوەڕاسـت وسیتاسیەکانیش لەگەڵ بابلیەکان بوون، ئەرمەنیەکان ڕۆڕنتس ومیتراد(میثرداد) ڕێبەرایەتیان دەکردن، کەپادۆکیەکانیش ئاریامس، بـەڵام ئـەو سوریانەی کـەمازیۆس لـەکاتی پاشەکشەیدا، شانبەشـانی پێـشڕەوی کردنـی ئەسـکەندەر،لەگەڵ خۆیـدا هێنـابوونی، خـۆی ڕێبەرایـەتی دەکردن[٥٧٦].

وردەکاری ڕێکخستنی بەرەش بەشێوەیەك بوو کە وەك هەندێك دەڵـێن لـەلاباڵی چـەپیدا بـەکتری ودانـی و ئەرغوسـیەکان جێگیر کرابـوون بەدواشـیاندا سـوارە و پیـادەی فارسـە ئەخمینیـەکانو سـەربازەکانی سوسـاو قـادەش هـەبوون، کـە بەرواڵـەت لـە فەرمانـدە تایبەتیـەکانی خۆیـان جیابووبوونـەوە[٥٧٧].کەچـی فیلافیـوس ئاریـانس لـە زمـانی ئەرستۆبۆلـسەوە تـەنها ئامـاژە بـە باکتریاییەکان و دانی (Daan)وکادۆسی (Cadissins)دەکات لەو باڵەدا ، کە تـا ناوەنـدی سوپای دەگرتەوە جێگیرکرابوون[٥٧٨].

بەڵام لاباڵی ڕاست وەك (البرت تـن ایـك اومـستد ) بـەدوای یەکـدا (ترتیـب) دیـاری کـردوون بریتی بـوون لـە(ئـەلبانی وساسیـسینی (ساکـسیثی)ەکـان وتـابوری وهێرکـانی ومـادو، پـارت (فرث)ەکان دەستە سەربازیەکانی کە لەسوریا هێنرابـوون[٥٧٩]. کەچـی سەرچـاوەیەك لـەناو ئـەو باڵەدا هێـزە سـوریەکانی ناونـەهێناوە[٥٨٠] و توێـژەرێکی تـریش سـەرەڕای باسـنەکردنی هێـزی ناوبراو لەوێدا هێزی پێکهاتوو لەخەڵکی دۆڵی ڕافدەین بەعێراقیەکان ناودەبـات کەهـەم وشـەکە تازەیـە و لـەو سـەردەمە بەکارنـەهاتووە، هـەم هـیچ کـام لـەدوو سەرچـاوەکەی پێـشوو باسـی نەکردووە[٥٨١].

---

[٥٧٦] فلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص١١-١٤.

[٥٧٧] البرت تن ایك اومستد: تاریخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٧١٤؛ حناخباز: المعارك الفاصلة في التـاریخ، ص٣٢؛ محمـد نجـم الـدین نقـشبندي: شـەڕی ئـەربیلا گۆڤـاری ڕۆشـنبیری نـوێ، ژمارە١٢٩.ل٦٠.

[٥٧٨] ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٢١.

[٥٧٩] تاریخ شاهنشاهي هخامنشي ،ص٧١٤-٧١٥.

[٥٨٠] فلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٢١.

[٥٨١] حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاریخ، ص٣٣.

داریوشی پاشا لەناوەند (ناوچەی دڵ)جێی گرتبوو بەدەوریدا، جەنگاوەرە تایبەتیەکانی پاشاو دەستەی نەمران (خالدین-جاریدان[٥٨٢])و ڕم هاوێژانی ئەخمینی کە سەری ڕمەکانیان(سێوی زێڕی پێوەبوو[٥٨٣])، هەبوون ،هەر لەناوەندا دەستەی هیندی وکاری وتیرهاوێژانی مەرداسی (مرداثي) و بابلی هەبوون، لەپشتەوەی داریوش و هەردوولای هێزی فارسەکان بەکرێگیراوی گریکی (المرتزقه)، قەراریان گرتبوو لەپشتی ناوەند (مرکز)یش هێزێك هەبوو، کە لەئۆکسیو بابلی و تیرەکانی دەوروبەری کەنداوی فارس پێکهاتبوون، لەبەردەم ناوچەی دڵیش پانزە فیل وپەنجا گالیسکەی (سکیث سیث) جێگیر کرابوون و لەبەردەم لابالی چەپو لەبەرامبەر لابالی ڕاستی سوپای گریك، کەئەسکەندەریش لەوێ جێی گرتبوو ،ئەسپ سوارانی سکیسی ونزیکەی هەزار بەکتریایی وسەد گالیسکەی داسدار قەراریان گرتبوو، ئەرمەن وکەپادۆکی وپەنجا گالیسکەی داسداریش لەبەردەم لابالی ڕاست بوون[٥٨٤].

مەبەستیش لەوشێوە ڕێکخستنە واتا دانانی یەکەکان بەدوای یەك و لەتەنیشت یەکدا، چارەسەرکردنی ئەو هەڵەیە بوو، کە داریوش لە شەڕی ئیسوس تێی کەوتبوو، کاتێك هەموو سەربازەکانی بەڕیزێکی درێژ لە بەرامبەر سوپای ئەسکەندەردا جێگیر کردبوو[٥٨٥]

کەچی نووسەرێك پێی وایە، کە ڕەوشی سوپای داریوش زۆر بێسەروبەرە و هیچ ڕێکخستنێکی پێوە دیارنەبووە لە نێوان پیادە و سوارە و گالیسکە و ئافرەتان و خزمەتکاران پێوە دیارنەبوو[٥٨٦].

---

[٥٨٢] هێزێکی دەهەزار سەربازی بوو سەرەتا لەلایەن داریوشی یەکەمەوە دامەزرابوو دواتریش مابوو، کە هەمیشە ئامادەی شەڕ بوون وبەباشترین چەك تەیاردەکران هەرگیزیش ژمارەکەیان کەمی نەدەکرد، چونکە هەرکاتێك یەکێك برینداربووبا یان گیانی لەدەستدا با بێدواکەوتن کەسی تری لەشوێن دادەنرا. یوزف ویسهوفر: ایران باستان، ترجمة مرتضی ثاقب فر، ص١٢٤؛ فاروق صفی زادە: پاسخ به تاریخ، (تهران: ١٣٨٦)، ص٣٧٢.

[٥٨٣] ئەوانە لە سوپای ئەخمینیدا ژمارەیان هەزار کەس بوو پاسەوانی تایبەتی شابوون، فەرماندەکەیان پێی دەووترا (هزارپتس Hazarpatis) یوزف یوسهوفر : ایران باستان ،ص١٢٧.

[٥٨٤] فلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٢٠-٢٢؛ البرت تن ایك اومستد: تاریخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٧١٤-٧١٥؛ حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاریخ، ص٣٢-٣٣. بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٧).

[٥٨٥] فوکس ویبرن: الاسکندر الاکبر، ص٨٠.

[٥٨٦] طلال عامر المهتار: التاریخ العسکري(٧٠٤ق.م-١٩٤٥م)، ص٤٤.

مونتجميری وای لێکداوەتەوە، کە دارا بەهۆی زۆری ژمارەی سەربازەکانی بەرەیەکی فراوانی بەدوو لابالّی بەهێز لەسوارە دروستکردو بۆ خۆی سەرکردایەتی ناوچەی ناوەندی دەکرد، کە پێکهاتبوو لەپیادەی ڕاهاتوو پاسەوانانی نێزە هەڵگر لەگەڵ دووهەزار بەکرێ گیراوی گریکی لەهوبلیت[587]، لەبەردەمیشیدا هەزار سوارە لەپاسەوانانی پادشاو هێزی سوارەی هیند و کاریەکان هەبوون، لەکاتێکدا لابالّی چەپ لەژێر سەرکردایەتی بەسوزدابوو کە لەچەند کۆمەڵە سوارەیەکی هاتوو لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەت پێکدەهات و لە نێویاندا هەزار سوارەکە زرێی قورسیان هەڵگرتبوو پێیان دەگوترا ساکا، لای ڕاستیش لەژێر سەرکردایەتی مازیوسدا بوو، کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك سوارەی هاتوو لە ڕۆژئاواوە لە نێویاندا کەپەدۆکیەکان جێگیربوو بوون لە پێشەوەش دووسەد گالیسکەی جەنگی و لە ناوەڕاستیشدا پانزە فیل[588].

---

[587] هوبلیت: بەسەربازی پیادەی گریکی واتا سەربازی قورس لەناو فالانکسدا دەوترا، کە قەڵغان و زرێ وجلوبەرگی سەربازی و کولاوە خودە و ئەژنۆپۆش و ڕمێکی دووسەری هەڵدەگرت: ارنولد توينبي: تاريخ الحضارة الهيلينية ، ص١٢١؛ بسام العسلي الاسكندر الكبير المقدوني، ص٥٢؛ عبدالحكم حسن صالح: تاريخ العالم منذ فجر الحضارة حتى احداث ١١سبتمبر ٢٠٠١، (القاهرة: ٢٠٠٦)، ص٥١. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (١١).

[588] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٥.

## تــــەوەرەی دووەم
## شوێن و ناو و ڕوودانی شەڕەکە

### ١- شوێن و ناوی شەڕەکە:

هەرچی ناوی شەڕەکەیە لە نێو کتێبە مێژووییەکاندا بە زۆر شێوە دەربڕاوە، کە دەکرێ بەگشتی هەموویان کۆبکەینەوە و لە ژێر دوو دەستەواژەی (ئەربیلا-گوگامیلا)دا ڕێکیان بخەین.

ناوهاتنی بە (ئەربیلا)بە گوتەی (بلوتارك) لەلای زۆربەی نووسەران[٥٨٩] بە(ئەربیلای کۆن و ئەربیل=هەولێر)ی ئێستای هەڵکەوتو لەسەر خاکی بەشی باشوری کوردستان، پەیوەستە، کە لە هەرە کۆنترین شارەکانی جیهان و زۆر بەناوبانگی سەردەمی ئاشوورییەکان بووە و لە نەخشە بزمارییەکاندا باسکراوە و تا ئەوکاتەش ئەو ناوبانگەی پاراستبوو و گەورەترین شارێکیش لە ناوچەکەدا، بوو کە ئەسکەندەر ڕاستەوخۆ دوای شەڕەکە پێی گەیشتووە و دوای چەند ڕۆژێك تێیدا ماوەتەوە[٥٩٠]. گوتراوە، کە لەدوای لەناوچوونی نەینەوا یان سەردەمی هاتن و گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانییەکە لەساڵی (٤٠١)ی پێش زاین جگە لە هەولێر(ئەربیل) هەموو شارەکانی

---

[٥٨٩] بڕوانە: السیر، الجزء الثالث، ص١٢٨٤.

[٥٩٠]طه باقر و فؤاد سفر: المرشد إلى مواطن الاثار والحضارة: الرحلة الخامسة، ص٤؛ هادي رشيد الجاوشلي: تراث اربيل التاريخي، (الموصل: ١٩٨٥)، ص١٩-٢٠؛ عبدالله امين آغا: معركة اربيلا، اربيل، ٢٠٠٤، ص٨؛ دلشاد عزيز زاموا: گەڕان بەدوای شوێنەواری جەنگی ئەربیلادا، گۆڤاری مێرگ، ژ(٤٦)، ل٢٠.

دیکەی ئاشووریان ببوونە وێرانە یانیش تەنها وەك گوندێکی بچوك مابوونەوە[٥٩١]. دواتریش بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان نەك هەر هەولی ئاوەدانکردنەوە لەلایەن ئەخمینیەکانەوە بەدی ناکرێت بەڵکو خراپتریش بوو.

جگە لەوەش ڕەنگە دارا وەك بارەگای پشتەوەی بەرەی جەنگ (مقر خلفی) بەکاری هێنابێ و ئازوقە و تفاقی جەنگی تێدا کۆ کردبێتەوە[٥٩٢]. هەروەها گوتراویشە کاتێك گریکەکان بینیویانە، کە ئەربیل، قەلاو شوێنی نیشتەجێ بوونێکی گەورە بووە و نزیکیش بووە لە گۆڕەپانی شەڕەکە، ئەویش خۆی شوێنێکی زۆر ناسراو نەبوو[٥٩٣]، گوتویانە سەرکەوتنەکە لەنزیك ئەربیل ڕوویدا، هەر بەمشێوەیەش مێژوونووسەکان گواستوویانەتەوە. لەچاو گۆگامیلاش گۆکردنی لەسەر زمان سووکتر بووە، لەبەرئەوەش، کە ئەسکەندەر لە گۆڕەپانی شەڕ خۆی دوانەخست و یەکسەر هاتە ئەربیل، تا ڕێ لەسەر لەنوێ خۆ ڕێکخستنەوەی دارا بگرێت[٥٩٤].

ئەمە جگە لەوەی کە ئەسکەندەر دوای کۆتاییهاتنی -کە دواتر باسی دەکەین- شەڕ دەسکەوتە جەنگییەکانی هێنا ئەوێ و لەوێدا کۆیکردنەوە[٥٩٥].

هەرچی وشەی گوگامیلایە ئەوە ناوی ئەو گۆڕەپانەیە، کە شەڕەکەی لێ قەوماوە و لە وەرگێڕدراوەکانی کتێبی پلۆتارك بە(ژینگەی وشتران=مناخ الجمل)[٥٩٦] خانەی وشتران (خانەی شتر)[٥٩٧]، وەرگێڕدراوە. ئەلبێرت ئەیك ئۆمستد نووسیویەتی کە سترا بۆ بەخانەی وشترانی نووسیوە بەلام لەڕاستیدا (گانو) بەمانای (چراگاه-لەوەرگا) دێت، لەبەرئەوە دەستەواژەکە

---

[٥٩١] م.شترك: دائرة المعارف الاسلامية،مادة اربيل، ترجمة احمد الشنتناوي وآخرون، مج٢، ص٥١٧؛ جورج رو، العراق القديم، ص٥٥٠.

[٥٩٢] حسن پیرنا: ایران باستان، جلد دوم، ص١٢٢٩؛ زوبير بلال اسماعيل: اربيل في ادوارها التاريخية، ص٩٦؛ جمس بكنغام، رحلتي إلى العراق ، ج١، ص١٢٧.

[٥٩٣] STRABO: THE Geography of STRABO, V II, p.١٩٧;

جمس بكنغام: رحلتي إلى العراق ، ج١، ص١٢٧، هامش و، ص ١٣١ هامش؛ فؤاد جميل: حدياب: اربيلا... عشتار... بابل، مجلد سومر، مج ٢٥، ج١-٢، ص٢٢٦.

[٥٩٤] عبدالله امين اغا: معركة اربيلا، ص٨.

[٥٩٥] ستيون لويد: رافدان، ص١٣٠؛ طه باقر وآخرون: تاريخ ايران قديم، ص٧٩.

[٥٩٦] بلوتارك: السير، ج٣، ص١٢٨٤.

[٥٩٧] بلوتارك: ايرانيان ويونانيان، ص٢٩٢.

مانـای لـەوەڕگای وشـتران دەگەیـەنێت[٥٩٨]. نووســەرێکیش بــە مــاڵی وشـتر (بیـت الجمـل)ی نووسیوە[٥٩٩].

لەسەر بنچینەی ناونانەکـەش ڕای جیـاواز هەیـە، هەنـدێك بـە ڕووداوێکـەوە پەیوەسـتی دەکـەن و دەڵـێن گوایـا دارا بـن هستابـسی پاشـای ئـەخمینی بـەهۆی خێرایـی یـەك لەوشـترەکانییەوە لـە ڕاوەدوونانی سکیسیەکان(سکیث)، ڕزگاری بووە، ئەویش لەبەرئەو چاکەیە لەوێ شوێنی حەوانـە و کەسی تایبەتی بۆ خزمەتکردنی تەرخانکردووە[٦٠٠]. یان دەڵێن وشترەکە زۆر مانـدوو بـووە بـە هەڵگرتنی کەلوپەلی پاشاکە، ئەویش لەبەرانبەردا ئەو چـاکەیەی داوەتـەوە، کـە باسمـانکرد[٦٠١]. بەڵام یەکێك لەتوێـژەرەکانی بەڵگـەی ئـەم ڕایـە بـەناماقووڵ و نادروسـت دەزانێـت و بـە جۆرێـك لەئەفسانە و خـەیاڵ لێکیدەداتـەوە، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش پـشت بەبەڵگـەی جوگرافیـایی گونجـاو دەبەسـتێت[٦٠٢]. سەرچـاوەی دیکـەش هەیـە کـە بنـچینەی ناونـانی شـوێنەکە، کـە بـەئارامی (Gvgml) یـاخود (Gamel-Gad) واتـا مـاڵی وشـتر (بیـت الجمـل) لێکداوەتـەوە، بـۆ هەڵکەوتنی ئەو گردە دەگەڕێتەوە، کە گوندەکـەی لەسـەر دامـەزراوە و گوایـا لـە پـشتی وشـتری کردووە[٦٠٣]. شوێنەوارناسێکیش نـاوی (Gomel) یـان (Gomela) وەك ئامـاژە بـۆ نـاوی کۆنی (Gaugamela) بە ئەگەر تێدەگات[٦٠٤].

---

(٥٩٨) STRABO: THE Geography, V II, p.١٩٧;

– تاريخ شاهنشاهی هخامنشی، ص٧١٤.

(٥٩٩) فؤاد جميل: حدياب، اربيلا، عشتار، مجلة سومر، مجلد ٢٥، جزء الاول والثاني، ص٢٢٦.

(٦٠٠)STRABO: THE Geography, Book VII, p.١٩٧;

– بلوتارك: السير، ج٣، ص١٢٨٤.

(٦٠١) فـؤاد جميـل: حـدياب، اربـيلا، عـشتار، ص٢٢٦؛ جمـس بكنغـام: رحلـتي إلى العـراق، ج١، ص١٢٧-١٢٨.

(٦٠٢) عبدالله امين اغا: معركة اربيلا، ص٢٧-٢٨.

(٦٠٣) جمـال رشـيداحمد: دراسـات كرديـة في بـلاد سـوبارتو، ص٢٩؛ موعتەسـەم سـاڵەیی: تێپەڕبوونی لەشکری ئەسکەندەری مەکدۆنی بە کوردستاندا، ل١١٢.

(٦٠٤) Austen H. Layard: Discoveries among the Ruins of Nieneveh and Babylon with Travels in Armenia, Kurdistan and desert, (Newyork: ١٨٥٣), p.١٧٧

شایانی باسە کە دەستەواژەکە لە هەموو سەرچاوەکاندا بەیەك شێوە دەرنەبڕدراوە و نەنووسراوە، بەڵکو بەچەندین شێوەی جیاجیا لەسەرچاوەکاندا ئامـاژەی پێکراوە وەك (گـۆگملا، کـۆکملا، غۆغامیلا، غوغمیلا، کۆکاملا، کۆکمالا، کۆکامیللا، جاوغمیلا، جاوجمیلا، کۆکمیلە[٦٠٥]، جـوغمیلا [٦٠٦]، گـائۆگمیلا[٦٠٧]، کافکامـل[٦٠٨]، تەنانـەت گیـل کمـش[٦٠٩] جافجمیلا[٦١٠]...هتد) هاتووە، کە ڕەنگە ناوی گوندێکی وێران یان ئاوەدانیەك بێ کەئێستا ناوەکەی گۆڕاوە[٦١١]، بەهۆی هەڵە خوێندنەوە یان هەڵە نووسین یان پەڕاندنی پیت و گۆڕینی پیتەکان بە گوێرەی گۆکردن‌و گۆنەکردنی‌و بوون‌و نەبوونیان — بۆ نموونە وەك دەرنەبڕینی پیتی (گ) لەزمانی عەرەبیدا- و جیاوازی دەربڕین لەنێو توێژەران (اختلاف التلفظ)یاخود نەبوونی ئاگـایی زۆر لـەبارەی بابەتەکـە، کـە وایکـردووە گرنگـی بـە پێداچـوونەوەی نـاوە راسـتەکە نەدرێت[٦١٢].

ڕەنگە بەکارهێنانی گۆگامێلا، کە لـەدوو وشـەی (گـۆ-گـامێلا)پێکهـاتووە لـەبارترینیان بێ، چونکە سەرچاوەکان تێکڕا باس لەشوێنێکی تەختی بەرفراوان دەکەن کە شەڕەکەی لێ ڕوودراوە، یەك لـە وشـەکانیش لـە زمـانی کوردیـدا، کـە گوزارشـت لـە شـوێنی تـەخت و فـراوان بکـات وشەی(گۆڕ) ە تا ئێستاش ئەو وشەیە لە فەرهەنگی گفتوگۆکردنـدا ئامـادەیی هەیـە بـۆ نموونـە دەوترێـت گۆڕەپـان واتـا (سـاحە، مەیـدان) ڕەنگـە ئـەو(گـۆ) یـەش هـەمان ئـەو گـۆڕە بێـت و بەتێپەڕینی کات گۆڕانی بەسەرداهاتبێ، ئەگەر وشەی گامێلاش لە(Gamela)ی ئارامی یـان (جمل)ی عـەرەبی وەرگیرابێ، ئـەوە گـامێلا نـزیکترە تـا(جمـلا، گمـلا، غمـیلا، کامـل...هتـد)، هەرچەندە قسەکردن لەسەر گێڕانەوەی وشەکە بۆ ڕیشەیەکی ئارامی یان عەرەبی، کە ناوی وشـتر بگەیەنێ بەرەهایی، کارێکی دروست نیە، چونکە ئەگەر بەڵگەی ئەو لێکدانەوەیـە بـوونی ئـەوان

---

[٦٠٥] عبدالله امين اغا: معركة اربيلا، ص٢٩-٣٠.

[٦٠٦] هادي رشيد الجاوشلي: تراث اربيل التاريخي، ص٥٨.

[٦٠٧] البرت تن ايك اومستد: تاريخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٧١٤.

[٦٠٨] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٧ ،هامش٥.

[٦٠٩] هیرمان بنگسون: یونان و پارسان، ص٣٢١.

[٦١٠] محمود فهمي: تاريخ اليونان، ص١٦١.

[٦١١] هادي رشيد الجاوشلي: تراث اربيل التاريخي، ص٥٨.

[٦١٢] عبدالله امين اغا: معركة اربيلا، ص٣٠.

بێت لەناوچەکە، ئەوە خۆ دانیشتوانە ڕەسەنەکەی زۆر پێشتر لەوێ بوون. ئەی ئەوانە ناوی چیان لێناوە؟ بۆ مێژوونوسەکان ئاماژەیان پێنەداوە؟ بۆیە دەشێ لەئایندەدا ساغ بێتەوە کە ناوەکە لەوشەیەکی خۆجێیی داتاشرابێت، خۆشمان زۆر وشەمان هەیە کە لەو وشەیە نزیک بێت لەوانە (گەماڵ واتا سەگ، گۆمیلکە بچوککراوەی گۆم، گا ...هتد) ڕەنگە قورس هاتنە سەرزمان و ئەنقەستیش لە تێکدانی روخساری وشەکەدا ڕۆڵی هەبووبێت و هەموو ئەوانەش وایان کردووە کە لەگشت سەرچاوەکاندا ناوەکە بەیەك شێوە نەنووسرێت و دەرنەبڕدرێت.

بە سەرنج لەو سەرچاوانەی ئاماژە بەشەڕی گۆگامیلا دەکەن، دەرکەوتووە، کە شەڕەکە لە شوێنێك کە هەڵگری هەمان ناوبووە، ڕوویداوە و لە سنووری نێوان هەولێر و موسڵ هەڵکەوتووە، بەڵام چونکە گوندێکی کتومت بەو ناوە لە ئێستادا بەرچاو ناکەوێت، یان وەك وتراوە ڕەنگە ناوی گوندێکی چۆلکراو وێران یان گوندێك، کە ئێستا ناوەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، یان دەربڕینی وشەکە لە کتێبە بیانیەکاندا لەگەڵ واقع تێکنەکاتەوە[٦١٣]، بۆیە بەوردی دەست نیشانکردنی شوێنەکەی لەسەر نەخشە کارێکی ئاسان نییە، هەوڵدان لەو بوارەشدا بیروبۆچوونی جۆراوجۆری هێناوەتە ئاراوە و سەرنجی توێژەرانی ئاراستەی چەندین جێگەی ناوچەکە کردووە، کە ئاماژەی مێژوونووسەکانیان لەوبارەوە بەبیری خۆیان لە تۆبۆگرافیای ئەوێدا بینیوەتەوە و بە گوێرەی شەڕەکە یان نزیك لەوێیان لەقەڵەمداوە، بەڵام ((دیارە تا ئێستا کەس نەگەیشتۆتە ئەنجامێك کە هەمووان قایل بکات))[٦١٤]، لەو نێوەندەشدا هەر یەك لە ناوچەکانی (نێوان هەردوو زێی گەورە و بچوك لە نزیك هەولێر و دەشتی هەولێر، دەشتی نەینەوا، بەرتلە[٦١٥]،

---

[٦١٣] زوبير بيلال اسماعيل: اربيل في ادوارها التاريخية، ص٥٨.

[٦١٤] دلشاد عزيز زاموا: گەڕان بە دوای...، گۆڤاری مێرگ، ژمارە(٤٦)، ل١٨.

[٦١٥] بەرتلە: گوندێکی گەورە و بەرفراوانە و لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە بە دووری پانزە تا بیست و پێنج کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی موصل هەڵکەوتووە و نزیکە لەچیای مەقلوب و ناوەندی قەزای حەمدانیە و(نووسراوە...) سەر بە قەزای پارێزگاری موصلە. جارية شكري رمضان رسول الكوراني: ريف الموصل في العصر العباسي من قرن الرابع إلى منتصف قرن السابع للهجرة (دراسة حضارية، اطروحة دكتوراه مقدمة إلى كلية الآداب، جامعة الموصل، (موصل: ٢٠٠٦)، ص٣٦؛ گورگيس عواد يعقوب سركيس: الموصل اسماء مدن وقرى عراقية، (بغداد: ٢٠٠٩)، ص٤١.

کرملـــــس[٦١٦]، خـازر لـه نزیـك گونـدی زاب و گـــــــردی گۆمـــل[٦١٧] تـا بـاکووری چـیای مـــەقلوب[٦١٨]، کـــەنارەکانی گۆمـــل) گـــردملا و گردمامـــك[٦١٩]، دەشـــتی نزیـــك شـــوێنی بەیەکگەیشتنی خازر و زێی بچووك[٦٢٠] ناویان هاتووە[٦٢١]. رەنگـە ئەسـتەمی دیاریکردنەکـە و بۆچوونە جیاوازەکانیش وایکردبێت، کە هەندێك خۆیان نەخەنـە نـاو ئـەو وردەکارییـانـەوە و هـەر بەوەندە وازبێنن کە بڵێن شەڕەکە لەنێوان هەولێر و موسڵدا روویداوە، بێ ئامـاژەکردن تەنانـەت بەدووری هیچ کام لەو دووشارە لە گۆڕەپانی شەڕەکە[٦٢٢]، یان ئامـاژەی هـەر بـە دووری شـارێك لەو دوو شارە کردووە و ناوی هەردووکیانیشی هێناوە[٦٢٣]. هـی واش هەیـە نـەك هـەر ئامـاژەی

---

[٦١٦] گونـدی کـرملس: بـەدووری ١٦-١٨ کیلۆمـەتر لەرۆژهـەڵاتی شـاری موصـل هەڵکـەوتووە لـە رووی بەرێوەبردنەوە سەر بە ناحیەی قەرەقوش ناو قەزای (حمدانیە)یە، گورگیس عـواد ویعقـوب سـرکیس: أصـول اسمـاء مـدن وقـری العراقیـة، ص١١٢؛ حبیـب حنونـا: تـاریخ کـرملیس، ص٨؛ جاریة شکري رمضان رسول الکوراني، ریف الموصل في العصر العباسي، ص٣٧.

[٦١٧] گـردی گۆمـل: شـوێنێکی (اثـري)یـە و لـەنزیك شـوێنی بەیەکگەیـتـشتنی رووبـاری خـازر و رووبـاری گومـل هەڵکـەوتووە. گـورگیس عـواد ویعقـوب سـرکیس: اصـول اسمـاء مـدن وقـری العراقیة، ص١١٦-١١٧.

[٦١٨] چیای مـەقلوب: لـەباکوری رۆژهـەڵاتی موصـل بـەدووری ٢٠کـم و رۆژئـاوای رووبـاری خـازر هەڵکـەوتووە و بەرزییەکـەی ٢١٥ پێیـە بـەرزترینی چـیاکانی نزیـك(موصـل)ە. جـیمس بکنغـام: رحلتي إلی العراق سنة ١٨١٦، ج١، ص١١٢، هامش١١؛ جاریـة شـکري رمـضان رسـول الکـوراني: ریف الموصل في العصر العباسي، اطروحة دکتوراه، ص١٨.

[٦١٩] وتراوە کە سوپای ئەسکەندەر رووەوە هەولێر لەنزیك گوندی گردمامك زێـی گـەورەی بڕیـوە و ئێستاش شوێنەواری پردێکی کۆنی لێیـە و بـەتلیموس ئـەو شـوێنە بـە(کورخورا) نـاوبردووە: زبیر بـلال اسماعیـل: اربیـل في ادوارهـا التـاریخیـە، ص٩٦، هـامش(١٤)؛ هـادی رشـید الجـاوشلی: تراث اربیل التاریخی، ص٥٨.

[٦٢٠] Austen H. Layard: Discoveris among..., p.١٧٧.

[٦٢١] زوبیر بیلال اسماعیل: اربیل في ادوارها التاریخیة، ص٥٨.

[٦٢٢] اندرو روبـرت بـرن: تـاریخ الیونـان، ص٤٣٣" عبدالحسین زریـن کـوب: روزگـاران، ص١٢٥ " حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٢.

[٦٢٣] بۆ نموونە: محمد آ. دندامایف: تاریخ سیاسي هخامنشیان، ص٣٦٤.

بەدووری هیچکام لەو شارانە نەکردووە، بەڵکو هەر بەوەندە وازی هێناوە کە بڵێت لە نزیک موسڵ هەڵکەوتووە[٦٢٤]، بەڵام بە زۆری لەگەڵ شەڕی گۆگامیلا ناوی (ئەربیل) وەك ناوچەی نزیك لێیەوە هاتووە[٦٢٥].

هەرچی جیاوازی بۆچوونەکانیشە لەسەر هەڵکەوتنی شوێنی روودانی شەڕەکە، دەشێت لەوەوە سەری هەڵدابێت کە ئەو شوێنە جێیەکی بەناوبانگ نەبووە و رەنگە خسڵەتێکی جیاکەرەوەی زۆر زەقی لەگەڵ ناوچەکانی دیکەدا نەبووبێت و ئەگەر هەشبووبێت باسنەکراوە، شارێك نەبووە تا لەرێی شوێنەوارەکەیەوە بناسرێتەوە، ئەو باسەش کە مێژوونووسە کۆنەکان کردوویانە — بە لەبەرچاوگرتنی خاڵەکانی دواتر- بۆ ناوچەکە وەك وەسفێکی گشتی دەچێتو دەشێت لە زۆرینەیاندا بەدی بکرێت[٦٢٦]. گریکەکانیش دوای سەرکەوتنەکەیان تێیدا نەماونەتەوە و شارێك یان قەڵایەکیشیان تێدا دروستنەکردووە کە پاشماوەکانی بکرێنە بەڵگە. دەگونجێت هەڵە تێگەیشتن لە مەبستی ئەو ناوانە کە مێژوونووسەکان لە میانەی نووسینەکانیاندا ئاماژەیان پێداوە و ناو هاتنی ئەربیلاش وەك هاوواتا یان لە جیاتی ناوی گۆگامیلا بۆ شەڕەکە لە سەرچاوەکاندا، مەزەندەی لێ تێکدابن. هەژمارکردنی تەنها مەودای رووباری خازری هەڵکەوتوو لە باشووری چیای مەقلوب لەسەر رێگەی نێوان هەولێر و موسڵ و بە رووباری خازر دانەنانی بەشی هەڵکەوتوو لە باکوری هەمان چیا، وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی وەهەو سەر لێشێوانی هەندێك کەس، کە یەك لە توێژەران بۆی دەچێت[٦٢٧]، هۆکارێکی دیکەی جێی ئاماژە پێکردنە[٦٢٨].

توێژەرێکی بواری شوێنەوارناسی، لەوەڵامی پرسیاری چۆنیەتی دۆزینەوەی شوێنی شەڕەکە، جەخت لەسەر پێویستی توێژینەوەیەکی ورد دەکاتەوە کە بەهەمئاهەنگی لەلایەن شوێنەوارناس

---

[٦٢٤] عبدالعظیم رضائی: تاریخ ده هزار ساله ایران، ص٣٠٦.

[٦٢٥] بڕوانە: جورج رو: العراق القدیم، ص٥٢٢؛ رمان گریشمن: تاریخ ایران از آغاز تا اسلام، ص٢٧٤؛ حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاریخ، ص٣١.

[٦٢٦] بۆ نموونە بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٢٤).

[٦٢٧] عبدالله امین اغا: معرکة اربیلا، ص٨.

[٦٢٨] بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر لە بارەی ئەو هۆکارە و ئەو شوێنانەش کە وەك جێی شەڕەکە ئاماژەیان پێکراوە بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٤).

و مێژوونوس و پسپۆڕانی بواری جوگرافیای مێژوویی جوگرافیای سەربازی ئەنجام بدرێت و بەبێ ئەوەش باسکردن لە دۆزینەوەی شوێنی جەنگەکە بە تەنها خەیاڵ دەزانێت، چونکە ئەویش وەك شەڕەکانی تری کۆن بەتیرو ڕم و شمشێر و خەنجەر و عەرەبانە بەڕێوەچووەو دوایی کۆتایی هاتنیشی لەگەڵ زرێ و کڵاو تەنانەت جلوبەرگی کوژراوەکانیش وەك تالآنی جەنگی لەلایەن سوپا یان تاڵانچیانەوە، براون. لەبەرئەوە تەنها شتی جێی پشت پێبەستن تەنها ئێسك و پروسکی کوژراوەکانە ئەویش ئەگەر نێژرابن، بەڵام بەپێی هەندێك سەرچاوە ئەسکەندەر لەبەر بۆنی لاشەی مردوان ئەویش لەبەر گەرمی هەوا زۆر و بۆنکردنیان، زوو هەولێری بەجێهێشتووە، ئەوەش مانای وایە ئەگەر کوژراوانی بەرەی گریکیش نێژرابن، ئەوانی تر جێهێڵراون و ئاژەڵ و دڕندە خواردوونی، بۆیە پشتبەستن بە شوێن هەڵگرتنیان ئەستەمە[٦٢٩].

(کلۆدیۆس جێمس ریچ) لەو بارەوە نووسیویەتی: ((بە پێی ئەوەی کە مێژوونووسە کۆنەکان ئاماژەیان بەوە کردووە کە گۆگامیلا دەکەوێتە سەر ڕۆخی ڕووباری بۆمادۆس(خازر) ناتوانین هیچ یەکێك لەو گوندانەی ناو ئەم دەشتە بە گۆگامیلا دابنێین، دەشزانین کە لەسەردەمی ئەسکەندەر گۆگامیلا گوندێکی ئاسایی بووە، لەبەر ئەوە گریکەکان لەناوی ئەو شوێنەوە کە شەڕەکەیان لەنزیکییەوە بڕاندۆتەوە ناوی (ئەربیلا)یان لێناوە، چونکە نزیکترین شوێنی گرنگ بووە لە مەیدانی شەڕەکە، باسکردنی گۆگامیلاش جیا لە هەموو شوێنێك لەو کاتەدا تەنها بە مەبەستی دیاریکردنی شوێنەکە بووە، خۆ ئەگەر ئێستا بمانەوێ شوێنی شەڕەکە دیاریبکەین هیچمان بەدەستەوە نییە، لەوە زیاتر کە پشت بەزانیاری خۆمان ببەستین لەسەر دەشتەکە ئەمەش کارێکی بێئەنجام دەبێت، ئەگەر نەڵێین هەر ناکرێت))[٦٣٠].

لایاردیش پێی وایە ئەگەر زانیاری تۆبۆگرافیایی مێژوونوسەکانی سەردەمی ئەسکەندەر لەبەرچاو بگرین ئەوە بە تەواوی ناتوانرێت شوێنی شەڕەکە دیاری بکرێت[٦٣١].

---

(٦٢٩) دلشاد عەزیز زاموا: گەڕان بەدوای شوێنەواری جەنگی ئەربیلادا، گۆڤاری مێرگ، ژمارە(٤٦)، ل٢٠-٢١. (جیمس ملك بکنغام)یش لە زمانی کۆرتیوسەوە باس لەو هۆکارە بۆ زۆر نەمانەوەی ئەسکەندەر لە هەولێر دەکات. رحلتي إلى العراق، ج١، ص١٣٢، هامش.

(٦٣٠) گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان(١٨٢٠)، (هەولێر: ٢٠٠٢)، ل٣١٧.

(٦٣١) Austen H. Layard: Discoveris among…, p.١٧٦.

کرملیس یەکێك لەو شوێنانەیە، کە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کراوەو کۆمەڵێك نووسەر بە گۆگامیلای دەزانن، و هەیە لە ناویاندا بەتەواوی دڵنیایە کە ئەوەی سەلماندووە و پێیوایە کە پشکنینەکانی ئەو ناوچەیە تەواو قایلیان کردووە کە شوێنی ناوبراو گۆڕەپانی راستەقینەی شەڕەکەیە[٦٣٢]. یەکێك لەشوێنەوارناسانی بەریتانی هۆکاری دانانی کرملیس بە گۆگامیلا، بە لێك نزیکی دەربڕینی ناوەکانیان (التقارب اللفظي بين التسميتين) دادەنێت[٦٣٣]و (کلۆدیۆس جێمس ریچ)یش، کە نازانیت هۆکاری سەرنجدانی لەکرملیس وەك شوێنی شەڕەکە لەچییەوە هاتووە، دەڵێت: (( رەنگە نەزانینی جێگەکە و هەڵبژاردنە سەیرەکەی ناوەکە، هاندەر بن بۆ ئەم دیاریکردنە))[٦٣٤]. کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا رەنگە گۆمل نزیکتر بێت نەك کرملیس.

یەکێك لەو توێژەرانەی کە شەڕەکە بە شەڕی کرملس ناودەبات گوتوویەتی: ((کە پێویستە بڕوایەکی زۆرمان بە (فیلافیوس اریانس) بێت، چونکە ئەو نووسیویەتی شوێنەکە لەگەڵ تۆپۆگرافیای کارە جەنگییەکانی ئەسکەندەر دێتەوە))[٦٣٥]و نزیکی (کرملس)یش لەو رێگایەی دەچێتە رووباری خازر هەندێك لە مێژوونووسانی لایەنگری ئەو بۆچوونەی سەرەوە کردووە[٦٣٦].

کەچی مێژوونوس (فیلافیوس اریانس) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە گۆگامیلا لە نزیك رووباری بۆمادۆس(خازر) هەڵکەوتووە[٦٣٧]. (کلۆدیۆس جێمس ریچ)یش پێی وایە، بە پشتبەستن بە قسەی (فیلافیوس اریانس و کۆرتیوس[٦٣٨]) لە بارەی هەڵکەوتنی شوێنی گۆگامیلا لەسەر

---

[٦٣٢] حبيب حنونا: تاريخ كرملس، ص٣٢-٣٣.عبدالله امين اغا : معركة اربيلا ، ص٣٣ .

(٦٣٣)Austen H. Layard: Discoveris among…, p.١٧٧;

[٦٣٤] گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، ل٣١٧.

[٦٣٥] حبيب حنونا: تاريخ كرملس، ص٣٣.

[٦٣٦] عبالله امين اغا: معركة اربيلا، ص٣٣-٣٤.

[٦٣٧] ايام اسكندر الكبير في العراق، ص١٤-١٥.

[٦٣٨] کۆینتوس کورتیوس(Quintus cortius) لە کۆنترین مێژوونوسەکانی رۆمانە و سەردانی سوریا و عێراق و فەلەستینی کردووە لە بارەی بینینی ئەو شوێنانەش شتی زۆری نوسیووە، کتێبەکەی سەرەڕای هەندێك هەڵەی پەیوەست بە هەڵکەوتنی هەندێك شوێن بە سەرچاوەیەکی

رۆخی بامۆدۆس و دانانی کرملس بە گۆگامیلا شیاو نییە، چونکە بە قسەی ئەو بە هیچ شێوەیەکی کرملس ناکەوێتە سەر ئەو رووبارە[٦٣٩].

عەبدولرەزاق الحصان کرملس بە گۆگامیلا دەزانێت، چونکە لیکوس(Lycus) (زێی گەورە) ئەوەی مێژوونووسە کۆنەکان باسیان کردووە، بەزێی بچوك تێگەیشتووە و پێیوایە، کە شەڕەکە لە نێوان خازر و زێی بچوکدا روویداوە[٦٤٠]. ڕای دیکەش هەیە کە دەشتی فراوانی بەرتلە بە شوێنی شەڕەکە بەرتلەش بە گوندی گۆگامێلا دادەنێن[٦٤١]. هەشن ئاماژە بە شوێنی دیکە دەکەن. گۆملیش یەکێکی دیکەیە لەو شوێنانەی کە وەك گۆڕەپانی شەڕی گۆگامیلا یان وەك شوێنی شەڕەکە، مێژوونووسان قسەیان لێکردووە. (ئەلبێرت تن ئیك ئومستد) لەوبارەوە باسی کردووە کە " گائۆگمیلا گوندێکی بچوك بوو لەخوارووی دامێنی چیا بە لای باکوردا هەلکەوتبوو، ئێستاش لە پشتی وێرانەکەی گردی گۆمل هەیە کە یادەوەرییە کۆنەکانی پاراستووە[٦٤٢]. هی تریش هەن کە گوتوویانە " (کۆکملا) لەسەر رووباری گۆمل هەلکەوتووەو هەردوو ناوەکەش یەك ریشەیان هەیە[٦٤٣]. هەیشە کۆکمیلیا بە بچوککراوەی ناوی رووباری گۆمل دەزانێ[٦٤٤].

---

گرنگ بۆ مێژووی عێراقی دادەنرێت، ئێستا ئەو رووبارە بە(خازر) ناودەبرێت: فیلافیوس اریانتس: الایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص١٥، هامش ١؛ جمس بکنغام: رحلتي إلى العراق، ص٢٩٦، هامش٦.

(٦٣٩) گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، ل٣١٧ ؛ عبدالله امین اغا: معرکة اربیلا، ص٢٤.

(٦٤٠) نظرة عابرة في شمال العراق، (بغداد: ١٩٤٠)، ص١٠٢-١٠٣.

(٦٤١) زوبیر بیلال اسماعیل: اربیل في ادوارها التاریخیة، ص٩٥-٩٦؛ عبدالله امین اغا: معرکة اربیلا، ص٦.

(٦٤٢) تاریخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٧١٤.

Great Sovietncyclopedia,vol.٥,p١٦٨

(٦٤٣) سیتون لوید: الرافدان، ص١٣٠؛

(٦٤٤) جمعة عبدالله:ارض کردستان.. بدایة الصراع بین الشرق والغرب،مجلة سردم العربي، العدد١٩، السنة الرابعة، ص٦٠.

(عبدالله أمين ئ‌غا) لەدوو توێـــی لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسـەر ئەو شـەڕە ئەنجامـیداوە لـە میانەی هەوڵدانیدا بۆ دیاریکردنـــی شوێنەکەی و سەلماندنـــی رای خـۆی، کـە پێیوایـە گۆمـل هەمان گۆگامیلایە، پەنای بردۆتە بەر زۆر لایەنـی جیـاواز، لە نێویاندا ئامـاژەی بـەوە کـردووە کە لە زمانـی گـریکیدا هەندێك پیت دەنووسرێن، بەلاّم ناخوێندرێنەوە، بۆ نموونە پیتـی (P)ی ئینگلیـزی لـە وشـەی (Musplla)دا گۆناکرێـت و بـە(Musela) موسـیلا =موسـڵ دەخوێندرێتەوە، ئەم حاڵەتە لەدووباره بوونەوەی پیتـی (G)یش لـە وشـەی (Gaugamela-Guagamela)[٦٤٥] بوونـــی هەیـە (G) یەکێکیـــان گـۆ ناکـــرێتو وشـــەکە بـە (Guamela-Gaumela) دەخوێندرێتــەوە[٦٤٦]. بۆیــە گـــونجاوە ئەگـەر بگـــوترێت" وشـەی (گۆمـل)ی ئێســـتا هـەمان وشـەی گۆگامیـــلایە و بـەو شـــێوەیە دەخوێندرێتـەوە، بـەلاّم ئـەوەی جیـــێی هەڵوەســـتە لەســـەر کـــردنە ئەوەیـە کـە" بەناوهێنانـــی شـەڕەکە بـە گۆگامیـــلا لە کـــۆندا بەتایبەت لای گریکەکان یان مێژوونووسانـــی دیکـەش، ئەم راســـتییە پێچـــەوانەی خـۆی دەنوێنێت، چونکــە ئەوە ئێمـــەین، کە بەشــوێنەکە دەڵـێین گـــۆمـل، نـەك ئەوان، خۆ ئەگـــەر ئێمـە بە شـــوێنەکەمان گوتبا گـــۆگامـــیلا لای ئەوان بـە گۆمـل نـاوی هاتبا، راستی ئەو قسەیە دەسەلما.

بەلاّم جەختکردنەوەی هەندێك لە مێژوونوسە کۆنەکان لەسـەر ئـەوەی کـە شـەڕەکە لـە گونـدی گۆگامیلای هەڵکەوتوو لەسەر رووبـاری بۆمـادۆس یـان بۆمیلـۆس روویـداوە[٦٤٧]، دەسـتەواژەی بۆمادۆس (Bumelo-Bumelus-Bumodus)یش، کـە وەك نـاو بـۆ رووبـاری خـازر و هەردوو لقەکەی لەلای گریکەکان، بەکار هێندراوە و هەندێك لە پێشینان بۆ جیاکردنـەوەیان بـە خازریان گوتووە (بۆمادیا یان بۆمادی)، (گۆمل)یشیان بە(بۆملیۆ یان بۆمیلۆس) ناوبردووە و لە سەرچاوەی تریشدا هاتووە، کە بە گریکی بـە رووبـاری (کۆملسۆ(کومـل صـو)، دەگوترێـت بۆملۆس)[٦٤٨]. مانای وایە کە دەشتێ رووباری خازر کە مێژوونووسە کۆنەکان ئاماژەیان پێداوە

---

[٦٤٥] جێی ئاماژەیە توێژەر بە گوتەی خـۆی ئـەو زانیاریانـەی لـە(سـعید دیوەچـی) ئـەویش لـە(طه باقر) وەرگرتووە، واتا لە سەرچاوەیەکی نووسراو وەرینەگرتووە. معركة ا ربيلا، ص٣٠-٣١.

[٦٤٦]نفس المرجع، نفس الصفحة.

[٦٤٧] بڕوانە: عبدالرزاق الحصان: نظرة عابرة في شمالي العراق، ص١٠٠.

[٦٤٨]بڕوانە: عبدالله امين اغا: معركة اربيلا (كوكاميلا ٣٣١ ق.م، ص٢٤-٢٥.

و سەرنجی لێکۆڵەرەوانی بۆ شوێنی جیاجیا ڕاکێشاوە، لقی خازری نزیك لقە ڕووباری (گۆمەل)ی بەشی سەرەوەی ڕووباری خازر بێت، پێش تێکەڵبوونیان بە یەکتر. ئەگەر ئەوەش وابێت دەبێ شەڕەکە لەدەشتی گۆملی نێوان هەردوو لقە ڕووباری خازر و گۆمل ڕوویدابێ. کارستن نیبوریش بەبێ ئاماژەکردن بە هیچ بەشێکی ڕووبارەکە، ڕووباری ( بومەلBoumelle ) بە خازر دەزانێت[٦٤٩].

هەرچی مەسەلەی ئەو شتانەشە، کە گوایا ئەسکەندەر و سوپاکەی لە میانەی ڕێکردنیان دوای پەڕینەوە لە دیجلە تا گەیشتن بە شوێنی شەڕەکە و دووری ئەو شوێنانەش تا دەگاتە هەولێر(ئەربیل) پێی وایە کە ئاماژە پێکردنیان ڕایەکە بەهێزتر دەکات و جیاوازیشیان لەگەڵ دووری ئێستای نێوان هەولێر و گۆمل کە ئەو بە شوێنی شەڕەکەی دەزانێت، دەگێڕێتەوە بۆ گۆڕینی ئاراستەی ڕێگاکانی پێکگەیشتن و نەریتی ئێستای پێوانەکردن کە بە پشتبەستن بە سەرچاوە مێژووییەکان بۆ سەلماندنی ڕایەکەی، ئاماژەی پێداوە و ناوهاتنیشی لە نووسراوەکاندا بە سیفەتی جۆراوجۆری وەك (ڕووبار، شوێن، گوند، دەشتو شار) تێبینکردنی هەموو ئەوانەی باسکران لەناوچەکەدا لە ڕاستی نزیکتری کردۆتەوە[٦٥٠].

واشی کردووە کە پێمان وابێ، هەرچەندە ناکرێ بە ڕەهایی بڕیار بدرێت لەسەر گۆمل و هیچ جێیەکی دیکەش لە حاڵەتی ئێستادا، بە شوێنی شەڕی گۆگامیلا، بەڵام بە تێفکرین لە بەڵگەکانو نزیکی ناوەکانیشیان لە یەکتری دەگونجێ لە نێو شوێنەکانی دیکە وەك گونجاوترین جێگە بۆ ئەو شەڕە لێی بڕوانین.

هارۆلد لەب ئاماژەی بەچەند شتێك کردووە، کە بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەوەی لە ناوچەکەدا بوونی هەیە و مێژوونووسان باسیان کردووە، دەردەکەوێ کە ڕەنگە ئەسکەندەر ئاراستەی ڕۆیشتنەکەی بەرەو گۆمل بوو بێت، چونکە هاوشێوەی وەسفەکانی ئەو لە ناوچەکەدا دەکەونە سەر یەك هێڵ. ئاماژەکردنی ئەو بە وەسفی ئەو شوێن و شتانەی کە ئەسکەندەر و

---

[٦٤٩]، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ترجمة: محمود حسين امين، مراجعة وتعليق: سالم الالوسي، (بغداد: د.ت)، ص٩٥، هامش ٩٨.

[٦٥٠] بڕوانە: گورگيس عواد ويعقوب سركيس: اصول اسماء مدن وقرى عراقية، ص١١٦-١١٧" عبدالله امين اغا: معركة اربيلا، ص٩، ص١٦-١٧، ص٢٠.

پیشکاروانەکانی لە میانەی رۆیشتنیاندا تووشی بوون، وەك بینینی شارێکی چۆلکراو کە لەئەملا و ئەولای دەروازەکەیدا پەیکەری ئاژەڵی باڵداری بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵێك سەربازی چەکدار هەبووبێ، تووشبوونیان بە بەربەستێك کە ئاوی تێدا نەبووە و جۆگەیەکی ئاو گواستنەوەی لەبەر دروستکرا و کە لەچیاکەی تەنیشتی ئاوی بۆ شارەکە گواستۆتەوە، پاشان رەتبوونی یەکەکانی سوپا بۆ رۆژی دواتر بە بەردەم قەدپاڵی چیایەك کە پەیکەری گەورەی لێهەڵکەندرا بوو، بە گوتەی شارەزا فینیقییەکانی هاوسەفەری کە بۆ رێبەریکردن لە ولاتی شامەوە رەگەڵیان کەوتبوون، هی خواوەند و پاشاکانی ئاشوورین...[٦٥١] لەگەڵ شوێنەوارە بە دوای یەکدا هاتووەکانی ناوچەکە دێتەوە. شارەکە شاری (دورشروکین) دەنوێنێ[٦٥٢] کە سەرجۆنی ئاشووری (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) دروستی کردووە و کە ئێستا پێی دەگوترێت خرساباد[٦٥٣]، پاشان جۆگەی سەنحاریب و پردەکانی جەروانە یان گۆمل دێن[٦٥٤]. کە سەنحاریب لە چوارچێوەی پرۆژەی ئاو راکێشانەکەی بۆ سوودمەندبوونی نەینەوا لە ئاوی سازگاری چیاکان دروستی کردبوون، ئەوی دیکەش پەیکەرە تاشراوەکانی خەنس[٦٥٥] دەنوێنن کە لەسەردەمی هەمان پاشای ئاشووری دروستکراون[٦٥٦].

---

[٦٥١] هارولد لمب: الاسكندر المقدوني، ص٢١٠-٢١١؛ لە وەرگێردراوە فارسیەکەدا، ص٣٨-٣٩.

[٦٥٢] بۆ بەرچاو روونی زیاتر بروانە: طه باقر وفؤاد سفر: المرشد إلى الموطن الاثار والحضارة، الرحلة الثالثة، (بغداد: ١٩٦٦)، ص٣٥-٣٦؛ مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الجزء الاول، ص٥١٦-٥١٧.

[٦٥٣] خرساباد: گوندێکە لە رۆژهەلاتی رووباری دیجلە و لەسەر رێگای عین سفنێی ئێستا بە دووری (١٨کلم) هەڵکەوتووە. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣، ص٢٢٤؛ طه باقر وفواد سفر: المرشد إلى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الثالثة، ص٣٥؛ جارية شكري رمضان الكوراني: ريف موصل في العصرالعباسي، اطروحة دكتورا، ص٤٠

[٦٥٤] بروانە: طه باقر وفؤاد سفر: المرشد إلى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الثالثة، ص٣٩-٤١.

[٦٥٥] خەنس لە چوارچێوەی قەزای شێخان-عین سفنێ و دەوروبەری نزیکەی هەشت کیلۆمەتر رووە و باکوری رۆژهەلات لە ناوەندی قەزای شێخان هەڵکەوتووە و کەوتۆتە رۆژئاوای رووباری گومل بە بەرزی زیاتر لە(٦٥٠م) لەئاستی رووی دەریا. ؛ طه باقر وفؤاد سفر: المرشد إلى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الثالثة، ص٣٩ ؛ بێوارخنسی: الاثار في خنس واهميتها، (اربيل: ٢٠٠٠)، ص١٣.

تورێژەرێك بە مەیدانی چۆتە شـوێنەكە و لە نووسینێكدا گوتوویەتـی (لە سـالّی ۲۰۰۳ حەوت رۆژ لە هەولێرەوە تا عـەین سوفنـیّ گەرِام كـرد بـۆ دەست نیشانكردنی جێگـەی ئەو شـەرِە، كە لە نزیك گـردی گـۆمل (جومـل) كـە ئـەو كاتـە شـار بـووە، روویداوە، بـە كـامێرای فۆتـۆگراف‌و ڤیـدیۆ وێنـەی زۆرم گـرت و گومـانم لـە شـوێنێك كـرد لـەو دۆلّـە لـە(خارۆباڤیـان[٦٥٧]) كـە شـوێنی سـەربازگەی دواوەی سـوپای ئەسـكەندەر بـێ ، چـونكە ئەسكەندەر هاتۆتە عەین سوفنیّ‌و لەوێوە هاتۆتە خەنس و باڤیان نەك رێگـای ئێستای گـشتی عێن سفنیّ‌و پێریووب و ناوك)[٦٥٨].

شـایانـی باسـە سـەرچاوەكان لە نیشاندانـی دووری نێوان گـۆگامیـلا و ئەربیلدا وێرِای ئەو شـوێنانەی لە زەینـی خۆیاندا بە شوێنـی شـەرِەكەیان داناوە جیـاوازیان لـە نێوانـدا هەیە، لە نێویاندا دەكـریّ ئاماژە بەچەند نمـوونەیەك بكەین لەوانە (ئاریان، ٦٠٠ سـتاد كـە بەپێوانـەی ئێـستا ١١١ كـم[٦٥٩] دەكـات)ی نووسـیوە و هەنـدێك نووسـەر بـە ٧٠[٦٦٠] میـل و

---

[٦٥٦] بـۆ ووردەكـاری لەسـەر گـرنگترین پرۆژەكـانی ناوچـەكە و مەسـەلەی كـاركردنی شوێنەوارناسـان لـە بارەیانـەوەو چارەنووسـیان و گرنگـی ئـەو شـوێنەوارانە بروانـە: بێـوار خـني: الاثـار في خـنس واهميتهـا، ص٤٧-٩١.

[٦٥٧] باڤیان: گوندێكی بچووكە لە قەزای شێخان لە نزیكی رووباری(گومل) هەڵكەوتووە و لەبەرئەوە ناوی دەركردووە، چونكە لە نزیكیەوە و لە قەدی ئەو چیایەی بەسەر رێرەوی رووباری گومل دادەرِژێ پەیكەرە لە بەرد تاشراوەكانی سەردەمی ئاشوری هەڵكەوتوون. گورگیس عواد ویعقوب سركيس: اصـول اسمـاء مدن وقرى عراقية، ص٣٧.

[٦٥٨] عەبـدولرەقیب یوسـف: سەرِاسـتكردنی شوێنەوارناسـان و مێژوونوسـان لـە بـارەی ئەشـكەوتی (خـنس)ەوە، گۆڤـاری مێرگ،ژمـارە(١٠)، سـاڵی یەكـەم، هـەولێر،٢٠٠٦ل ؛ هـەروەها بروانـە: موعتەسـەم ساڵەیی: تێپەرِینی لەشكری ئەسكەندەری مەكدۆنی بە كوردستاندا، گۆڤاری كەركوك ،ژمارە (٢)، سـاڵی هەشتەم،٢٠٠٦ ، ل١١٢.

[٦٥٩] فيلافيوس ئاريانس: ايام اسكندر الكبير في العراق، ص١٤-١٥.

[٦٦٠] سير برسي سايكس: تاريخ ايران، ج١، ص٢٤٣؛ جەلالی ئەمین بـەگ: مێـژووی كـورد و هاوسێكانی، ل٢٣٥؛ حبيب حنونا: تاريخ كرمليس، ص٣٥.

هەندێك بە ٦٠[٦٦١] میلی دادەنێن. کامبریج ئاماژەی بە ٥٦[٦٦٢] میل بۆ دووری نێوان ئەو دوو شوێنە کردووە. کەچی سەرچاوەیەکی دیکە کە پێیوایە زۆربەی مێژوونووسەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە شوێنەکە لە دووری ٦٠٠ ستادی هەولێر هەڵکەوتووە، ئەو رووبەرەی بە(٤٥) میل لێکداوەتەوە[٦٦٣]. هەیشە پێی وایە گوگامیلا بیست میل لەباکوری رۆژئاوای هەولێر و لەسەر رووباری خازر هەڵکەوتووە[٦٦٤].

## ٢- ڕوودانی شەڕەکە[٦٦٥]:

دوای ئەوەی هەردوولا ئامادەسازی هێزەکانیان بۆ ئەنجامدانی شەڕێکی یەکلاییکەرەوە کۆتایی پێهێنا، هێزەکانی ئەخمینی شەوی پێش شەڕەکە لەحاڵەتی ئامادەباشی دابوونو بە ئێشك گرتنەوە بەسەریان برد، ئەسکەندەریش ئێوارەیەکی باش و خەوێکی ئارامی بۆ سوپاکەی بڕیاردا، بەیانی یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٣١پ.ز رووبەڕووی یەك بوونەوە، بەڵام ئەسکەندەر پێش جموجۆڵکردنی تێبینی کرد کە شوێنی تیپی سوارە هاوەڵەکانی لە بەرانبەر گالیسکە داسدارەکانی ئەخمینی هەڵکەوتبوو، بۆیە فەرمانیدا بەرەو لای (ڕاست) بجوڵێنو تیپی قەڵغان هەڵگرەکانی هێنایە شوێنی ئەوان[٦٦٦].

---

[٦٦١] فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارته، ص٢٢٥؛ هارولد لمب: الاسكندر المقدوني، ص٢١٥.

[٦٦٢] J.BURY and others: The Cambridge Ancient History, Vol .VI, P٣٨٢.

[٦٦٣] حبيب حنونا: تاريخ كرملس، ص٣٥.

[٦٦٤] طه باقر وآخرون: تاريخ ايران قديم، ص٧٩.

[٦٦٥] بۆ روونکردنەوەی هەنگا و بەهەنگاوی شەرەکە بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٧)

[٦٦٦] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٦؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٨-٧٩.

ئۆردوی داریوش و ئەسکەندەر هەریەکە لە شوێنی خۆیدا چاوەڕوانی دەست پێشخەری ئەوی دیکە بوون و لە بەرانبەر یەکتردا وەستابوون، پاشان شەیپورچییەکانی کەڕەنای جەنگیان لێدا و هاواری جەنگ (نەعرەتەی جەنگ) بەرز بووەوە و شەڕ دەستی پێکرد[٦٦٧].
یان وردتر بڵێین کاتێك هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەك وەستان و بەهۆی ئەوەش، کە هێڵی پێشەوەی سوپای گریك لە هێڵی ئەخیمنییەکان کورتتر بوو و ئەسکەندەر خۆی لە بەرانبەر دارا و هێزەکانی دەوروبەری، کە جێگەیان لە ناوەندا گرتبوو، بینییەوە، بۆیە وردە وردە بەرەو لای ڕاست کشا، تا وەك شەڕەکانی پێشوو بتوانێت هەڵمەت بەرێتە سەر لای چەپ، سوپای بەرانبەریش، کە لە حاڵەتی پێشڕەوی کردندا بوو بەرەو هەمان لا جوڵان و هەوڵیاندا گەمارۆی لای چەپی بدەن و سوارەکانی (سکیث-سیث) لەناو سوپای ئەخمینیدا هەمان ڕێگەیان گرت و لەگەڵ پێشەنگەکانی ئەسکەندەر لێکیاندا کە بەرە و پێشەوە دەڕۆیشتن، بەلاّم داریوش ترسا لەوەی کە گالیسکەکانی لەو گۆڕەپانەی ڕێکی خستبوو، بچنە دەرێ، بۆیە فرمانی بە ریزەکانی پێشەوەی لا باڵی چەپدا کە گەمارۆی لا باڵی ڕاست بدەن کە ئەسکەندەریش لەوێ جێی گرتبوو، تا لەوە زیاتر پێشڕەوی نەکەن[٦٦٨]، هەڵمەتی سەرەتایی تیپەکەی ئەسکەندەر بەرەو لای چەپی سوپای داریوش وەستان بەرەو لای ڕاست(رکز باتجاه اليمين) تا گەیشتنە ئەو ناوچەیە کە ئەخمینیەکان بۆ گالیسکە جەنگیەکان هەڵیان بژارد بوو، بەوەش نەکرا سوود لە گالیسکەکان ببینرێت و ئەخمینیەکانیش هیوا بڕاو کران، ئەمەش وایکردووە کە هەندێك پێیانوابێت یەکەم هەڵمەت وەك سەرەتای دەسپێکردنی شەڕ لەلایەن ئەسکەندرەوە دەستی پێکردووە[٦٦٩]. بەلاّم بەپێی ئەوەی، کە نەخشەی ئەسکەندەر وابوو، کە بەرگری ساخلەمیانەی بەهێز پارێزی باش و دژە هێرشی ئازا و خێراییانەی بەدوادابێت، مانای وایە دەسپێشخەری لە داراوە بووە و نزیکەی تێکڕای نووسەرانیش پشتی ئەو رایە دەگرن، هەڵمەتبردنی هەندێك لە سوارەکانیش بەفەرمانی

---

[٦٦٧] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٤٥.

[٦٦٨] فیلافیوس اریانس: ایام اسکندر الکبیر في العراق، ص٢٦؛ اولریش ولکین: اسکندر مقدوني، ص١٨٣.

[٦٦٩] حبیب حنونا: تاریخ کرملس، ص٣٧.

دارا بۆ سەرلای ڕاست کە ئەسکەندەر و سوارە هەواڵەکانیشی لەوێدا قەراریان گرتبوو، تا ناچار بەگەڕانەوە کران، زیانێکی زۆریان بەو لاباڵە گەیاند، بەدەسپێکردنی شەڕی دەزانن[٦٧٠].

سەرچاوەیەکیش نووسیویەتی ((کاتێك ئەسکەندەر بە سوارەکانی لەلای ڕاستی ناوەند(دڵ)ەوە بەرەو ئەوبەری لای ڕاستی بەرە، جوڵا، فالانکسی گریکیش بۆ پاسەوانی کردنی کەوتە پێشڕەوی کردن، بەڵام سوارەکانی ئەخمینی بە سەرکردایەتی مازیوس لەلای چەپ و بە سوس لەلای ڕاست، بە دەوری لاباڵی سەربازانی ئەسکەندەردا لە هەوڵی گەمارۆدانی سوپاکەیدا بوون، داراش دەیەویست ئەسکەندەر و سوپاکەی بەتەواوی لەناوبەرێ))[٦٧١]. دەبێ هەردوو بەرە لەیەك کاتدا دەستیان بە جووڵە کردبێ.

هێرشی گالیسکەکان بۆ سەر هەمان لاباڵی ڕاستی سوپای گریك، لەلایەن هەندێك لە سوارەکانی هێڵی دواوە بە سەرکردایەتی (منیداس) پاشان پیاوەکانی (ئەریستۆن)و هەندێك سەربازی دیکە، کە بۆ بەرلێگرتنی ڕەوانەکران، بەرپەرچدرانەوە، هەرچەندە سەرەتا زیانی زۆریان لێکەوت، بەڵام خۆیان گرت تا دەوریان هاتەوە، لەناو چوارگۆشەی پاڵپشتیکەر شەڕیان دەکرد، ئینجا دارا هێزێکی سوارە و گالیسکەی ئاراستەی دڵی سوپای ئەسکەندەر کرد و لەلایەن پیادە چەك سووکەکانی گریك بە سەرکردایەتی کراتیوس بەرپەرچدرانەوە، بە نێزەکانیان ئەسپەکانیان بریندار کردوو و ئەسپەکان هەڵدەپەڕین، بەمەش گالیسکەکان تێکدەشکان[٦٧٢]. لەو بارەیەوە گوتراوە کاتێك ئەو هێرشەی ئەخمینی دەستی پێکردووە، کە (منیداس) بە هێزێکی بە کرێگیراوی گریکی بۆ بەرلێگرتنیان ڕاسپێردرابوو و لەلایەن هێزێکی دیکەی (باکتری و سیث)، کە لەنێو سوپای ئەخمینیدا ڕێکخرابوون و ژمارەیان ئێکجار زۆربوو، پەلاماردران و قڕیان خستە ناو ئەو هێزەی گریك، بۆیە ئەسکەندەر، ئەریستۆنی بەو سوپایەی لەبەردەستیدا بوو لەگەڵ هێزی هاوەڵانی پێشتر تێکشکاو و گەڕاوە بۆ مەیدانی شەڕ، ڕایسپارد کە هێرش بکەنە سەر ئەو هێزەی دوژمن و شەڕێکی

---

(٦٧٠) بڕوانە: بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني ، ص٧٩؛ محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ١٢٩، ل٦٣؛ هادي رشيد الجاوشلي: تراث اربيل التاريخي، ص٥٩.

(٦٧١) فوكس و يبرون: الاسكندر الاكبر، ص٨٠.

(٦٧٢) حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص٣٥.

گشتی لە نێوان ئەسپ سوارانداقەوما، سوپای ئەسکەندەر، بەهۆی باش چەکدارکراوی، هێزی زرێپۆشی، ئەو بەشەی هێزی ئەخمینی و بەرگە پارێزکردنی ئەسپەکانیان زیانی زۆریان لێکەوت، بەلاّم سەرەڕای ئەوەش مەکدۆنییەکان لە هەڵمەتە یەك لەدوای یەکەکانیان سارد نەبوونەوە و تیپ دوای تیپی ئەخمینییەکانیان لەناوبردو ریزی سوپاکەیانی تێکدا و شوێنی پێیان لەقکرد[٦٧٣] و لەمیانەیدا ئەسکەندر لێهاتوویی زۆری نواند لە بەهێزکردنی هێزەکانی دروستکردنی یەکەی نوێ و ئەنجامی کاراشی لێبەدیهاتن پاشماوەیەك سوارە ئەخمینییەکانیان تێکشاندن و ناچار بەکشانەوەیان کردن، لە پەککخستنی پەلاماری هێزەکانی ئەخیمینی کە بەسوس سەرپەرشتی دەکردن بۆ سەر لاباڵەکەی -لاباڵی ڕاست- سەرکەوت، لەو کاتەشدا پەلاماری گالیسکە داسدارەکان دەستیپێکرد[٦٧٤]، کە داریوش هەموو هیواکانی خۆی لەسەر هەڵچنی بوو[٦٧٥]، سەرەتا ترسێکی زۆری لە نێو ریزەکانی سوپای گریکدا دروستکرد، چونکە داسی ئەو گالیسکانە[٦٧٦] بەر هەر ئەندامێکی جەستەی سەربازەکانی دوژمن کەوتبا دەیپەڕاند و کاریان هێندە خێرا بوو، کە کاتێك سەری سەربازێك دەکەوتە سەر زەوی هێشتا چاوەکانی هەر کراوە بوون، کاتێکیش مازیۆس بە کۆمەڵێك سوارەی ئێرانییەوە پەلاماری بردە سەر گریکەکان چالاکی گالیسکەکان بەهێزتر بوو، بەلاّم گریکەکان وەك چۆن ئەسکەندەر رایسپارد بوون بەهۆی بەیەکەوە نووساندنی سوپەرەکانیان و بەنێزە لێدانیان و دروستکردنی دەنگەدەنگی ترسێنەر کە بەهۆیەوە ئەسپەکان دەشڵەژان و ڕوویان بۆ لای خۆیان وەردەگێڕا، پەشێویان لەوێدا دروستدەکرد و لە مەترسیەکانیان کەمدەکردەوە[٦٧٧]. واتا دەکرێ بوترێت کە

---

[٦٧٣] فيلافيوس اريانس: ايام اسكندر الكبير في العراق، ص٢٦.

[٦٧٤] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٦؛ فوكس ويبرن: الاسكندر الاكبر، ص٨٠-٨١.

[٦٧٥] اولريش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص١٨٣.

[٦٧٦] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٠)

[٦٧٧] حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٢٤٥.

تەكنەلۆژیای جەنگی ئەخمینیەكان پێشكەوتووتر بوو، بەڵام تاكتیكی جەنگی لە سوپای ئەسكەندەردا سەركەوتوانەتر بەكاردەهێنرا.

جگەلەوە، ئەو تیرهاوێژانەی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو جۆرە هێرشانە تەرخان كرابوون، كەوتنە تیرباران كردنی ئەسپو گالیسكە لێخورەكان و بەشێكی زۆریان لێ لەناوبردن، لەلایەكی دیكەشەوە سەربازانی گریكی بە كشانەوەی خێرایان كەلێنێكیان بۆ تێپەڕینی گالیسكەكان بێ ئازار گەیاندن كردەوە، تا دواتر لەلایەن داروودەستەی ئەسكەندەرەوە جڵەوگیركران[٦٧٨].

بەمشێوەیە ئەو گالیسكە داسدارانە لەگەڵ سەربازانی گریكی رووبەڕووی یەك بوونەوە و ڕمباران كران و هەندێكیان پێكرانو سەریان لێ شێوا و ئەسپەكانیش تۆقین و تووشی شڵەژان بوون، ئەوانەش كە بە كەلێنەكراوەكەی نێوان سەربازە گریكەكاندا گوزەریان كرد، گەیشتنە كۆتایی، بەڵام بێسوود بوو، چونكە توشیان بوو بە تووشی هێزی پیادەی هێڵی دووەمو بەربەست كرانو نەهێڵدرا بچنە پێشەوە، كاتێكیش دارا بینی ئەسكەندەر هێزی یەدەكی لای راستی خۆی خستۆتە كار، بڕیاری دوو پەلاماری بۆ سەر سوپای دوژمندا، هەموو سوارەكانی بەرەو پێشەوە بەڕێ كرد و ناهەموارترین ساتەكانی شەڕیان دەستپێكرد[٦٧٩].

بە گوتەی فیلافیوس ئاریانس لەوكاتەدا، كە دارا هەموو سوپاكەی خستە حاڵەتی جموجۆڵەوە و ژمارەیەكی زۆر لە سوارەكانی گەمارۆی لابالی راستی سوپای گریكیان دابوو، ئەسكەندەر فەرمانی بە (ئارتیس) كرد، كە هێرش بباتە سەر سوارە گەمارۆدراوەكان، كە تا ئەوكات سەركردایەتی سەربازە رێكخراوەكانی بە رێكوپێكی دەكرد[٦٨٠].

بەڵام ئەگەر باڵی راست گەمارۆ درابێو پێشتریش باسمانكرد كە ئەسكەندەر خۆشی لەو باڵەدا بووە و فەرمانیشی بە ئارتیس كردبێت كە لە هێڵی دووماهیدا جێی گرتبوو، ڕەنگە رەوشەكە لە سێ حاڵەت بەدەر نەبێت یا ئەوەتا دەبێت ئەوكات باڵی ڕاست جیابووبێتەوە و ئەسكەندەر لە

---

(٦٧٨) اولريش ولكن: اسكندر مقدوني، ص١٨٣.

(٦٧٩) الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٧؛ محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا ، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ١٢٩، ل٦٣.

(٦٨٠)ايام الاسكندر الكبير في العراق، ص٢٩.

دەرەوەی بەشە گەمارۆدراوەکە بوویێ، یان گەمارۆکە هەموو لابالّەکانی نەگرتۆتەوە، - کە ئاماژەی پێنەکراوە- یان هەر ناوبراو خۆی هەلّمەتی بردووە بێئەوەی فرمانی پێ بکرێ. ئەگینا چۆن دەشێ گەمارۆش درابێ‌و فرمانیشی بە سەرکردەیەك کردبێ، کە لێیەوە دوور بووە تا هێرش بکات، بە تایبەتیش کە هیچ هۆکارێکی پەیوەندی کردنی وا لەئارادا نەبووە و ئەگەر هەش بوویێ باسنەکراوە. ڕەنگە هەر ئەوەش بێ، وای لە توێژەرێك کردووە کە بنووسێ "...لەو کاتەدا کە زۆرترین ژمارەی سوارەکانی داریوش کۆبوونەوە و پەلاماری لای ڕاستی سوپای گریکیانداوە -کە ئەسکەندەریش لەو ناوچەیەدا بوو- ئارتیس کە لە هێڵی دواییدا بوو و چاوەڕوانی جموجۆڵەکانی دەکرد، ڕووبەڕوویان بووەوە و توانی بەریان پێ بگرێت"[٦٨١].

ژمارەیەك سوارەی ئەخمینی بۆ یارمەتیدانی ئەو هێزە گەمارۆدەرە، هاتنە دەرەوە و هێڵی بەرایی سوپاکەی خۆیان شکاند و بەوەش کەلێنێکیان لەدوای خۆیان لە نێوان بالّی چەپ‌و دلّدا بەجێهێشت کە ئەسکەندەر دەرفەتی لێهێناو بەسوارەکانییەوە هێرشی بۆ کردو چووە ناو بەرەی ئەخمینی، بەمەش بالّی چەپی سوپای ئەخمینی کەوتە نێوان دوو ئاگر، فیلۆس و نیکاتۆر لە لایەك و ئەسکەندەریش لە لایەکی تر، زرێ هەلّگرە گریکەکان بەناو ئەخمینییەکاندا بلاّوبوونەوە و بەلاّیان بەسەردا هێنان، پێنج لیوای چوارگۆشەی (الایات)یش دابەزینە سەر گریکە بەکرێ گیراوەکان (المرتزقە)ی ناو سوپای ئەخمینی، ئیتر بەرەی ئەخمینی بوو بە سێ بەشی لێکدابڕاو، یەکیان لای ڕاست و بەشێکی دلّ و دووەمیش لای چەپ، کە لەنێوان ئەسکەندەر و نیکاتۆردا هەلّکەوتبوو، سێیەمیش (دلّ)، کە کەوتبووە بەرانبەر چوارگۆشەی مەکدۆنی، کەچی بەرەی گریك تا ئێستاش هەر بە یەکەوە پەیوەست بوون، ئەسکەندەر زەبر و زەنگێکی دلّتەزێنی بە سوارەی قورس ئاڕاستەی لای چەپی سوپای دوژمن کرد، بەمەش سوارە ئەخمینیەکانی ئەملاوئەولا هەلاّتن‌و بەشداریکردنی ڤالانکسیش لە بەرەی شەڕدا، ئەوەندەی تر دەست وەشاندنەکەی بەهێز کرد[٦٨٢].

---

[٦٨١] حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص٣٥.

[٦٨٢] فيلافيوس ئاريانس: ايام الاسكندر في العراق، ص٢٩؛ الفيرد مارشال فيكون مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٧؛ حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاريخ، ص٣٥.

دواتر هەردوو سوپا بە ئاستێك لە یەك نزیکبوونەوە، کە تیر هاوێژو رم وەشێنەکان چەکەکانیان رۆڵیان نەماو شەڕ بوو بەشەڕی دەستەویەخە، لەو قۆناغەدا شەڕی ترسناك لەنێوان سوارەی لای راستی گریك و سوارەی لای چەپی سوپای ئەخمینی روویدا. دارا کە هەزار سوارەی ئازا و چاپوكو نایابی لە دەورەی بوو و بە کەسی نزیکی ئەو دەژمێردرانو ئامادەبوون دڵسۆزی و خۆشەویستی پیاوانەیان بۆ نیشان بدەن، لە پێشەوەی بوونو سینگی خۆیان کردبوو بە قەڵغانی ئەو تیرانەی بەرانبەر پاشاکەیان دادەبارین، ژمارەیەکی زۆری لەوانە نووکی نێزەکان بەسێوی زێڕ کۆتایی هاتبوو، کۆمەکیان دەکردن، جگە لەوانە هێندێك هێزیش یارمەتیان دەدان، بارودۆخی سوارەکانی دەوری دارا خراپ نەبوو و گریکەکانیان خستبووە ژێر فشار و ناچار بە ڕاکردنیان کردبوون، بەلاّم کە ئەسکەندەر بارودۆخەکەی وا بینی، بە دەستەیەك لە سوارەی نایاب کە ئیمتیازیان بەسەر تێکڕای بەشەکانی تری سوارەدا هەبوو، هەڵیکوتایە سەر دارا، ئەویش لە بەرانبەر ئەو هەڵمەتەدا خۆی ڕاگرتو بەسەر گالیسکەیەکەوە لەگەڵ جەنگاوەرانی دەوروبەری ڕمیان دەسرەواندە جەنگاوەرانی سوپای گریك، دواتر لەگەڵ ئەسکەندەر کەوتنە بەرانبەریەك، ئەسکەندەر ڕمێکی وەشاندە دارا و گالیسکەکەی پێکاو سەر نگوم بوو، ئەمەش شڵەژانی لەنێو سوپای ئەخمینیدا دروستکردوو و بەشێکیان وایانزانی، کە کوژراوە و ورەیان بەردا و ڕایانکرد، هەلاّتنی ڕیزێکی تریشی بەدوادا دەهات، دواتر کە دارا بینی لایەکی بە تەواوی لەبەرگریکاران چۆڵ بووە، ترسی لێنیشتو ڕێی هەلاّتنی گرتەبەر[٦٨٣].

بەلاّم بە ڕاکردنی دارا، یەکسەر شەڕ کۆتایی نەهات، چونکە ئەو فشارەی (مازیوس) و لابالّی ڕاستی ئەخمینی خستبوویانە سەر لابالّی چەپی سوپای گریك، هێندە توند بوو، کە سەرکردە گریکەکان پێیان وابوو، ڕەنگە شەڕەکە دژ بە بەرژەوەندی ئەوان بشکێتەوە[٦٨٤]. هەروەها سەرچاوەیەکی دیکەش ئاماژەی بەوە کردووە، کەمازیوس دەستەیەکی لە سوارەی نایابی سێ هەزار سەربازی ڕاسپارد، کە هەڵمەت بێنە سەر ئۆردوی بەرانبەر، لەلابالّی چەپدا و دەست بەسەر سەربازگە و بارگە و بنەیاندا بگرن، جێبەجێکردنی ئەو

---

[٦٨٣] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢ ، ص١٢٤٥-١٢٤٦.

[٦٨٤] بسام العسلي: الاسكندر الكبيرالمقدوني، ص٧٦.

فـــرمانـــەش شـێواوی لـە نێـــو تـــوردوی ئەســـــکەندەردا دروستکــرد، بـەرادەیــەك، کـە غـــیرەتـــی دیلـــە ئەخمینـــیەکانـــی ژێـــر دەســـەلاتـــی گـــریکیـشـــی جولانـــد تـــا دەرفـەت بدۆزنـــەوە و بەهـــانای ئێـرانیـەکانەوە بێـــن[٦٨٥].

(فیلافیـوس ئاریـانس) زیـاتر لـەوە نووسیویەتـــی، کـە کاتێـك سەرکـــردەی ئـەو ســەربازانەی بەیـەدەك دانرابـوون، بـەو ڕووداوەیـان زانـــیو چوونـــە شـــوێنەکانیان بـە خێرایـــی، کەچـی ئەخیمنیـــەکان لە دواوە هاتـــنو زۆر لەوانـەیان کـــوشت، کـە لـە دەوری کەلوپەلـەکان بـوونو ئەوانـــی دیکـــەش هەلاتن[٦٨٦].

مازیوس تا ئاگاداری ڕاکردنی دارا نەبوو، ئازایانە دەجەنگاو فشارەکانی هێندە توند بـوون، کـە پارمینیۆنی سەرکردەی باڵەکە و سوپاکەی، سەرەڕای ورەبەرنەدان و خۆڕاگریان تاسەر، هەراسـان بووبوون، ناچار بوو داوای کۆمەك لە ئەسکەندەر بکات، بەلاّم کە ئەو هەواڵەکەی پێگەیشت بـە شوێن داراوە بوو و لە گۆڕەپانی شەڕ دوور کەوتبۆوە، بۆ ئەو مـەبەستەش پێشڕەوییەکەی ڕاگـرت و گەڕایەوە، لەرێگاش لەگەڵ سوارەکانی سـوپای ئـەخمینی ڕووبـەڕوو بوونـەوە و، کـە لەسـەربازە هەرە باشەکانی سوپای ئەخمینی بوون، کـە بـەزانینی هـەواڵی ڕاکردنـی دارا ئـەوانیش خـەریکی هەلاتن بوونو لە رووبەڕووبوونەوەکەشیاندا تەنها بیریان لە بە سـەلامەتی دەربـازبوون دەکـردەوە، هەرچەندە لە نێو هاوەلانی ئەسکەندەر شەست کەس کوژران و ژمارەیەکیش بریندار بوون، بەلاّم ئەسکەندەر توانی بەسەر هەموو کەرتەکاندا سـەرکەوێت و زۆرتـرینی ئـەو ئەخمینیانـەش توانـای هەلاتنیان هەبوو، هەلاتنو زۆریشیان لێ کوژرا، زۆربـەی کوشـتارەکەش لـەو شـوێنەدا بـوو کـە گـەرد و تـۆزی پەیـدا بـوو لـە ڕاکردنـی سـەربازەکانی ئـەخمینی و شـوێنکەوتنی گریکـەکان ئاسمانەکەی داپۆشی بوو، بەهۆی سەر لێ تێکچوونیان دەکەوتنە ژێر پێی سـوارە هـەلاتووەکانو پاشان ڕووبەڕووی تیخی دوژمنیان دەبوونەوە، هەرچی (مازیوس)یش بوو کاتێـك زانیبـووی کـە دارا ڕایکردووە هێواش هێـواش لـە فـشارەکەی کـەمکردەوەو کەوتـە پاشەکـشێ کـردن، ئـەوەش بەنیسبەت گریکـەکان نائاسـایی بـوو و (پـارمنیۆن)یـشی سەرسـام کردبـوو، دواتـر پـارمنیۆن دەرفەتی وەرگرتو کەوتە هاندانی هێزەکانی، پێش گەیشتنی کۆمـەکی ئەسکەندەر لە بارودۆخـە

[٦٨٥] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٤٥.

[٦٨٦] فیلافیوس ئاریانوس: ایام الاسکندر الکبیر فی العراق، ص٣١.

ناهەموارەکەی رزگاری بوو، ئینجا ئەسکەندەر بڕیاریدا شــــوێن دارا بکـەوێت، بـۆ ئەمـــــەش ملی ڕێی گــرت و لەزێـــی لیکـــتۆس (زێـی گـــەورە) پەڕییەوە و ماوەیەك پشوویدا و دووبارە کەوتەوە ڕێکەوتن بـەرەو ئـەربیل(هـەولێر) بـەهیوای دەسـتگیرکردنی دارا، دوای بـڕینی (٦٠٠) سـتاد نزیکـەی نـۆ میـل دەکـات، گەیـشتە ئـەربیل، کەچـی بـە دارا ڕانەگەیـشت و ڕایکردبـوو. بەمشێوەیەش کۆتایی بە شەڕەکە هات[٦٨٧].

---

[٦٨٧] بڕوانە: فیلافیوس ئاریانوس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٣٢-٣٥؛ حسن پیر نیا: تـاریخ ایـران باسـتان، ج٢، ص١٢٤٧-١٢٥٠؛ جمـس بکنغـام: رحلتـی إلى العـراق ، ص١٣٠-١٣١،لەهامشدا ئاماژە بە ڕاکردنی داریوش و شوێن هەڵگرتنی ئەسکەندەر کردووە لەسەر قسەی مێژوونوسە کۆنەکانیش وتویەتی، کە دارا نیوەی شەو گەیشتۆتە هەولێر تیایدا نەماوەتەوە، ئەسکەندەریش بە بەیانیەکەی، بۆیە نەگەشتونەتە یەك.

# بەشی دووەم

## باسی دووەم/ هۆکارەکانی یەکلا یی بوونەوی شەڕی گۆگامیلا

ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی ڕووتی سەربازیەوە نەڕوانینە شەڕی گۆگامێلا بەوەی کە وەك سروشتی هەر شەڕێکی تر کە لەنێوان دوو هێزی دژبەیەکدا ڕوودەدات و لایەکیان بەسەر لایەکیاندا سەربازیانە، سەردەکەوێت، بەڵکو شیکاریانە و لە ڕووی مێژوورییەوە تێی بڕوانین، ئەوە دەبێ پێش ئاماژەکردن بە تەکنیك و تەکتیك و ئەو ڕەوش و پێشهاتانەی لە ماوەی هەڵگیرسانی شەڕەکە تاکۆتایی هاتنی، بەرچاودەکەون و ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، شەڕەکەیان پێوە بەستراوە...، قسە لسەر هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بێ، بەو هەموو ناوبانگ و دەسەڵات و ژمارەی زۆری سەربازان و سنووره بەرفراوان و ئەو تەمەنە پڕ ئەزموونە لەشەڕ و پەیوەندییە جۆراوجۆرەکاندا، بەدەست هێزێکی تازە ڕێکخراو و لە ڕووی ژمارەی سەربازانەوە کەمتر و خاوەنی سەرکردەیەکی لاو، کە لەو شەڕە کورت مەودایەدا بەرجەستەکرا و سەرنجیش لەو هۆکار و کاراکتەرانە بدەین کە ڕاستەوخۆ زەمینەی ئەو شێوە یەکلایی بوونەوەیان —سەرکەوتنی گریکەکان و ژێرکەوتنی ئەخمینیەکان ڕووخانی ئیمپراتۆریەتەکەیانی- ڕەخساند. بۆیە لەو باسەی بابەتەکەماندا بە گشتی هۆکاری شەڕەکە لەژێر دوو تەوەرەی (هۆکارە ناڕاستەوخۆکان و هۆکارە ڕاستەوخۆکان)دا ڕێکدەخەین و سەرەتاش لە هۆکارە ناڕاستەوخۆکانەوە دەست پێدەکەین:

## تەوەرەی یەکەم

## هۆکارە ناڕاستەوخۆکان

### ١- لاوازی ئیمپراتۆرەکانی ئەخمینی(دامەزراوەی سیاسی):

یەکێك لە هۆکارە ناڕاستەوخۆکانی، وا کەوتنەوەی ئەنجامی شەڕی گۆگامێلا - سەرکەوتنی مەکدونی گریکەکان و تێکشکانی ئەخمینییەکان- جیاوازی ڕەوشی بەڕێوەبردن و هەڵکردنی سیاسی و ئاستی هێز و توانست و دەسەڵاتی پادشایەتی بەرهەمهاتوو لە هەلومەرجی ڕابردووی هەردوو دەوڵەت، بوو، واتە ئەگەر ئەسکەندەر هاتبێتە سەر میراتی فیلیپ وەك بەهێزترین کەسی سەردەمەکەی و فریادڕەسی میللەتانی گریك دەرکەوتبێ، ئەوە دارا جێی کۆمەڵێك پادشای لاواز و نەشیاو و بێتوانای گرتەوە.

لە باسەکانی پێشوودا زانیمان، کە ئەسکەندەر هاتە سەر وەختی هەلومەرجێکی ئامادە بۆ شەڕێکی یەکلایی کەرەوەی چارەنووس ساز، کە(فیلیپ)ی باوکی بە لێزانی سیاسی و توانای سەربازی، دوای دروستکردنی دەوڵەتێکی بەهێز و پێکهێنانی یەکێتی دەوڵەتە شارەکانی گریك بە ڕێگای جۆراوجۆر و بە دەرفەت زانینی ئەو قەیرانە هەمەلایەنەی وڵاتی گریك، کە بەهۆی سروشتی جوگرافیای وڵاتەکەو زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و شەڕەکانی ناوخۆو دەرەوە و ...هتد، تێی کەوتبوو و بەسوود بینین لە دیدی چارەسازیانەی بیرمەند و فەیلەسوفانی سەردەمەکەی، توانیبووی هەڵسێ بە چڕکردنەوەی بڕوا و ئاراستەکردنی سەرنجی گشتی لە بەچارەسەر زانینی ڕۆیشتن بۆ ڕۆژهەڵات و ڕەوایی شەڕکردن لەگەڵ دەوڵەتی ئەخمینیدا و ئامادەکردنی سوپا بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی لەشکرکێشی، بۆ ئەو مەبەستە، بە سەرکردایەتی خۆی، ئەمە لە کاتێکدا کە دارا هاتە سەر تەخت و دواتر هێرشی ئەسکەندەر دەستی پێکرد، دەمێك بوو هۆکارەکانی شکستی دەوڵەتی ئەخمینی لە بەرامبەر هەر هێرشێکی دەرەکیدا، فەراهەم ببوو[٦٨٨] چونکە گومانی تێدا نیە، کە ئاینده و چارەنوسی دەوڵەتان هێندەی پەیوەستە

---

[٦٨٨] مرتضى راوندى: تاريخ اجتماعي ايران،ج١، ص٥٧٥.

به ئاستی سەقامگیری ڕەوشی ناوخۆ، هۆکاری دەرەکی کاری تێناکا، زۆرجار لە باری ڕەوشی ناوخۆ دەکاریٚ ئەو کەمایەسیانەش پڕبکاتەوە کە بە بەراورد لەگەڵ هەڕەشەی دەرەکیو لە توانستی دەوڵەتەکە تێبینی دەکرێت ، لەسەر ئەو بنەمایەش هەمیشە هۆکاری ناوخۆ فاکتەری لە ناوبردنی دەوڵەتانە .

سەرەتاکانی خراپی ڕەوشی ناوخۆ لە دەوڵەتی ئەخمینیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەحشویرشی یەکەم(خشارشای یەکەم٤٨٦-٤٦٥پ.ز) ، کە هەموو گرنگیدانی خۆی تایبەت کردبوو بە ویلایەتی فارس و ویلایەتەکانی دی، جگە لە ڕەعیەت و پاشکۆی دەوڵەت هیچیتر نەبوون، بە فیڕۆدانی دەرامەتی وڵاتیش لە شەڕی یۆنانیەکاندا، هێندەی تر بارودۆخەکەی خراپ کردبوو، ئەوە سەرەڕای سەرکەوتنی لە شەڕی (ترومبیلی) ساڵی(٤٨٠پ.ز) و گرتنی ئەسینا کە هیچ سوودی پێنەگەیاند و دوو ڕۆژ دواتر لە شەڕی سەلامیس تێکشکاو بەرەبەرەش ورە(معنویات)ی ڕووخا[٦٨٩]. کە لە جەنگی پلاتیەی ساڵی(٤٧٩پ.ز)ش شکاو بە یەکجاری وازی لە بیری داگیرکردنی وڵاتی گریك هێنا[٦٩٠]. بەتەواوی لاوازی خۆی لە بەرامبەر گریکەکان، نیشاندا، لە ڕاستیدا ئەو هێندەی بەلای ڕابواردن و دروستکردنی کۆشکدا بوو، مەیلی شەڕکردنی نەبوو[٦٩١].

ئەو وەك پیاوێکی بێتوانا و بەکەسێکی خاوەن سەلیقە و ڕەوشی منداڵانە و خۆویست و بێ بەزەیی و داوێن پیس(فاجر)و خورافی و کاڵ فام، ناسراوە، کە هەموو ئەوانەش دەشیٚ(دەتوانن) پەیامهێنی سەرەو ژێر(انحطاط)بوونی، هەر ئیمپراتۆریەتێك بن[٦٩٢].

لەگەڵ ئەوانەشدا وتراوە، ڕەنگە ئەو دوا پادشای بەهێزی بنەماڵەی ئەخمینی بوویٚ، بەوەش، کە توندوتیژی و داکەوتن(انحطاط)و ڕەشەکوژی و پیلانگێڕی ئافرەتانی دەربار تەشەنەی کردوو ملدانە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی لە نێو چینی ئەرستوکراتەکان کە لە ڕاستیدا بەڕێوەبردنی وڵاتیان پێوە بەندبوو، لە دوادواکانی دەسەڵاتی خشایرشا، بڵاوبۆوە، وەی بنەماڵەی

---

[٦٨٩] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨.

[٦٩٠] حسن كريم الجاف، الوجيز في تاريخ ايران، ج١، ص٥١.

[٦٩١] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارت القديمة، ج٢، ص٤٠٩؛ رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٢٤٥.

[٦٩٢] پى ير بريان: تاريخ امبراتوري هخامنشيان، ج٢، ص١٠٨١.

دەسەڵاتداری ڕوخاند و نیشانەکانی هەرەسی ئیمپراتۆریەتیش دەرکەوتن، خۆشی بەدەستی یەك لەکەسانی دەربار کوژرا، کە پیلانگێری ئافرەتانی کۆشکی لەپشتەوە بوو[٦٩٣].

دوای ئەویش کۆمەڵێك پادشای لاواز و بێتوانا هاتنە سەر تەخت، کە خەریك بوونیان بە سامان و ڕابواردنی بێئەندازە و خۆویستی و دەستوەردانی ژنان لە کاروبارياندا و نەبوونی سیاسەتێکی گونجاو لە بەرامبەر دوژمنان و کوشتنی خۆبەخۆی شازادان و ڕۆچونیان لە کێشەی ناوخۆ و ململانێی هاتنە سەرتەخت، بەدیکردنی دوا چارەسەر لە کوشتندا بە شێوەیەك، کە برا سڵی لە کوشتنی برا و باوك و لەناوبردنی تێکڕای خێزان وتەنانەت منداڵی شیرەخۆرەش نەدەکردەوە، ئەخمینیەکانی بەرە و لاوازی برد[٦٩٤]. ئەوان هێندە بێتواناو لاوازبوون لە چارەسەری گرفتەکانیان و ترسیان هەبوو لە ڕووبەڕووبونەوەی نەیارانیان، کە بۆ ڕێگرتن و یان ڕزگاربوون لەوەها پێشهاتێکی نەویستراو، ڕێگای جۆراوجۆر گیراوەتەبەر، کە پادشاگەردانی لێکەوتۆتەوە، پاشان سەری کێشا بۆ هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەت، ئەو پاشاگەردانیەش بەزنجیرەیەك ڕەشەکوژی لە خشایارشای یەکەمەوە دەستی پێکرد. لەو پێوەندەشدا دەکرێ نموونە بە ئەرتەخشتای یەکەم (ئەردەشێری یەکەم ٤٦٥-٤٢٤پ.ز) بێنینەوە کە لە ترسی شۆڕشی دەربار[٦٩٥]، یان وەك دەڵێن تەنها لەبەرئەوەی برایەکی لە دژی ڕاپەڕی، هەموو براکانی خۆی کوشت[٦٩٦]، یان ئەردەشێری سێیەم (٤٠٤-٤٥٩پ.ز) کە نەك تەنها هەر برا و خوشك، بەڵکو ئامۆزا و برازا و تەواوی ئەو کەسانەی کوشت، کە گومانی دەکرد ڕەنگە لە دەسەڵاتی ناڕازی بن[٦٩٧].

یەك لە هۆکار و سیما لاوازەکانی دەوڵەتی ئەخمینی خۆ تێهەڵقورتاندنی ژنان لە کاروباری دەوڵەت و باڵادەستیان بوو بەسەر پادشاو، ڕۆڵیان بوو لە ئاراستەکردنی ڕەفتاری پادشاو وروژاندنی ناکۆکی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی و پیلانی لەناوبردن و پەلکێشکردنی

---

[٦٩٣] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٤١٠.

[٦٩٤] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان ، ج١، ص٢٥٤؛ مؤيد سعيد: العراق خلال عصور الاحتلال الاخميني –السلوقي–الفرثي –الساساني، العراق في التاريخ، (بغداد:١٩٨٣)، ص٢٣٨.

[٦٩٥] ادوين اريدويچ گرانتوسكى وديگران: تاريخ ايران، ص١٠١.

[٦٩٦] رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ل٢٤٩-٢٥٠؛ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨١.

[٦٩٧] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص١٩٧.

پادشـاو دارودەسـتەکەی بـۆ ئەنجامـدانی تـاوان و ڕەفتـارکردنی هەڵـە، (ئەمستریـسی) دایکـی ئەردەشێری یەکەم، (پرۆشات =پرزاتس) خوشك و لەهەمانکاتـدا ژنـی داریوشـی دووەم (٤٢٥-٤٠٥پ.ز) لـە نموونـەی ئـەو ژنانـەن، کـە کـۆنترۆڵی تـەواوی دەسـەڵاتی پاشـاکانیان کردبـوو، باڵادەستی پرۆشات وایکرد هەموو سەردەمی داریـوش نـوقمی پیلانگێـڕان بێـت، دوای مردنـی مێردەکەشی وەك پـشتگیری لـە کوڕێکی بـچوك دژی ئەردەشـێر (٤٠٥-٣٥٩پ.ز)ی بـرای، بـۆ وەرگرتنی دەسەڵات خەڵکی زۆر هاندا لەگەڵ شـاژن (ئەسـتاتیرا)ناوێـك هەریەکـە بـۆ پـشتگیری لایـەك، کەوتنـە کێبەرکێ بـەنابردنی کوڕێکـی بـچوکیش بـۆ بـەکرێگرتنی سـەربازی گریکـی (المرتزقە)لە(٤٠١پ.ز)بـۆ شـەڕی کـوڕش، نیـشانەیەکی تـری لاوازی دەسـەڵاتی ناوەنـدبوو[٦٩٨] .بەهاتن و ڕاستەوخۆ بینین و گەڕانەوشیان، پەردەیان لەسەر ڕاسـتی بێتوانـایی سـوپای ئـەخمینی هەڵدایەوە،کـە لـە ئاکـامی ماوەیـەکی دووری خۆریـستی وناشایـستەبوون و بەخۆڕاگەیـشتنی فەرمـاندەکانیانیان، پێکهاتبوو[٦٩٩]

ناوەناوە دەرکەوتنی پیاوانی ناو دەرباری ئەخمینی باڵادەستبوونیان لـە مـاوەی نێـوان سـەردەمی خەشایارشای یەکەم تا دەستپێکردنی شەڕی گۆگـامێلا هۆکـار و نیـشانەیەکی تـری لاوازبـوونی دەسەڵاتی ناوەندی و خودی پادشا بوو، بەتایبەت کە زۆرجـار بـە گـوێرەی ویـست و بەرژەوەنـدی خۆیـان پادشـایان هەڵدەسـوڕاند و هەنـدێك جـار چارەنوسیـشیان دیاریـدەکرد، لـەو ڕووەوە دەرکەوتنی (باگوس) لەسەردەمی ئەردەشێری سێیەمدا(٣٥٩-٣٤٠پ.ز)، نموونەیەکی بەرچاوە، کە بە هۆی ڕۆڵ بینینی لە دووبارە گێڕانـەوەی میـسر بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی پادشـایەتی، لەلایـەن پادشاوە ڕێزی لێگیراو گرنگی پێدراو دەست ڕۆیشتویی زیادبوو و بـوو بـە جێگـری سـەڵتەنەت، سوودی لە پلەوپایەی خۆی وەرگـرت، لـە سـاڵی(٣٣٧پ.ز) ئەردەشـێری دەرمـان خـوارد کـرد و ئەرشکی کوڕی وەك ڕووپۆشی دەسەڵاتی خۆی، لە شوێن، دانا، لە(٣٣٦پ.ز) ئەویشی بەهەمـان دەرد برد و لە جێی ئەو کەسی نزیك نەمابوو، کە ببێتە پادشا بۆیـە کودمـان، کـە بەخزمایـەتی دەچۆوە سەر بنەماڵەی پادشایەتی، بـە نـاوی (دارا)داریوشـی سـێیەم(٣٣٧-٣٣١پ.ز) گەیانـدە تەختی پادشایەتی، پاشان ویستی ئەمیش بەهەمـان چارەنووس بگەیەنێ، بـەڵام دارا پێڕاگەیـشت

---

[٦٩٨] بروانە: عبدالحسین زرین کوب: روزگاران، ص١١٣-١٢٠.

[٦٩٩] حەبیبوڵا تابانی: هاونەتەوەیی کوردوماد، وەرگێڕانی: جەلیل گادانی، (سلێمانی: ٢٠٠٤)، بەرگی یەکەم، ل٢٥٩.

و دەرفەتی لێهێنا و ناچاریکرد لـە هـەمان ئـەو ژەهـرە بنۆشـێ، کـە پادشـاکانی پێـشووی پـێ کوشت[٧٠٠]. هەرچەندە هەیە، کە باگواس بەچاکسازێکی بەڕێوەبردن دەزانێ، پێی وایـە کـە ئـەو توانیبوی کاروبارەکان ڕێکبخاتەوە و ئەگەر دارا ئەو پیاوە بـەئیادە و کـار بـەهێزەی نەکوشـتبا، لەوانـە بـوو پێـشگری لــە داگیرکــاری ئەســکەندەر کرابــا، ســەڵتەنەتی ئــەخمینیش تێکــڕا لەناونەچووبا[٧٠١].

خۆ ئەگەر ئەو بۆچوونەش ڕاسـت بێ دیسـان بەڵگەیە بۆ لاوازی دەســەڵاتی ناوەنـدی و خـودی پادشا، چونکە لەلایەك ئەوە دەردەکەوێ، کە پاشـا ترسـی لە ڕووبەڕووبونـەوە هـەبووە و توانـای قبوولکردنی هـیچ جموجـۆڵێکی نـەبووە، تەنانـەت ئەگـەر جموجۆڵەکـە چاکسـازیش بێـت و بـۆ مەبەستــی خۆڕاگــری بـەرەو پـێش چـوونی وڵاتــیش نـەنجام درابــێ، ئەگــەر هــەوڵی لەناوبردنی(دارا)یش، لەلایەن باگواسەوە کە زۆر لە مێژوونوسەکان باسی دەکـەن و ڕاسـت بـێ، دەکرێ بە بەشێك لە چاکسازی دابنـرێ کـە پێـی وابـووە نەشـیاوی دارا و لاوازیەکـەی هۆیـە بـۆ خراپی بارودۆخی وڵات ڕزگاربوون لێی، ڕزگاربوونە لە بارودۆخی نالەبار، ئەگینا کەس لە کار و دڵسۆز لە ئیدارەیەکی بەهێز و باشدا هەوڵی لەو جۆرە و تەنانـەت چاکسـازیش نـادات، چـونکە چاکسازی بۆ شتێك دەکرێ کـە پێویـستی بـە چاکـسازی بـێ. خـودی کوشـتن و هەوڵـدانیش بـۆ کوشتن و بۆ هەردووکیان، هەم بەڵگەیە لەسەر بێتوانایی لە هەڵبژاردنی شێوازی چارەسـەکردنی گرفتەکان، هەمیش بوونی ناکۆکی و گرفتی گەورە لە نێو دەسەڵاتی باڵای وڵات، نیشان دەدات و بوونی وەها نـاکۆکیش کـە چارەسـەرەکەی لـە یـەکتر کوشـتندا بدۆزرێتـەوە، سەردەکێـشی بـۆ دەستەبەندی و گومـان و لاوازبوونی متمانە و گیـانی یـەکێتی، دەسـەڵاتدارانیش وا لـێ دەکـات لەبـەر سـەرگەرمی بـە گرفتـەکانی نـاوخۆ، بـیر لـە خۆڕێکخـستن و ئامادەسـازی گونجـاو بـۆ ڕووبەڕووبونەوەی دەرەکی نەکەنەوە.

لەبەرئەوە دەبینین لەو هەلومەرجـە دژوارەدا، کـە تــێایدا خانـەدان و پادشـاو بڵنـد پایەکانــی ئەخمینی، خەریکی پیلانگــێڕان و کودەتا و کوشتنــی یەکتربوون، کە ڕەنگدانەوەی لەکایەکانی

---

[٧٠٠] عبدالحسين زريـن كـوب: روزگـاران، ل١٢١-١٢٣؛ ادويـن اريـدويج گرانتوسـكى و ديگـران: ايران، ص١٠٥-١٠٦.

[٧٠١] حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل ازاسلام ، ص١١٣-١١٤.

بەڕێوەبردن و سوپا و گیانی میللیشدا هەبوو[٧٠٢]، دەوڵەتی مەکدونیا وەك دوژمنێکی ترسناك سەری دەرهێنا[٧٠٣].

بۆیە شتێکی سەیر نەبوو سوپای گریك -لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکانی تر- دەرفەتی سەرکەوتنی لە شەڕی گۆگامێلادا، بۆ بڕەخسێ.

## ٢- نەبوونی هەستی هاوبەندی و بەرەیەکی یەکگرتووی میللی لە دەوڵەتی ئەخمینیدا:

نەبوونی ئینتیما یان کایە یان چوارچێوەیەکی هاوبەش لەنێو میللەتانی ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی ئەخمینیداو بە ڕێکوپێکی(جدی)کارنەکردنی پادشاکانیش، بۆ فەراهەمکردنی، تا لێیەوە بڕواننە سروشتی شەڕ و سەرەڕای هەموو جیاوازیەکانی نێوانیان، بەربەرەکانی کردنی گریکەکان بە ئەرکی هاوبەشی سەرشانیان بزانن. یەکێك بوو لەو هۆکارانەی، کە دەرفەتی بۆ سوپای گریکی یەکگرتوو و بە ڕەوا زانینی گرتنی ڕۆژهەلات، ڕەخساند، کە لە شەڕی گۆگامێلادا بە سەرکەوتن بگەن.

لە ڕاستیدا ئەخمینیەکان ئیمپراتۆریەتێکی بەرفراوانیان دروستکردبوو، کە سنوورەکەی لە( هند)ەوە تا(تونس) و لە( دەریای عەرەب)ەوە تا( ڕوسیا)، دەگرتەوە، یان وەك وتراوە[٧٠٤]: بەپێی( نەخشی ڕۆستەم[٧٠٥]) کە لەگۆڕستانی داریوشی گەورە (٥٢٢-٤٨٦پ.ز) هەڵکەنراوە و لە سەردەمی ئەودا ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی لەوپەری بەرفراوانی خۆیدا بووە، سنوورەکەی لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا لە کەنارەکانی ڕۆژئاوای ئۆقیانوسی هندی تا کەنارەکانی دەریای ئەدریاتیك و قرتاجینەوە و

---

[٧٠٢] پی یر بریان: تاریخ امپراتوری هخامنشیان، ج١، ص١٠٨١.

[٧٠٣] ادوین اریدویچ.کرانتوسکي و دیگران: تاریخ ایران، ص١٠٦.

[٧٠٤] حنا خباز: المعارك الفاصلة في التاریخ، ص٩.

[٧٠٥] یەکێکە لە گۆڕستانەکای پاشایانی ئەخمینی کە لەچیا هەڵکەنراوە و بەدووری فەرسەخێك(٦کم) لە پشت تەختی جەمشید هەڵکەوتووە، گۆڕی داریوشی یەکەم وهەشت پاشای تری لێیە کە نەزانراوە کێن، حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل ازاسلام، ص١٣١.

لەباكوریشەوە بۆ باشوور" لەو دیوی ڕووباری سیحونەوە تاحەبەشەی گرتۆتەوە، لەو ڕووشەوە دەكرێ بە گەورەترین دەوڵەت دابنرێت، كە تائەو كات پێكهێنراوە[٧٠٦].

لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەو ئیمپراتۆریەتەدا ژمارەیەكی زۆر نەتەوە و وڵاتی بەزمان و باوەڕ و نەریت و ئاداب و ڕەوشتی جیاواز، ژیانیان گوزەراندووە و زۆر لەوڵاتەكانی وەك كوردستان و بابل و ئاشور و میسرو هند و شام...هتد كە دەوڵەتی ئەخمینی بەخێرایی و لە ڕێگای چەكەوە ژێردەستی كردن، خاوەن شارستانیەتێكی كۆن بوون و ڕیشەیان بۆ هەزاران ساڵ پێشتر دەگەڕایەوە و خودانی كەسایەتی تایبەت بوون، سیستەم و نەریتی تایبەتیان پەیڕەو دەكرد بە پێچەوانەی ئەخمینیەكان كە لەچاو ئەوانی ژێردەسەڵاتیان، شارستانیەتێكی هێندە پێگەیشتوو و پێشكەوتوویان نەبوو و لە سیاسەت و بەڕێوەبردنیشدا، تازە پێڕادەگەیشتن[٧٠٧].

ئەو وڵاتانە سەرەڕای بوونی یاسای گشتی(القانون التشريعي العام)و بەكارهێنانی پارەی زێڕ و پێوەری پادشایەتی(المقياس الملكي)بۆ پێوانە و كێشانە و بەفەرمیكردنی زمانی ئارامی بەتایبەت لە بواری بازرگانی كردندا، وەك هەوڵدانێك بۆ لەیەك نزیكبوونەوەی هەرێمەكان، دەوڵەت هێنابوونیە ئاراوە و دەبوو پابەندی بن، یاسای خۆماڵی و پێوەرەكانی كێشانە و پێوانە و ڕژێمی پارەی نەختینە و سیستەمی نووسینی ناوچەییان، پەیڕەودەكرد و زمانی خۆجێییان هەبوو، كە پێیدەدوان[٧٠٨].

ئەمەش مانای وایە، هەرێمەكانی ناو قەڵەمڕەوی ئەخمینی تارادەیەك ئازادبوون لەوە، كە بەگوێرەی بیروباوەڕ و ڕێبازی خۆیان، ڕەفتاربكەن و دەسەڵاتیان هەبوو، تا دامودەزگای میللی خۆیان و هەندێكیان (وەك میسر و فینیقیە و قبرس و گریكەكانی ئاسیای بچوك و هیتر) زنجیرەی فەرمانڕەوا و پیاوە ئاینیەكانی خۆیان بپارێزن، بێگومان ئەوەش لە هەموو سەردەمەكان، وەك یەك نەبوو[٧٠٩].

بەڵام چونكە سروشتی شتەكان وانیە، كە ئەو گەلانەی لە زمان و دین و نەریت و ڕەوشتدا جیاوازبن، بۆ ماوەیەكی درێژ بە یەكگرتوویی و پەیوەست بمێننەوە، بەتایبەت كە یەكێتییەكەیان

---

[٧٠٦] حسن پیرنیا: تاريخ ايران قبل از اسلام، ص١٢٦؛ بڕوانە پاشكۆی ژمارە(١).

[٧٠٧] عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم، ج١، ص٢٦٢-٢٦٣.

[٧٠٨] مؤيد سعيد: العراق خلال عصورالاحتلال، العراق في التاريخ، ص ٤٥٣-٤٥٤.

[٧٠٩] حسن پیرنیا: تاريخ ايران قبل از اسلام، ص١٢٣.

لەسەر بنچینە و بنەمای وا پتە و داناـەزرێ کە لە درزبردن و شەقبوون، بیپارێزێ بۆیـە ناچـارن بۆ هێشتنەوەی ئەو پەیوەندیە دەستکردە، جار دوای جار پەناببەنە بەر هێز[٧١٠]، ئەخمینیـەکان لە مـاوەی دوو سـەد سـاڵی حـوکمڕانی کردنیانـدا، وەك پێویـست تێنەکۆشـاون تـا ئـەو کۆمەڵـە میللەتانەی ژێر دەسەلاتیان، لە بۆتەیەکـدا ئاوێتـەی یـەکتر بکـەن[٧١١] و سروشـتـی پێکهـاتن و شـێوازی گەشەکردنـی ئیمپراتۆریەتەکەشـیان دەریدەخات ئەوان یەکگرتنیان پێ باشـتربوو لەیەکـبوون (تفـضل الاتحـاد علـی الوحـدة) و لـە میانـەی یەکگرتنەکەشـیاندا، ئیـشیان نەکردووە، بۆ کەمکردنەوەی جیاوازی نێوان ئەو میللەتانە و بەرگرتن لەو هـێزە ڕاونەرانەی کار لەسەر لێکهەڵوەشانـی دەوڵەتەکەیان، دەکەن، بەڵـکو قایـل بـوون بـەوە، کـە حوکمڕانـی ئـەو گەلانـە بەتێکـەڵاوی بکـەن و هەرگـیز بیریـان لەوەنەکـردۆتەوە، کـە یـەك دەوڵەتـی ڕاسـتەقینەیان لێ پێکبهێنن، لەبەرئەوە دەسـتگرتن بە یەکێتـی نـاو ئـەو ئیـمپراتۆریەتە سـاڵ دوای سـاڵ قورسـتردەبوو[٧١٢].

دەشـێ هێنانـەوە بەرچـاوی ڕەوشـی داگیرکردنـی ناوچـەکانی خۆیـان و سروشـتی پێکهـاتنی ئیمپراتۆریەتەکەش، کە لە بەشی یەکەم باسی یەکەم لێـی دوایـن، ڕۆڵـی بووبـێ لـەوەی کـە ئـەو میللەتانە کە شەڕکردن لەگەڵ گریکەکان –وەك داگیرکردنی ناوچـەکانی خۆیـان- بـە سیاسـەتی فراوانخوازیانەی تایبەت بەئەخمینیەکان لێك بدەنەوە و خۆشـیان پێشتر ئـازاری ئـەو سیاسـەتەیان ئەزموون کردبوو و هـیچ بەرژەوەندیـەکیان، تێـدا بـەدی نـەکردبێ، لەلایـەك و لەبەرئـەوەش، کـە پێـشتر هێـرش و شـەڕەکان هـەر لەلایـەن ئەخمینیەکانـەوە ئەنجامـدراون و بـەهۆی سروشـتی وڵاتەکەشیان ڕووبەڕووی ئەو قەیرانە نەبووبوونەوە، کە گریکەکانی ڕازی بە هێرشکردن بـۆ سـەر ڕۆژهەڵات کرد، لەلایەکی ترەوە، ڕەنگە وای کردبێ کە ئەو گەلانە خواستی بەشداری کردنیان لە شەڕی ئەو دوو دەوڵەتەدا نەبووبێ و بە ئەرکی خۆیانیان نەزانیبێ و بە پێچەوانەی گریکەکان وەك کۆنە دوژمن و هەڕەشەی بەردەوامی بەرژەوەندیەکانیان لێیان نەڕوانیبێ.

---

[٧١٠] ویـل دیوانـت: قـصة الحـضارة، مج١، ج١، ص٤٥٦؛ لـویس پـل تـاد ودیگـران: تـاریخ تمـدن وزندگی مردم جهان راه های جهان، ترجمه هاشم رضی (تهران: ١٣٨٣)، ص١١١.

[٧١١] سامي ريحانا: شعوب الشرق القديم، ص١٧٥.

[٧١٢] ویـل دیورانـت: قـصة الحـضارة، مج١، ج١، ص٤٥٦؛ لـویس پـل تـاد ودیگـران:تـاریخ تمـدن وزندگی مردم جهان، ل١١١.

هـەموو ئەوانـەش دەریدەخـەن، کـە لـە سروشـتی میللـەتانی نـاو چوارچـێوەی ئیمپراتۆریـەتی ئەخمینیدا، شتێکی هاوبەش جگە لە ستەم لە ئارادانەبووە کە گەورەتر لە جیاوازیەکانی نێوانیان بێت و یان هەر هیچ نەبێ سەرەڕای لە یەکنەچـوونی کایـەکانی تـر، تیایـدا یـەك بگرنـەوە و بـە نیشانگرتن و هەڕەشە لێکردنی لەلایەن هێزێکی دەرەکیەوە، هەسـتی ڕووبەڕووبوونـەوەی گـشتی بخولقێنێ، چونکە ئەوان لەیەك ڕەگەز نەبوون و پەیڕەویان لەیەك دین نەکردووە، هەریـەکـەش ئـەو هەرێمەیان بەنیشتمان دەزانی کە تیایدا دەژیان و یەك زمانیان نـەبوو و لـەرووی شارستانیـشەوە وەك یـەك نـەبوون، بێگومـان لـە هـەر ناوچەیەکیـشدا جۆرێـك چـالاکی ئـابوری ئەنجامـدراوە و بارودۆخی کۆمەلایەتیشیان، جیاواز بووە، بۆیە چوارچێوەیەکی هاوبەش نادۆزرێتەوە کـە دەبوایـە ببێتە هەوێنی یەك هەلۆێستی و یەکگرتنیان بۆ ڕووبەڕوونەوەی پێشهاتەکان.

پادشـاکانیش لـەلای خۆیانـەوە لەبـەر سـەرقاڵیان بـە دەوڵەمەنـدبوون و ڕابـواردن و ململانـێ وەرگرتنی دەسەلات، نەخشە و پیلان دانان بۆ پاکتاوکردنی یـەکتر، نـەیانپرژاوە، یـان بیریـان لـە دۆزینەوەی خالێکی یەکگرتن و پێدا ئاراستـەکردنی هەلۆێـست و بـیری گـشتی بـۆ بـەرگرتن لـە شکست. وەك ئەوەی فیلیپ و دواتر ئەسکەندەر کردیان -لە هۆیەکانی هەلگیرسانی شەڕ باسمان کرد- و توانیان بەهۆیەوە لە دیدی گشتی گریکەکاندا ئێران وەك دوژمن و هەڕەشەی بەردەوامی شەڕ و ، لەناوبردنی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیش وەك هـەنگاوێکی پێویـست و پـیرۆز و بـە ئـەرکی سەرشـان و دواچارەسـەری قەیرانـەکان، وێنابکـەن و هـەنگاوێکیش لـە سـەرکەوتن نزیکبنـەوە، بەمەش توانستی داهێنانیان سەلماند بـە پێـچەوانەی ئەخمینیـەکان، (کـە ئـەو هێـزی داهێنانـەی پادشـا یەکەمینـەکانی پێدەناسـرایەوە، دوای گەیـشتن بەمیللـەتانیتر و ژێردەسـتکردنیان، زۆر بەردەوام نەبوو)[٧١٣].

ئەمـەش لەگەڵ دیدی توینبی سەبارەت بە ڕووخانی شارستانیەکان دێتـەوە و کـە چـڕی کردۆتـەوە لە: کورتی هێنان لە وزەی داهێنەرانەی کەمینەی جڵەوگیر و لـەجێی خـۆدا مـەینی و بـوونی بـە دەستەلاتدارییەکی ستەمکاری کۆسپ دروستکەر لە بەردەم هەر داهێنانێك، وازهێنـانی زۆرینـە لە چاولێکەری کەمینەی دەسەلاتدار، کاتێ دەبینێ چیتر کەمینە شایانی دووکەوتن و پێشەوایی نیە و لەناوچوونی یەکدی گیری کۆمەلایـەتی و نـەمانی یـەکێتی لـە نێـوان تـاقم و دەسـتەکانی

---

[٧١٣] ل.لوکهارت : فارس في نظرالغرب، تراث فارس، ص٤١٥.

کۆمەڵگادا، ئەمەش یان بەهۆی لێهەڵگەڕانەوەی کەسانی دەرەوە یان بەهۆی توڕەیی گەلی حوکمڕانەوە[٧١٤] مەیسەر دەبێ.

بە زۆریش شێوەی هەڵسوکەوتی پادشا لە نێو میللەتانی ژێر دەستیدا، وەك نمایشی تێکڕای هەڵسوکەوتی ئەو نەتەوەیەی دەگەڕێتەوە سەری، دەردەکەوێت و لەسەر بنەمای جولانەوەی ئەویش، مامەڵە و هەڵسوکەوتی خۆیان بەرامبەر نەتەوەکەی هەڵدەچنن و چەندیش بیر و ڕەفتارەکانی شۆڕبینەوە و لەناوتوێژەکانی تری فەرمانڕەوایاندا، ڕەنگبدنەوە و هاوشێوەی کردارەکانی لە نێو کاربەدەستاندا، زیاتر بلاوبێتەوە، هێندەش گەلانی ژێردەست لە ڕاستەقینەیی بۆچوونەکانیان بێگومانتر دەبن.

ئەو پادشایانە بەتایبەت، کەدوای خشایارشا هاتنە سەرتەختی دەوڵەتی ئەخمینی، نەیانتوانی پەند لە سیاسەتی وردبینانەی کورش و داریوش وەربگرن و پەیوەندی گیانی(معنوی) لەگەڵ میللەتانی سەربەخۆیان، بپارێزن بەڵکو لە جیاتی ئەوە، بە سەپاندنی زۆری باج و ماڵیات و گوێنەدان بە بەرژەوەندیەکانیان، سەرەتای لە رزینی شاهنشاییان فەراهەم کرد[٧١٥].

لە ڕای توینبیش وا دەخوێندرێتەوە، کە لەحاڵەتی هەرەسدا، کۆمەڵگا بەشێوەیەك دەبێ کە کەمینەی کاربەدەست توانای داهێنانی نەماوە و بە زەبروزەنگ کار دەگێڕێ، هەوڵدەدا بەزەبری هێزیش لەو پایەدا بمێنێتەوە، کە چیتر پێی ڕەوانیە و ئەمەش هەست و هۆشێك بۆ تاکی پرولیتار دروست دەکات، کە پێی وابێ لەو پایە کۆمەڵایەتیەی لەباوباپیرانی بەمیرات بۆی ماوەتەوە، بێبەشکراوە، حاڵی بەجۆرە ناشایەنیەشی وای لێدەکات، کەللەڕەق و چاوەڕوانی دەرفەت بێت بۆ شۆڕش کردن و هەڵکوتانە سەر کەمینەی ستەمکار[٧١٦]. بێگومان ئەگەر لەڕێی شۆڕشیشەوە نەتوانی بە ئازادی و مافەکانی بگات، چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێ کە لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی کەمینەی دەسەڵاتدار بە هەڕەشەی دەرەکی، پارسەنگی بەربەرەکانی کردن و

---

[٧١٤] محسن محمد حسین: دامەزران و ڕووخانی شارستانی بەهۆی مرۆڤەوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩، ساڵی ١٩٩١، ل١٠؛محمد بیومي مهران: التاریخ والتأریخ ، دراسة في ماهیة التاریخ وکتابته ومذاهب تفسیره ومناهج البحث فیه، (الاسکندریة: ١٩٩٢)، ص٦١

[٧١٥] مرتضی راوندي: تاریخ اجتماعي ایران، ج١ ص٥٧٥.

[٧١٦] محسن محمد حسین: دامەزران و ڕووخانی شارستانیەتەکان بەهۆی مرۆڤەوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل١٢.

مانەوەی بۆ ڕابگرێ، ئەوەش لە میانەی ڕووبەڕووبونەوەی دەوڵەتی ئەخمینی لەگەڵ سوپای ئەسکەندەردا، لە شەڕی گۆگامێلا بەرچاو دەکەوێت، هۆکارێکی دیکە بوو بۆ لاوازی بەرەی ئەخمینی .

## ٣- ناجێگیری سیاسی ناو دەوڵەتی ئەخمینی:

گومانی تێدانیە کە بەردەوام بوونی هیچ ئیمپراتۆریەتێکی وەها تێکەڵ لە ڕەگەزی جۆراوجۆر و بەرقەرار بوو، لەسەر پانتاییەکی ئاوا بەرفراوان و پێکهاتوو بە ڕێگای پرۆسەی فراوانخوازی و مەیدانخوازیانەی بە زۆری زەبروزەنگ ئامێز، کە لەناوبردنی دەسەلاتی کۆمەلێك دەوڵەت و زەوتکردنی سەربەخۆیی زۆر میللەتی لێکەوتبێتەوە، پێبەربەرەکانی و ڕاپەڕین و هەلگەڕانەوە و وەلامدانەوە گوزەر ناکات، ئەم حاڵەتانەش بەدرێژایی سەردەمی پادشاکانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی، لێرەو لەوێ بوونیان هەبووە.

لەبەرئەوەش، کە پرۆسەی فراوانخوازی ئەنجامدرا و لەسەر دەستی کۆرشی گەورە (٥٥٩-٥٣٠پ.ز)و بەردەوامی پێدانی لەلایەن قمبیزی کوڕی و دارای ئامۆزای، کە پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بەو هەموو بەرفراوانیەوە لە ماوەی چارەکە سەدەیەکدا بە پشتبەستن بە لێهاتوویی جەنگی و سیاسەتی خۆ بە ڕزگاریکەر پێشاندان، لێکەوتەوە[٧١٧]، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەلای هەندێ هۆز و میللەتی ستەم دیدە و نارازی لە فەرمانڕەواکانیان، وەك فریاد ڕەس هەژماریان کردبێ –کە لەبەشی یەکەمدا باسمانکرد- لە بنچینەدا پرۆسەیەکی داگیرکاری بوو و ڕەهەندی ڕەتکردنەوەی کەلتورەکانی دی، هەلگرتبوو و لەلایەن هەندێك میللەت و دەوڵەت و کسایەتی تر بە هەڕەشەی لە دەستدانی سەربەخۆیی و لەناوچوون لێکدەدرایەوە، بۆیەش هەوڵی بەرلێگرتن و بەربەرەکانی کردنی دەدرا، تەنانەت کۆرشی یەکەم لە میانەی خەریکبوون بە سەرکوتکردنی جولانەوەی هۆزێکی بەربەرەکانیکاردا، کوژرا.

لە سەردەمی داریوشی یەکەم(٥٢٢-٤٨٦) ڕاپەڕینێك لە شاری بابل بە سەرکردایەتی (نەدنتو-بیل) سەریهەڵدا ، کاردۆخیەکانیش(کادوس) کە لە خاکی نێوان ئاشور و ماد و ئەرمەنستان،

---

[٧١٧] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي الحديث والمعاصر، (اسكندرية: د.ت) ، ص٦١-٦٢.

نیشتەجێ ببوون، ئالآی یاخیبوونیان هەلکردبوو، داریوشی دووەم لە میانەی لە شکرکێشی کردن بۆ سەریان بریندار و دواتریش بەو برینەوە مرد[٧١٨].

(زەینەفۆن) لە باسی ئەواندا وتویەتی، کە ئەو نەتەوەیە هەرگیز گوێڕایەڵی ئێرانیان نەکردووە، وتراوە کە تاجارێك یەك لە پادشایانی ئێرانی بەئوردویەکی(١٢٠)هەزار کەسی هێرشی کردۆتەوە سەریان، بەڵام سوپاکەیانیان بەتەواوی تێکشکاندووە[٧١٩].

هەیە پێی وایە کە یەکەم نیشانەی لێکەوتن (انحطاط) و هاتنەخوارەوەی گیانی شەڕکردن لە سوپای داریوشی دووەمدا بە شۆڕشی کادۆس و میسریەکان دەرکەوت[٧٢٠].

ئەخمینیەکان لەوپەڕی ڕۆژئاواش لەگەڵ شارە ئەیونیەکانی ئاسیای بچوك بەردەوام لە تێکهەڵچووندا بوون، بەوەش ئەو شارانە ببوونە سەرچاوەی بەردەوامی دڵەڕاوکێ و دانیشتوانەکانیشی لەبەرئەوەی ئازاد نەبوون و لەژێر سایەی ساترابەکانی ئەخمینی دەوڵەتی شاریان پێکهێنابوو، دەیانەویست سەربەخۆبن و جگە لەخواکانیان و یاساکانی شار، کەس سەرۆکیان نەبێ و چاودێری کارەکانیان نەکات و بەسەریاندا زاڵ نەبێت، بۆیە لە ناخەوە بۆ هەڵگەڕانەوە دەکولآن[٧٢١].

تەنانەت میدیەکان سەرەڕای ئەو نزیکی و تێکەڵاویەیان لەگەڵ ئەخمینیەکاندا کەچی هەوڵی یاخی بوونیانداوە و بەلای دارای یەکەمەوە، هەڵگەڕانەوەی ئەوان زۆر ترسناك بوو، بۆیە خۆی سەرکردایەتی سوپای کرد بۆ سەرکوتکردنیان[٧٢٢]. فراورتسی سەرکردەی هەڵگەڕانەوەکەی بەوپەڕی دڕندانە کوشت، بەڵام نەیتوانی شۆڕش لەماد کۆتایی پێبهێنێ، بەڵام نەبوونی یەکێتی

---

[٧١٨]زینفون: حملة العشرة الاف "الحملة علی فارس"، ص١٦٦؛نینا ویکتورونا پیگولوسکایا: تاریخ ایران باستان ، ترجمە: مهرداد ایزد پناه، انتشارات محمود، (تهران: ١٣٨٥)، ص٧٧-٧٨.

[٧١٩]حملە العشرە الاف، ص١٦٦؛ محەمدامین زەکی: کورد و کوردستان،(بەغدا:١٩٣١) بەشی یەکەم، ل١١٢؛ محەمەد مەردۆخی کوردستانی: مێژووی کوردو کوردستان،(سلیمانی:٢٠٠٧)، ل٦٢.

[٧٢٠] عبدالحسین زرین کوب: روزگاران، ص١٠٩.

[٧٢١] ادون بڤن: ارض النهرین، ص٦٦.

[٧٢٢] ادوین اردویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران، ص٨١.

ناوخۆ و دەرەوە و بەربەرەكانی یەكتری و هەركەس بۆ خۆكاركردنیان و دواكەوتوویی هەندێكیان، لە ڕووی ئابوریەوە و لایەنگری كردنی ژمارەیەكی زۆری سەرۆك هۆزەكانی ئەخمینی و میدی لە دەوڵەت و توانستی داریوش لە كێشكردنی ژمارەیەكی زۆری زەحمەتێكشان، نەیانتوانیوە بە ئامانجەكانیان بگەن[٧٢٣]. هەستكردنی میللەت بە جیاوازی و كاریگەری نێگەتیڤی خراپ سوود بینینی ئەو بێگانانە لە دەسەلات لەسەر چارەنووسیان، دەبێتە یەك لە هۆكارە كاریگەرەكان لە خولقاندنی ڕاپەڕین و شۆڕش لە پێناوی سەربەخۆییدا[٧٢٤]. بۆیە دەبینین زۆربەی میللەتانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ئەخمینی بەگوێرەی هەلكەوتنی دەرفەت، هەوڵی خۆرزگاركردنیانداوە بۆ ئەم مەبەستەش لەڕاپەڕین و شۆڕش بەردەوام بوون و سەركوتكردنی درندانە و وێرانكردنی شارەكانیان ساردی نەكردونەتەوە، لە نێویاندا وەك نموونە میسریەكان هەرگیز ئەندامێكی گوێڕایەڵ و ڕازی نەبوون لە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی، بەلكو هەمیشە جیاوازی سەرەكی لە سروشت و میزاجی میسریەكان و ئێرانیەكاندا هەبوو، میسریەكان بڕوایان بەخوا زۆری هەبوو و بتیان دەپەرست كەچی ئەوان ڕقیان لە بتپەرستی دەبۆوە و مەیلی یەكتاپەرستیان هەبوو، یۆنانیەكانیش ڕۆڵیان هەبوو لە هاندانیان بۆ شۆڕش كردن دژی دەوڵەتی ئەخمینی بە تایبەت لە سەدەی چوارەمی پێش زاینیدا [٧٢٥] (سیتون لوید)میسر وەك درکێكی بەردەوام لە جەستەی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیدا وەسف دەكات[٧٢٦].

شایەنی باسە ئەو گەلانە لەلایەك نەیاندەتوانی ڕابردوو فەرامۆش بكەن، لە دەسەلاتی میللەتی زاڵیشدا پشتگوێ خستنی بەشێك لە مافەكانیان دەبینی، چونكە دەسەلاتداری بیانی چەندی ڕێكوپێك مامەڵە بكات و باش لەگەڵ ژێر دەستەكانی بجولێتەوە نەدەتوانی بەوان بێت و خۆی لەنێو دابونەریتی ئەواندا بتوێنێتەوە و كار بەئاداب و ڕێوڕەسم و گوزەرانی ئەوان بكات، نە دەشتوانی خۆی لە پاشخانی كۆمەلایەتی و فیكری كۆمەڵگای خۆی، دابڕنی، چەندی هەوڵیش بدات، هێشتاش هەندێك شت هەیە كە جێی سەرنجی گەلەكەیە و گرنگی پێی نەداوە یان بە

---

[٧٢٣] ئی.م.دیاكۆنۆف: میدیا، ل٥٩٦-٥٩٧.

[٧٢٤] بۆ بەشێكی ئەو بۆچوونانە و نموونەی سەلمێنەر بڕوانە: عبدالحسین زرین کوب: آشنائي با تاريخ ايران ، (تهران: ١٣٨٥)، ص١٤٤-١٤٧.

[٧٢٥] سیرهارولد ادریس بیل: الهلينية في مصر، ص٤٦.

[٧٢٦] الرافدان ،ص١٢٢.

چاكی نەزانیوە گرنگی پێ بدات، خراپ سوود وەرگرتنیش لە نەریت و بڕوای ئەو میللەتانـە بـۆ ڕاكێشانی سۆزیان و دەستبردن بۆ خاڵی لاوازیان، بـەو توانـستەی لەبـەر دەسـتدایە و بـە خـراپ لێكدانەوەی نەریت و پرنسیپی زیندەگیان، جیاوازی ئاداب و ڕێوڕەسمی نێوانیـان زەق دەكاتـەوە، پیادەكردنی بچوكترین بنەمای هەڵچنراو لـە نـەریتی میللەتەكەشـی لـەناو گەلێكـدا، كـە پێـی نامۆیە، خۆماڵی بوونی دەسەڵاتی لای ئەو گەلـە، لێدەسـەنیتەوە، لەبەرئەوەشـە كـە پادشـاكانی ئـەخمینی سـەرەڕای یاداشـت كرانیـان لـە پلـە و مـەقامی بـاڵادا، هـەر بـە بێگانـە، دەزانـران وەدەرنانیشیان وەك ئەرك و كاركردن بۆ سەربەخۆیی، ئەژماردەكرا و تێگەیشتن لەو ئەركـە و لـە دەستدانی سەربەخۆیی و لەناوچوون لێكدەدرایـەوە، بۆیـەش هـەوڵی بـەرلێگرتن و بەربـەرەكانی كردنـی دەدرا، تەنانـەت كـۆرش لەمیانـەی خـەریكبوون بەسـەركوتكردنی جوڵانـەوەی هـۆزێكی بەربەرەكانی كاردا كوژرا.

وتیشمان، كە زۆر لەو میللەتانەی ژێردەستیان لە ڕووی شارستانی و بـەڕێوەبردن و سیاسـەتەوە، لـە ئەخمینیـەكان پێـشكەوتووتر و كـۆنتر بـوون، بەشـێوەیەك پادشـاكان هەسـتیان بـەگرانی كۆنترۆڵكردنیان كرد و ستەمكارانە حوكمڕانی كردنیشیان لەلایەن والیەكانەوە بەگوێرەی ویست و ئارەزووی خۆیان، بەپێی ئەو مـاف و ئیمتیازاتانـەی لەلایـەن پادشـاكانەوە بـۆ فەرمانڕەوایـەتی كردنی ئەو ناوچانە پێیـان درابـوو، هـەم گەنـدەڵی و خـۆش ڕابـوێری پیلانگێـڕی و پاشـقول لـە یەكگرتن یەكتر كوشتنی لە كۆشكی فەرمانڕەوا و والیەكاندا زیادكرد، هەم شۆڕشی بـەردەوامی ناوچەكانیـشی بـەدوای خۆیـدا هێنـا، كـە بـوون بـە هۆكـاری سـەرەكی لاوازبـوونی دەسـەڵاتی ئەخمینی[727].

پەیڕەوكردنی سیاسەتی لێبووردەیی و نەرمونیان جوڵانەوەی كۆرش وەك شتێكی ئاكاری و كەم و زۆر پـەنا بـۆ بردنـی دارا و پادشـاكانی تـریش وەك سیاسـەت، نەخـشی زۆری لـە فراوانكردنـی پانتـایی دەوڵـەت و ڕادەی بەرقـەراربوونی ئـارامی و ئاسـودەیی و كـەم و زۆری سـەرهەڵدانی گێروگرفتدا هەبوو[728]. بەڵام نەیتوانیوە ببێتە ئەڵتەرناتیف(بدیل)و قەرەبووی سەربەخۆیی وشتە لە دەستچووەكان بكاتەوە.

---

[727] عامر سليمان واحمد مالك الفتيان: محاضرات في التاريخ القديم، ص٢١٢-٢١٣.

[728] عبدالحسين زرين كوب: اشنائي با تاريخ ايران، ص١١٠-١١٦.

فراوانبوونی سنووری حوکمڕانی وهاتنی پادشی لاواز و بێ ورە، ڕەوشی دەوروبەریانی ئاڵۆزکرد و تا ورەی ئیمپراتۆرەکانیش خاوتر دەبۆوە چاو لە دوویی و ورەی والیەکان بۆ دەسەڵات زیاتر دەبوو و ئەو کەسانەش کە لەلایەن پادشاوە بۆ بەشداریکردنی حکومەت نێردرابوونە ولایەتەکان بە ترساندن یان بە فریوی زێڕ و زیو، دەکردە خزمەتکار و گوێڕایەڵ، ئیتر والیەکان خۆیان سەرکردایەتی سوپایان دەکرد و ماڵی زۆریان وەسەریەك دەناو جارجاریش زاتی لارێییان دەکرد دەکەوتنە شۆڕش کردن[729].

لەنێو ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەدا ڕاستبوونەوەی هەندێك شازادە و خۆبە شازادە زانیش شوێنیان هەیە، کە لەناوچە جیاجیاکاندا فەرمانڕەوا بوون و ململانێی وەرگرتنی دەسەڵاتیان دەکرد، یاخیبوونی بردیا لەقمبیز وخۆ بەپاشا ڕاگەیاندنی و ڕاپەڕینی والی باکتریا(ویشتاسب) دژی دەسەلاتی ئەردەشێری یەکەمی برای (درێژدەست) لە ساڵی( ٤٦٥پ.ز) [730]. ڕاستبوونەوەی کۆرشی بچوك دژی دەسەلاتی ئەردەشێری برای لە(٤٠١پ.ز) کەئاماژەمان پێکرد، شایەنی باسکردنن.

بەردەوام دووبارەبوونەوەی حالەتی شەڕ و سەرهەڵدانی شۆڕش و ڕاپەڕین- و توندوتیژی سەرکوتکردنیان، سەرەڕای ئەوەی، کە کاریگەری دەبوو لەسەر ئاڵۆزکردنی پەیوەندی دەوڵەت بەو میللەتانەوە و تادەهات هەوڵی ڕزگاربوونیان لێی گەورەتر دەبوو، سنووری بە ئەرکی خۆزانینی بەشداری کردنیشانی لە شەڕەکانی حکومەتی ناوەندیدا لەگەڵ هێزی دەرەکی، بەرتەسك دەکردەوە، هەروەها لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆر پیاوانی دلێر و چاپوکی ئەخمینی و شوێن پڕبوونەوەیان بە کەسانی ترسنۆك و خۆپارێز و لە هەمانکاتدا کەمبوونەوەی بزوزی(حیوی) و چالاکیشی لێدەکەوتەوە[731].

بێگومان کۆکردنەوەی سوپاش لەنێو ئەو میللەتانە بۆ شەڕکردن کە خواست و بەرژەوەندیان تێیدا نەبوو، لەگەڵ سوپای یەکگرتوو و ئامادە و شەڕ ویستی گریك، بەسەرکردایەتی

---

[729] لویس پل تادودیگران:تاریخ تمدن وزندگی مردم جهان،ص١١١؛ویل دیورانت:قصة الحضارة،مج١، ج١،ص٤٥٦.

[730] ادوین اریویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران، ص١٠١

[731] ویل دیورانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٤٥٧؛لویس‌پل تادودیگران: تاریخ تمدن وزندگی مردم جهان، ص١١١.

ئەسکەندەر، کە پێشتر لێی دوایــن، بــا بــەژمارە زورتــریش بــن، بەتایبــەتیش کــە" شــەڕە بەردەوامەکانی پێشووی دەوڵەتی ئەخمینی لەگەڵ میللەتانی گریك سامانێکی زۆریانی بەهــەدەر دابــوو[٧٣٢]، جگــە لــە تێکشکان چیتری لێچاوەڕوان نــەدەکرا، ئــەم ڕاستیانەش لــە شــەڕەکانی گرانیکوس و ئیسوس و ئاسان داگیرکردنی ناوچەکان، خۆی دەرخست لە گۆگــامیلاش بەتــەواوی سەلما.

## ٤-ڕەوشی کارگێڕی و بارگرانی ئابوری و ئەرکە جۆراوجۆرەکان:

سیستەمی ئابوری و کۆمەلایەتی قەڵەمڕەوی هەرێمەکانی چوارچێوەی ئیمپراتۆریــەتی ئــەخمینی وەکیەك نەبوو، لەسەر زەمینی سەر بەو مەملەکەتەدا هەرێمی جۆراوجۆر هەبوون کە چەندین ساڵ پێش پەیدابوونی ئەو ئیمپراتۆریەتە خودانی دام ودەزگای پێشکەوتووی حکومەتی بوون، هــۆز و خــێڵ و میللــەتانی تــری کۆچــەریش هــەبوو، کــە لــەقۆناغی دواکــەوتووی ســەردەمی خێلایــەتی دەیانگوزەراند، لەبەرئەوە دامەزراندنی یــەك سیــستەمی بــەڕێوەبردنی چەســپاو لــە وڵاتــانی ژێــر دەسەلاتیدا، ڕووبەڕووی دژواری زۆر دەبوونەوە بۆیە کوڕش و قمبیز دەستیان بۆ ڕەوشی کارگێڕی ناوخۆی دەوڵەتانی بابل و میسر و ئاسیای بــچوك و هــیتر نــەبرد و ڕێیانــدا وەك پێــشوو خۆیــان بەڕێوەببەن و شێوەیەك و لەخۆ ڕێبەریان هەبێ کە وڵاتەکان بە شێوەی(ساتراب) پارێزگا دابــەش ببــوون، لەهــەر یەکێکیانــدا پارێزگارێــك لــە نێــو پیــاو مــاقوڵ و پایەبــەرزەکانی ناوچــەکەدا هەڵدەبژێردرا، کە هەمەکارەبوو ولایەتەکەی بــەڕێوەدەبرد، بــەلام ڕاپەڕینــەکانی ســالانی (٥٢٢-٥٢١پ.ز) هەڕەشــەی ناســەقامگیریان لـــە دەوڵـــەتی ئـــەخمینی کـــرد، دارا ویـــستی دوای ســەرکوتکردنی ڕاپەڕینــەکان بــەر لــە ویــستی جــودایی خوازانــەی میللــەتانی ژێــر دەســەلاتی بگرێت[٧٣٣]، چونکە ولایەتەکان بە پێی سیاسەتی کوڕش خاوەنی قەوارەیــەکی گــەورەی سیاســی بوون، هەر والیەکیش پادشایەك بــووە بــۆ خــۆی بۆیــەش شــتێکی ڕەوابــوو کەشــا نازنــاوی شــای شایان(شاهنشا) لەخۆی بنێ لەهەمانکاتیشدا بەهۆی ئەو دەسەلاتەیان، مەترسیەکی گەورەبوون بــۆ پادشــای ئــەخمینی، کاتێــك بیانویــستبا هــەوڵی ســەربەخۆیی بــدەن یــان پایەکــەیان بکەنــە پشتاوپشت[٧٣٤].

---

[٧٣٢] عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم، ج١، ص٢٦٢.

[٧٣٣] ادوين اريدويج.گرانتوسكی: تاريخ ايران، ص٨٢-٨٣.

[٧٣٤] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٤١٨.

به پێی ئەو بنەمایانەی، کە کورش خستیەڕوو و داریوش دایمەزراند، کە سەڵتەنەتی ئەو لوتکەی ئەوپەڕی توانای پادشایەتی و شارستانیەتی تەخمینیەکان بوو، سەدەو نیوێکی تر شاهنشایی بەردەوامی بە زیندەگی خۆیدا، بەڵام گەشەکردن و وەستان و خراپبوونی ژیانی میللەت، لەو سەردەمەدا بە چۆنیەتی حوکمڕانی کردنیەوە بەندبوو[٧٣٥].

شیتەڵکردن و شرۆڤەکردنی ناونیشان و نازناوی پادشایەتیش لەنووسراوەکانی پارسی کۆندا، کە گەوهەری پلەوپایە و هەلومەرجی هەربوونیان نیشاندەدات و نزیکەی تەواوی دەقەکان بە دەستەواژەی (من فلانم، شای شایان، شای جهان، کوری فلان، لە بنەماڵەی هەخامەنشیان...) دەست پێدەکات و بەوەش، کە نووسیویانە کە (ئەو پایە ئاهورامزدا بەمنی داوە یان من بە یارمەتی ئەو بوومەتە پادشا)، کە قسەی خودی پادشاکانن، ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەوان خۆیان بە نوێنەر و جێگری خواوەند و گەورەترین فەرمانڕەوای یاسایی رووی زەمین، زانیوە و لەلایەن ئەوەوە هەڵبژێردراون و بەمەش پلەی سروشیتان بۆ خۆیان بڕیارداوە، کە نزمتر لە پایەی خوداوەند و بەرزتر لە پایەی ئادەمیانە[٧٣٦].

لەو دەوڵەتەدا جگە لە ئیرادەی پادشا و هێزی سوپا، هیچ یاسایەکیتر نەبوو و بە پێی ئەو بنەمایە، یاسای مەملەکەتیش لە ئیرادەی خودایەوە وەرگیرابوو، بۆیە هەموو دەرچوونێکیش لەو یاسایە بە دەرچوون لە ئیرادەی خوداوەند دادەنرا و پادشا دەسەڵاتی دادوەری باڵابوو لەسەر زەوی[٧٣٧]، تەنانەت لە میسر بەخودا دەزانران، ئەو یاسایانەش، کە ئەو پادشایانە جێبەجێیان دەکرد بە یاسای خودایی و ئاسمانی دەزانران[٧٣٨].

رەنگە لەو سۆنگەیەشەوە بووبێ، کە لە هەموو گۆشەکانی جیهان زێڕ رووە و گەنجینەکانی دەوڵەت دەهات و وایکرد پادشاش بە ژیانی سەربازیانەی زبر و بە خانویەکیش ڕازی نەبێ کە هەندێك لە هی رەعیەتەکان گەورەتربێت، بەڵکو چەندین پایتەخت و کۆشکی فراوان و جوانتر لە هاوتاکانیان کە بە فەرمانی سوڵتانە بە تواناکانی وەك ئەوانەی بابل و ئاشور دروستکرابوون، بە پێویست دەزانی، لەسەر ئەو بنەمایەش بوو کە گەورەیی بارەگای بە شکۆی پادشایانی

---

[٧٣٥] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٥٤٣.

[٧٣٦] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سموئیل کندی ادی: ایین شهریاری در شرق، ص٤٩-٧٢.

[٧٣٧] ویل دیورانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٤١٨.

[٧٣٨] سموئیل کندي ادي: آیین شهریاري در شرق، در مقدمة کتاب، ص٩- ١٠.

ئەخمینی، ببوو بە جێی سەرسامی هەموو ئەو کەسانەی لە شوێنی دوورونزیکەوە بۆ پێشکەشکردنی دیاری و دەرخستنی لایەنگری (پەیڕەوی لێکردن) دەهاتنە ئەوێ[٧٣٩].

شاهنشا چەند پایتەختێکی هەبوو و لەهەر یەکێکیاندا ماوەیەك دەمایەوە و کۆشکی شکۆداریان دروستکرد بوو و دەربار بە هەزاران لە خزمەتکار و قەراوڵ و نۆکەری تیادابوو و هەرکەس لەشا نزیك ببایەوە دەبوو بکەوێتە سەر زەوی و کڕنۆش ببات، بێ ئەو جۆرە ڕەفتارەش کەس نەیدەتوانی بچێتە بەردەمی و هەر کاتێك ویستبای خۆی نیشانی خەڵك بدات لەسەر کورسیەکی زێڕ دادەنیشت و گۆچانێکی زێڕی بە دەستەوە دەگرت و کەوایەکی درێژی دەکردەبەر و تاجێکی لەسەر دەناو پشتێنی زێڕی دەبەست و کەس لەتوانای ئەو بالاترنەبوو و تەنها ئاماژیەکیشی بەس بوو بۆ هەر کەسێك کە بیویستایە بیکوژێ، با لەوپەڕی مەملەکەتیش بایە[٧٤٠].

پادشا لوتکەی سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو و دەسەلاتی ڕەهای و سەرۆکی گشتی داد بوو و کۆشکی ڕازاوەی هەبوون و باخچە گوڵستانەکانی پڕ لە باڵندە و ئاژەلانی ڕاو بوون[٧٤١].

بەلام پیرۆزی پادشا و بەردەوامی گوێڕایەڵی کردنی، بەندبوو بە هاتنەوەی ڕەفتار و هەوڵ و ئامانجەکانی، لەگەڵ ڕەوشی باوی دەق گرتووی هەڵقولا و لە هزر و تێڕوانین و دابونەریت و گشت ئەو دەرئجامانەی لەڕێی پێشهاتەکانی دیرۆکی گوزەرانیاندا، پێی گەیشتبوون و ئەندامانی کۆمەڵگا کە لەسەری ڕێکەوتبوون و ببوونە هەوێنی بەیەکەوە هەلکردنیان، واتا تا ئەو کاتەی ئارەزووەکان و میانیزمی بەدیهێنانیان لەو سنوورانەدا مابایەوە کە کۆمەڵگا بە زاندنیانی حەرام کردووە، پادشا پیرۆز بوو و گوێڕایەڵی کردنی بەپێویست دەزانرا ئەم ڕەوشەش لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکیتر جیاوازبوو.

بۆ نموونە مۆرکی باوی پادشایەتی لە دەوڵەتی میسر دانانی پاشابوو، بە کوڕی خوای بالا، کە خستویەتیە و ناردوویەتیە سەر زەوی بۆ بلاوکردنەوەی دادوەری هەڵسانی بە دروستکردنی پەرستگای خواوەندان بڕواش وابوو، کە تا ئەو کاتەش کە ئەو بیرە کاریگەری بمێنێ و ولات لە خێر و خۆشیدا دەبێ، کاتێکیش ئەو بۆچوونە شێوا، تێکچونی ماریفەتیشی لێدەکەوێتەوە کە

---

[٧٣٩] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٢١٥.

[٧٤٠] البرماله: تاریخ البرماله،ج١، ص٣٣٢-٣٣٣.

[٧٤١] جلال یحیی: التاریخ الاوروبي، ص٦٣.

سەردەکێشێ بۆ ئاژاوە و ئەگەر ئەو حاڵەتەش بە سیستەمێکی بێوەیدا ڕەت نەبێ، ئەوە چاوەبڕدرێتە پادشایەکی ڕزگاریدەر(فریادرەس)و نێردراوێکی تری خودایی کە لە توانایدا هەبێ بارودۆخ بگێڕێتەوە و بەرەو چاکتری بەرێت[٧٤٢]. لەسەر ئەو بنچینەیەش ئاسایی بوو، کە پادشا خۆی بە خاوەنی تێکڕایی زەویەکانی ئیمپراتۆریەت دانابێ[٧٤٣].

لایەنی ئابوری و فەزای کۆمەڵایەتی چوارچێوەیەکیان هەیە، کە ئاستی کارکردن بۆ ڕەخساندنی هەلومەرجی گەشەسەندیان و کەم و زۆری دەستبردن بۆ فشار تیایاندا لە پێناو سەقامگیر هێشتنەوەی ڕەوشی فەرمانڕەوایەتی کردن گەیشتن بە ئارەزووە باڵاکان، لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، ئاستی پاراستن و بەزاندنی نیشاندەدات و کایەیەکیش دەخوڵقێنێ کە تیایدا ئارامی کۆمەڵگا و ئاراستەی پەیوەندی و ڕادەی هۆگری ئەو میللەتانەش بە دەسەڵاتەوە دیاری دەکات و ڕۆڵیشی دەبێ لەسەر توانستی خۆڕاگری دەوڵەت لە بەرامبەر مەیدانخوازی دەرەکیدا. بەزاندنی ئەو سنوورە لە میانەی حوکمڕانی کردنی پادشاکانی ئەخمینیدا، بە زەقی دیارە و ئاسەواری نێگەتیڤیشی لێکەوتەوە.

ئەوان بەهۆی هەڵچنینی بیری گەیشتن بە خواستە باڵاکانیان لەسەر سامانی کەڵەکەبووی ناو گەنجینەکان و ژمارەی سەربازان، بەردەوامی داوا و خواستی جۆراوجۆر و سەپاندنی ئەرکی گران و مامەڵەی نادروستی کۆمەڵایەتی و بەرتەسککردنەوەی هەلی بەرهەمهێنان و بڕەونەدان بە دەرفەتی گەشەکردنی ئابوری میللەتانی ژێر دەسەڵاتیان، هەلومەرجێکی دژواریان هێنایە ئاراوە، کە تادەهات بۆشایی نێوان دەسەڵات و میللەتی فراوانتر و زەمینەی خۆڕانەگرتنی ئیمپراتۆریەتی لە بەرامبەر فشاری دەرەکیدا گونجاوتر دەکرد.

باری باجی سەر ولایەتەکان بەپێی سەروەت و سامانیان ( پارە، میوە، ئەسپ، مەڕوماڵات...) کە لەلایەن داریوشی یەکەمەوە دیاریکرابوو[٧٤٤] و سەرچاوەی سەرەکی سامانی کۆکراوە و کەڵەکەبووی ناو گەنجینەکانی پایتەختی ئەو ئیمپراتۆریەتەی دەنواند، کە بەمانای وشە

---

[٧٤٢] یان آسمان: مصر القديمة، ص٤٣٤.

[٧٤٣] جماعة من علماء الآثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٦٠.

[٧٤٤] هارڤی بورتر: موسوعه مختصر التاريخ القديم، ص١٦١؛ باقر ياسين: تاريخ العنف الدموي في العراق، الوقائع –الدوافع –الحلول،(بيروت:١٩٩٩)، ص٦٧؛ نيناويكتوروناپيگولوسكايا: تاريخ ايران باستان، ص٥٨.

ئیمپراتۆریەتێکی سەربازی بوو و هەموو شتێك لە ژێر دەستی پادشاو سوپادابوو[٧٤٥]، هێندە زۆر و قورس بوو، کە هەڵگرتنی ئاسان نەبوو.

خەڵکی هەر ولایەتێك دەبوو سەرەڕای دانی موچەی فەرمانبەران کە لەولایەتەکەدا کاریان دەکرد و حوکمڕانیان بوون و هێندەش زۆر بوو کە بەشی ئەوەی دەکرد، والیەکان چەندین کۆشك و حەرەمسەرا(حریم)و باخی ڕاویان هەبێ، کە پارسەکان بە فیردەوس(بە هەشت)ناویان بردووە[٧٤٦]، یان وەك وتراوە کە زۆری موچەکە، توانستی فەرمانبەرانی بۆ دروستکردنی کۆشك و بەکارهێنان یان ڕاگرتنی خزمەتکار و هەڵسان بە سازدانی ئاهەنگەکانی ڕاوی گشتی، مسۆگەر کردبوو[٧٤٧].

جۆرو بڕی ئەو باجەش، کە پێویست بوو خەڵکی ولایەتەکان لە ڕێی کاربەدەستی ناوچەکان بیدەنە پادشا لە ولایەتێکەوە بۆ ولایەتێکیتر جیاواز بوو بۆ نموونە هند لە پێش هەموو ولایەتەکان دەهات و خەراجی ساڵانەی کە دەچووە گەنجینە شاهنشا(ملك الملوك)(٤٦٨٠) وەزنە(Talent) بوو لە زیوو دوای ئەویش ولایەتی بابل و ئاشور دەهات و بڕی باجەکەی(١٠٠٠) وەزنە بوو و پاشان میسر دەهات کە باجەکەی(٧٠٠)و کیلیکیەش(٣٦٠) وەزنە و چوار ولایەتەکەی ئەنادۆلیش(٧٦٠) وەزنەیان دەدا[٧٤٨]. کە تێکڕا دەیکردە (١٤,٥٦٠) تالنت لە ساڵێکدا و بەهاکەی بە(١٦٠,٠٠٠,٠٠٠) بۆ (٢١٨,٠٠٠,٠٠٠)ملیۆن ریال خەمڵێنراوە، جگە لەوەش لە هەموو هەرێمێك چاوەڕوان دەکرا کە بە ناردنی کەلوپەل و تازوخە یارمەتی پادشا بدەن بۆ ئەم مەبەستەش بۆ نموونە هەموو ساڵێك میسر بە(١٢٠,٠٠٠) دەفر گەنم لە دانەوێڵە و میدیاش بەسەد هەزار سەرمەڕ و ئەرمەنەکانیش(٣٠)هەزار جانومایین و ولایەتی بابل و ئاشوریش بە پێنج سەد پیاوی خەسیو[٧٤٩] و لە هەر ساڵێکیش چوار مانگ خۆراکی دەربار دابین بکات ڕۆژانەش بەیەك ئەرتاب لە زیو (نزیکەی دە پاوەند)و دابینکردنی

---

[٧٤٥] محمد الاسعد بن بوبكر: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٤٠.

[٧٤٦] ويل ديورانت: قصة الحضارة، مج١،ج١، ص٤٢٢.

[٧٤٧] سامي ريحانا: شعوب الشرق الادنى القديم، ص١٦٣.

[٧٤٨] ويل ديورانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٤٢٢؛ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٧٧.

[٧٤٩] ويل ديورانت: قصة الحضارة، مج ١، ج١، ص٤٢٢.

ئالیکی (٨٠٠)ماین و (١٦٠٠)ئەسپ و بە بەردەوامی تەرخانکردنی چوار گوند، باری قورسی والی یان دەسەلاتی ناوچەکە، هەڵبگرێت[٧٥٠].

ئەمە جگە لەوەی، کە هەندێك لە ڕەعیەتەکان ناچار دەکران، کە ڕۆڵەکانیان بۆ کاری نانەوایی و چێشت لێنان و دەرگاوانی و...هتد، ڕەوانەی کۆشکی پادشایەتی وخانەدانەکانی ئەخمینی بکەن، هەندێکیش دەبوو بە سەدان لە ئافرەتی بێخەوش بۆ پادشا بنێرن[٧٥١]،یەك لە مێژوونوسان پێی وایە کە هەموو میللەتانی چوارچێوەی قەڵەمڕەوی ئەخمینی دەبوو باجی شتومەك ونەختینە بدەن ئەوەش کە خەراجی نەختینە پێی گەیشتیبوو بەیەك ملیۆن فرەنك مەزەندە دەکرا [٧٥٢].

سەرچاوەیەکی تریش، بێ ئاماژە کردن بە هیچ نەتەوە و بڕ و جۆری ئەوەی لەسەر هەر یەکێکیان بوو بیدەن، نیشانیداوە، کە سەرەڕای دیاری جۆراوجۆری وەك ئەسپ و مەی و خوێ و دانەوێڵە، بخور و سەگی ڕاو و زێڕ(تیر)و تەنانەت خەسیو و منداڵ و لاوان، ددانی فیل و ئەبەنوس، بە گوێرەی بەرهەمی هەر ناوچەیەك و بەهای ئەو باجەش کە نوێنەرەکانی پادشا دەیاننارده پایتەخت، دەگەیشتە(٣٥٠)تەن زیو ئەوەش بەهایەکی زۆربوو کە هیچ دەوڵەتێك نەیدەتوانی لە ساڵێکدا کۆی بکاتەوە[٧٥٣].

(نینا ویکتوروناپیگۆلوسکایا) تێکڕای خەراج کە دەچووە گەنجینەی داریوش بە(١٤٥,٠٠٠)تالنت یان نزیکی(سی و چوار ملیۆن روبل) زێڕ یان نزیکی (سێ سەد ملیۆن تمەن) داناوە[٧٥٤].

ئەوان تەنانەت لەسەر پەرستگاکانیشیان پێویست کردبوو کە جگە لەباجی جۆراوجۆری وەك مەڕومالات دەبوو ژمارەیەك کۆیلە بۆ کاری جۆراوجۆر بنێرنە کۆشکی پاشا، بۆ دڵنیابوونیش لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان چاودێریان لە ئیدارەی پەرستگاکان دانابوو[٧٥٥]

---

[٧٥٠] جورج رو: العراق القديم، ص٥٥٠؛ مؤيدسعيد: العراق خلال عصور الاحتلال، العراق في التاريخ، ص٢٤١.

[٧٥١] جماعة من علماء السوفيت: العراق القديم، ص٤٧٢-٤٧٣.

[٧٥٢] البر مالة: تاريخ البرمالة، ج١، ص١٣١.

[٧٥٣] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي، ص٦٥.

[٧٥٤] تاريخ ايران باستان، ص٥٨.

[٧٥٥] جماعة من العلماء الاثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٧٤.

ئەمەو دەركەوتنی ڕەنگدانەوەی كاریگەری ئەو فشارە ئابوریە و لە بەڕێوەبردنی وڵات و چۆنیەتی مامەڵەكردنیان لەگەڵ سەرچاوە و هۆكارەكانی بەرهەمهێنان و سروشتی ئامانجە لە بەرچاو گیراوەكان و ئاستی ڕەچاوكردنی بەرژەوەندی گشتی، ڕادەی جێی خۆكردنەوەی هەڵوێستەكان لە زەینی ئەو میللەتانەدا، لە سەردەمێكەوە بۆ سەردەمێكی تری ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی، جیاواز بووە و لەماوەی دەسەڵاتی پادشاكانی دوای داریوشی یەكەمەوە زەفتر دێتە بەرچاو، بۆیە دەبینین لە سەردەمی پادشا یەكەمینەكانی ئەخمینیدا بەهۆی گرنگیدان بە باری ئابوری ناوچەكان گەشەكردنی هەمە لایەنەی ئەو بوارە، سەرەڕای سەپاندنی باجی زۆریش كەچی ئاستی زیندەگی بەرەو باڵا دەڕۆیشت[٧٥٦]،بەڵام بە خاوبوونەوە و لاوازی سیستەمی حوكمڕانی ناوەندی(حكم المركزي) لە ئیمپراتۆریەتدا، بارودۆخی ئابوریش تێكچوو.

سەرەتای لاوازی دەسەڵاتی ناوەندی بە مردنی داریوشی یەكەم دەست پێدەكات چونكە" دوای مردنی ئەو بە وردی چاودێری بنەماكانی لێكهەڵوەشان و ئەركی فەرمانبەرەكان نەكراو چارەنوسی دەسەڵاتی ساترابەكانیش كەوتە سەر ئاستی لێهاتوویی فەرمانبەرەكان و كامیان كارامەتربایە دەیتوانی كۆنترۆڵی دەسەڵاتەكان بكات، بەشێوەیەك، كە لەسەدەی پێنجەم و دواتریش وا ڕوویدەدا كە چەند ساترابێك دەكەوتنە دەست فەرماندەیەكی سەربازی، یانیش والیەكان خۆیان بە ئەركی سەربازیەوە خەریك دەكرد، كە ئیشی ئەوان نەبوو[٧٥٧] و ئەو پادشایانەش كە وتمان نەیانتوانی بۆ پاراستنی پەیوەندیان بەرامبەر بە میللەتەكانی ژێردەستیان، پەند و ئەزمون لە سیاسەتی وردوبینانەی كورش و داریوش وەربگرن، لەبەر سەرقاڵبوونیان بە بەخۆڕاگەیشتن و پلانی لەناوبردنی یەكتری و دروستبوونی دەستەبەندی ڕامیاری و بەفیڕۆدانی پارە و زێڕی شاهنشایی لە كاری گەندە و خیانەت، بەرژەوەندی ئەو بەهێزكرد[٧٥٨] و لە سەرێكی تریش بێ ئیرادەیی و لاوازی دەسەڵاتی پادشاكانی نیشاندەدا، زیادبوونی چڵێسی و چاو لە دوریی كاربەدەستی سەر ناوچەكانیشی بە دوای خۆیدا هێنا و پاش میللەتانەیان فەرامۆش كردبوو ئەمەش لە سەرێكەوە بزاڤی ئازادیخوازی ئەو میللەتانەی

---

[٧٥٦] بڕوانە: رمان گیرشمن: تاریخ ایران از غاز تا اسلام، ص٢٣٤-٢٤٣؛ سامي ريحانا: شعوب الشرق الادنى القديم، ص١٦٦-١٦٧.

[٧٥٧] ادوين اردويچ گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران، ص٨٢-٨٤.

[٧٥٨] مرتضى راوندي: تاريخ اجتماعي ايران، ج١، ص٥٧٥.

ئەوەی بە هێزترینیان بە ترس یان بە فریوی زێڕ و زیو کاربەدەستانی دەوروبەری دەکردە بەندە و گوێڕایەڵی خۆی، کوێی ویستبا لەشکری بۆی دەکرد و دەکەوتنە کۆکردنەوەی سامان[٧٥٩]. بێگومان تا ئەو کاتەش، کە پابەندیان بەناوەندەوە هێشتبێتەوە، لەگەڵ رایکردنی ئەرکی پێسپێردراویان، بەرژەوەندی خۆشیان کاری زیاتریان کردووە، ئەمەش باری سەرشانی هاوڵاتیانی قورستر دەکرد.

ئەمانە و زەوتکردنی زۆرترین و باشترین زەویەکانی ئەو ناوچانەی دەستیان بەسەردا دەگرت، لەلایەن پادشاوە و دابەشکردنیان بە سیفەتی کیلگەی گەورە و ملکی میراتی نەشیا و بۆ گواستنەوە(غیر قابل للتحویل) لەنێو ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی و هاوڕێیان و نزیکەکان پادشا و فەرماندە کارگێڕیە دیارەکان و ئەو کەسانەی خزمەتی نایابیان پێشکەش بە پادشا دەکرد، بە زۆری لەگەڵ مولکە بەرفراوانەکانی والی و ئەفسەرە دیارەکان، لەسەر شانی کۆیلەکان ڕەنیو دەهێنران و لەلایەن بەڕێوەبەرانی سەر بە دەسەڵاتی پادشایەتیدا، سەرپەرشتی دەکران[٧٦٠] و ئەو مولکانەش، کە بە سیستەمی(لزمة الاراضي) لە بەرامبەر ئەرکی سەربازی و جێبەجێکردنی ئەرکێکی دیاریکراوی وەك تیرهاوێژی و گالیسکەڕانی و سوارچاکی و خزمەتکردن بە پادشا دەدرا بە جەنگاوەران[٧٦١] و بە کۆمەڵی و لە هەموو ناوچەیەك وەریاندەگرت و باجی دەوڵەتیان لێیدەدا[٧٦٢]، لە بنچینەدا مولکایەتی سەربازی بوون و زۆربەی ئەوانەش کە وەریاندەگرت، نە لە بنەڕەتدا جوتیار بوون و نە زانیاریشیان لەبارەی شێوازی کاری کشتوکاڵی هەبوو، بۆیە ناچاربوون ئەرکی بەڕێوەبردن و ڕەنێوهێنانی بسپێرنە کەسانیتر و لە بریتی موچەیەکی مانگانەی جێگیر، وەربگرن[٧٦٣].

---

[٧٥٩] لویس پل تاد ودیگران: تاريخ تمدن وزندگی مردم جهان، ص١١١.

[٧٦٠] بڕوانە: جماعة من علماء الآثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٦٠-٤٦٢.

[٧٦١] ادوين اردويج گرانتوسكی ودیگران: تاريخ ايران، ص٨٧؛ مؤيد سعيد: العراق خلال عصور الاحتلال العراق في التاريخ، ص٢٤٢.

[٧٦٢] جماعة من علماء الآثار السوفيت : العراق القديم، ص٤٦٥.

[٧٦٣] مؤيدسعيد: العراق خلال عصورالاحتلال ،العراق في التاريخ، ص٢٤٢.

به کۆیلەکردنی خەڵکی ئەو شوێنانەش کە ڕاپەڕین تیایاندا دژی دەسەڵات ڕوویدەدا و بە موڵکی دەوڵەتکردنی، زەویەکانیان[764] و زەوتکردنی ماڵ و موڵك و خانو لە هەندێك شوێن و بێ ماڵ و حاڵکردنی خاوەنەکانیان[765]، وازهێنانی ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەر و خاوەنی کاران لە کاری بەرهەمهێنان و گوزەراندنی ژیانی مشەخۆرانە لەسەر ڕەنجی جوتیار و پیشەوران و زیادبوونی ژمارەی ئەو کەسانەی کە هۆکارەکانی بەرهەمهێنانیان لەدەستچوو[766]، ئەو هەموو داهاتە زۆرەش، کە دەوڵەت لە ئامادەکردنی سوپا بۆ شەڕەکان بەتایبەت لەگەڵ وڵاتی گریك خەرجی دەکرد، لەگەڵ ڕوودانی گۆڕانکاری لە ڕێگاکانی بازرگانی و فەرامۆشکردنی پرۆژەکانی ئاودێری[767] و قۆرخکردنی موڵکداریەتی ڕووبار و جۆگەکانی ئاودێری لەلایەن پادشاوە و دەستاودەستکردن لە بەکرێدانیاندا، نرخەکەشی زیادی دەکرد[768] و ناچاربوون بە قبوولکردنی مەرجی جۆراوجۆر لەکاتی سوود لێبینینیاندا[769]، تێکڕا دەبوونە هۆی کەمبوونەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی و بازرگانی و پادشاکانیشی بۆ زیادکردنی باج، هاندەدا[770].

ئاشکرایە کە بەکارهێنان و بڵاوبوونەوەی پارەی زێڕ لە هەموو سەردەم و دەوڵەتێکدا، بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری پێشکەوتنی ژیانی ئابوری ئەو وڵاتە و گەشەسەندویی بازرگانی و کشتوکاڵ و پیشەسازی و پیشەی دەستییە تیایدا، ئاسودەیی وخۆشگوزەرانی نەوەکانیشی دەگەیەنێ، بەڵام لێدانی سکە واتە پارەی زێڕ و زیو بەناوی (الداری، داراییکوس، دریق) لەلایەن داریوشی یەکەم(٥٢٢-٤٨٦پ.ز)ەوە لە ساڵی(٥١٧پ.ز) بۆ یەکەمجار لە ئێران، بە شێوە و کێشی جۆراوجۆر بە گوێرەی هەرێمەکان[771] و وەك دیارترین دیاردەی ئابوری لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەخمینیدا ، کردنی بە بنەمای

---

[764] جماعة من علماء الآثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٧٢.

[765] نفس المرجع، ص٤٧١.

[766] جماعة من علماء الاثارالسوفيت:العراق القديم، ص٤٧٣.

[767] عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم، ج١، ص٢٦٣.

[768] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٨٦-٨٧؛ أدوين اردويج گرانتوسكى وديگران: تاريخ ايران، ص٨٦-٨٧.

[769] بڕوانە: جماعة من علماء الآثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٦٩-٤٧٠.

[770] عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم،ج١، ص٢٦٣.

[771] مؤيدسعيد: العراق خلال عصور الاحتلال، العراق في التاريخ، ص٢٤٢.

مامەڵـەی بازرگانـــی[٧٧٢] و بەرقەرابوونـــی وەك یەكـەمین سیـــستەمی دانـــی مـاڵیـات لــە ســاڵی(٥١٨پ.ز) ، هەموو ولایەتەكانی ناچاركــرد كەماڵیاتـــی سـەپێنراو و بڕیـار لەســەر دراوی خۆیان، جگـە لـە میللەتـــی پـارس (ئەخمینیـەكان) وەك میللەتـی سـەردەســـتە، بـە پارەی نەختینە ( واتە بەزێڕ یان بەزیو) بدەن[٧٧٣].

لەبەرئەوەش كە ئەو پارە كۆكراوەیە بەشێكی كەمی نەبێ هەمووی لـە گەنجینەكانـدا هەڵـدەگیرا، بۆ خۆی گیروگرفتێكی تربوو، چونكە" ڕێی لە گەشەكردنی مامەڵەی نەختینە دەگرت و بەردەوام ڕێژەی دەستاودەست پێكردنیشی، لە بازاڕدا كەمتر دەبۆوە[٧٧٤] .

ئەمە و سووربوونی دەوڵەت لەسەر ڕایی بوونی پرۆسـەی (بـاج) دانەكـە و ڕەچـاونەكردنی كـەمی پـارەو بـەروبووم و هەرەسـهێنانی بـاری ئـابوری و بەرزبوونـەوەی نـرخ و گرانـیو بـەرزی كـرێ پێداویستی هەموو چینەكانیش بە پارەی نەخت بەتایبەت خاوەن زەویەكان بۆ دانـی بـاج، هـەلی خستە دەست دەوڵەمەند و سوخۆر و پارە گۆڕەرەوان، كە بەقازانجێكی زۆر پارە بدەنە خەڵك[٧٧٥] و چالاكی بانكیش گەشەیكرد و كاری بانكی، كە تا ئەو كات لە نێو ئـەمیران پیـاوانی ئاینیـدا ئەنجام دەدرا، ئێستا خەڵكی تریشی گرتەوە و بانكی تایبـەتی پەیـدابوون بـۆ نموونـە لـە(نەفـەر) بانكێكی تایبەت بە بنەماڵـەی(موراشـو ناوێـك) دەركـەوت، كـە پـارە و شـتومەكی بازرگـانی وەردەگرت و جۆگای ئاودێری هەڵدەكەند و ئاوی بە كـشتیاران دەفرۆشـت...هتـد[٧٧٦] ، بەشـێكی زۆری زەویـــەكانی دەوروبـــەری شـــاری بارمتـــەكرد و وەك كۆمپانیایـــەكی بازرگـــانی وابـــوو و هاوڵاتیانی لە بواری تری وەك ڕاو و فرۆشتنی ماسیو بەكرێگرتنی ئاژەڵ و هەڵكەندنی جۆگـە، بەكاردەهێنا و سەرچاوەی داهاتیشی ئەو قەرزە داراییە بوو، كە پێشكەش بە كشتیاران و خـاوەن

---

[٧٧٢] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨٢.

[٧٧٣] ادوين اردويچ گرانتوسكی وديگران: تاريخ ايران، ص٩٤-٩٥.

[٧٧٤] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨٤؛ عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم، ج١، ص٢٦٣.

[٧٧٥] طـه بـاقر: مقدمـة في تـاريخ الحـضارات القديمـة، ج١، ص٥٨٢؛ محمـد الاسـعد بـن بـوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين ،رسالة ماجستير، ص٤١.

[٧٧٦] رمان گیرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٢٤٠.

زەویەکانی، دەکرد[٧٧٧] بە گوێرەی ئەو بەڵگەنامانەش کە لە بەردەستدان کاربەدەست و شاژن و خانمەکانی دەربار بە زۆری خانوو و باخەکانیان بە کرێ دەدایە بنەماڵەی موراشو و کەسانی تر[٧٧٨].

هەروەها بەردەوام بەرزبوونەوەی نرخی هۆکارەکانی گوزەران، دوای مردنی داریوشی یەکەم بێنەوەی لەگەڵیدا کرێی کارکردن زیادبکات[٧٧٩] و ئەو فشارەش کە لەلایەن دەوڵەتەوە پراکتیزە دەکرا، زۆر خەڵکی ناچارکردبوو کە سەرەڕای قەرزکردن، کێڵگە و خانویان بە بارمتەبدەن، تا لە مردن ڕزگاریان بێت و باجی پادشاشی پێ بدەنەوە، تەنانەت زۆرجار بۆ ئەستوپاکی لەباج و قەرز و ئازادکردنی موڵك ومالّەکانیان لە بارمتە، بەتایبەت کە نەیانتوانیوە پارەی پێویست بۆ ئەو دەست بخەن، کوڕ و کچەکانیان دەفرۆشت یان دەیانکردنە کۆیلە لەبری، یاخود ناچاردەکران، وەك کرێ گرتەی بێ زەوی لە زەویەکانی خۆیاندا، کاربکەن و منداڵەکانیشیان لەبری بدەن و زۆرجاریش وا ڕێدەکەوت کە خەڵکی لەبەرئەو بارە قورسەی باج لە گوندەکانیان ڕابکەن و بچنە شار، کەچی لەلایەن داروودەستەی شاوە دەستگیردەکران بە تۆبزی دەگێڕدرانەوە گوندەکانیان[٧٨٠].

لە نێو بەڵگەنامەکاندا دەقی زۆر هەیە سەبارەت بەو سەردەمە و پەیوەست بە وەرگرتنی زەوی دەرەبەگایەتی(الاقطاعیات)و کیلگە و زەوی تاکەکەس و دامەزراوەکانی وەك پەرستگاکان و بەکرێگرتنی(ایجار) خانوو و وەرگرتنی دەستکەوت، هەروەها لە دەقەکاندا گەلێك ڕاستیش لە بارەی حاڵی دارایی تاکەکان و پەیوەندیان بە دامەزراوەکان و شوێنی نیشتەجێ بوون و زەویی کشتوکاڵی کە لە ژێر فەرمانی دەسەڵاتی داگیرکاری ئەخمینی دابوون، هاتووە و ئەو حاڵەتەی هاوڵاتیانیشی تێدا ڕەنگداوەتەوە کە کاتێك دووچاری تەنگانەی دارایی هاتوون و شوێنێکیان شك نەبردووە بۆ تێدادانیشتن و ناچار (بەبارمتەدانی) زەویەکانیان ومنداڵەکانیان و

---

[٧٧٧] جورج رو: العراق القديم، ص٥٥١؛ محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: الغزو اليوناني في البلاد الرافدين رسالة ماجستير، ص٤١.

[٧٧٨] جماعة من علماء الاثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٦٤.

[٧٧٩] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨٣.

[٧٨٠] ادوين اردويج گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران، ص٩٠؛ مجموعة من علماء الاثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٧١-٤٧٢.

بەکرێگرتنی خانوو بە نرخێکی گران بوون، ئەوەش بارودۆخێکی زۆر شەرمێون بوو، کە خەڵکی بابل بەتایبەت دووچاری ببوون[٧٨١]، وتراویشە، کە ئەو گۆڕانکاریانەی لە پەیوەندی کشتوکاڵی و سیستەمی باجدا ڕوویاندا شەقڵێکی تایبەتی لانی کەمی زۆربەی ئەو وڵاتانە بوو، کەخاوەنی ئاستێکی باڵای گەشەسەندنی ئابووری بوون و لە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیدا، تێکەڵی یەکتر کرابوون[٧٨٢].

جێی سەرنجە سوپایەك لە نێو ئەو میللەتانە، کە بەو حاڵەوە گوزەراندویانە، پێکبهێنرێت و بۆ شەڕێك سازبدرێت کە ئایندەی ئەو دەسەڵاتەی پێوەبەندبێ، لە بەرامبەر هێزێکیش کە بە عیشقەوە و بە ئامانجی ئایندەیەکی پڕشگندار ڕووە و شەڕکردن دێن، بجەنگن، جگە لە دۆڕان چیتری لێ چاوەڕوان ناکرێ، لەو بارەشەوە دیاکۆنۆف وتویەتی: ((باری ژیانی ئازادی ئەمپراتوری پارس(ئەخمینی) لە ئەنجامی باری گرانی ژیان و زۆر بێگاری لە شکری و ئەم و ئەو سەرانە و باج و خەراجی ئاژەڵەوە کە بەتایبەتی لە ناوچە کشتوکاڵیەکانی کیشوەری پادشایەتیدا بایەخدار بوو لە سەدەی شەشەم و چوارەمی پێش زایینی زۆر ناڕەحەتی کردبوون و کاری زۆری کردە سەر سستی دامەزراندنی لەشکر و هونەری شەڕکردن و ئامادەبوونی لەشکریشی بۆ شەڕ کەم کردەوە))[٧٨٣]، لە شوێنێکی تریشدا نووسراوە کە تێکشکانی سوپای ئەخمینی بەسەرکردایەتی دارای سێیەم لە ساڵی(٣٣١پ.ز) بەرامبەر سوپای ئەسکەندەری بۆ زوڵم و زۆر و ستەمی ئەو پادشایانە دەگەڕێتەوە کە دەرهەق بە میللەتانی ژێردەسەڵاتیان، ئەنجامیانداوە، بە ڕادەیەك کە ئەو میللەتانە ئەوەندە هەستیان بە چەوسانەوە کردووە، کە ئامادەنەبوون لە بەرامبەر هێزی داگیرکەران بەرگری لە وڵاتەکەیان بکەن[٧٨٤].

### ٥- هۆکاری دیکە:

لەگەڵ ئەو هۆکارانەی لە تەوەرەکانیتر لێیان دواین، هێشتاش کۆمەڵێك هۆکاری دیکە هەبوون کە ناڕاستەوخۆ و دوور ونزیك ڕۆڵیان لە بەهێزی و لاوازی گیانی شەڕکردن بەرزونزم کردنەوەی

---

[٧٨١] محمد الاسعد بن بویکر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٤١.

[٧٨٢] جماعة من علماء الآثار السوفيت: العراق القديم، ص٤٧٥.

[٧٨٣] میدیا، ص٦٠٦.

[٧٨٤] موعتەسەم ساڵەیی: تێپەڕبوونی لەشکری ئەسکەندەری مەکدونی بە کوردستاندا، گۆڤاری کەرکوك ٣٠، ژمارە(١٢٩)، ل١١٠-١١١.

وره و خواستی شەڕکردنی جەنگاوەرانی هەردوو لاو یەکلاییکردنەوەی شەڕی گۆگامیلا بەو شێوەی کە هاتە پێش هەبووە، لە نێویاندا لە خۆبایی ئەخمینیەکان و بەکەمگرتنی ئەسکەندەر و سوپاکەی بێئاگایی لە توانای دوژمن و ڕاستەقینەی سەرکردایەتی کردن بوو، کە سەرکردایەتی کردنی ڕاستەقینە وەك یەك لە هۆیەکان خۆی لە بەئاگایی سەرکردە لە کاروباری جۆراوجۆری وەك بەکارهێنانی تاکتیکی سەربازی گونجاو لە گۆڕپانی شەڕ و ناسین و خوێندنەوەی دوژمن بە دروستی و بەکارهێنانی هێزەکان بە گوێرەی پێویست و هێشتنەوەی هەندێك لە حاڵەتی ئامادەیی و چالاکی خۆپارێزیدا و فەرامۆش نەکردنی هەوڵی ڕامالینی دوژمن لە هەموو حاڵەتێکدا بە شەڕی کتوپڕ(خاطفة) بۆ شێواندنی دوژمن و نەهێشتنەوەی بواری دژە چالاکی[٧٨٥]، کە پێچەوانەی هەموو ئەوانە لە مامەڵەکردنی دارا لەگەڵ سوپای ئەسکەندەر، هەر، لە سەرەتای لەشکرکێشیەکە تا شەڕی گۆگامیلا، ئامادەیی هەبوو و هەلی پێشڕەوی کردنی و سەرکەوتنی بۆ ئەسکەندەر زیاتر ڕەخساندووە و لە بەدوای یەکداهاتنی سەرکەوتنەکانیشدا کە ئەم هەلانە ڕۆڵیان تیایدا هەبوو، باوەڕی بە بەختی خۆی زیاتر دەبوو و بەردەوام دووبارەبوونەوەشیان مێژوونوسەکان سەرگەرم و حەیران کردووە[٧٨٦]. چونکە تا فیلیپ شای مەکدونیا بوو و دەیەویست سوپایەکی بەهێزی بۆ مەکدونیاو یۆنان هەبێت و وڵات لە دوژمنی کۆنینە ڕزگار بکات دارا سڵی دەکردەوە، بەڵام کە پاش ماوەیەکی کەم فلیپ کوژرا پێی وانەبوو ئەسکەندەر ئیرادەی بەزاندنی خاکی ئێرانی هەبێ، بۆیە لە ڕێکخستنی هێز و جەنگ ساردبۆوە[٧٨٧] و پێی وا نەبوو هیچ هێرشێك بکرێتە سەر وڵاتەکەی، لەبەر ئەوە بەهێزێکی لاواز و ژمارەیەك بەکرێگیرا و ڕووبەڕووی سوپای ئەسکەندەر بووەوە[٧٨٨]، لە کاتێکدا سوپای ئێران و هێزە دەریاییەکەی دەیتوانی پێشگیری پەڕینەوەیان بکەن کەچی نەیانکرد و لە کەناری ڕووباری کرانیگوس چاوەڕوانی هاتنیان بوون، بەمەش یەکەمین هەڵەی گەورەی خۆیان تۆمارکرد[٧٨٩]، بەتایبەتیش کە لەو کاتەدا کەشتیگەلی گەورەی ئەخمینی دەسەڵاتی باڵای بەسەر

---

[٧٨٥] أحمد زماني: بحوث حول النظام العسكري في الاسلام، (بيروت:١٩٩١)،ص١٩٠-١٩١.

[٧٨٦] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٦٧.

[٧٨٧] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص٢٤٨.

[٧٨٨] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٠.

[٧٨٩] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص٢٤٨.

ئاوەکانی دەریای ناوەڕاستدا هەبوو[٧٩٠]، لە ڕووی ژمارە و سەرکردایەتی کردنیشەوە ژمارەی کەشتیەکانی ئەسکەندەر لە (١٦٠) کەشتی تێنەدەپەڕی و بەدەست کەسانێکی یۆنانیشەوە بوون، کە گومان لەلایەنگرییان دەکراو کەچی کەشتیەکانی ئەخمینی چوارسەد کەشتی دەبوون و بەدەست فینیقی[٧٩١] و قوبرسیەکانیشەوە بوون کە بەرژەوەندیان لەوەدابوو لەگەڵ ئێران بمێننەوە بۆ بەربەرەکانی کردنی گریکەکان، چونکە لە ڕووی ئابوریەوە گریکەکان، ڕکەبەریان بوون[٧٩٢] و ئەگەر بەشێکی کەمی ئەو کەشتیگەلە گەروی دەردەنێلیان ببەستایە، پەڕینەوەی زۆر لێ ئەستەم دەبوو و زۆریش گران دەکەوتە سەرشانی لەشکرەکانی ئەسکەندەر[٧٩٣].

یەکێکیتر لە هەڵە گەورەکانی دارا ئەوەبوو کە بەهۆی بایەبوون بەدەسەلاتی بەهێزی خۆی ئەسکەندەری لاوی بەکلۆڵ و پەرێشان هەژمار دەکرد و بەهاو هێزی، بەکەم دەزانی[٧٩٤]، ئەم بەکەم زانینەش بەهۆی پێنەگەیشتنی هۆشی سەربازییەوە بوو، کە لەلای ئەخمینیەکان چوارچێوەیەکی گشتی وەرگرتبوو، واتا هیچ بیانویەك بۆ تەمبەڵیان لە بەرامبەر یەکخستنی پەڕینەوەی هێزەکانی ئەسکەندەر نیە بەتایبەت کە کەشتی گەلی ئەوان دوو چەندانەی کەشتیگەلی گریك دەبوو و بەدەست فینیقیەکانیشەوەبوو، کە بەزیرەکترین دەریاوانی سەردەمی کۆن دیەهاتنە هەژمار[٧٩٥]، بۆیە ئەگەرچی هاوکات لەگەڵ بەرە وپێشهاتنی سوپای ئەسکەندەر، هەندێك لە هێزەکانیان وەجوڵە خست و لەسەر ڕووباری گرانیکوس مۆڵیاندان، بەڵام گرنگیەکی ئەوتۆیان پێوە دیارنەبوو و تەنانەت دارا لەبەر بەکەمگرتن، بواری چوون و بەشداریکردنی بەخۆی نەداو وەك منداڵێك لە ئەسکەندەریان دەڕوانی[٧٩٦].

---

[٧٩٠] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٠٠.

[٧٩١] فینیقیەکان کۆمەڵێکن لە هۆزە سامیەکان وبە(کەنعانیەکان)ناسراون ولە ناوەڕاستی هەزارەی چوارەمی پێش زایین لە نیوەدورگەی عەرەبەوە بەرەو ڕوژئاوا کۆچیانکرد و لەناوچەیەکی کەناریی، کە لەباکورەوە لە(راس الشمرا) سەر لێواری سوریاوە تا چیای (کرمل) لە باشور درێژ دەبێتەوە، گیرسانەوە و لە ناوی ئەوانیشەوە ناوی کەنعان بەسەر ئەو ناوچەیە دابڕا،گریکەکان کومەڵێك لەوانیان بەفینیقی ناوبردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: لبيب عبد الساتر:الحظارات ، (بيروت:٢٠٠٣)، ص٧٣-١٢٧

[٧٩٢] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٧٣، هامش ٩.

[٧٩٣] جەلالی امین بەك: مێژووی کورد و هاوسێکانی، (ب ش:٢٠٠٣)، ل٢٢٦.

[٧٩٤] رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٢٦٦.

[٧٩٥] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٦٧.

[٧٩٦] چو جنتر : الاسكندر الاكبر، ص٦٢-٦٣.

ئەو لەبەر بێئاگایی لە توانای سەربازی ئەسکەندەر و بەلاوازتر زانینی هەنگاوەکانی لە هی فلیپی باوکی وسەرچاوەگرتنی پێشبینی و هەڵوێستەکانی لەسەر غرور، سەرکەوتنی خۆی بە مسۆگەر دانابوو فەرمانیشی دابوو کە ئەسکەندەر بە زیندوویی دەستگیر بکەن و بیبەنە شوش[٧٩٧]، بۆیەش گریکەکان سەرکەوتن، دەنا بڵندی وبەردەلانی وبەرزی وسەرەولێژی کەناری رۆژهەلاتی رووبارەکە کەئەوان دەسەلاتیان بەسەریدا هەبوو، دەبوو گریکەکان پێیدا رەتبن، تیژڕەوی رووبارەکە و بەردی زۆر و چاڵ و قووڵیەکانی ناوی، یارمەتی دەربوون بۆ رێگرتن لە پەڕینەوەیان[٧٩٨] بە تایبەتیش کەزانیمان ئەنجومەنی شەڕی پێکهێنراو لەلایەن ئەسکەندەر ، پێشنیار و خواستی خۆپاراستن لەو شەڕە و بەڵگەی گەلاڵە بوونی ئەو هەڵوێستەیانی خستبۆ بەردەستی ئەسکەندەر و تیایدا شەڕکردنی ئێوارە و لەومانگە[٧٩٩]ی تێیدا دەگوزەران وتیژڕەوی رووبارەکەیان بۆ ئاینده بەباش نەدەزانی کەچی ئەو هەر سوور بوو لەسەر پەڕینەوە و بەوەش توشبوونی سەربازەکان بە شەڕ شێوەیەك لە ناچاری وەرگرت[٨٠٠]

ئەم هەستی بەکەمزانینەی ئەسکەندەر لە زەینی دارای سێیەمدا دوای شەڕی (گرانیکۆس) هەر مابوو، بۆیە کەمێك پێش شەڕی ئیسۆسی( ٣٣٣پ.ز)کاتێك هەواڵی نەخۆشی ئەسکەندەری بیست زۆر بە پەلە سوپای خۆی گەیاندە فورات و سوور بوو لەسەر ئەوەی بەزووترین کات پێی بگات نەوەك رابکات و دەستی پێ نەگات، هەرچەندە سەرکردەیەکی مەکدۆنی بە ناوی (ئەمینتاس)، کە بەهۆی دوژمنایەتی لەگەڵ ئەسکەندەر هات بۆ لای دارا پێی گوت کە ئەسکەندەر لەو کەسانە نییە رابکات، کەچی بەوە دڵی دانەکەوت[٨٠١].

---

[٧٩٧] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغازتااسلام، ص٢٧٠؛ محمد .ا.داندامایف: تاریخ سیاسی هخامنشیان ، ص٣٦٠؛ مرتضی راوندي: تاریخ اجتماعي ایران، ص٥٧٨.

[٧٩٨] جەلالی ئەمین بەك: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ل٢٢٩.

[٧٩٩] مانگی یونیو لە نەریت و بیروباوەڕی مەکدونیەکاندا بۆ شەڕکردن شوم بووە و فلیب هەمیشە لەو مانگەدا خۆی لە شەڕ پاراستووە، ئەسکەندەر بۆ ڕازیکردنی یارانی و نەهێشتنی ترسی(تووش بوون بە نەهامەتی)، با رۆژمێرەکە بگێڕینەوە دواوە وای دابنێن ئێستاش هەر لە مانگی(مایو)داین، شایەنی باسە مانگەکان بەو ناوانە نەبوون لە رۆژمێری یۆنانی و مەکدونی ناوی تریان هەبوو، بەڵام(چون جنتر) بە بەراوردکردن لەگەڵ رۆژمێری نوێ ئەو ناوانەی بەکارهێناون. الاسکندر الاکبر، ص٦٣؛ مع هامش في نفس الصفحة.

[٨٠٠] نفس المرجع، ص٦٢-٦٣.

[٨٠١] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١١٦٨.

گومانیشی تێدانیە، کە بایی بوون و بە دروستی نەخوێندنەوەی بەرامبەر یان خۆبواردن لە لێوردبونەوەی هەڵسەنگاندن، مەزەندە تێکدەدات و ئاڕاستەی مامەڵەکردنیش دەگۆڕێ، هەر ئەو دروست نەخوێندنەوەیەش بوو، دارای سێیەمی تووشی شکستی کرد لە ئیسوس.

هەروەها ئەسکەندەر بۆ تێپەڕین لە ئاسیای بچوك بۆ سوریا دەبوو سێ تەنگەبەری سەخت لە کیلیکیە و سوریا ببڕێت، کە بواری تێپەڕینی چوارکەسیان بەیەکەوە نەدەداو بە هێزێکی کەم ماتڵ دەکران، یان زیانی زۆریان لێدەکەوت، کەچی ئەخمینیەکان سوودیان لێنەبینی، لە کاتی ڕێکردنیشیان لە فوراتەوە بۆ شوێنی شەڕەکە هەلی باشیان بۆ سوپای ئەخمینی ڕەخساند، چونکە دەشتی نێوان دیجلە و فورات بۆ کاری سەربازی وئەسپ سوارەکانی ئەخمینی گونجاو بوو بە خوڕی ئاوی دیجلەش بۆ پەڕینەوەی گریکەکان دژواربوو دەکرا بەهۆی تیر هاوێژی کارامە ڕێی هاتنە ئەمبەریان لێبگرن، کەچی دیسان سوودی نەبوو [٨٠٢] (هارڤی پورتەر) یش پێی وایە، ئەگەر داریوش ویستبای وتەنها پشتی بە سوپا زۆرەکەی نەبەستبا، کە سوودی پێنەگەیاند دەیتوانی بەریان پێبگرێت، بەلاّم نەیکرد [٨٠٣].

هەروەها دەشڵێن" ئەگەر (مازە=مازیوس) لەو هەلومەرجەدا بەو شێوەیەی لە ڤالانکسەکاندا ڕوویدەدا، هێرشی کردبایە سەریان بێگومان سەردەکەوت[٨٠٤]. نووسەرێکی تریش سود وەرنەگرتنی ئەخمینیەکان لە ڕووباری دیجلە وەك هەڵەکانی تر بۆ بەختی ئەسکەندەر دەگێڕێتەوە[٨٠٥].

یەکێکی تر لەو شتانەی وەك هۆیەك لە ژێرکەوتنەکانی دارا دا ڕۆڵی خۆی بینیوە، تاکڕەوی دارا و بەهەند نەگرتنی ڕاوێژی ڕاوێژکاران، بوو بە پێچەوانەی ئەسکەندەر کە ئەگەرچی پێشنیارەکەشی قبوڵ نەکردبا، تێبینییەکانی بەهەند وەردەگرت لە میانەی سەپاندنی ڕاکانی خۆیو جێبەجێ کردنیاندا، جێی بۆ دەکردنەوە. بۆ نموونە(مەمنن Memnon[٨٠٦])، کە

---

[٨٠٢] حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل از اسلام، ص١٢٠-١٢١.

[٨٠٣] موسوعة مختصر التاريخ القديم ، ص٢٩٤.

[٨٠٤] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢ ، ص١٣١-١٣٢.

[٨٠٥] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٦٩.

[٨٠٦] ممنن خەڵکی رودس بوو بەکرێ(وەك مرتزقە) لە سوپای ئەخمینیدا خزمەتی دەکرد، دارای سێیەم بۆ بەرگرتن لە ترسی هێرشی سوپای ئەسکەندەر لە پشت دەریاوە بۆسەرکردایەتی کردنی هێزی ژمارەیەك لە ولایەتەکانی ئاسیای بچوك،ڕایسپارد. بسام العسلي:الأسكندرالكبير المقدوني، ص٦١.

سەرکردەیەکی بەئەزموونی گریکی بووو لە سوپای ئەخمینیدا خزمەتی دەکرد ، لە جەنگی گرانیکۆس ئامۆژگاری سوپای کرد ، کە بە بەرگری کردن ڕازی بن و نەچنە پێشەوە کەچی ساترابەکان پەلاماردانیان بە باشتر دەزانی[٨٠٧]. لە کاتێکدا کە ئەو سەرکردەیەکی شیاو سیاسی و زیرەك بوو و بارودۆخەکانی ڕۆشن دەبینی و بابەتەکانی چاك هەڵدەسەنگاند[٨٠٨] و زیاتر لە شای ئەخمینی لە بەهای سەربازی مەکدونیەکان شارەزابوو، پێشنیاری کردبوو کە ئەسکەندەر و سوپاکەی بۆ ناو ئێران کێش بکەن و پێشی چۆڵ بکەن و بکێشنەوە دواوە و لە دوای خۆشیان جگە لە خاکی سووتاو چیتر جێ نەهێڵن، (واتە سیاسەتی سوتماك کردنی خاك پەیڕەوبکەن)، تاکو سوپای گریك برسی بێ، ئینجا لە دەریاوە پەلاماری مەکدونیا بدرێت و هانی یۆنانیەکانیش بدرێت بۆ لێهەڵگەڕانەوەی، بەڵام ئەخمینیەکان بەوە ڕازی نەبوون دواتر سوپاکەیان تێکشکا، (ممنن)یش سەرکردایەتی هێزی دەریایی دەکرد و لە وشکانی هیچی بۆ نەکرا، تا پێشڕەوی ئەسکەندەر بوەستێنێ[٨٠٩].

ڕەنگە پەسەندکرانی پێشنیاری سوتماك کردنی خاك لەو ساتە وەختەدا کۆسپی گەورەی بۆ سوپای ئەسکەندەر دروست کردبا، بەتایبەت، کە ئەسکەندەر کاتێك مەکدونیای جێهێشت تەنها بەشی مانگێك ئازوقە و کەلوپەلی پێبوو و بە هیوابوو کە بە داگیرکردنی خاکی دوژمن، پێداویستیەکانی دابین بکات، جگە لەوەش لە پێناو چاپوکتر بوونی سەربازەکان لە جموجۆڵدا تا توانیبووی باروبنەی کەمکردبوونەوە[٨١٠]. لەبەرئەوەش، کە وتراوە ئەگەر دارا لە سەرەتادا ئیدارەی شەڕی لە ئاسیای بچوکدا بایە دەست (ممنن)، نەیدەهێشت ئەسکەندەر پێشڕەوی بکات[٨١١]. کەچی ئەسکەندەر ڕاوێژی بەریارانی کرد، هەرچەندە سوور بوو لەسەر ڕای

---

[٨٠٧] البرمالة: تاريخ البرمالة،ج١، ص٣٠٢.

[٨٠٨] حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١١٤٠.

[٨٠٩] مرتضى راوندى: تاريخ اجتماعي ايران،ج١، ص٥٧٨؛ رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٢٧٠؛ هارڤى بوتر: موسوعة مختصر التاريخ القديم، ص٢٩٣.

[٨١٠] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٦٨؛ البرمالة: تاريخ البرمالة،ج١، ص٣٠١.

[٨١١] هارڤى بورتر: موسوعة مختصر تاريخ القديم، ص٢٩٣.

خـۆی، بەڵام شــەڕەکەی بەهەندگــرت و ســـوپاکەی ڕێکوپێـك دابەشکــرد و دەستـــی بـۆ تاکتیکـی گونجاوی وا برد، کە ســەرکەوتنـــی پێ بەدی بهێنـــێ‌و ســەرکەوتوش بوو[٨١٢].

لە پێش جەنگی (ئیسوس)یش سەرداری دنیادیدە و سیاسـەتمەداری ئەسینایی (خـاری دمـوس) کە باشتر لە هەرکەس دەیزانی خاڵی لاوازی سوپای گریکی لـە کوێدایـە و ڕایگەیانـد، کـە بـە ژمارەیەکی کەمتر، بەڵام بە کەسانی بە ئەزموونتر دەکرێ پێش بە ئەسکەندەر و سوپاکەی بگـرن و ڕەنگە زۆری و بۆری و جۆراوجۆری سوپا(لە ڕووی ڕەگەزەوە) لە جەنگ لەگەڵ سوپای ڕێکخراو و مەشق پێکراو و سنووردارردا، دەست و پێگیر بێت[٨١٣] و هۆشداریدا کـە مـادام دارا بـاری ئیدارەکردنی ئاسیای لە ئەستۆدایە ناشێ تـەواوی مـەمالیکـەکانی ئـێران بخاتـە مـەترسـیەوە، بەڵکـو چەند سەرکردەیەکی بە ئەزموون و سوپایەکی سەد هەزار کەســی مەشق پێکــراو، کـە چارەکێــکیان لە بەکرێگــیراوان( مرتزقــــە ) بـن، بەســە بـۆ ئـەو پرۆســەیە و ئامادەیــی خۆشــی بۆ سەرکردایەتـی کــردنی ئەو ســوپایە بە بەڵــێن، پێشـــاندا، کەچـی ئەخمینیــەکان قایل نەبوون و پێشنیارەکەشـی خــراپ بەســەردا شـکایەوە[٨١٤]و ئەنجامـــی شـــەڕەکەش بـە زیانـیان کۆتایـی هات، دارا بۆ ئەو جەنگە ســوپایەکـی زۆری کۆکـردەوە کە شـوێنەکە توانای لە خۆگرتنـــی بۆ شـەڕکردن نەبـوو، ئەمـەش وایکـــرد کـــە زۆر لـە ســەربازەکان ســوودیان لێنەبیــنرێ و بەشـــداری شـەڕ نەکــــەن، بـــواری هەڵــسوڕ و چالاکیــــش لەوانــیتــر بەرتەســك بکـــەنەوە لە ئەنجامیشـــدا، ژێرکەوتن[٨١٥].

ئەو لەبەر شانازی کردنی بە زۆری ژمارەی هێزەکەی و بڕوابوونی بەوەی، کە بـۆی دەبێتـە مـاکی سەرکەوتن ئەوەی فەرامۆش کردبوو، کە ئەو هەموو هێـزە پێویـستی بـە شـوێنێکی بـەرفراوان و پێدەشتێك هەیە کە بگونجێ لەگەڵ جموجۆڵی سەربازەکانی، بەتایبەت سوارەکان[٨١٦].

لە دوای شەڕی ئیسوس کاتێـك ئەسـکەندەر نامـەی داواکـاری پێکهـاتنی داریوشـی پێگەیـشت ڕاوێـژی بەســەرکردە و ڕاوێـژکارەکانی کـرد و (پـامنیون)، کـە لەنامـەکـەی ڕوانـی ئامۆژگـاری

---

[٨١٢] بڕوانە: جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ل٢٢٩-٢٣٠.

[٨١٣] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٢٠٦.

[٨١٤] حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١١٥٢-١١٥٣.

[٨١٥] حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل ازاسلام، ص١١٨ .

-[٨١٦] هارڤی بورتر: موسوعة مختصر التاريخ القديم، ص٢٩٢-٢٩٣.

پێشکەش کرد و بە دەست ئاماژەی بۆ دەریای ناوەڕاست کرد و پێی وت کە" پێویستە لەیادتبێ کەشتیگەلی ئەخمینی هەیە و دوورنیە خەڵکی یۆنانت لە دژ بورووژێنێ بۆ شۆڕش و داراش لەو دیو فوراتە و وڵاتەکەشی لەلای ئەورووپا و جیهانی گریك بەهۆی دووری لێیانەوە، بێخەمە و بەبیریشی هێنایەوە، کە باوکی لە نەخشەیدا نەبوو دوژمنکاری بکاتە سەر ئەو سنوورانەی کە ئەم شالاوەی پێگەیشتووە[817] .

ئەسکەندەر لەیەك لە هەوارەکانی تر و لە میانەی پشووی سوپاکەیدا، نامەیەکی دارای پێگەیشت کە تیایدا سەربازەکانی هاندا بوو، ئەسکەندەر بکوژن و ئەویش دەیویست ئەو نامەیە لە بەردەم سەربازەکانیدا بخوێنێتەوە، کەچی (پامنیون) ناهێڵی و بە شتێکی نادانایانەی دادەنێ، کە بەڵێنەکانی دارا بە گوێی سەربازەکان بگات، چونکە کەسی چاوچنۆك و هەلپەرستیان تێدایە، کە ڕەنگە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك، ئامادەبن[818]. ئەو بەرلێگرتنە و قبووڵکردنیشی لەلایەن ئەسکەندەرەوە نموونەیەکە لە بەهای گرنگیدان بە نهێنی سەربازی، کە بەپێی یەك لە لێکۆڵینەوە سەربازەکان، بە هۆیەکی گرنگی سەرکەوتن دادەنرێت لە یەکلایی کردنەوەی ڕووداوەکاندا[819] و خاسیەتێکیشە لە خاسیەتەکانی سەرکردەی باش[820] و لەگەڵ نموونەکانی پێشتریش بەڵگەن بۆ جیاوازی هەڵوێستی ئەسکەندەر لەگەڵ دارای سێیەم، لە هەمبەر بە هەندگرتنی ڕای کەسانی دەووبەر و شوێنی ئەو هەڵوێستەش لەسەر ئایندەی ڕووداو و شەڕەکان نیشاندەدات.

شەڕ و ڕووداوەکانیش هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی لەشکرکێشییەکەوە ڕۆڵی گرنگیان لە شەڕی گۆگامێلادا بینیوە، چونکە تێکڕایان لە بەرژەوەندی ئەسکەندەر کۆتاییانهاتووە و هەموو سەرکەوتنێکیش ئاواتێکی(طموح)کەی دەخستەسەر ئاواتەکانی تر[821]و دەشبووە بەهۆی بەرزبوونەوەی وورە و مەیلی پێشڕەوی کردنی زیاتری ئەفسەر و سەربازەکان.

---

[817] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٠١-٣٠٢.

[818] حسن پيرنيا: ايران باستان،ج٢، ص١٢٣٥.

[819] احمد زماني: بحوث حول النظام العسكري ، ص٩٧.

[820] نفس المرجع ، ص١٩٥.

[821] بڕوانە: الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٧٢، هامش(١).

ئەمەش بەهۆی دەستکەوتنی ماڵ و سامانی زیاتر لەگەڵ هەر سەرکەوتنێکداو بینینی دەست و مەقامی خۆیان لە ڕووبەڕووبونەوەی سوپای زۆری ئەخمینییداو لە لای ئەوانیش بێگومان پێچەوانە کەوتۆتەوە، تا دەشهات ئەسکەندەر زیاتر توانای خۆی بۆ دارا دەردەخست، گۆڕینی هەڵوێستی داراش لە بەرامبەر ئەسکەندەر لە وەك مندالّ سەیرکردن و ترس لە هەلاّتنی، بۆ پێشنیاری پێکهاتن و ئامادەیی بە فەرمی دەست بۆ لێهەڵگرتن لە نیوەی مەملەکەتەکەی و خستنە بەردەمی ئیمتیازاتی تر بەپێی نامەکانی نێوانیان کە پێشتر ئاماژەیان پێکرد، بەڵگەی سەلێنەری ئەو ڕاستیەن.

هەروەها لەناوچوونی ئەو هەموو ژمارە زۆرەی سەربازان[٨٢٢] و کوژرانی زۆر لە سەرکردە بەناوبانگەکانی دەوڵەتی ئەخمینی لە شەڕەکانی پێش شەڕی گۆگامێلا، بێگومان کاریگەری لەسەر سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە و بەهێزبوونی وورەی گریکەکان و کوشتنی گیانی بەربەرەکانی و بێ هیوایی ئەخمینییەکان هەبوو[٨٢٣] مردنی (ممنن)یش، کە بە بەهێزترینی ئەو سەرکردانە دانرا، کە بەربەرەکانی ئەسکەندەری مەکدونیان دەکرد، زیانێکی زۆری لە ئەخمینیەکاندا، کە پڕکردنەوەی ئاسان نەبوو و دڵی ئەسکەندەریشی بەهێزکرد، چونکە ئەو دوای شەڕی ئیسوس سەرگەرمی ئەوەبوو کە لەلای دەریاوە جەنگ لە ئاسیاوە بۆ ئەورووپا بگوازێتەوە و پێشکەوتنی بەرچاویشی بەدیهێنا، کە دەربارەی ئەخمینی هیوادار و هێزی ئەسکەندەریشی هەراسان کردبوو[٨٢٤].

یەکێکی تر لەو شتانەی ڕۆڵی هەبوو لەلاوازکردنی دەسەلاّتی ئەخمینی بەد گومانی پادشاکان لە کەسانی دەوروبەر هەڵوەستە و ڕاڤەی خراپی ڕاو پێشنیار و هەڵسوکەوتیان بەشێوەیەك، چاکەکانیشیان وەك خراپ لێکدەدرایەوە و زۆرجاریش ڕووبەڕووی کوشتن دەبوونەوە کە ڕێدەکەوت ئەو کەسە زۆر کارمە و بەسوود بووە، بە لەناوچوونی کەلێنی گەورەی بەجێ هێشتووە، ئەم حاڵەتی بێ متمانەیە لە سەردەمی زۆربەی پادشاکانی ئەخمینی ئامادەیی هەبووە، زۆر ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتیش بوونەتە قوربانی ئەو حاڵەتە و لە سەردەمی دارای سێیەمیش

---

[٨٢٢] بۆ نموونە بڕوانە: هارڤی بورتر: موسوعة مختصر التاريخ القديم، ص٢٩١-٢٩٣.

[٨٢٣] حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٢٢٨-١١٣٠.

[٨٢٤] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٦٨-٦٩؛ حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل از اسلام، ص١١٦-١١٧.

بەردەوامی هەبوو، لەوانە باگواس کە لەلایەن دارا کوژرا و هەیە بە کەسێکی ئیرادە بەهێزی دادەنێ و پێی وایە، ئەگەر نەکوژرابا ڕەنگە ئەسکەندەر بەو ئاسانیە نەیتوانیبا وڵات داگیربکات و دەوڵەتی ئەخمینیش لەبەریەك هەڵوەشێنێ[٨٢٥].

(خاری دمی ئەسینیش) کە لەبەر ڕەخنەگرتنی لە ئامادەسازی داریوش و پێشنیارکردنی ڕووبەڕووبوونەوە بە سوپایەکی کەمتری، مەشق پێکراو، بەوە تاوانبارکرا کە دەیەوێ هەموو وڵات ڕادەستی ئەسکەندەر بکات، ئەویش بە ترسنۆك وەسفی کردن بۆیە دارا کەمەری گرت و گرتنی کەمەری هەرکەسێکیش لەلایەن پادشاوە، بە قسەی مێژوونوسە یۆنانیەکان نیشانەی کوشتنی ئەو کەسە بوو[٨٢٦].(مەمنن)ی ڕۆدسیش لە گومانی خراپی خیانەتکردن بە دەوڵەتی ئەخمینی، بە دوورنەبوو هەر بۆیەش کاتێك هەستی کرد کە لێی بەگومانن، ژن و منداڵەکەی ناردە دەربار[٨٢٧] قبووڵنەکردنی پێشنیارەکانیشی ڕەنگە هەر لەو سۆنگەیەوە بووبێ.

داریوش(دارای سێیەم) لە(بسوس)یش دڵنیا نەبوو، چونکە هۆشداریان دابوویە، کە کەسێکی پایەخوازە و خەیاڵی سەڵتەنەتی لە سەردایە و گەیشتن بەوەش بێ خەیانەتکردن، تێبینی نەدەکرا، بۆیە بەردەوام گومانی لێدەکرد داراش بە دەستی ئەو کوژرا[٨٢٨].

---

(٨٢٥) حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل از اسلام، ص١١٤.

(٨٢٦) حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١١٥٢-١١٥٣.

(٨٢٧) همان مأخذ،ج٢، ص١١٤٠.

(٨٢٨) حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢ ، ص١١٢٤.

## تــەوەرەی دووەم:

## هۆکارە ڕاستەوخۆکانی یەکلایی بوونەوەی شەڕەکە

لە ڕاستیدا سـەرەڕای ئـەو هـەموو هۆکارانـەی لـە تـەوەرەکانی پێشووتردا لێـی دوایـن و ڕۆڵـی تەواویان لە ڕەخساندنی هەلومەرجێك کە لە نیشاندانیدا، بەهێزی گریکـەکان بـە سـەرکردایەتی ئەسـکەندەر و لاوازی ئەخمینیـەکان بـە سـەرکردایەتی دارای سـێیەم، بەرچـاو دەکـەوێ، ئەگـەری سەرکەوتنی بەرەی یەکـەم و ژێرکـەوتن و هەرەسـهێنانی دەوڵـەتی بـەرەی دووەمـی لـە شـەڕێکی یەکلاکەرەوەدا لێدەخوێنرێتەوە، تەواوی ڕاسـتەقینەی نـەپێکاوە، چـونکە بـەدیهاتنی ئـەو لەسـەر هەڵگێرسان و برانەوەی دواشەڕ وەستابوو و خۆبواردن یان فەرامۆش کردنی هـەموویان بەشـێکی ئەوەی پێویست بـوو، بـۆ بردنـەوەی لـەلای بـەرەی یەکـەم ڕێکـەوتێك یـان ئەنجامـدانی کـارێکی چـارەنووس سـاز لەلایـەن بـەرەی دووەم، کـە جێـی چـاوەڕوانی نـەبێ، لەوانـەبوو هاوکێـشەکەی هەڵگێڕابایەوە، یان لانی کەم بەو ئامانجەی نەگەیاندبا، کە پێی گەیشت. خـۆ ئەگـەر ڕەوشـەکەش ئەو ئاراستە پێچەوانەیەی وەرگرتبا، بێگومـان هـەموو ئەوانـە کـە باسـکران ڕەنگـە هـەر ناویـان نەهاتبا، یانیش وەك هـۆی کاریگـەر ناوزەنـد نـەدەکران و دەچـوونە نـاو چوارچێوەی تـری ڕاڤـە بۆکردنەوە، بۆیە ئەو هۆکارانەی باسکران ناتوانن ببنە کاراکتەری بێ چەند وچوونی خولقانـدنی ئـەو ئاکامـەی لێـی چـاوەڕوان دەکـرێ و تـەنها نەخشی یارمەتیـدەریان بینیـوە و ئـەنجامگیری ڕەوشـەکەش لـە زەینـدا لـە چوارچێوەی پێشبینی، تێناپـەڕێ و بـەڵکو ئـەوەی ڕاسـتەقینەیی ئاکامەکەی بەرهـەمهێناوە، جـۆری مامەڵـەکردن بـووە لەگـەڵ ئـەو پێـشهاتانەی کـە لەمیانـەی شەڕەکەدا هاتونەتە ئاراوە، ڕەخسانی ئەو زەمینەیەش بە(بوون و نەبوون و بە لە ئاستی پێویستدا بـوونی ئـەو شـتانە) پەیوەنـدی هەیـە، کـە سروشـتی مامەڵەکردنەکـە دەخـولقێنن و ئەگـەری سەرکەوتن و ژێرکەوتنی لایەنەکانی شەڕ بەدیاردەخـەن، دیـاریکردنی ئـەو پایانـەش بـە گـوێرەی ئاسـتی تێگەیـشتن لـە جـەنگ و باکگراونـدی ڕۆشـنبیری و چـونیەتی تێفکـرین لـە سروشـتی شەڕەکان، دەشێ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازبێ.

بوونی ڕابەرێکی بە تواناو بیروباوەڕێکی پتەو، بەرنامەی ئامادە و ستراتیژی دیاریکراو، گیانی سەربازی جێگیر و بەهێزی مرۆیی پێویست و کەلوپەل وتفاقی جەنگی لەومەرجانەن کە یەك لە شارەزایانی بواری جەنگ، لە بوونیاندا، مسۆگەری سەرکەوتن، دەبینێت[٨٢٩]، لەبەرئەوەش کە ڕۆڵی هەریەکەیان لە شەڕێکەوە بۆ شەڕێکی تر جیاوازە و مەرج نیە لە هەموویاندا هەرهەمان ڕۆڵ یاری بکەن، بۆیە لە یەکلابوونەوەی شەڕی گۆگامێلاشدا، هەریەکە بەقەد خۆی شوێن پەنجەی دیارە، کە لەمیانەی ئەو باسە و بە گوێرەی پلانی لێکۆڵینەوە، کە لە ژێر ناونیشانی (هۆکارە ڕاستەوخۆکانی یەکلایی کردنەوەی شەڕی گۆگامێلا)دا لەگەڵ هۆکارەکانی تردا بەمشێوەی خوارەوە لەسەری دەڕۆین:

١- **ڕۆڵی سەرکردە**:کاتێك جەنگ هەموو گۆڕەپانەکانی چالاکی ئادەمیزاد دادەگرێ و پەنادەبردرێتە بەر بەکارهێنانی ئامرازی جۆراوجۆر بۆ گەیشتن بە مەبەستەکان، پیشەی شەڕکردن دەبێتە گرانترین و شەکەتەکارترین، پیشە و سەرکردەی سەربازیش ناچار بەرووبەڕووبوونەوەی گۆڕانی بارودۆخ دەبێتەوە و پێویست دەبێ لەسەری، بە پشتبەستن لەوەی هەیەتی لە زانیاری و توانا لەگەڵ پێشبینیکردنی بۆنیەت و پلانی دوژمن، خێرا لێپێچینەوەی ئەقڵانی ئەنجامبدات[٨٣٠]. ئەمە بەنسبەت سەرکردەی هەردوو بەرەی شەڕی گۆگامێلا زۆر دژوارتر بوو، چونکە لە هەمانکاتدا پادشای وڵاتەکانیشیان بوون و ئاراستەی شەڕکردن بەر لە هەرشت لە خواستی ئەوانەوە سەرچاوەی گرتبوو و لە پشتی بڕانەوەشیدا خولیا و ئاواتەکانی ئەوان هەبوون، هەرچەندە دەشێ کەم و زۆر تیایدا ویستی شوێنکەوتووەکانیشیان ڕەنگیدابێتەوە، بەڵام خۆیان ئاڕاستەکار و خۆشیان شانبەشانی جەنگاوەران لە ئەنجامدانیدا، بەشدار بوون و سەرپەرشتیان دەکردن.

لەبەرئەوەش، کە گەرەنتی بۆ مسۆگەری سەرکەوتن نیە، هەمیشە لە پێشبینی کۆتایی هاتنی شەڕدا ئەگەری زیاتر لە حاڵەتێك، کە زادەی زەمینە و هەلومەرجی تایبەت بە خۆیانن، بەدی دەکرێ[٨٣١]، چونکە هەرگیز ناشێ دوژمن لە هەموو بوارەکاندا وەکو خۆی، کە هەیە بناسرێت،

---

[٨٢٩] مهدی ادیبی سده: جامعه شناسی چنگ و نیروهای نظامي، (تهران: ١٣٨٥)، ص٢٧-٢٨.

[٨٣٠] اکرم دیری: آراء في الحرب الاستراتیجیة وطریقة القیادة، (بیروت: د.ت)، ص٥-٦.

[٨٣١] بڕوانە: مهدی ادیبی سده: جامعه شناسی چنگ ونیروهای نظامي، ص٢٧؛ غلام رضا علي بابایي: فرهنگ سیاسی ارش، (تهران: ١٣٨٤)، ص٢٢٣.

چەندیش کار لەو بوارەدا بکرێت هێشتا هەندێك شت بە نادیاری دەمێنێتەوە، لەبەرئەوە سەرکردە ناچارە بیری بەرستێك گریمانەدا ڕەت بکات، بڕیارەکانیشی لەسەر بنەمای ئەوان دابڕێژێت، کە پراکتیزەکردنیان خواست و پلان و هەنگاو و ئامراز و زەمینەسازی جۆراوجۆری گەرەکە[832]، بۆیە ئاگادارانی سەردەمی نوێی بواری سەربازی بە سەرنجدان لە یەکلایی بوونەوەی شەڕە دیارەکانی مێژوودا، مسۆگەرترکردنی هەڵی سەرکەوتنی سەرکردەیان، لە بوون و ئامادەیی مەرجی جۆراوجۆردا دەبینیەوە، کە دەتوانین بە گوێرەی ئاستی ڕەنگدانەوەیان لە بیر و کرداری سەرکردە و جەنگاوەرانی هەردوو بەرەی شەڕی گۆگامێلادا، بەشێکی نهێنی واکەوتنەوەی ئاکامەکەی -سەرکەوتنی ئەسکەندەر و ژێرکەوتنی دارا- بدۆزینەوە.

لەبەرئەوەش کە سەرکردە لوتکەی هەستیاری و گرنگترین کۆڵەکەی شەڕە، بۆیە پێویستە بەر لە هەر شت توانای بڕیاردانی ڕاست و(صائبە)ی هەبێ و لە جێبەجێ کردنیشیاندا بە ورە و ئازا بێت و دەبێ بزانێت چی دەوێت و بەر لە بینینی ئامانجەکەی بە ڕوونی، هەوڵی بەدیهێنانی نەدات و دەبێ لەوەی دەیەوێ بەدیبهێنێ و بنەمای سەرەکی ئەو سیاسەتەش، کە لە ئایندەدا پیادەی دەکات، دار ودەستەکەی لێ ئاگادار بکات، پێویستە بە ئیرادەوە سەرکردایەتی بکات و ڕێنوێنی و ئاراستەکانی ڕوون بن و کەشێکی وا دروستبکات کە، هەریەك لە یاریدەدەر و سەرکردەکانی تریش، والێبکات، کە بتوانن جڵەوی سەرکردایەتی و ئاراستەکردن بگرنەدەست و کەسایەتی و توانایان هەبێ لە بڵاوکردنەوەی متمانە لە نێوان ئەوانەی لەژێر دەستیاندان، هەروەها دەبێ سەرکردە نەبەردبێ و بەهرەمەندبێ لە ئازایەتی و خۆڕاگری و هێزی ئیرادە کە بەهۆیانەوە دەتوانی ڕووبەڕووی هەر پێشهاتێك ببێتەوە کە هاوتایی و بڕیاردانی خێرای گەرەك بێ[833]. لێکۆڵەرەوەیەکی تریش لە پاڵ چەند خاسیەتێك کە بۆ سەرکردە بە پێویستیان دەزانێ، لە نێو ئەو خاڵانەی سەرەوەشدا جەخت لەسەر پێویستی دەرککردنی بارودۆخ (استیعاب الامور) و ئازایەتی و لێهاتوویی دەکاتەوە[834] و دەکرێ لە بڕیاردانی ئەسکەندەر لەسەر شەڕێکی یەکلایی کەرەوە دوای سەرکەوتن لە ئیسوسی(333پ.ز)و قبوولکردنی خواستی پێکهاتن ویستانەی ئەنجومەنی شەڕ، بەتایبەت پارمنیون لە کاتێکدا هێشتا ناوچەکانی باشور لە سوریا

---

[832] بڕوانە: اكرم ديري: أراء في الحرب، ص183-204.

[833] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص17-18.

[834] احمد زماني: بحوث حول نظام العسكري، ص90-92.

و فلسطين و فينقيــه و ميــسر، ژێردەســت نــەکرابوون و هێــزی دەریــایی ئــەخمینیش لــە دەریــای ناوەڕاستدا، پڕ مەترسی بوو، هەروەها لە سووربوون لەسـەر بڕیارەکـەی و دوای کۆتـایی هێنــان بـەو مەترسـیانە و کەوتنـەوەی شـەڕەکەش بـە قازانجیـان و لەگـەڵ تـەو شـتانەش — لـە میانـەی تەوەرەکانی تردا دێبینەسەری- و گۆڕانی هەڵوێستی دارا، دوای هەڵاتنی لە ئیسوس لە بەرامبـەر ئەسکەندەر، لە وەك منداڵ سەیرکردن بۆ ڕازی بوون بـە هاوبەشـکردنی لـە دەسـەڵاتدا —کـە لـە باسەکانی پێشوتر لێیان دواین- و ئەوەش کە لە وەڵامـی پێشنیاری دارا دا نووسـراوە[٨٣٥] وەك نموونە لەو پێشهات و بڕیار و هەڵوێستانەی لە ماوەی لەشکرکێشیەکەدا هاتوونەتـە ئـارا، پـەی بەبوون و نەبوونی ئەو خاسیەتانە ببەین. کە ڕەنگدانەوەی زۆریان لـە کەسـایەتی و هەڵسوکەوتی ئەسکەندەر و ئەو ئەنجامانەی کە بە درێژایی پرۆسەکە پێیان گەیشت و کـەم بەرچـاوکەوتنیان لـە کەسـایەتی دارای سـێیەمدا، یەکـەمیان بـە سـەرکردەیەکی بـەهێز و لێهـاتوو و دووەمـیش وەك کەسێکی بێتوانا، پێدەناسێنێ، هەر ئەوەش بۆ خـۆی جۆرێـك خوێندنـەوەی ئایندەی بـۆ شـەڕی گۆگامێلا لێ بەدیدەکرێ، دووبارەبوونەوەشیان لە میانەی شەڕەکە پێناسـەکان دروسـتتر دەخاتـە بەرچاو، زۆرترینی مێژوونوسانیش جەختی لێدەکەنەوە و بەگرنگترین یان هەنـدێك جـار بـە تاکـە هۆکاری سەرکەوتنی گریك و ژێرکەوتنی ئەخمینیەکانی دەزانن. ئـەوەتا یـەك لـە مێژوونوسـەکان سیفاتە کەسیەکان و تواناو پەروەردەی تایبـەتی ئەسـکەندەر بـە لـە پێـشترین هـۆی سـەرکەوتنی سوپاکەی دادەنێ[٨٣٦].

سەرچاوەیەکی تریش لە باسی دوو سەرکردەی شەڕی گۆگامیلادا ئەسکەندەر بە کەسێکی نوقمی غرور (بایی بوون)و سەوداسەری گرتنی جیهان بە سەرکردایەتی پیاوانی بـە ئـەزموون و پێـداگر لەسەر پێشڕەوی کردن و داگیرکردنی دنیایەك کە نایناسن، بەیەك لە کەسە شەڕ پیشە بەختەوەرە گەورەکانی مێژووی جیهانی دادەنێ، کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دەستی لە هیچ نەپاراسـتووە و لە بەرامبەریشدا داراش وەك کەسێکی ترسنۆك و بودەڵـە و کـەمتر لـە ئەسـکەندەر شـەڕانی و نازپـەروەر و گـەرمی و سـاردی ڕۆژگـار نەچەشـتوو و بێئـاگـا، تەنانـەت لـە سەرچـاوەی لـە بـن نـــەهاتووی مرۆیـــی و جوگرافیـــای بـــەرفراوانی قەڵەمڕەوەکـــەی، دەناســێنێ و دروســـتکردنی

---

[٨٣٥] H.D. Amos and A.G.P.Lang: These were the Greeks, p.١٠٩.

[٨٣٦] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨٨.

پیاوێکیش لێی کە توانای شەڕکردن و لەشکرکێشی و دوژمن پەرتکردنی هەبێ، لەلایەن هەندێك کەسەوە، بەشێکی ناڕاست(ناواقعی) دەزانێ[٨٣٧].

هەروەها ئەسکەندەر وەك سەرکردەیەکی بلیمەت و لێهاتوو لە سەرکردایەتیکردنی پیاوان و وەك جەنگاوەرێکی ئازا و هەندێك جار هەڵەشەش، وەسفکراوە[٨٣٨].لە سەرچاوەیەکدا هاتووە کە سوپای ئەسکەندەر بەهۆی زۆری ژمارەی سەربازانی ئەخمینیو زیرەکی سوارەکانیان بارگرانی زۆری تووش دەهات، بەڵام کە نەترسیو ئازاییو سووربوونیان لە سەرکردەکەیان بەدیدەکرد، سەرلەنوێ گەرموگوڕ دەبوونەوە[٨٣٩]. ئەو تا ئاستێك لەتەیارکردن و بگیری (تعبئە) و نەخشەکێشاندا بلیمەت بووە کە بووەتە جێی سەرسامی هەندێك سەرکردەی نادار و گەورەی جیهانی دوای خۆی، کە پەند و ئەزموونیان لێوەرگرتووە و تەمەنای گەیشتن بە پایەی ئەویان کردووە[٨٤٠]، دارای سێیەمیش وەك پادشایەکی لاواز و ڕاڕا و وەك دەرد و مۆتەکەیەك بۆ ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی ئاماژەی پێکراوە[٨٤١].

---

[٨٣٧] رضا شعباني: مرور كوناه بر تاريخ ايران، ص٨٠.

[٨٣٨] ج. م. روبرتس: موجز تاريخ العالم، ترجمة فارس قطان، ج١، ص٢٥٣.

[٨٣٩] محمود فهمي: تاريخ اليونان، ص١٦٠.

[٨٤٠] وتراوە کە هانیباڵ(١٨٣پ.ز) لە شاری ئەفسس بە دوژمنە ڕۆمانیەکەی کیبون (ناسراو بە کیبونی ئەفریقی دەگات و لە میانەی قسەکردن لە بارەی سروشتی شەڕ و سەرکردەکان کیبۆن لێی دەپرسی کێ گەورەترین سەرکردەی مێژووە؟ بە خێرایی وەڵامی دەداتەوە دەڵێ یەکەم ئەسکەندەر و دووەمیش بیروسی پادشای ئیبیر خۆشی لە پلەی سێیەم دادەنێ، پاشان لێی دەپرسێ ئەی ئەگەر لە شەڕی زامای(٢٠٢پ.ز)بەسەر مندا سەرکەوتبای؟ وتویەتی من پلەی یەکەمم وەردەگرت. بلوتارك السير ج٢، ص٧٧١ . ناپلیۆنیش ئامۆژگاری سەرکردەکانی دەکرد، کەدیراسەی شەڕەکانی ئەسکەندەر بکەن و سەرنج بدەنە شێوازی ئامادەکردنی(تعبئە)سوپا و پلانی شەڕەکانی، قسەیەکی بەناوبانگیشی هەیە کە لە کاتی تاج لەسەرنانی بەدیکریسی وتوە، دەڵێن کاتێك ئەو پیرۆزبایی لێدەکات وپێی هەڵدەڵێ و بە ئەسکەندەری دەچوێنێ، ناپالیۆن وتویەتی: لە تەواوی ژیانمدا هیوام خواستوە ببمە ئەسکەندەر، پاشان تۆزێك دەوەستێ و ئینجا دەڵێ: دەبێ چ ئیشێکی هێندە گەورە هەبێ، کە مرۆڤ بیەوێ دوای ئەسکەندەر ئەنجامی بدات ؟. الادب میتودیوس زهیراتي: الاسكندر الكبير، ص٥٩-٦٠.

[٨٤١] مصطفى العبادي: العصر الهلينستي(مصر)، (بيروت: ١٩٨١)، ص١٨.

بەو پێیە و بە گەڕانەوەشمان بۆ باسەکانی پێشوو دەکرێ لە هۆکاری هەڵکەوتوویی ئەسکەندەر و پاشڤەچوونی دارا تێبگەین.

ئەو سەرکردە گەورانە، هونەرەکەشیان کاریگەری زۆری زانستی هاوچەرخەکانیان و ڕێگای بیرکردنەوەشیانی لەسەرە و هەر بەتەنهاش سوود لە داهێنانەکانی سەردەمیان وەرناگرن، بەڵکو لەسەر بیری باوی سەرۆکەکان لە زەمانی خۆیاندا، پێدەگەن و ئەسکەندەریش وەك هەموو ئەمانە تاکتیکی خۆی لە بیری گریکی وەرگرتووە[842]. ئەمەش مانای وایە کە ڕۆڵی سەرکردە گەورەکان لە ڕەوتی مێژوودا (حرکە التاریخ) دا زۆر گرنگ و ڕوونە، بەڵام دواجار پەیوەستە بە هەلومەرجی بابەتی، کە دەرفەت دەداتە ئەو(گەورانە)، بۆ یاریکردنی ڕۆڵیان، تا ئەو هەلومەرجەش بەردەوام بێت چالاك و کاریگەر دەمێنێتەوە[843].

## ٢- سوپا:

سوپاش وەك کەلوپەل و ئامراز و سوتەمەنی شەڕ و پایەی سەرەکی ڕووداو و بڕانەوەی[844]، یەکێکی تر بوو لە هۆکارە سەرەکیەکانی یەکلابوونەوەی شەڕی گۆگامێلا -سەرنەکەوتنی گریگ و ژێرکەوتنی ئەخمینیەکان- لە یەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە ئەگەر سوپا بە مرۆڤ بچوێنێ ئەوە چەکدارە سوکەکان لە جێی دەستن و سوارەش لە جێی پێیەکان، ڕیزی تەیارکراویش بە چەکی قورس (پیادەی قورس) سنگەکە قەڵغانی خۆپاراستنی بەسەرەوەیە و سەرکردەش وەك سەروایە[845]، گرفتیش لەهەر یەکێك لە ماندا بەهۆی مەشق یان خراپی

---

[842] فرنان شنيدر: تاريخ الفنون العسكرية، الطبعة الاولى، ترجمة: فريد انطونيوس، (بيروت: ١٩٧٠)، ص٥-٦.

[843] محمد بيومي مهران: تاريخ التأريخ، ص٣٧.

[844] عبدالله محمود حسين: دراسات في تاريخ العسكري، ص٢٣.

[845] الفيلد مارشال فيكونت مونتجيمري: الحرب عبر التاريخ، ص٩٣.

چەك یان هەست نەكـردن بە ئەركـــی ســەرشان یـان فـەرامۆش كـــردنی... هتـد ڕەنگـــە لـە ڕووبەڕووبوونەوەدا، ئاراستەی ڕووداوەكە بە دژی خۆی و بەرژەوەندی ئەوی دی، بكـــەوێنێتەوە.

ئامادەسازییەكانی ئەسكەندەر لە ڕووی چەندی و چۆنی سـوپاو ئـەو پیاوانـەی دەكـرا لـە بـواری بەڕێوەبردن و زانستیدا، پشتیان پێ ببەستێ، زۆر گەورەبوون (ضـخم جـداً)[٨٤٦]، لـە(فیلیپـی) باوكیەوە سوپایەكی ئامادەی ناسراو بەفالانكسی بۆ بەجێما، كە بە یەكەمین پێـڕۆی ڕێكخـراوی سەردەمی خۆی دەژمێردرێت، سەربازەكانیش بەیەك ئـیرادە دەجـەنگان سیـستەمی سـوارەكە بـۆ یەكـەمین جـار بـە ڕێنمـایی سـەخت پـەروەردە دەكـران، لـە ئاسـتی جێبـەجێكردنی هـەر بەرپرسیاریەتیەكدا بوون، كە پێیان بسپێردرێت[٨٤٧].

بناغەی ڕەسـەنی ئـەو سـوپایە لـە پیـادەی قـورس(فالانـژ = فـالانكس)ی مـەكـدونی و سـەربازە سـوارەكانیش، كـە ئەندامـەكانی وابەسـتەی خانـەدانانی مـەكـدونی بـوون، پێكـدەهات، سـوپای مەكدونی لە نێو لە شكركێشی بـێ شـومـاردا، جموجـۆڵ و چـالاكی و ئـەزموونی بەرچـاوی بـۆ شەڕكردن بەدەستهێنابوو، بالاتری ئـەو سـوپایە لـە چـاو سـوپای گریكـی (پـێش ئەسـكەندەر)و ئێرانیش ئەوەبوو كە ئەو سوپایە سەرەڕای بەشە جۆراوجۆرەكانی (سەربازی پیادەی سوك و قورس و سـوارەی سـوك و قـورس)، هـەموویان یەكـەی یەكپارچـەییان پێكـدەهێناو لـە ڕیـزی بـەدوای یەكداهاتووی چووە پاڵیەك (فشردە = پەستێوراو)ی سەربازی پیـادەی تـەیار بـەنێزەی درێـژ كـە قـولای هـەر ریزێـك (١٦) شـەڕكەر بـوو، ڕێكخرابـوو، ئەسـكەندەر پـشت ئەسـتور بـوو بـەو فالانكسالانە، كە بە قەلای جولاو دەژمێردران، دەیتوانی هێزەكانیتر كە توانای مانۆڕیان هەیـە، بە خێرایی بەرەو خاڵی لاوازی دوژمـن ڕەوانـە بكـات و بـە لێـدانی گـورزێكی گورچكبڕ ئەوانـە لەناوبەرێت، لەو بوارەشدا بەتایبەت سوارە قورسـەكان نەخـشی سـەرەكیان هـەبوو[٨٤٨]. ئـەو بـۆ شەڕی گۆگامیلا فالانكسی بۆ هەشت بـەش لـەجیاتی چـواربەش دابەشـكردبوو، بەمـەش سـوك جولانەوەی هێزەكانی زیاتركرد و توانیشی سـەركەوتوانە ڕۆیـشتنی بەرەبـەرەیی بـۆ هێرشـكردنە

---

[٨٤٦] نیقولا زیادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام ، مجلة الفكر العربي، العدد (٢٢)، السنة الثالثة، ١٩٨١، ص١٨٢.

[٨٤٧] هیراند پاسدر ماجیان: تاریخ ارمنستان، ترجمة محمد قاضي، (تهران: ١٣٧٧)، ص٣٠.

[٨٤٨] ادوین اردویچ گرانتوسكی و دیگران: تاریخ ایران، ص١١٢.

سەر لای چەپ جێبەجێ بکات، ئەم سەرکەوتنەش بوو بەهۆی بەدیهێنانی یەکەمین بنەما لە بنەماکانی هەڵمەت کە بریتی بوو" لە گەڕان بەدوای تەنیشتی هێزی دوژمن و پەلاماردانی[849]، فراوانی و تەختی زەویەکەش کاری بەکارهێنانی ئەم فالانکسانەی ئاسانکرد[850].

سوپای ئەسکەندەر لەڕووی ژمارەوە کەمتر بوو، بەڵام سەرکردایەتیەکەی باش و جێگرەکانی لێهاتوو بوون[851].

لەبەرئەوەش کە کارایی سەرکردە و فەرماندەی تەکتیکی لە ئیدارەکردنی شەڕدا، بەهۆی کارلێکردن و چوونە ناو یەکتری کۆی (دابەشکردن ودابەشنەکردنی سوپا بۆ یەکەکان و بوونی ڕیزبەندی ڕاست لە نێوان سەکردە و فەرماندە و ئەوانەی سەرکردایەتیان دەکەن)، دابینکراوە، سروشتی تەکنولوجیای پەیوەندیکردنیش، کە لەبەردەستدایە لەگەڵ ئەو کۆت و بەندانەی دەیسەپێنێ و سروشتی چەکی زاڵی بەکارهێنان و ئاکاری سەردەم (اخلاق العصر) ەکە و ڕوانینی بۆ ئەرکی سەرکردەی(ڕاست)، دیاریدەکرێ[852]. لە نێو سوپای گریك و لە میانەی شەڕی گۆگامیلادا هێندە بەهەند وەرگیراوە و وردەکاری بۆ کراوە، کە چالاکی ئەسکەندەری وەك سەرکردەیەکی تەکتیکی زۆر بردە سەرێ.

لە بەرامبەریشدا سوپای ئەخمینی کە هێزێکی گەورە بوو، پێکهاتبوو لە جەنگاوەرە گریکە بەکرێ گیراوەکان و سوپاو خێڵی نەتەوەکانی ناو ئیمپراتۆریەت بەتایبەت بەشی ڕۆژهەلات[853].

بە واتایەکیتر دارا چەندی توانی لە میللەتان، سوپای کۆکردەوە[854] و هەریەکەشیان لە تیپێکدا

---

[849] محمد عبدالفتاح ابراهيم: الحرب بين الماضي والحاضر، ص١٢٣؛ اريك موزير: مدخل إلى التاريخ العسكري، (بيروت: ١٩٧٩)، ص٢٩٧.

[850] اريك موزير: مدخل إلى التاريخ العسكري، ص٢٩٧.

[851] فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارته، ص٢٢٠.

[852] مارتن ڤان كريڤلد: القيادة في الحرب، الطبعة الاولى، ترجمة يزيد صائغ، (بيروت: ١٩٨٩)، ص٤٨.

[853] SARAH B. POMEROY and others: Ancient Greece, APolitical Social and Cultural, p.٤١٢.

[854] تقي الدين احمد بن علي المقريزي: الخطط المقريزية، الطبعة الاولى، تحقيق محمد زينهم ومديحه الشرقاوي، (القاهرة: ١٩٩٨)، ج١، ص٢٤٥.

ڕێکخرابـوون، کـه بـه زمـانی خۆیـان دەدوان و بـه چـەکی خۆیـان و شـێوازی تایبـەتی خۆیـان دەجەنگان، لەبەرئەوە چەکەکانیش لە تیپێکەوە بۆ یەکیتر جیاواز بـوون و وێـڕای زۆری ژمارەیـان - بەپێچەوانەی گریکەکانیش کە بەیەك زمان دەدوان- ، هەرگیز یەکێتییـەکی هاوچەشـنیان لـێ پێکنەدەهات، ئەمـەش خـاڵێکی لاواز بـوو بەنـسبەت ئـەو سـوپایە، کـە لێـی چـاوەڕوان دەکـرا دەستپێکردنی لاوازی لە ماوەی شەڕدا، لەلایەن تاڕاوەچیانەوە(الغوغائیة) کە جگە لە دەسەڵات هیچیتر کۆی نەدەکردنەوە بگۆڕێ بۆ تێکشکان[855]. واتـە زۆری ژمـارە و ڕەگـەزی جۆراوجـۆر و بەشداریکردنی خەڵکی ئەو هەموو هەرێمانە لە سوپای ئێرانـدا، پێکهاتەیـەکی ناهەمـاهـەنگی لە تیرە و نەتـەوەو دابونـەریتی جۆراوجـۆر دروسـتکرد بـوو، کـە زیـاتر لـە نـەبوونی تۆکمـەیی و ڕێکخستن و بێ ئەزموونی، سوپای ئەخمینی لاواز دەکرد[856].

ئەو کەرتۆڵکانەی (قطعات) - ئـەو یەکـە سـەربازییە خێڵەکیانـەی میللەتـە جۆراوجۆرەکـان کـە سوپایان لێ پێکدەهات- لە نێو سوپای ئەخمینیدا بوون، جگە لە کۆت و زنجیری بەندایەتی هیچ پەیوەندییەك، پێکەوەی گرێ نەدابوون، لەبەرئەوەش بوو، کە وەك سوپای یۆنانی لـە ڕێکخـستن و مەشقکردن و چەکداریدا، کارامە نەبوون[857].

هەرچەندە لە نێو سەردارانی دارادا کەسانی خانـەدان هـەبوون کـە لـە نێـو بنەمـاڵـەکانی کـۆنی ئێراندا بەناوبانگ بوون و لە جـەنگی گۆگامێلاشـدا وەك پێـشنیان (باوباپیرانیـان) دەجـەنگان، بەڵام چونکە دارای سێیەم سەرکردەیەکی شیاو نەبوو و سوپا گەورەکەی خۆی باش ڕێکنەخست و ڕێی هەڵاتنی گرتەبەر، نەیانتوانی سەرکەوتووبن[858].

واتە زۆربەی ساترابەکان ناوبانگی گەورە سەنگینیـان هەبوو و سەر بەخانەوادەی ناوداریش بوون و هیچ بەڵگەیەکیش نیە کە بیسەلێنێ ئەوان لە باوانیان کەمتر دلاوەر بوون، بەڵام ئەوانە هـیچ لـە هونەری جەنگ کردنی ئەو زەمانە فێر نەبووبوون، هەرچەندە دەتوانین هەندێك نیشانە بدۆزینـەوە کە دەریدەخات لە نێـو ئەخمینیـەکانـدا کۆششکراوە بـۆ بـەر کـەنارکردنی شـێوازی کـۆن، بـەڵام

---

[855] ویل دیورانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٤١٧؛ سامي ريحانا: شعوب الشرق الادنى القديم، ص١٦٤-١٦٥.

[856] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مروم ايران، ج١، ص٢٠٣.

[857] محمد نجم الدين نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٦٠.

[858] بانومري بويس: تاريخ كيش زرتشت امخانشيان، چاپ اول، ترجمة همايون صنعتي زاده، (تهران: ١٣٧٥)، ج٢، ص٤١٦.

ئەوەندە بۆ بردنەوەی سەرکەوتن بەس نەبوو[٨٥٩] و ئەوان هیچیان لە بارەی ئەو پێشکەوتنەش نەدەزانی، کە گریکەکان لە هونەری شەڕکردن پێی گەیشتبوون و لەوبارە و لە چاو نەوەی سەردەمی خۆیان دواکەوتوو بوون[٨٦٠] و داراش بەجێی نەزانینی هونەری شەڕکردن چاوەڕوان بوو، بەهۆی ژمارەی زۆری سەربازەکانیەوە، بەسەر سوپای ئەسکەندەردا زاڵ بێت[٨٦١]، بۆیەش ئەو سوپا زۆرەی کۆکردبۆوە کە سوپای ئەسکەندەر لە بەرامبەریدا زۆر کەم دەهاتە بەرچاو، بەڵام بەهۆی نەبوونی یەکانگیری و وێڕای ئاژەوە و ترسنۆکی خۆشی، کە لە لوتکەی شەڕەکاندا گۆڕەپانی شەڕی جێدەهێشت، ئەسکەندەری لە سەرکەوتن دڵنیاکردبوو[٨٦٢].

جگە لەمانە لە ئوردوی ئێراندا هێزی ڕەسەنی ئەخمینی کەمبوو و سەربازە بەکرێگیراوە گریکەکانیش شێلگیری و خرۆشیان لەنەبەردا نیشان نەدەدا، جەنگاوەرانی میللەتانی تری سەر بە دەوڵەتیش، چاوەڕوانی فیداکاریان لێنەدەکرا، لە کۆتایشدا سوپا کەوتە ناکامیەوە[٨٦٣].

بەتایبەتیش کە لەو سوپایەدا هێزی گریکە بەکرێگیراوەکان(المرتزقە) —کە نەدەکرا بەتەواوی لە شەڕ لەگەڵ هاونیشتمانانیاندا پشتیان پێ ببەسترێت- هێزی چالاکی سەرەکی(فعلی)بوون و خەڵکی میللەتەکانی تریش لە بنەڕەتدا خواستیان لەو شەڕەدا نەبوو و لەلایەن سەرداری ناوچەکانەوە بەتۆبزی هێنرابوون بۆ شەڕ، بنەماڵەی پادشایەتیش بۆ خۆیان دەستەوستان ببوون و پەکیان کەوتبوو، وای کردبوو کە سوپا ئەگەر زەبروەشێن و بەتواناش بایە، گیانی شەڕکردنی تێدا لاوازبووبێ[٨٦٤]

لەبەرئەوەش کە سەرکردایەتی سوپای ئەخمینی بۆ دروستکردنی سوپایەکی ڕێکخراو لەو سەربازانە و فێرکردنی هونەری جەنگی نوێ، هیچ هەنگاویان نەنا، ئەو هێزانە بە ئاسانی ڕادەستی لەشکری گریك —سوپای ئەسکەندەر- دەبوون کە بەنوێترین چەك تەیار بوون و فەرماندەی بە ئەزموونشیان هەبوون، سەرکردەکانی ئەخمینیش کە لە پاشکەوتوویی سوپاکەیان

---

[٨٥٩] رمان گریشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص ٢٧٤؛ البرت تن ایك اومستد: تاریخ شاهنشاهي هخافشي، ص٧١٥.

[٨٦٠] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٠٢.

[٨٦١] البرت تن ایك اومستد: تاریخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٧١٣.

[٨٦٢] ف. دیاکوف و س.کۆفالیف الحضارات القدیمة، ج٢، ص٣٩٥.

[٨٦٣] نینافیکتوروڤنا پیگولوسکایا: تاریخ ایران باستان، ص٨٤.

[٨٦٤] ف. دیاکۆف و س.کوفالیف: الحضارات القدیمة، ج٢، ص٣٩٤.

بەرامبەر سوپای گریك ئاگاداربوون، بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەمایەسیە کەوتنە بەکرێ گرتنی سەربازی گریك و وەك چالاکترین سەربازەکانی ئەو سوپایە شوێنیان گرت، کەچی وەك پێویست نەبوون، سەربازە پیادەکانیش کە لە نێو خەڵکی ئازادی ئەخمینی(پارس)و (ماد ) هەڵدەبژێردران گرنگی چلۆنایەتی خۆیان لەدەستدابوو، چونکە بارودۆخی کۆمەڵایەتی چینەکانی خەڵك کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە تێکچوو بوو و تووشی پاشاگەردانی ببوون، ئەوانیشی گرتبۆوە[٨٦٥] و بەمشێوەیە دەبینین سەرەڕایی نەبوونی یەکپارچەیی لە سوپای ئەخمینیداو نارێکخراوەیی و لەدەستچوونی بەشێکی زۆری هێز، ئیتر توانا نەماو و دەرفەت کەوتە دەست ئەسکەندەر، کە لەو نەبەردەشدا سەرکەوتوبێت[٨٦٦] و سوپاش وەك هۆیەکی کاریگەر بۆ یەکلاکردنەوەی شەڕی گۆگامێلا و بۆ بەرژەوەندی گریکەکان -مقدونیەکان- ، ڕۆڵی خۆی ببینێ.

## ٣- چـەك و کەلوپەلـی جەنگـی:

مادام شەڕ بریتی بێت لە ململانێی چەکدارانە، لە نێوان دەوڵەتاندا بە ئامانجی سەپاندنی ئیرادەی هەندێك بەسەر هەندێکی تردا[٨٦٧] و چەکیش وەك ئامراز(اداه)ی هەڵگیرساندن و هۆ(واسگە)ی شەڕ و یەك لەبنچینە گرنگەکان، بوون و بەردەوامبوونی ئەوی پێوە بەندبێ[٨٦٨]، ئەوە هەمیشە ڕێژەی بەهرەمەندبوون لێی و ڕادەی چلۆنی و کارایی و پێشکەوتوویی و ئاستی شارەزایی بەکارهێنان و سود لێ بینینی و ڕەچاوکردن و بیرکردنەوە لەتاکتیکی گونجاو، کاریگەری زۆر گەورەی لەسەر ئاراستەی ئایندەی شەڕ دەبێ، ڕەنگە هەڵسوکەوت لەگەڵ کردن یان ڕێوشوێن دانەنان بۆ ئەگەری بەربەست دروستکردن لەلایەن دوژمنەوە لە بەرامبەر بەکارهێنانیدا، ئاسەواری خراپی لێبکەوێتەوە و بە قازانجی بەرەکەیتر بشکێتەوە. ئەم ڕەگەزە سەرەکی و گرنگە لە شەڕی گۆگامێلاشدا ڕۆڵی زۆر گەورەی یاریکرد و کاراکتەرێکی گەلێك بەرچابوو لە یەکلاییکردنەوەیدا.

---

[٨٦٥] ادوین اردویج گرانتوسکی ودیگران: تاريخ ايران، ص١٠٦.

[٨٦٦] آ.برگر ودیگران: جهان باستان، ج٢، ص٢٥٠-٢٥١.

[٨٦٧] عبدالله محمود حسين: دراسات في التاريخ العسكري، ص٧٠

[٨٦٨] نفس المرجع، ص٣٢.

دارای سێیەم پادشای ئەخمینی هەندێك چاکسازی چەك و چۆڵی لە سوپادا کرد و لە نێویدا درێژکردنی شمشێر و نێزەی سەربازان بوون، چونکە وای دەزانی کە سەرکەوتنەکانی مەکدونی بە چەکی وا ئەنجامدراوە و بە مەبەستی ترس خستنە ناو دوژمنیشەوە فرمانیدا بە دروستکردنی دوو سەد گالیسکەی داسدار واتە دروستکردنی گالیسکەی پێچکەدار کە لە دەوروبەریدا داسی تیژ چەسپ کرابوو[٨٦٩]، ئەو گالیسکانە خاڵی بە هێزی سوپای ئەخمینی بوون، بەڵام دروست بەکارنەهێنانی وایکرد ببێتە مایەی خراپ شکانەوە بەسەر خۆیاندا[٨٧٠]، لە سەرێکی تریشەوە ئەو گالیسکانەی کە دارا هێنانیەوە گۆڕێ، لە مێژ بوو بەکارنەدەهاتن و گالیسکە لێخوڕەکانیش مەشقی پێویستیان پێنەکرا[٨٧١]. کە لەباش بەکار نەهێنانیدا ڕۆڵی هەبوو.

دارا کە وەك ئەزموون وەرگرتن لە شەڕی ئیسوسی ساڵی (٣٣٣پ.ز) بەوریاییەوە شوێنی شەڕی دیاریکرد و هیوادار بوو کە زۆری سوپاکەی و دەشتی بەرینی گۆگامیلا، سوودی پێ بگەیەنن و یارمەتیدەری بن لە ئەنجامدانی چالاکی سوارەکانی و زاڵبوون بەسەر سوپای ئەسکەندەر و بشبێتە مایەی داپۆشینی لاوازی هێزە پیادەکەی، ئەو پشتی بەهێرشی لەناکاو و ئەو گالیسکانە و بەکارهێنانی فیل دەبەست،[٨٧٢] کە چەکی ترسناك بوون و بەنسبەت یۆنانیەکانیش نوێ بوون، بەڵام ئەو ئومێدەی چاوەڕوانیدەکرد، بەدی نەهات، چونکە ئەسکەندەر چاکسازی گۆڕانی لە تاکتیکەکانیدا دەکرد، هێزە سەرەکیەکانی پیادەی لە ژێر سەرکردایەتی پارمنیون لە باڵی چەپدا ڕێکخستبوو و خۆشی سەرکردایەتی باڵی ڕاستی دەکرد کە هێزێکی یەدەگی پیادەشی لە پشتەوە بۆ بەرگری لە هەوڵی گەمارۆدانی سوارەکانی ئەخمینی دامەزراندبوو[٨٧٣]. ئەمە جگە لەوەی کە هێڵی جەنگی بە شێوەی مانگ (هلال = کەوان) ڕێکخستبوو تا بە ئاسانی گەمارۆ نەدرێن، بۆ ئەوەش کە سەربازان لە پەلاماری گالیسکە داسدارەکان بپارێزێ فرمانیدا سەربازەکان دەمی قەڵغانەکانیان بە یەکتر بگەیەنن و لە کاتی پەلاماری گالیسکەکاندا بە نێزە

---

[٨٦٩] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٢٨.

[٨٧٠] عبدالحسین زرین کوب: تاریخ مردم ایران، ج١، ص٢٠٤.

[٨٧١] الفیلد مارشال فیکونت مونتجمیري: الحرب عبر التاریخ، ص١٠٥.

[٨٧٢] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١٠)فیل وجۆرەکانی گالیسکەی ئەخمینی تێدا نیشاندراوە.

[٨٧٣] SARAH B. POMEROY and others: Ancient Greece, p.٤١٢.

له قه‌ڵغانه‌كان بده‌ن تا ئه‌سپه‌كان به‌ره‌و سوپای خۆیان بگه‌ڕێنه‌وه‌[874]. ئه‌مه‌ش مانای وایه‌ به‌ پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی چاوه‌ڕوانیان لێده‌كرا كه‌ دوژمن بخاته‌ ترس و هه‌راسانیه‌وه‌ وا ده‌رنه‌چووه‌،[875] نه‌شزانرا چۆن فیله‌كان به‌كاربهێنن، ئه‌گینا كاریگه‌ری زۆریان ده‌بوو له‌سه‌ر سواره‌كانی ئه‌سكه‌نده‌ر[876]. له‌و باره‌وه‌ مێژوونوس گیرشمن پێی وایه‌ هه‌ندێك جار ڕێده‌كه‌وت كه‌ پادشا توانادار بوو، به‌ڵام نه‌یده‌زانی سوود له‌ سه‌ربازه‌كانی ببینێ دوا بڕیاره‌كانی هێواش بوون و له‌ جێبه‌جێكردنی فرمانه‌كانیشیدا، ڕووبه‌ڕووی به‌ربه‌ست ده‌بۆوه‌[877]

سه‌ربازه‌ تیرهاوێژه‌كانی[878] ئه‌خمینیش زرنگ بوون به‌ تایبه‌ت كه‌ له‌ دووره‌وه‌ شه‌ڕیان كردبا ده‌یانتوانی لێزانی خۆیان نیشانبده‌ن، به‌ڵام له‌ جه‌نگی ده‌سته‌ویه‌خه‌ (یه‌ك به‌ یه‌ك=تن به‌ تن) به‌هۆی له‌ ده‌ستدانی چه‌كی به‌رگری له‌ پێكران، ڕزگار نه‌ده‌بوون و چه‌كی پارێزگاریش كه‌ هه‌م كه‌م بوو هه‌میش بریتی بوو له‌ قه‌ڵغانی له‌ (شو = لكی ناسكی دار) دروستكرا، له‌گه‌ڵ نێزه‌ی كورت[879]، ئه‌و نامه‌حكه‌میه‌ش له‌ چه‌كی به‌رگری سه‌ربازان له‌ جه‌نگه‌كاندا لایه‌نێكی تری نیگه‌تیفی سوپای ئه‌خمینی بوو هه‌رچه‌نده‌ چه‌كی سه‌ربازانی نه‌مر(جاویدان = خالدین) باش بوو، به‌ڵام چونكه‌ هه‌میشه‌ له‌ ناوچه‌ی (دڵ) قه‌راری ده‌گرت و له‌ كاتی په‌لاماردا ده‌چووه‌ ناو ڕیزه‌كانی دوژمن هێزی لاباڵه‌كانیشی له‌به‌ر چه‌كی خراپ نه‌یانده‌توانی به‌ ئه‌ندازه‌ی ئه‌وان پێشڕه‌وی بكه‌ن، بۆیه‌ ده‌بوو ئه‌وانیش پاشه‌كشه‌ بكه‌ن[880]، و نه‌یانده‌توانی پێشكه‌وتنی زۆر به‌ده‌ی بهێنن له‌ ترسی ئه‌وه‌ش كه‌ دووچاری گه‌مارۆدان نه‌بن ناچاربوون كه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌و هێزانه‌دا، هه‌مئاهه‌نگی بكه‌ن[881].

به‌ڵام چونكه‌ له‌ باری و چاكی كه‌لوپه‌ل و ئامرازی شه‌ڕكردن یه‌ك له‌ تاكتیكه‌كانی سه‌ركه‌وتنه‌ و له‌هه‌ر حاڵێكدا بێهێزی مرۆیی به‌ سه‌رباز گیراو به‌ بوونی ئیمكانیاتی جه‌نگی گونجاو، به‌

---

[874] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٤٤.

[875] البرت تن ایك اومستد: تاریخ شاهنشاهي هخامنشي، ص٧١٥.

[876] الفیلد مارشال فیكونت مونتجمیري: الحرب عبر التاریخ، ص١٠٥.

[877] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام ، ص٢٦٦.

[878] بڕوانه‌ پاشكۆی ژماره‌(٩و١٠).

[879] عبدالحسین زرین كوب: تاریخ مردم ایران، ج١، ص٢٠٤.

[880] حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل از اسلام، ص١٢٠-١٢١.

[881] عبدالحسین زرین كوب: تاریخ مردم ایران، ج١، ص٢٠٤.

خێرایی دەتوانی دوژمن بیبەزێنی[٨٨٢]، هەیە تەیارکردنی سوپا بە چەکی نوێ دوای بەرزی وورە، بە سەروترین هۆی سەرکەوتن، دادەنێن[٨٨٣]، بۆیە خۆڕاگری و سوارچاکی و کەتیبەکانی گریك و ڕێکخراوەیی و ئیلتیزامیان بە سەرکردایەتیکردنی سەرکردە داناکەیان[٨٨٤]، دوای خۆشکردنی ڕێگای سەرکەوتنی ئەسکەندەریش بەو نوێ بوونەوە و چاکسازیان، کە فلیپی باوکی ئەنجامیدا، لە سیستەمی سوپاو شێوازی شەڕکردن و ڕاهێنان و چاککردنی شێوەی سیستەمی ڕیزبستن(نطاق الصف) فالانکسی کۆن و ڕێکخستنی تیپی سوارە بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە و وەستایانە کە لە جەنگی هەولێردا بە باشی دەرکەوتن[٨٨٥]، لەگەڵ پێشکەوتویی تری چەك و باشی سەرکردایەتی کردن و ئازایەتی خۆی، لە ماوەیەکی کەمدا شەڕەکەی بردەوە[٨٨٦].

ئەسکەندەر بەوەی وەك یەکەم سەرکردە هەڵسا بە تێکەڵکردنی هێزی سوك جوڵە بەچەکدارانی تر و، وەك یەکەم سەرکردەش کە تۆپی گۆڕەپانی(مدفعیە المیدان) لە هەموو هێرشەکاندا بەکارهێناو بە بەدیهێنانی چەکی گەمارۆدانی جۆراوجۆر و ئەو ڕێگایەی بۆ فریاکەوتن گرتبویە بەر، بەپێکهێنانی دەستەی ئەرکان کە لە شانزدە ئەفسەری پایە بەرز، پێکهاتبوو و دروستکردنی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری پێکهاتوو لە هەشت ئەفسەر، بەو گروپەش کە لە لەشکرکێشیەکەیدا هاوڕێ بوون و پێکهاتبوو لە ئەندازیار و زاناو شارەزا لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا، ئامادەکاریەکی گەورەی ئەنجامدا، کە وایکرد سوپاکەی وەك بەهێزترین و بە تواناترین سوپاکانی سەردەم دەربکەوێت و ئامادەی شەڕکردن بێت لە هەر ناوچەیەك و لەگەڵ هەر چەشنە سوپایەکدا[٨٨٧] و لەگەڵیشیاندا هێنانەدی هاوکاری نێوان چەکی جۆراجۆر و

---

[٨٨٢] مهدی ادیبی سده: جامعه شناسی جنگ ونیروهای نظامي، ص٢٨.

[٨٨٣] احمد زماني: بحوث حول نظام العسكري، ص١٥٥.

[٨٨٤] ويل ديورانت: ابطال من التاريخ، ترجمة سامي الكعكي وسميركرم، مراجعة عمر الايوبي، دار الكتاب العربي، (بيروت: ٢٠٠١)، ص١٣١.

[٨٨٥] طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٥٨٨.

[٨٨٦] لويس ويگران بل تاد:تاريخ تمدن وزندكي مردم جهان،ص١١٦؛ويل ديورانت:قصة الحضارة،مج١، ج١، ص٤٦٠.

[٨٨٧] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص٩٧-٩٨.

سەرکردەکان و هێزە سەربازیە هەمەچەشنەکان[888] و یەکخستنی یەکەکان[889] و ڕاوێژکردن کە ئەرکی سەرکردایەتی بوو پێی هەڵسێ لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی سەرکەوتن دەژمێردرێن[890].

هەیە جەخت لەسەر فالانکس و ئەو ڕمە درێژە[891] کە سەربازەکان هەڵیان دەگرت لەگەڵ ئامێرەکانیتری شەڕکردن[892] لە نێویاندا مەنجەنیق، دەکاتەوە کە بەهۆیەوە ئەسکەندەر لە هەموو جەنگەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە[893]. هەیە ئەو ڕمە درێژەی لەو شەڕەدا هێندە بە کاریگەر زانیوەو کە پێی وایە، جگە لە ئاسمان هەر ئەوە بڕیار لە دوا ئەنجامی جەنگ دەدات و وتراوە کە شفرەکەی لە باشترین جۆری ئاسن دروستکراوە و زۆر پتە و قایم بوو، نەهێنیشی لەدەسکە درێژە حەوت مەتریەکەیدایە و ئەسکەندەر بە باشی سەربازەکانی لەسەر ڕادەهێنا و ئەوەی ویستبای لەگەڵ ئەو هێزەدا بجەنگێ، پێویست بوو پێش هەموو شت بە دارستانێك لە شفرەدا بڕوات، ئینجا لوتی دەتەقی بە یەکەم سەربازی ئەو هێزە[894]، هەیشە کە تیبەی مەکدونی بە دەرکەوتنی ئەو هەموو نوکە تیژانە بە(ژوشك) دەچوێنێ کە وەك یەك تۆپەڵە(کتلە)ی تەواو بەیەکەوە نووسا و دەردەکەوێ هەموو ئەوانە دەشکێنێ کە دێتە بەردەمی و ڕێی پێدەگرن، ئەمەش ئاستێکی هێندە پێشکەوتووە کە کەرتە ڕیز ڕیزکراوەکانی سەربازی هیچ سوپایەکی چاخی کۆن پێی نەگەیشتبوو[895].

## ٤- ورەو گیانـــی شەڕکردن:

ورەی بەرز(گیانی معنوی) مەرجی سەرەکییە بۆ ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی تا ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات کە بۆی دامەزراوە، واتە ورەی بەرز لە هەر کۆمەڵێکدا وادەکات تاکەکانیشی

---

[888] نفس المرجع، ص٢٩.

[889] احمد زماني: بحوث حول نظام العسكري، ص٩٩.

[890] نفس المرجع، ص١٠٤.

[891] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٨).

[892] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١١).

[893] محمود شيث خطاب: جيش الروم ايام الفتح الاسلامي،مجلة المجمع العلمي العراقي، مج٢١، ص١٣٤.

[894] کەناڵی ئاسمانی کوردسات: بەرنامەی ڕوخانی ئیمپراتۆریەتەکان بەشی دووەم: بە نووسراو.

[895] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٦١، حاشية رقم(١٤).

ئەرکەکانیان هەریەکە لەوەی پەیوەندی پێیەوە هەیە، بە دروستی ڕاپی بکات و لە نێو خۆشیاندا هاوکاری توند بکەن[٨٩٦] و گرنگترین هۆکارێکیشە کە پلەی تێکۆشانی بەرزدەکاتەوە و لەو بارەشەوە بۆ نموونە وتراوە کە ((شاری شورە بەرز و پرچەك و بەهرەمەند لە باشترین ڕەگەزی ئەسپ و بەهێزترین گالیسکەی شەڕ و فیل... هەموو ئەوانە جگە لە(مەڕ کە کەوڵی شێریان لەبەرکردووە) هیچی تر نین، ئەگەر بۆ گشت، پیاوانێك نەبن کە ورە و ئامادەیی شەڕیان تێدابێ...))[٨٩٧] هەیە ورەی بەرزی سەربازان و گرنگی پێدانی بەیەك لە ئەرکە سەرەکیەکانی سەرکردە[٨٩٨] و بە یەکەمین هۆکاری سەرکەوتن دادەنێ لە هەموو شەڕێکدا[٨٩٩].

هێزە سەرەکیەکانی ورەش بریتین: لە بەهرەی شەڕکردنی سەرکردە و برشت و ئازایەتی(فضائل) شەڕکردنی سوپا و هەستی نیشتمانی[٩٠٠] و هەرچی نیشانە سەرەکیەکانی ورەی بەرزیشن کە بریتین لە:

أ- بوونی مەیلی یەکگرتن لەلای گشت تاکەکانی ئەو کۆمەڵە(سوپایە) کە لە دەروونەوە هەڵقوڵابێ، نەك ملکەچی دەسەڵات بن لەبەرئەوەی هەژموونی هەیە بە سەریانەوە.

ب- خواستی کۆمەڵە(سوپا) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بارودۆخ و هەڵوێستی جۆراوجۆری ناوخۆ، کە ڕەنگە لە چوارچێوەی کۆمەڵەکەدا پێك بێت و ململانێی لێبکەوێتەوە و بە گێڕانەوەی یەکگرتن کۆتایی دێت.

ج- بوونی ئارەزوویەکی دەروونی لای هەموو تاکەکان بۆ کاری بە کۆمەڵ و کەمی خواستی دوورکەوتنەوە و تەنیایی لەکارکردن.

د- تێگەیشتنی تاکەکان لە ئامانج و ئەرکەکانی کۆمەڵەکە وەك یەکەیەك کە لە پێناوی بەدیهاتووە و بوونی بیروبۆچوونی پۆزەتیف، لە بەرامبەر ئامانج و ئەرکەکان و سەرکردایەتیکردن.

---

[٨٩٦] محمد عاطف السعيد:فصول في علم النفس العسكري،الطبعة الاولى، تقديم مصطفى زيور، (د.م: ١٩٥٩)، ص٨٩.

[٨٩٧] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص٣٧-٣٨.

[٨٩٨] احمد زماني: بحوث حول نظام العسكري ، ص١٠٢.

[٨٩٩] نفس المرجع، ص١٥٥.

[٩٠٠] كارل فون كلاوزفيتز: الوجيز في الحرب، ترجمة اكرم ديري والهيثم الايوبي، (بيروت: ١٩٧٤)، ص١٨٠.

هـ- شانازی تاکەکان بە کۆمەڵەکەیان و ئەو کارەی لە پێناویدا ئەنجامی دەدەن[٩٠١].

بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەو هەلومەرجەی کە لە نێو هەردوو بەرەی شەڕەکەدا گوزەراوە کە لە میانەی باسەکانی پێشوودا هەستی پێدەکرێ، دەردەکەوێت کە گریکەکان -هەندێك حاڵەتی لێدەربکەی کە لە نێو لێکۆڵینەوەکەدا بەدەردەکەون و چارەسەریان بۆ کردووە- بە گشتی گریکەکان خاوەنی ورەیەکی بەرزبوون ئەخمینییەکان بێ ورە، لەبەرئەوەی هەموو تێکهەڵچوونێك (اشتباك) پێشبڕکێی بەردەوامی تێکشکاندنی هێزی (مادی و معنوی)یە و سەرکەوتوش ئەوەیە، کە لە کۆتاییدا، دەبێتە خاوەنی کۆمەڵێکی زۆتری ئەو هێزانە، زیانی لە دەستدانی ورەش لە شەڕدا دەبێتە هۆکاری سەرەکی لە گەیشتن بە ئەنجامێکی یەکلاییکەرەوە، هەر زیاتریش دەبێت تا دەگاتە دواخاڵی کۆتایی پرۆسەکە.

سەرکەوتنی سوپایەکی بچوکیش بەسەر سوپایەکی لە خۆی گەورەتردا، قازانجەکەی دوو چەندانە دەبێت و دەبێتە بەڵگەی گشت سەرکەوتن واشی لێدێت، کە سوپای تێکشکاو دوای ئەوە، بەردەوام لێی بترسێت، هەرچەندە لە کاتی ڕووداوەکە تێبینی کاریگەریەکەی ناکرێ، لەبەرئەوە مرۆڤ لە میانەی پرۆسەکەدا بیرێکی ناڕۆشنی لە هەمبەر هێزی ڕاستەقینەی دوژمن هەیە و تەنانەت لە بابەت مەزەندەکردنی هێزی خۆشی لەهەڵەدایە[٩٠٢].

بۆیە یەکلایی بوونەوەی هەموو پێکدادانەکانی پێش شەڕی گۆگامێلاش لە بەرژەوەندی گریکەکاندا، سەرەڕای زۆرتری ژمارەی سەربازانی ئەخمینی[٩٠٣] و پێشبینی نەکردنی ئەم دۆخەش لەلایەن دارای سێیەمەوە، لەوحاڵەتە بەدەرنیە . لەو بارەشەوە وتراوە، کە سوپای ئەسکەندەر بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە پێشڕەویان کردووە و بە ئارەزوو بوون، کە بەیەکجاری کۆتایی بە ئەخمینیەکان بهێنن[٩٠٤].

بێگومان حاڵەتی ورەبەرزیش بۆ سەرکردەیەکی وەك ئەسکەندەر، کە گشت پێشهات و ڕووداوەکانی ماوەی لەشکرکێشیەکە، بە گوێرەی بەرژەوەندیەکانی بەلادا دەکەوتن گرنگ بوو، تادەهات زیاتریش زەمینەی وەڕاستی گەڕانی ئەوئایندەیەی لەسەر پێشبینی فاڵ و خولیای

---

[٩٠١] محمد عاطف السعيد: فصول في علم النفس العسكري، ص٩٠-٩١.

[٩٠٢] كارل فون كلاوزفيتز: الوجيز في الحرب، ص٢٣٦-٢٣٨.

[٩٠٣] نينا ويكتورونا بيگولوسيكايا: تاريخ ايران باستان، ص٨٤.

[٩٠٤] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص٨٤-٨٥.

تایبەتی و ئەو پشتیوانیە بابەتیەی لێی بەهرەمەند، ببوو و ئەوەش، کە لە خەیاڵیدا بۆ خۆی قەراری دابوو، دەرەخساندو سوپاکەشی لە میانەیدا تامی ئەو سامانەیان چەشت و بە بەشێك لەوئامانجانەیان گەیشتن، کە ئومێدی چوونە ڕۆژهەڵاتیان لەسەر هەڵچنیبی بوو و ترسی ڕووبەڕووبوونەوەشیان لە سوپای ئەخمینی شکابوو، لەو زەویانەشدا کە ژێردەستیان کردن، دەیانتوانی تێبگەن، کە خەڵکی بەتایبەت توێژی گشتی بەهۆی ئەو ئەرکانەی بەسەریاندا سەپێنرابوو و هەموویانی هەژار و کەساس کردبوو، زۆری لە دەسەڵاتی ئەخمینی ناڕازی و بێزار کردبوون[905]، ئەمەش دەریدەخات کە نەك هەر سوپا بەڵکو لە قەڵەمڕەوی ئەخمینیشدا خەڵك، بە گشتی ورەیان ڕووخابوو لە دۆخێکی نالەباردابوون.

لە یەکگرتنەوەی بەرژەوەندی ئەسکەندەر و سوپاکەی لە لەشکرکێشیەکەدا بە ئەندازەی قایلکردنی سەربازەکان بۆ فیداکاری و خۆڕاگری، تا ڕادەیەك ئامانجی شەڕەکە لای ئەوان ڕوون کرابۆوە.ڕوونکردنەوەی ئامانجیش لە شەڕدا یەك لەو شتانەیە، کە پێویستە لەسەر سەرکردە بەهەندی بگرێت..[906].

ئەنجامدانی کۆبوونەوەی پێش شەڕ و بەوردی دابەشکردنی هێزەکان‌ودانانی هێزی یەدەگ بۆ بەرگرتن لە ئەگەری هەوڵی دەورەدان و ئاسوودە کردنی هێزەکانی پێشەوە لە مەترسی شاڵاوی دوژمن لە پشتەوەڕا. لەو هەموو نەخشە جۆراوجۆرانەی ئەسکەندەر لە خەیاڵی خۆیدا بۆ لێدانی دوژمن دەیکێشا، لە جێبەجێ کردنی مەراسیمی قوربانیدان و وەڵامی ئەسکەندەریش لە بەرامبەر پرسیاری پارمنیون، دەربارەی هۆی گۆڕانی کاتی لە خەوهەڵسانی لە بەرەبەیانی ڕۆژی شەڕدا، کە ڕایگەیاندبوو ((تا ترسم لە خۆم دوورخستەوە نەخەوتم، کە دەمبینی دارا خانوو و ئازوقەی دەسووتاند و لە ناوی دەبرد، خاوەنی خۆم نەبووم، بەڵام کە ئەو دەیەوێ لەگەڵم شەڕ بکات ناترسم، ئەو هەنگاوەی داریوش، کە تەواوی هێزی ئامادەی شەڕ کردووە هەمان ئارەزووی منیشە))[907]، لە وەختی شەڕیشدا، کە پارمنیون نێردراوی ناردە لای ئەسکەندەر و پێی ڕاگەیاند کە ((ئەخمینیەکان خێوەتەکان تاڵان دەکەن ئەو پێی وتوە، واز لەو بابەتە بهێنێ، چونکە یان سەردەکەوین ئەو کات هەموو شت دەست دەخەینەوە یان ژێردەکەوین، کە ئیتر گشت

---

[905] نینا ویکتورونا بیگولوسکایا: تاریخ ایران باستان، ص٨٣-٨٤.

[906] الفیلد مارشال فیکونت مونتجمیري: الحرب عبر التاریخ، ص١٧.

[907] حسن پیرنیاه: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٤٢.

شتێکمان له دەست دەچێت...))[٩٠٨] ئاستی بەهەندگرتن و خەملاندنی مەترسیەکان لەلای ئەسکەندەر و ئاست و چۆنیەتی کارکردن و تێکۆشان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەردەخات، کە بردنەوەی سەربەخۆیی بە دوای خۆیدا دێنێ.

لەبارەی کەمکردنەوە یان نەبوونی کەلێن لە نێوان سەرکردە و سەربازەکانیشدا، کە کار لە گیان و ورەی شەڕکردن دەکات، شارەزایەك بەناوی (پاسیلۆ) لە زانکۆی بۆستدام پێی وایە... هەموو سەریان لێ سوڕمابوو بەهۆی ئەو سیحرەی هەیبوو کە بەرهەڵستی نەدەکرا، ئەگینا نەیدەتوانی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و بێ هیچ مەرجێك پشتگیری بکەن و بەقسەی بکەن[٩٠٩].

بەشداری چالاکانەی لە شەڕەکاندا و لێهاتوویی و ڕۆڵی وەك سەرکردەی گشتی سوپاکەی و بەدەستەوە گرتنی لابالی ڕاست لە شەڕی گوگامیلاو سەرەگرتنی لە پێشەوەی شەڕ[٩١٠] دڵسۆزی ئەو بۆ مەسەلەکەی نیشاندەدات، ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ورەی سەربازەکان. ئەسکەندەر بەبڕیاردانی مەشق و ڕاهێنانی باش و چاکسازی ناو ڤالانکس و دانانی ڕیزی یەدەگ و تاکتیك بۆ ناکاراکردنی چەکەکانی دوژمن، ڕاسپاردنی ئەفسەرەکان بۆ هاندانی سەربازانیان‌و جەختکردنەوە لەسەر کەم وتن‌و گوێڕایەڵی و چوستی لە ڕاپەڕاندنی ئەرك‌و خێرایی لە هەواڵ گەیاندن، قیژە و هاوار و هەڕەشەکردن بەدەنگی گەورەی زەندەقبەر، ترساندنیان بە لەکەمین دابوونی دوژمن بۆ سوود وەرگرتن لەکەم تەرخەمییان، دڵنیایی خستە نێو دەروونی ئەفسەرەکان[٩١١]. چونکە بەهاندان‌و هەڵنان، وزەکان دەتەقنەوەو گیانی شەڕکردنێك ئافەریدە دەبێت، کە تا گەیشتن بەئەنجام ساردنەبێتەوە، بەمەرجێك هاندانەکە کەم یان مادی ڕووت نەبێت چونکە کاریگەرییەکەی زوو لەناودەچێت[٩١٢]. قوربانیدان‌و نمایش‌و وتاردانی پێش شەڕ و جەنگان شانبەشانی سەربازان بەنۆرەی خۆیان کاردەکەنە

---

[٩٠٨] الاب میتودیوس زهیراتي: الاسکندر الکبیر، ص٦١، هامش (١٥).

[٩٠٩] کەناڵی ئاسمانی کوردسات، بەرنامەی دیکومینتاری ڕووخانی ئیمپراتۆریەتەکان، بەشی دووەم: بە نووسراو.

[٩١٠] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٧) بەرەی گریك لە نەخشەی شەڕدا.

[٩١١] محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٦٢-٦٣

[٩١٢] احمد زماني: بحوث حول النظام العسکري، ص٩٩

ســـەر بەرزبوونـــەوەی ورەو وەك ئامرازی ڕاگەیاندن وابوون[٩١٣]، کە لە هەردوو بەرەدا تێبینـــی ئەنجامدانـــی کـــراوە، بـەڵام بـۆ ئەخمینییـــەکان لەبـەر تێکنەگەیشتنیانو ڕاکـــردنی دارا، بەخـراپو بـۆ گـریکەکان، کـە بەیـەك زمـان دەدوانو لەبـەر خـۆڕاگری ئەسـکەندەریش، بـەباش شکایەوە.

پاشان ڕەتکردنەوەی پێشنیاری بەشەو بەسەرداداں و دەبڕینی دەستەواژەی (من سەرکەوتن نادزم) کە نیشانەی دڵنیایی بوونە لـە سـەرکەوتن، بڕیـارداني ئێـواره خـوانێکی بـاش و بـە ئاسـودەیی خەوتن، پاشان قوربانی کردن بۆ ڕازیکردنی دڵی خواوەندان و مسۆگەرکردنی یارمەتی دانیان و سوود بینین لە فاڵگرەوە و کاهن و ئەستێرەناسان بۆ خوێندنـەوەی پۆزەتیڤانـەی ئاینـدەی شـەڕی گۆگامیلا، هۆیەکی تری ورە بەرزی بوون، لە ڕاستیدا ئەسکەندەر وای دەبینی، کـە شـەڕ لەگـەڵ دارا، شەڕی ئیرادەیە بەرلەوەی شەڕی پیاوان بێت، بەدەستهێنانی بەنرخترین شـتیش لـە بەرامبـەر دوژمن، ورەی پیاوەکانیەتی، کە دەیەوێ پارێزگاری لێبکات و بەهێزی بکات، چونکە دەیزانـی بەبێ ئەوە ناتوانێت بە سوپا بچووکەکەی بەسەر هێزی دارادا سەربکەوێ[٩١٤].

هەر بۆ ورە بەرز ڕاگرتنی سـەربازەکان هەنـدێك لـە سـەربازەکانی سـوپای گریـك پـێش شـەڕەکە هەڵـستاون بـە یـاری کـردن و پێکهێنـانی دوو گـروپ و دانـانی دوو کەسـایەتی بـە ناوەکـانی ئەسکەندەر و دارا، کە ڕۆڵی دوو سەرکردەی بەرەی شەڕ ببینن و ئەنجامدانی زۆرانبارزیەکی شانۆ ئامێز و سەرکەوتنی بەرەی ئەسکەندەر لە گەمەکەدا و پاداشتکردنی کەسـایەتیە سـەرکەوتووەکە لەلایەن ئەسکەندەری ڕاستەقینە کە ئامـادەی یاریەکـە بـوو، ئـەویش بـە پێـداني دوانـزە گونـدی ئەخمینی لە پای بینینی ئەو ڕۆڵەی[٩١٥]،هێنانە ئارای ڕەوشـێکی ئـارام و پڕدڵنیـایی و دوور لـە ترس و دڵەڕاوکێی دەگەیاند و ئاماژەش بوون، بۆ گرنگیدانی ئەسکەندەر و سەرکردەکانی تر بـە سوپا، ئەوەش زۆر پێویست بوو بۆ ڕەخساندنی زەمینەی بە عیـشقەوە شـەڕکردن ، بەرزکردنـەوەی ورەیان بوو بەهۆی بەدیهێنانی ئازایەتی و بایەخداری شەڕکردن، کە ئەویش بـە گـرنگترین هێـزی سوپا دادەنرێـت لـە شـەڕدا، کاتێـك ئـەو ئازایەتییـە لەناودەچـێ پێویـستە هێزێکـی تـری وەك"

---

[٩١٣] مارتن ڤان کریڤلد: القیادة في الحرب، ص٥٠.

[٩١٤] فوکس ویبرن: الاسکندر الاکبر، ص٧٧ .

[٩١٥] چون جنتر: الاسکندر الاکبر، ص٨٥.

لێهاتوویی سەرکردە یان ورووژانی گەل جێی بگرێتەوە[٩١٦] ئەگینا چارەنووس بەرەو تێکشان دەچێ.

تێکڕاشیان لەگەڵ ئەو هۆکارانە یەکدەگرنەوە، کە یەك لە نووسەرانی بواری سەربازی بەگوتەی خۆی لە میانەی لێکۆڵینەوەکانیدا لە بارەی گیانی مەعنەوی (الروح المعنویە) پێیان گەیشتووە، بەدوایکدا ریزی کردوون و وتویەتی کە: ((بوونی ئامانجێك کە کۆمەڵەکە هەوڵی بەدیهێنانی بدات، تێکۆشان و خۆڕاگری لە بەدیهێنانیدا، لەبەرچاوگرتنی ئەگەری مەترسی و کۆسپ لە ڕێی بەدیهێنانیدا، بوونی سەرکردەیەکی دڵسۆز و لێهاتوو و کەمکردنەوەی کەلێنی نێوان سەرکردە و سەربازانی، گرنگیدان بە سوپا لە ڕووی ڕاهێنان و مەشقی چاك و بەردەوام، تەیارکردنی بەچەك و پێداویستی نوێ، زیادکردنی بەشەکانی سوپا و پێکهاتەکانی، بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆ، دنەدانی گیانی دوژمنکاری لای جەنگاوەر بەرامبەر دوژمن و پێداگری لەسەر سەرکەوتن بەهەر نرخێك بێت، فەراهەمکردنی کەشێکی ئەرێنی بۆ سەربازان و دروستکردنی پەیوەندیەکی مرۆیانە لەگەڵیاندا، بەرقەرارکردنی ئاسایش و دڵنیایی بۆ سەربازان و زاڵکردنیان بەسەر ترس و دودڵی و چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوە، گرنگیدان بەپێگەی سەرباز و ریزگرتن و هاندانی و دەسخستنی هەواڵی ڕاست و بڵاوکردنەوەی وەك خۆی)) دەبنە هۆی بەرزکردنەوەی وورەی سەربازان و لەگەڵ ئەو هۆکارانەی تریش دێنەوە، کە لەو بوارەدا نووسەرانی تر جەختیان لێکردونەتەوە و لە چوارچێوەی هەمان سەرچاوەدا خراونەتە ڕوو،[٩١٧] لەگەڵ چاوخشاندنەوە بە باسەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا، لە سوپای ئەخمینیدا بەدیدەکرێن.

هەرچەندە لە هەندێك سەرچاوەدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەسکەندەر لە بینینی ئەو هەموو سوپا زۆرەی ئەخمینی و بڵاوبوونەوەی لە دەشتی گۆگامیلا و دەنگەدەنگ و حیلەی ئەسپان و بریسکەی چەکەکانیان ترساوە سەربازەکانی ئەهوەنیان کردۆتەوە، کە زۆری ژمارەیان نەی ترسێنێ[٩١٨] دەنگۆیەکیش هەیە، کە گریکەکان بە ڕووداوی مانگ گیرانی پێش شەڕەکە شڵەژاون و لەگەڵ پێشهاتە ناخۆشەکانی پێشتری ڕێگا، بە هێمای ڕقی خواوەند لەو لەشکرکێشیەیان زانییە، خۆ

---

[٩١٦] كارل فۆن كلاوفيتز: الوجيز في الحرب، ص١٨١.

[٩١٧] كامل علوان الزبيدي: علم النفس في الميدان العسكري، (بيروت: ١٩٨٨)، ص٩٩-١٠٢.

[٩١٨] ويل ديورانت: ابطال من التاريخ، ص١٣١؛ حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٢٤٠.

لۆمەکردنیش بەوە، کە شوێن کەسێکی پایەخواز و فریوخواردووی خەیاڵات کەوتوون.... نزیک بوو هەڵگەڕانەوەی بەدوادابێت، بەڵام ئەسکەندەر بە کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردەی بەشە گرنگەکان و خواستن لە کاهینەکانی میسر، کە-بۆ ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ ئەسکەندەر کەوتن- زانیارییەکانیان جێی بڕوای سوپابوو، تا بڕوایان لە بارەی ئەو دیاردەیە دەربخەن...، ڕەوشەکەی ئاسایی کردەوە[919].

ئەمەش دەکرێ وەك حاڵەتێکی ئاسایی بۆ ئەو سەردەمە لێك بدرێتەوە، چونکە سروشت و دیاردەکانی بە قووڵی لە باوەڕی خەڵکدا جێیان گرتبوو، بە دیدی ئەوان لە پشتی هەموو دیاردەیەك هێزێك هەبوو کە دەستی دەخستە ناو ژیانیان و ئایندەی خۆیانیان بە ئاستی ڕەزامەندی ئەوانەوە گرێدابوو، ڕووداو حاڵەتە ناباوەکانی سروشتیان وەك نیشانەو ئاگاداری‌و یاداشت‌و تۆڵەی خۆیان تەماشا دەکرد، ئەجۆری بیرکردنەوەیەش بە درێژایی مێژوو لە ئارادابووەو ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئامادەیی هەیە، دەشێ لەو ساتەوەختەی شەڕیشدا ڕەشبینی دروستکرد بێت، بەڵام درێژە نەکێشانی، ئەویش بەڕاڤەکرنی وەك نیشانەی چاکە لای کاهینەکان کە ئاماژەمان پێدا، ڕۆڵی زۆری بینیبێ لە جۆشدانی سەربازانی گریك بۆ شەڕو مسۆگەرکردنی سەرکەوتن. لە سەرچاوەیەکیشدا هاتووە کە بەگشتی سوپای گریك هاوکات لەگەڵ سەرکردایەتی باش‌و ڕێکخستن‌و ڕاهێنانی چاك لە سوپای ئەخمینی ورە بەرزتربوون[920].

هەرچەندە ئەخمینییەکانیش سەرەڕای پشتبەستنی پلە یەکیان بە زۆری ژمارەی سەربازان کە باسمانکرد، خۆئامادەکردنیان بۆ ئەو شەڕە فەرامۆش نەکردبوو، چونکە دارای سێیەم لە وەرگرتنەوەی وەڵامی نەرێنی نامەی ئاشتیخوازانەی خۆیدا زانیبووی کە ئەسکەندەر بە شەڕێکی یەکلایی کەرەوە نەبێ، وازناهێنێ، زۆربەی لێکۆڵینەوە نوێیەکانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا تێکۆشانێکی شەکەتکاری لە پێناو ڕێکخستنەوەی سوپایەکدا کرد، کە بتوانێ ڕووبەڕووی ئەو هێزە ڕێکخراو و سەرکردە لێهاتووە بێتەوە، لەم بوارەشدا هەندێك سەرکەوتنی بەدیهێناوە، بەڵام نەیتوانی هەنگاوی پێویستتر هەڵبێنێ و سەرکەوتن

---

(919) حسن پیرنیا: تاريخ ايران باستان، ج٢، ص١٢٣٢.

(920) عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم، ج١، ص٢٦٥.

مسۆگەر بکات[٩٢١]، لەبەرئەوەیە، کە وتراوە ئەسکەندەر ئومێدی سەرکەوتنی لەو جەنگەدا نەبوو کەچی بە سەرکەوتنێکی گەورە گەیشت[٩٢٢].

باسمانکرد کە دارا سوپایەکی زۆرتر لە پێشوی ئامادەکردو شوێنی گونجاوی بۆ شەڕ هەڵبژاردو چەکی ترسناکی هێنابە ناوەوە کە بۆ یۆنانیەکان(گریکەکان) نوێ بوو، پێش دەست پێکردنی شەڕیش بۆ هاندانی جەنگاوەران وتاریدا و بە پشتیوانی خودا هیواداری کردن، بەڵام ئەنجامدانی شەڕێکی یەکلاکەرەوە لەگەڵ ئەسکەندەرو سوپاکەیدا زۆر شتی تریش پێویست بووکە ڕەنگە بەبوون و بەهەندگرتنیان، ڕووداوەکان ڕوویەکی تریان وەرگرتبا، بەرزی وورەی شەڕکردن و بەردەوام مانەوەی یەك لەو شتانەبوو، کە لەسوپای ئەخمینی کەم بەرچاو دەکەوت، خۆڕانەگرتن لە ڕووبەڕووبونەوەکاندا باشترین بەڵگەیەتی کە بێگومان لە پشتی لاوازبوونی وورەش کۆمەڵێك هۆکارهەن[٩٢٣]. کە لەپێداچوونەوە بەتەوەرەکانی پێشوو ئەوەش کە دواتر لە میانەی ڕاڤەکردنی خاڵەکاندا، بە گوێرەی پێویست ئاماژەی پێدەکەین. کتومت لە سوپای ئەخمینیدا بەدی دەکرێت. لە نێویاندا سەرهەڵدان و جێگیربوونی بیروبۆچوونی هەڵە، کە ڕەوشی شەڕ یان ڕاڤەکردنی نادروستی سەربازان یان سەرکردە....هتد. دەیسەپێنێ ناڕوونی ئامانجی جەنگیش هۆیەکی ترەو ڕەنگە چەمکی شەڕ لای میللەتانی ناو ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی هەر داگیرکەری دیکە بووبێ کە نەپێشتر سوودیان لێبینیوەو نەو لاتەکەشیان لە ئەنجامە خراپەکانی دەربازی بووە.

سیفەتی باشی سەرکردایەتی و نەخشە لە سوپای گریکداو خەسڵەتی خراپی زۆری سەرکردەو بەرپرسیارێتی بەهۆی دابەشبوونی هێزەکان بەپێی ناوچەو هۆز لە بەرەی ئەخمینیدا، بە چەکی خۆیان و بەهۆی ئەو باجە زیادەش کە بەهۆی شەڕەکان دەخرایە سەر هاولاتیان و خانوادەکانیان، شەکەتی وچاوەڕوانی هێرشی دوژمن و پەلاماری کتوپڕ پاشان هەلاتنی داراو ژمارەیەك سەربازو دیمەنی لاشەی کوژراو و بریندار کە لەمیانەی باسەکانی تردا ئاماژەیان پێکراوە، بەشێکی تر بوون لەو هۆیانەی وورەی جەنگاوەران وگیانی شەڕکردنیان لە سوپای ئەخمینیدا هێنایە خوارێ و لە سوپای گریکیدا بەرزکردەوە و بوونە هۆیەکی تری بەلاداخستنی شەڕ بە

---

[٩٢١] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص١٥٩-١٦٠.

[٩٢٢] محمد جواد مشكور: تاريخ ايران زمين، ص٤٧.

[٩٢٣] سەبارەت بەهۆکارەکانی لاوازی ورە بڕوانە:كامل علوان الزبيدي: علم النفس في الميدان العسكري، ص١٠٢-١٠٣

قازانجی گریك. له نێو ڕێنمایی سەربازیشدا گیانێکی چالاك و بەهێزو باوەڕێکی پتەو بەمەرجی سەرکەوتوو بوون دەزانرێت، بڕوا وایە، کە ئەو گیانە لە هێزێکی پێویستی مرۆیی و ئامادەیی بەرفراوانی خەلکدا دەتوانێت خێرایی بە سەرکەوتن بدات[٩٢٤]

(هارولدلب) باس لە هۆکارێکی تر دەکات بۆ هاندانی گریکەکان بۆ شەڕکردن، پێی وایە مێژوونوسەکان ئاماژەیان پێنەداوە و هەر بەڕێکوپێکی و گوێڕایەڵی کەوای کردووە یەکگرتووبن و سەرکەوتوویی کەسایەتی ئەسکەندەر وەك هۆکاری سەرکەوتن وازیان هێناوە، ئەویش ترسی لەناوچوونە، چونکە گریکەکان ترسیان لە زۆری سوپای ئەخمینی هەبوو بەتایبەت، کە نە دەیانتوانی لە گۆگامیلا بگەڕێنەوە دەشیانزانی کە سوارەی ئاسیایی بە زیانێکی کەم، توانای سەرکەوتنیان هەیە، لەبەرئەوە گریکەکان هیچ چارێکی تریان نەبوو ئەوەنەبێ دربخەنە ناو بەرەی دوژمن و لەوەشدا هێزی بەرەنگاربوونەوە و مەشقی باش و ڕێکوپێکی سوپا، یارمەتیدەریان بوو[٩٢٥]. واتا دەشێ .. وەرەی بەرزی سوپای گریك وترای ئەوەی ئاماژەمان پێدا، لەوەش سەرچاوەی گرتبێ، کە ئەوان زۆر لە وڵاتی خۆیان دووركەوتبوونەوە و لەسەر زەمینی دوژمنەکانیان دەجەنگان بۆیە شەڕی مان و نەمانیان دەکردو جگە لە سەرکەوتن چارێکی دیکەیان نەبوو، ئیتر وره قەرەبووی دوورکەوتنەوە و مەترسی دەوره تەنرانیان بە دوژمن بۆ کردبنەوە، بە پێچەوانەی ئەخمینیەکان زۆری ژمارەی سەربازەکان و جەنگانیان لەناوچەیەکی ژێر قەڵەمڕەوی خۆیاندا وای لێکردن وره بەرزی پاشەکشە بکات، کە گرنگترین بنەمای سەرکەوتنە.

## ٥- هۆکاری تری ڕاستەوخۆ یەکلایی کردنەوەی شەڕەکە:

یەکێك لە شارەزایانی بواری سەربازی لە ژێر ناونیشانی گرفتەکانی شەڕ(مشكلات الحرب) باس لە هەندێك ڕەگەزی سەرەکی دەکات، کە پێی وایە ئایندەی شەڕیان لەسەر وەستاوە و بەدیهێنانیان بۆ بردنەوەی سەرکەوتن، لەسەر سەرکردە بە پێویست زانیوەو بە سەرنجدان لە ڕەوشی بەڕێوەچونی شەڕی گۆگامیلاش کەم و زۆر ڕۆڵیان لە یەکلاییکردنەوەیدا بەدیدەکرێت کە بریتین لە" کتوپڕی(المفاجأة)، هاوکاری نێوان چەکداران و سەرکردە و هێزەکان، ئاسانگرتن(البساطة)، خێرایی هەڵسوکەوتکردن(سرعة التصرف)، چڕکردنەوەی تێکۆشان،

---

[٩٢٤] مهدی ادیبی سده: لا جامعة شناسي جنگ ونیروهاي انتظامي، ص٢٨.

[٩٢٥] الاسكندر المقدوني، ص٢١٥-٢١٦.

دەستپێشخەری (المبادأة)و خەڵەتان لەگەڵێشیاندا ڕوونی بیری سەرکردەو دووربینی و توانستی پوختکردنەوەی هۆکارە گرنگەکان و دەست پێوەگرتنیان لەو کێشەیەی دەوریداوە -کە هەندێکیمان لە میانەی تەوەرەکانی تردا ئاماژە پێکردووە- ئەو وای دەبینێ کە ئەوپەڕی چاو لە دووریی دوژمن لەوەدایە، کە دەرفەتی بۆ هەڵکەوێ تا ئیرادەی خۆی لە شەڕدا بسەپێنێ، بەڵام سەرکردە دەتوانێ بە لەباربردنی هاوسەنگی بەرامبەرەکەی، ئەویش بە بەکارهێنانی جوڵەی سوك و ناچارکردنی لەسەر ملکەچ بوون بۆ جموجۆڵەکانی خۆی و هەڕەشەلێکردنی و بەکارهێنانی کتوپڕی کە بەهۆکاری سەرەکی بردنەوەی شەڕی دەزانێ، چاو لەدووریی دوژمن لەناوببات و بەوەش دانایی و سەلیقەی سەرکردە لە مانۆڕ(مناورە)و فێڵدا دەردەکەوێت، کەوا لە دوژمن دەکات بەگوێرەی فشاری ئەو بجوڵێتەوە، هەروەها ئەو وای بۆ دەچێ کە گرفتەکانی شەڕ لە گەوهەردا سادەن، بەڵام توانستی سادەکردنەوەو پوختکردنەوەیان قورسە لەبەرئەوە پێویستە سەرکردە ئەو توانستەی هەبێت و دووربینیش بێت[٩٢٦].

ئەسکەندەر لە جێبەجێ کردنی پلانی جەنگیدا نەرمی دەنواند، هەمیشە لەسەریەك شێوازی سەربازی نەدەڕۆیشت وبەپێی بارودۆخی هەر شەڕێك هەڵسوکەوت و ڕێکخستن وشێوازی کوشتاری دەگۆڕی،[٩٢٧] ئەمەش مانای وایە، کە سەرکەوتنی ئەسکەندەر لەم شەڕەدا کارێکی ڕێکەوت نەبوو، بەڵکو بەهۆی بەکارهێنانی شێوازی نوێ بوو لەبگیری(تعبئە)و کوشتار(قتال)دا، ئەو بەسەردادانە کتوپڕەش کە ئەنجامیدەدا ڕۆڵی کاریگەر و باڵای هەبوو لەو سەرکەوتنەدا[٩٢٨].

سەرچاوەیەکی تریش مسۆگەربوونی هەلومەرجی سەرکەوتنی گریکەکان بۆ توندی لێدانەکانی سوارەی مەکدونی و لەسەروەتری تاکتیکی فالانکسەکانی گریك و بارودۆخی جێگیری سەربازان و تەوژم و سەرکەوتوویی تری سوپاکەیان دەگەڕێتەوە[٩٢٩].

---

[٩٢٦] بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بڕوانە: الفیلد مارشال فیکونت مونتجمیري: الحرب عبر التاریخ، ص٢٩-٣٤.

[٩٢٧] فوزي مکاوي: تاریخ العالم الاغریق وحضارته، ص٢٢٠-٢٢١؛ محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٦٦.

[٩٢٨] محمد نجم الدین نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٥٤.

[٩٢٩] نینا فیکتوروونا پیگولوسکایا: تاریخ ایران باستان، ص٨٤.

کەچی بەسەردادانێکی کتوپڕی ئەخمینیەکان کە تایبەت بەهی خۆیان لە شەڕی گۆگامێلا لە ئارادا نەبوو لە کاتێکدا بەسەرداداني کتوپڕی گریکەکان بەڤالانکس دیار و بە بەرچاوەوە بووە، گۆڕاوەو بووە بەدابەشکردنی نایەکسانی هێزەکان و بەکارهێنانی یەدەگ(سپێر) لە چوارچێوەیەکی ڕادەداردا، سوپای ئەخمینی هەر پشتی بەدابەشبوونی هێزەکەی، بەبوونی هێڵی دووەم بەستبوو لە هێزکانیداو نەیکردووە، بەوچەمکەی کە ئەسکەندەر بەکاریهێناوە، ئەویش بەکاریبهێنێ، لەبەرئەوە ئەو سوپایە هیچ سوودی لە شارەزایی و پسپۆڕی و گۆڕانکاری هونەری کوشتار لەلای لەشکرانی تر وەرنەگرتووە. بەمشێوەیە بەسەرداداني کتوپڕی ئەخمینیەکان بەوشکی و نەگۆڕی ماوەتەوە و نەیتوانیوە لە تەك شێوازە گۆڕاوەکانی تری کوشتاردا، کارلێك بکەن و سوود وەربگرێ، لەبەرئەوەیە، کە مێژوونوسانی بواری جەنگ کە لەبەسەرداداني کتوپڕەکانی سوپای کۆن دەدوێن، سورن لەسەر ئەم کەڵك وەرگرتنە[٩٣٠].

ئەسکەندەر لە شەڕەکاندا توانیبوی بەسەرداداني کتوپڕ بەدیبهێنێ، ئەویش بەسوود وەرگرتن لەورەی بەرزی سەربازەکان و مەشقکردنی چاکیان بەهۆی هەڵخەڵەتاندنی دوژمن سەبارەت بەکاتی پەلاماردان و بەکارهێنانی شێوازی نوێ(یەدەگ) لە شەڕداو گورجی و خێرایی لە مناوەرەکردن، پەماردان و وەدیهێنانی نوشوستیدا، گورجی نواندن بۆ سوود وەرگرتن لە هەل و بەکارهێنانی شێوازی نزیك کەوتنەوەی ناڕاستەوخۆ، لە ئەنجامدا[٩٣١]، سەرچاوەیەکیش بەسەرداداني کتوپڕ بەهۆکاری سەرکەوتن و بنەمای بەدیهێنانی باڵا ڕۆیشتنی ڕێژەیی (تفوق النسبي)دەزانێ و وەك بیرێکی بنچینەییش بۆ ئەوپەڕی خێراگەران بەدوای زانیاری وچۆنیەتی تێکشکاندنی یەکجارەکی دوژمن، بەپێویستیەك بۆ سەرکردەی ڕاستەقینەی سەرکەوتنخواز تێدەگات[٩٣٢] کەئەویش پێویستی بە شارەزایی لە شێوازی شەڕکردنی دوژمن وهەندێك جار پەیڕەوکردنیش هەیە، بەتایبەت ئەگەر ئەزموونی لە پێشتر بۆ سەرکەوتن بەو شێوازە هەبێت. کەچی بەپێی سەرچاوەیەك لە نێو سوپای ئەخمینیدا جگە لە بەکرێ گیراوەکان (المرتزقە)کەسی

---

[٩٣٠] محمد نجم الدين نەقشبەندی: شەڕی ئەربیلا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٩)، ل٦٠.

[٩٣١] هەمان سەرچاوە، ل٦١.

[٩٣٢] كارل فون كلاوز فيتز: الوجيز في الحرب، ص٢٨.

دی، بەپاشاشەوە، پەیڕەویان لە ستانداردی شەڕی ئەوروپایی نەدەکردو شارەزای نەبوون و ڕۆژهەلاتیانە دەجەنگان[٩٣٣].

لە بڕیاردانی ئەسکەندەر بە خواردن و خەوێکی بێترس بۆ سەربازەکانی لە شەوی پێش دەستپێکردنی شەڕەکە، کە (مونتجمیری) بە ئاسودەکردنی بە زۆر (راحة الاجباریة) ناوی دەبات[٩٣٤]، سەرەڕای بینینی ئەو هەموو سوپا زۆرە لە دەشتی گۆگامیلا و ئەو هەموو نیگەرانیەش کە بەهۆیەوە چەشتی[٩٣٥]. بە دیوێکیدا نیشانەی توانای ئەسکندەری لە بەدواداچوون و خوێندنەوە و فامکردنی عەقلی دوژمن دەگەیاند، کە دەیزانی سوپای ئەخمینی لە ترسی پەلاماردانی بە شەو تا بەیانی ئێشك دەگرن، ئەو توانایەش لە گرنگترین خاسیەتەکانی سەرکردەی باش دەژمێردرێت[٩٣٦] و یەکێکیشە لە ئەرکە زۆر پێویستەکانی، بۆ سوود وەرگرتن لە خاڵی لاوازی دوژمن[٩٣٧].

چڕکردنەوەی هەڵمەتیش بۆ سەر گالیسکەی دارا، بە هێزێکی وا، کە نەدەگەڕایەوە ئەویش لەبەرئەوەی کە دەیزانی ئەگەر داریوش بشکێ یان بگیرێ ئەو دەگاتە مەبەست، چونکە سەربازەکان دوای شکانی پادشا ئۆقرە ناگرن[٩٣٨]، بەڵگەیەکی تری بەهرەمەندی ئەسکەندەرە لەو توانایە.

لەوەش کە گوایە دوای لە خەو هەڵسانی لە بەرەبەیانی ڕۆژی شەڕدا بە پارمنیونی وتووە: (ئێمە بەکردەوە شەڕەکەمان بردۆتەوە = ولكننا كسبنا المعركه فعلاً)، یان هەر هیچ نەبێ درەنگ لە خەوهەڵسانی[٩٣٩]، سادە گرتنی گرفتی شەڕ دەنوێنێ کە بێگومان کاریگەری هەبوو لەسەر چارەنووسی شەڕەکە. بڕیاردانی داراش بەئامادەسازی بۆ شەڕ و ڕاگەیاندنی حاڵەتی نائاسایی بە درێژایی شەوی پێش دەستپێکردنی شەڕ لە ترسی بەسەرادانی شەوانە، کە مونتجمیری بە

---

[٩٣٣] هرمان بنگسون: یونان وپارسان ، ص٣٢١.

[٩٣٤] الحرب عبر التاريخ، ص١٠٦؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٧٦-٧٩.

[٩٣٥] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان، ج٢، ص١٢٤٠-١٢٤٢.

[٩٣٦] الفيلد مارشال فيكونت موتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص٣٠.

[٩٣٧] عبداللطيف احمد علي: مصادر التاريخ الروماني، (بيروت: ١٩٧٠)، ص٥٩.

[٩٣٨] هارڤي بورتر: موسوعة مختصر التاريخ القديم، ص٢٩٥.

[٩٣٩] چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص٨٦.

هەڵسوكەوتێكی گەمژانە و ناپێویستی دادەنیٚ‌و بوو بەهۆی شەكەتی و ماندووبوونیان لە سەرەتای شەڕو كاریشی لەورەیان كرد، بە پێچەوانەی سوپای ئەسكەندەر، كە باسمانكرد[٩٤٠]، ئەمەش هۆیەكی دیاری یەكلاكردنەوەی شەڕەكە بوو.هەروەها ناچاربوونی كشانەوەی چەند هێزێكی داراش بەهۆی خۆڕاگری ئەسكەندەر و هێزەكەی‌پاشان پارچەپارچە بوونی بەرەی ئەخمینی و لە دەستچوونی دەرفەتی هاوكاری نێوان بەشەكانیان وهەڵكەوتنی هەل بۆ هێزی گریك كە بچنە كەلێنەكان وله هەمووولاوەدەست بوەشێنن، سوپای ئەخمینی خستە بارودۆخێكی خراپ و بووش بە هۆیەكی تری سەركەوتنی گریكەكان [٩٤١].

یەكێكی تر لە هۆیەكانی ژێركەوتنی سوپای ئەخمینی، زۆر وابەستەبوونی بەشەكانی بوو بەخۆڕاگری سەركردەوە، كە جێگیر نەبوونی هەستی شەڕكردنی لە ناخیاندا، دەگەیاند و نیشانەی ئەوەش بوو، كە بە خواستی خۆیان نەهاتبوونە شەڕ، وەك دیاردەیەك لە شەڕەكانی تریشدا ئامادەیی هەبوو و كۆتایی هاتن و بەردەوامبوونی شەڕیشی پێوەبەندبوو، لە شەڕی گۆگامێلاشدا دووبارە بۆوە، كاتێك دارا ڕایكرد[٩٤٢]، چونكە بەهۆیەوە لە ڕووی دەروونیەوە هەرەسی هێناو گەورەترین كاریگەری لەسەر ڕەوشی شەڕەكە دروستكرد و سوپای ئەخمینیش خۆی ڕانەگرت[٩٤٣]، تەنانەت (مازیوسی) فەرمانده، كە هەڵمەتی برە بۆ سەر ئوردۆی گریكەكان و دەستی بەسەر زۆر لە كەلوپەلەكانیاندا گرت و هەندێك لە دیلەكانیشی ڕزگاركرد، دایكی دارا یەك لەوانە بوو... كە بینی دارا ڕایكردووە ئەویش كشایەوە و لە ئاكامیشدا لە شكری ئەخمینی شكستی خوارد[٩٤٤].

لەبەرئەوەش كە سەركردە بۆ وەرگرتنی بڕیاری ستراتیژی (سوقی ) و تاكتیكی (تعبوی ) دەبێ تاووتوێی ئەرك وژینگە (زەوی) ، ئامراز وهێزەكانی دوژمن بكات، چونكە لەناوبردنی

---

[٩٤٠] الحرب عبر التاريخ، ص١٠٦.

[٩٤١] زوبير بلال اسماعيل: اربيل في ادوارها التاريخية ، ص٥٩-٦٠؛ الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ ، ص١٠٧.

[٩٤٢] محمد جواد مشكور: تاريخ ايران زمين: ص٤٧؛ عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٢١٠.

[٩٤٣] زوبير بلال اسماعيل: اربيل في ادوارها التاريخية، ص٦٠.

[٩٤٤] غلا محسين مصاحب: دائرة معارف فارسي، (تهران: ١٣٨٣)، ج٢، بخش دوم، ص٢٤٣٥.

ئەویش دوا ئامانجی شەڕە، ئەوا ناسینی لە ئاستی ستراتیژیدا دەبێتە ڕەگەزی سەرەکی بڕیارەکە وجێبەجێکردنیشی لە ڕووی تەکتیکیەوە ئاسان دەکات دەشبێتە مەرجی سەرکەوتن، ئەمەش لە ڕێی کۆکردنەوەی زانیاری وهەواڵگری (استطلاع واستخبارات) وکاری نهێنی بەدی دێت کە بابەتێکی زیندو و گرنگە و یارمەتیدەری سەرکردەشە لە کاتی پیش ودوای شەڕ[٩٤٥] بۆیە بەلای سەرکردەی گریکیەوە پێویست بوو کە دەچێتە شەڕ بەهەر شێوەیەك بێت زانیاری لەسەر زەوی و ژمارە و جموجۆڵ وچۆنیەتی دابەشبوونی سوپای دوژمن کۆبکاتەوە، تابەپێی ئەوە بڕیاری ڕێکخستنی هێزەکەی لە ڕاستەوە بۆ چەپ بدات، ئەمەش بڕیارێکی ترسناکە و گۆڕینی لە میانەی شەڕدا قورسە، بۆیە کۆبوونەوەی ئەفسەرە سەرەکیەکان بەر لە شەڕ بۆ ڕێککەوتن لەسەر دتوری شەڕ و پلانی هاوبەش بۆ کاتی نەمانی پەیوەندی و بەرگرتن لەو هێزانەی دەخوازن پەیڕەوی نەریتی خۆیان بکەن، گرنگە[٩٤٦]. سەرچاوەیەکیش کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر سوپای هەردوولا بە ئەرکی سەرکردەی بە توانا و هەڵوەستەکردنی لەسەر تواناکانی بەرامبەر، بەیەك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن دەزانێ[٩٤٧].

هەموو ئەمانە پێش شەڕی گۆگامیللا لەلایەن گریکەکانەوە ئەنجامدراون کەچی ئاماژەکردن بە گرتنبەری وەها ڕێوشوێنێکم جگە لە هەوڵی سوسەکردن، لەلای دارا وسوپاکەیەوە لە سەرچاوەکاندا بەرچاونەکەوت. کە ئەسکەندەر وەك نەریتێکی سەربازی پەیڕەوی لێدەکرد، چونکە بەهۆی سوسەکردن و تێفکرینەوە زانیویەتی کە دارا دەیەوێ بەهۆی ژمارەی سەربازەکانی بە پرۆسەی گەمارۆدانی سوپای ئەسکەندەر هەڵسێ، بۆیەش هەموو سوپاکەی بەیەکەوە ئاراستەی شەڕ نەکرد، بەڵکو لەسەر گردێك کە بەسەر گۆڕەپانی گۆگامیلادا دەیڕوانی یەکە(وحدە) دوای یەکە و بەهێواشی لە شکرەکەی هێناوەتە ناو گۆڕەپانی شەڕ، تا بەر لەویستی دەورەدانی ئەخمینیەکان بگرێت[٩٤٨].

---

[٩٤٥] اكرم ديري: اراء في الحرب ، ص١٥٧-١٦٠

[٩٤٦] مارتن ڤان كريڤلد: القيادة في الحرب، ص٤٩-٥٠.

[٩٤٧] احمد زماني: بحوث حول النظام العسكري، ص٩٥.

[٩٤٨] مارتن ڤان كريڤلد: القيادة في الحرب، ص٥٢.

هەرچی دەستەی سوسەکارانیشە، کە لەلایەن داراوە ڕەوانەی ناوچەکە کرابوو، لەوەناچێ بۆ ئەوە نێردرابێ، کە لەسەر بنەمای زانینی هەواڵی گریکەکان سوپای خۆیان ڕێکبخەن، بەڵکو ڕەنگە زیاتر ویستویانە بەو خۆنیشاندان و ڕاکردنە ڕێی گۆڕەپانی شەڕیان پێ بڵێن و بیانکێشنە ئەو شوێنە، کە خۆیان هەڵیانبژاردووە، نەك ملی شوێنێکیتر بگرن و ڕێسەکەیان لێبکەنەوە بەخوری، چونکە دارا پێی وابوو لەو دەشتە بەرفراوانە و بەهۆی ژمارەی زۆری سەربازانی دەتوانن سەرکەوتن بەدەست بێنن، هەرچی مەسەلەی ڕاوێژ و نەخشەی هاوبەشیشە ئەوە نەك هەربوونی نەبووە، بەڵکو زووتر زانیمان، کە ئەوانەی پێشنیاری بەسوودیان خستەڕوو گومانی خیانەتیان لێدەکرا.

هۆکاریکی تریش، کە بەگشتی لە سەرکەوتنی گریکەکان لە میانەی لەشکر کێشیەکەدا، ڕۆڵی هەبوو و پیویستیشە ئاماژەی پێبکەین، پشتبەستنی ئەسکەندەر بوو بە شارەزایانی بواری ئەندازیاری(هندسی) و سوود لێوەرگرتنیان بوو بۆ ئابڵوقەدان و ڕوخاندنی شار و قەڵاکانو دروستکردنی شار وقەڵای تازە ، لە نێو گرنگترینی شارەزایانی ئەو بوارەشدا ناوی (دیادسdiades) و(دینوکراتسdienokrates) هاتووە[٩٤٩].

هەیشە لە سەرکەوتنی گریکەکان بە سەرکردایەتی ئەسکەندەر و ژێرکەوتنی ئەخمینیەکان بە سەرکردایەتی دارا ئاماژە بە جیاوازی تەمەنی سیاسی هەردوو دەسەڵات واتە پیری دەوڵەتی ئەخمینی و دەسەڵاتی لاوی مەکدونی، دەکات[٩٥٠]. کە دەکرێ وای لێبخوێننەوە، کە دەوڵەتی ئەخمینی تەمەنی منداڵی و گەنجی خۆی تێپەڕاندبوو و گەیشتبۆ قۆناغی پیری و ڕووبەڕووی دەسەڵاتی گریك بە سەرکردایەتی ئەسکەندەر ببۆوە، کە قۆناغی منداڵی جێهێشتبوو و لە هەرەتی گەنجی و تواناداا بوو ئارەزووەکانی سنووری ئاساییان لەبەرچاو نەدەگرت، لەم پێوەندەدا دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئەخمینی سەردەمی گەنجی دەوڵەتەکەیان لە ڕێی تواناو وزەی داهێنان بە شکۆمەندی و هەگبەی پڕو دەسەڵاتی زۆر و سنووری بەرفراوان، کە پەلکێشی کردن بۆ ڕۆچوون لە ژیانی پڕ هەوەس و ڕابواردن و خەریکبوون بە کۆکردنەوەی سامان و چڕکردنەوەی هەوڵەکان بۆ تێرکردنی ئارەزووە تایبەتیەکان، تێپەڕاندو هەوڵدانیش بۆ

---

[٩٤٩] بسام العسلي: الأسكندر الكبير المقدوني، ص٥٨.

[٩٥٠] ويل ديورانت: قصة الحضارة، مج١، ج١، ص٤٦٠؛ سامي ريحانا: شعوب الشرق الادنى القديم، ص١٧٥.

پاراستنی ئەو میراتە و بەرقەرار هێشتنەوەی دەسەڵات بەسەر ژێردەستەکاندا، لە سەردەمەکانی سەرەتای قۆناغی پیریدا، بێ لاکردنەوە لە بەردەوامی داهێنان، سلکردنەوە لە هەموو شێوازێکی مامەڵەکردنی، لەگەڵیاندا، بەدوای خۆیدا هێنا، بەمشێوەیەش ڕەوشەکە ستەمکاریانە تێپەڕی و هاوسەنگی نێوان ئەرك و مافەکانی هاوڵاتیان فەرامۆشکرا، کە بوونی پێویستترین شتێکە بۆ دەسەڵاتێك بیەوێ بە پایەداری بمێنێتەوە، ئیتر میللەت نەك هەر گیانی بەربەرەکانی کردنی مەترسی دەرەکی نەمابوو، بەڵکو ڕەواییان بەخۆشیان دابوو، کە بە شۆڕش و ڕاپەڕین هەڵسن، دەوڵەتیش بەوە کە دەسەڵاتدارانی نوقمی کەیف خۆشی تێرکردنی ئارەزووەکانیان بوون و لەبەر سەرگەرمیشیان بە ململانێی باڵادەستی و چۆنیەتی دابینکردنی ناوخۆ و هێشتنەوەی ڕەوشی دەسەڵات وەك خۆی، لەلایەك تا دەهات وزە و توانایان دەیدایە کەمی و لەلایەکی تریش نەیاندەپرژایە سەر ئامادەسازی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دەرەکی، ئەمەش مانای وابوو کە چیتر هەلومەرج لە بەرژەوەندی پایەدار مانەوەی دەسەڵاتیاندا نەبوو، چاوەڕوانی کەوتنی دەکرا وەك پەیکەرێکی ڕەق هەڵاتووی لارەوەبوو، کە تەنها دەستێکی دەویست بۆ کەوتن و شەڕی گۆگامیلاش ڕۆڵی ئەو دەستەی یاری کرد.

شایانی باسە حاڵەتی پیری وەك فلتەرێك کە بە ناچاری و لە کۆتاییدا دەبێ گشت شارستانیەتەکان (کە هەموو چالاکیە ماددی و مەعنەوی و فیکریەکانی ئادەمیزاد دەگرێتەوە) بەرەو مردن پیایدا، ڕەتبن بیروڕا و قەناعەتی گروپێك لە دوو گروپی بیریارە(مفکر)چارەسازەکانی (ڕەوشی دامەزراندن و ڕووخانی شارستانیەتەکان)ە، لە نێویاندا (ابن خلدون و ڤیکۆ و شبنگلەر) کە لەمیانەی تێڕوانینیان بۆ مێژوو لە سەرهەڵدان و گەشەکردن و لاوازی و هەڵسانەوە و ڕووخان و لەناوچوونی شارستانیەتەکان و میللەتەکاندا، ئاماژەکانیان خوێندۆتەوە و ڕەشبینانە چوارچێوەیەکیان دارشتووە کە تیایدا زەمینەی بوون و چارەنوسیانیان، تێدا ڕوونکردۆتەوە و لە نێویدا، مێژووی هەر یەکێکیان بەبوونەوەرێکی زیندو چواندووە کە بە قۆناغەکانی تەمەندا، هەر لە لەدایکبوونەوە بۆ مردن، تێپەڕدەبێ. لە دیدی ئەو گروپەدا ئاکامی هەموو شارستانیەتێك مردنەوە و بڕیاری ئەوەشی هەر لە پەیدابوونەوە بۆ دراوە و هۆکارەکانی ڕوخانیشی هەمان هۆکارەکانی سەرهەڵدانن. لەسەر ئەو بنچینەیە و بەچاوپۆشین لە چەندی قۆناغەکانی و چلۆنی ئەو خاسیەت و نیشانە و تایبەتمەندیانە

که هەریەك لە بیریارەکان بەگوێرەی ئاستی تێگەیشتنیان... بۆ هەر قۆناغێك بە مەرجیان گرتووە، دەشێ بڵێین دەسەڵات کە هەرەس و بەرقەرار مانەوەی دیواری ئیداری و ئاسایشی شارستانیەتی پێوەبەندە[951]، لە دەوڵەتی ئەخمینی پێش شەڕی گۆگامێلا گەیشتبۆ دوادواکانی قۆناغی پیری . لەناوچوون، دوا مەنزڵی چاوەڕوانی کردن بوو کە لەو شەڕەداو بەدەستی سوپای گریك بەرجەستەکرا.

[951] بۆزانیاری زیاتر لە بارەی دیدی هەر یەك لەو بیریارانە لە بواری سەرهەڵدانی شارستانیەکان وقۆناغ بەندی و ڕوخانیان بڕوانە: هاشم یحیى الملاح وآخرون: دراسات في فلسفة التاريخ، ص١٧١-٢٢٢؛مفيد كاصد الزيدي: المدخل الى فلسفة التاريخ، ص١٠٥-١٠٦.

## بەشی سێیەم

## دەرەنجامەکانی
## شەڕی گۆگامێلا (ئەربیلا)

باسی یەکەم: دەرەنجامە سیاسی و سەربازی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان
باسی دووەم: دەرەنجامە زانستی و ڕۆشنبیری و هونەری وهزری و ئایینیەکان

## بەشی سێیەم:

### دەرەنجامەکانی شـەڕی گۆگامێلا

### باسی یەکەم:دەرەئەنجامە سیاسی و سەربازی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان

لـە ڕاسـتیدا ناوبـانگ و بـەهاو قـەبارەی ڕووداوە مێژووییـەکان لـە نەخـشی ئەوشـوێنکارانەدا بەرجەستە دەبێ کە لەکایە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگادا، بەجێیان دەهێڵێ، بەوپێیەش کە نهـێنی پشتی زیندوومانەوەی شەڕی گۆگامێلا، بـەو دەرئجامـە گـەورە و گرنگانـەوە پەیوەسـتە کـە لێـی کەوتوونەوە، یان دەرفـەتی ڕِسـکانیان بـە زەمینەیەکـەوە گرێـدراوە، کـە فەراهـەمبوونی لـەوێوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە بەپێی توانا ئەوەندەی لێکۆڵینەوەکە ڕێی پێبدات بەرەنجامەکانی شـەڕی گۆگامێلا لە چوار ڕەهەندی جیاجیادا دەخەینە ڕوو:

#### تـــەوەرەی یەکـــەم: لە بواری سەربازی و سیاسی و بەڕێوەبردندا

شەڕی گۆگامیـلا دوا شەڕی بازنەی ململانێ سیاسی و سەربازی نێوان سـوپای ئـەخمینی سـوپای گریك دەنوێنێ و بەهۆیەوە ناکۆکی جەنگی نێوان هەردوو هێز، یەکلایی بووەوە و بڕیـار لەسـەر چارەنووسی ئاسیاو ڕۆژهەڵات بۆ مـاوەیەکی درێژ، درا[952]. ئەویش بەهۆی بەهرەمـەندی زیـاتری گریکەکان لە ئالیاتی سەرکەوتن، نەتوانینی سوود وەرگرتنی سـوپای ئـەخمینی تـا کۆتـایی، لـە

---

[952] محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٤٥.

هەلومەرج و تواناکان، سەرەڕای سەرکەوتنی سوارانی بەکتریایی[٩٥٣] و ساکایی[٩٥٤] و خۆڕاگری سەرسەختانەی بەکرێگیراوە(المرتزقه) گریکیەکان، کە لە خزمەتی سوپای ئێراندا بوون، ئەو ئالۆزیەش کە بە هەڵمەت بردنیان لە هەموو لاوە بۆ سەر سوپای مەکدونیا، دروستیان کردبوو، کەچی بەڕاکردنی دارا لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەدا –وەك وتمان- شەڕ بە سەرکەوتنی سوپای گریك و ژێرکەوتنی سوپای ئەخمینی کۆتایی هات[٩٥٥].

ئەمەش کوژرانی ژمارەیەکی زۆری سەربازی لێکەوتەوە کە مێژوونووسان لە دەرخستنیدا هاوڕانین، لەم بارەوە فلافیوس ئاریانس ژمارەی کوژرانی سەربازانی ئەسکەندەر بە سەد کەس و ژمارەی کوژراوانی ئەخمینیشی بەسێ سەد هەزار و دیلەکانیشی بە زیاتر لە کوژراوان، ئاماژەپێکردووە، لەگەڵ دەستگرتن بەسەر هەموو فیل و گالیسکەکان کە لە میانەی شەڕەکەدا تێکنەشکابوون[٩٥٦]، لە دائیرە المعارفی فارسیدا ئاماژە بە ٩٠٠٠٠کوژراوی ئەخمینی کراوە[٩٥٧].

وتراویشە کورتیوس ئاماژەی بە کوژرانی چل هەزار ئەخمینی و کەمتر لەسێ سەد کەس گریك و دیۆ دۆریش بە زیاتر لە نەوەد هەزار ئەخمینی و پێنج سەد کەسی گریکی، کردووە و لەنێو بریندارەکانی سوپای ئەسکەندەر ناوی (هیمفستیون و بریکادس و کۆینوس و میندیاس) لە هاوڕێ نزیکەکانی هەبووە[٩٥٨]. بە چاوپۆشین لە ئاماژەی مێژوونووسان دەکرێ بووترێ بە گشتی لەوشەڕەدا خەڵکێکی زۆر تێداچوو،ئەوەی نەکوژرابێ گیرا یان پەرشوبڵاوبوون ، بۆیەشە لە دوای

[٩٥٣] مەبەست لە خەڵکی ناوچەی باکتریا، یەکێك لە هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیە، کە بریتی بوو لە ئەفغانستانی باکوور بەشێکی گەورەی تورکستانی ڕوسیای ئێستا کە بەناوبانگ بوو بە بەروبومی سروشتی و بەهێزی و لاساری ڕۆڵەکانی، بسام العسلي، الأسكندالكبير المقدوني، ص٧٧ ، هامش١٢٢.

[٩٥٤] ساکا: ناوی نەتەوەیەکی سەرەتایی نیشتەجێی ناوچەی چیاو تەپۆلکە لمینەکانی هەرێمی هەڵکەوتو لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سەردریا(سیحون) بوون ئەو هەرێمەش بخار و تاشقەندی لەخۆ گرتبوو و ناسرابوو بە هەرێمی ئەودیوی ڕووبار. بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني(٣٥٦-٣٢٣ق.م)، ص٧٨، هامش١٢٥.

[٩٥٥] فلافيوس اريانس: ايام الاسكندر الكبير في العراق، ص٣٢؛ ادوين اريدويچ گرانتوسكی و دیگران: تاریخ ایران، ص١١٤.

[٩٥٦] ايام الاسكندر الكبير في العراق ، ص٣٤ .

[٩٥٧] غلام حسين مصاحب: دائرة المعارف الفارسي، ص٢٤٣٥.

[٩٥٨] نفس المرجع، ص٣٤، هامش ٣؛حسن پيرنيا: تاريخ ايران باستان ، ج٢، ص١٢٤٧-١٢٤٨.

شەڕەکە تەنانەت تیپێکیش نەمایەوە کەدژی ئەسکەندەر بوەستێت [٩٥٩] ئەمە جگە لەو هەموو کوشتارەش کە لە دوای شەڕی گۆگامیلا و لە میانەی پێشڕەوی کردنی سوپای گریکدا بەتایبەت لەوناوچانەی پێشڕەویانکرد چ لە سەردەمی ئەسکەندەر یان جێنشینەکانی، لە گەلانی رۆژهەلاّت وسوپای گریك کرا [٩٦٠].

هەروەها سەرکەوتن لەو شەڕە، هانی ئەسکەندەر و سوپاکەیدا، تابەرەو ناوچەکانیتر پێشڕەوی بکەن بۆیە" کاتێك دارا لەگەلّ پاسەوانەکانی بۆ شاری ئەربیلا(هەولێری ئێستا) هەلاّت، تا لەوێوە بەناو شاخ وداخاندا بۆ ئەکباتانە (هەمەدانی ئێستا)، بگەڕێتەوە. -بەلای کێوەکانی کوردستاندا پاشەکشەی کرد[٩٦١]- ئەسکەندەریش تا هەولێر بەدوایەوەبوو، بەلاّم پێی نەگەیشت[٩٦٢] و نەش خەلّەتا بەوە، کە ڕووە و باکوری رۆژهەلاّت بەناو بەرزاییەکانی میدیا، شوێنی دارا هەلّبگرێت و لەمەبەستە سەرەکیەکەی لابدات، بەلکو پێشڕەوی کرد تادەست بگرێت بەسەر گرنگترین مەلّبەندەکانی ئەخمینی کە بریتی بوون لە بابل و سوسە پرسپیۆلّس و هەمووشیان بە ئاسانی سالّی( ٣٣١پ.ز) ڕادەست بوون[٩٦٣].

رۆیشتنی داراش بەنێو چیاکانی ئەرمینیا بەرەو میدیا، بەو هێزەوە کە لەگەلّیدا بوو، لەو بڕوایەوە سەرچاوەی گرتبوو کە پێی وابوو ئەسکەندەر دوای سەرکەوتن لە شەڕ، ڕێ بەرە و ئەو شارانە دەگرێ و شوێنی ئەو هەلّناگرێ، چونکە ڕێگای خۆشە گواستنەوەی کەلوپەلی پێدا ئاسانە وەك دەستکەوتی جەنگیش، لە سوسەی دەروانی لە کاتێکدا کە ڕێگای میدیا سەختە و

---

[٩٥٩] هارڤی بورتر: موسوعه مختصر التاريخ القديم، ص٢٩٥.

[٩٦٠] بۆ نموونە تەنها لەبەربەرەکانی هیندیەکاندا ژمارەی کوژراوان بە هەزار تاسیٚ هەزار ئامارەی پێکراوە: سیر برسی سایکس: تاريخ ايران ، ج١، ص٢٣٦، هامش٢ . سەرچاوەیەکیش ئامارە بەکوژرانی ٦-١٠هەزارکەسی کوردە براخۆییەکانی هەرێمی بلوجستان دەکات، ئەویش لە میانەی بەربەرەکانیەکی چەند ڕۆژەو شەڕێکی خوێناوی (گل کالا)(کۆکالا )ی ئێستا لە دژی ئەسکەندەر بۆ پارێزگاری سەربەخۆیی: میر نەسرخان ئەحمەد زەیی بەلوچ: بەلوچ و بەلوچستان، (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل٢٠٨-٢١٢ و وتراویشە چارەکی ئەو سوپایەی هاوڕێی ئەسکەندەر بوو بەسە -لامەتی نەگەڕایەوە یۆنان: الفريد فن گوتشمد: تاريخ ايران، ص٢٦.

[٩٦١] هرمان بنگسون: یونان و پارسان، ص٣٢.

[٩٦٢] خسرەو گۆران: کوردستان لە مێژوودا، چاخە کۆنەکان، وەرگێڕانی ئاسۆ کەریم ، (هەولێر: ٢٠٠١)، بەشی یەکەم ، ل١٠٣.

[٩٦٣] الفيلد مارشال فيكونت مونتجيري: الحرب عبر التاريخ، ص١٠٨.

ڕەتبوونی سوپا بەویدا زەحمەتە، و لەو باوەڕەشیدا هەڵەی نەکرد، چونکە ئەسکەندەر دوای هەولێر یەکسەرە بەرەو بابل کەوتەڕێ[964]. بێگومان دوای تێکشکاندنی سوپای ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیش لەو شەڕەدا شتێکی سروشتی بوو، کە ئەسکەندەر بۆ گرتنی شارە گرنگەکان و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی فەرمانڕەواکانیان ، پێشڕەوی بکات، ڕۆیشتنیشی بەرەو بابل لە سۆنگەی ئەوەوە سەریهەڵداوە[965].

کاتێك لە شارەکە نزیکبوونەوە، کە دەست بەسەرداگرتنی، ئامانجی دوای شەڕەکە بوو[966]، خەڵکی بابل لە پێشەوەیاندا زەیوان(کاهن)و فەرمانڕەوایان بۆ پێشوازیان، هەریەکە و بە دیارییەکەوە هاتنە دەرەوە، شارو قەلاّ و سامانەکەیان ڕادەستکرد، پاش مانەوەی ماوەیەك تیایدا[967]، فرمانی هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو بڕیارانەیدا کە جێبەجێ‌کردنی نەریتی بابلیەکانی، هەر لە دوای ڕووخانی دەوڵەتەکەیانەوە لە(۳۵۹پ.ز)ەوە، پێ قەدەغە کرابوو[968].

پێشوازی کردنی خەڵکی شارەکەش بەو شێوەیە لە ئەسکەندەر لەبەر بێزاریان بوو لە دەسەلاّتی ئەخمینی کە چەندین ساڵ بوو بە دەستیانەوە دەیان نالاّند، پێیان وابوو هەر گۆڕانێك لەو دەسەلاّتەدا و لەهەر لایەکیشەوە بێت، زۆر لە حوکمڕانی ئەخمینیەکان باشترە[969]. بەچوونی ئەسکەندەر بۆ ناو ئەو شارە بەناوبانگە هەموو شارەکانی تری ناوچەکە (عێراقی ئێستا) ڕادەست بوون و لە ترسی لە دەستچوونی، دەرفەتیش، نەیەویست لەویدا بمێنێتەوە، لەبەرئەوە بەرەو ناوچەکانی تری سنووری قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئەخمینی پێشڕەوی کرد[970].

---

(964) فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص۳۵-۳٦.

(965) باقر یاسین: تاریخ العنف الدموي في العراق، ص٦۹.

(966) حسین فهد حامد: موسوعة الاثار التاریخیة، ص۲۵.

(967) فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص۳٦؛ هرمان بنگسون: یونان و پارسان، ص۳۲۰-۳۲۱؛ طه باقر واخرون: ایران قدیم، ص۸۰.

(968) مفید رائف العابد: دراسات في تاریخ الاغریق، ص۱٦۰؛ بسام العسلي: الاسکندر الکبیر المقدوني، ص۱۱.

(969) محمد الاسعد بوبکر الحفصي: الغزو الیوناني لبلاد الرافدین، رسالة ماجستیر، ص۵۰.

(970) علي ظریف الاعظمي: تاریخ الدولة الیونانیة والفارسیة في العراق، ص۷.

پاشان ڕووی کردە(سوس) لە ڕێگا، نوێنەری خەڵکی شار، بەپیریەوە هات کە والی ڕەوانی کردبوو، تاپەیامی خۆشحاڵی دانیشتوانی پێبدات و پێی ڕابگەیەنێ، کە خەڵکی شار پێشوازی لە هاتنی دەکەن و هەموو گەنجینەکانیشی، تا گەیشتنی ئەو پارێزراو دەبن و دوای بیست ڕۆژ گەیشتنە ئەوێ[971] و بەبێ شەڕ شارەکە خۆی بەدەستەوەدا، ئەسکەندەر دەستی بەسەر خەزێنە و کۆشکی پادشادا گرت و فەرمانڕەوا ئەخمینیەکەشی لە شوێنی خۆی هێشتەوە و خانەوادەی دارای سێیەمی لەوێدا نیشتەجێ کرد[972].

بەبۆنەی گرتنی ئەو شارە ئاهەنگێکی سازدا و بەپەیوەندی پێوەکردنی هێزێکی نوێی گریکیش لەوێ شوێنی کوژراو و پەککەوتەکانی پڕکردەوە، پاشان بڕیاری ڕۆیشتن بەرەو پەرسیپۆڵس (تەخت جەمشید)ی پایتەختی پیرۆزی ئەخمینیەکانیان لە بانی ئێران بەناوچیاکانی زاگرۆسدا، کە هۆزێکی لێدەژیان بەناوی( کوسی،کاسی)کە هەرگیز ڕێیان نەداوە بێسەرانە لەشکری بێگانە بەخاکیاندا بڕوات،دوای دەربازبوون لێیان وسەرکەوتن بەسەر ئەوان وهێزێکی تری ئەخمینیش کەلە دەربەندێکی دواتر توشی هاتن، ڕێی گەیشتن بە شارەکەیان بۆ ئاوەڵابۆوە[973]، یوزف یوسەهوڤر وەك دەوڵەمەندترین شاری ژێرخۆر و ماڵەکانیشی بەدارای گرانبەهاترین ئامراز وکەلوپەلی ناومالْ وەسفکردوە[974] ئەوەش گرنگترین ئامانجی داگیرکاری ئەوان بوو، چونکە لە مێژبوو چیرۆکی سەرسامکەریان لە بارەی سامان وگەنجینە وگەورەیی شارەکە دەبیست و لە دیدیاندا،ئەفسانە ئامێزبوو، زیاتر لە هەر شتێکی تریش ئەسکەندەری لە ئامانجی سیاسی یەکێتی گریکەکان نزیکدەکردەوە و پێگەیشتنیشی جێی باوەڕکردن نەبوو، بۆ سەربازەکانیش موژدەی نزیکبوونەوەی کۆتایی هاتن بە لەشکرکێشی وگەڕانەوەی ناوخانەوادەکانیان دەگەیاند بەوەش، کە دەتوانێ بە ئاماژەیەك تۆڵەی سووتانی ئەسینا کە گریکەکانی ڕووبەڕووی ڕیسوایی

---

[971] فیلافیوس اریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٤١؛ هارولدلمب: الاسکندر المقدوني، ص٢٢٣؛ الاب میتودیوس زهیراتي: الاسکندر الکبیر، ص١٠٨.

[972] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٢٧٤؛ مفید رائف العابد، دراسات في تاریخ الاغریق، ص١٦٠؛ بسام العسلي: الاسکندر الکبیر المقدوني، ص٨١.

[973] هارولدلمب: الاسکندر المقدوني، ص٢٢٥-٢٢٨؛ جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ل٢٣٧-٢٣٨.

[974] ایران باستان، ص٤٣.

کردبوو، بکاتەوە، دڵخۆشبوو، سوپاکەشی کە ڕێی ناوشار و تالاّنکردن و سووتاندنی بۆ کرایەوە خۆشحالّبوو، پێیان وابوو ئەونامەیەی بۆی هاتبوون گەیاندیان و ئێستا نۆرەی گەڕانەوەیە [975].

بەپێی سەرچاوەیەك دوای چوارمانگ قەرارگرتنی ئەسکەندەر لە شارەکە ئەنجامدانی چەند بەسەردادانێك بۆ گوێڕایەڵی پێکردنی کێونشینەکان، پاش سەردانی گۆڕی کۆرشی گەورە و دەرکردنی فەرمانی دەست لێنەدانی ،لە دوارۆژەکانی مانەوەیدا پەرسیپۆلسی ئاگرتێبەردا سەرچاوەکە لەگەڵ ئاماژەدانی بە چەند ڕایەك پرۆسەکە سیاسیانە نابینێت بۆ ئەگەری پرسێکی وا لە هەموو ڕویەکەوە (سوس) بە لە پێشتر دەزانێ، نکوڵیش دەکات لە دەستبردنی ئەسکەندەر بۆ ئیشی وا لە میانەی لەشکرکێشیەکەیدا، کەچی هەرخۆی چەند لاپەڕەیەك پێشتر باسی فرمانی ئەسکەندەر بەگرتێبەردانی شاری (تیبە) بەکۆیلەکردنی دانیشتوانی دەکات[976].

وتراویشە کە ئەسکەندەر ڕایگەیاندوە، کە گریکەکان دوژمنی لە پایتەختی ئەخمینیان خراپتر ونەفرەت ئەنگێزتر نەبووە بۆیە پێش سووتاندنی کەوتوونەتە کوشتن وتالاّن و شکاندنی ئەوشتانەی بۆیان نەبراوە تاوای لێهاتووە زۆرخەڵکی شار بڕیاری خۆکوژیانداوە[977] .

لەمەڕ هۆکاری سووتاندنەکەش ڕای جیاواز هەیە، هەندێك پێیان وایە، کە هەڵسان بەوکارە سەرەڕای هۆشداریدان بەسەرکردەکان بۆ خۆپاراستن لێی، ویستویەتی بیکاتە پەند بۆ ئاسیاییەکان، بە وا نیشاندانی تۆڵەکردنەوەی ڕووخاندنی پەرستگای بابل بە دەست ئەخمینیەکان، لە بابلیەکان نزیك بێتەوە و پەیامێکیش بداتە گریك، کە تۆڵەی سووتاندنی ئەسینای ساڵی ( ٤٨٠پ.ز)ی کردۆتەوە[978] ، ئەوەی دواییان زۆرترین نووسەران جەختی

---

[975] رمان گیرشمن: تاریخ ایران ازاغاز تا اسلام، ص٢٧٥-٢٧٦.

[976] همان ماخذ ، ص٢٧٥-٢٧٦.

[977] محمد جواد مشکور: تاریخ ایران زمین، ص٤٧-٤٨؛ یوزف یوسهوفر: ایران باستان، ص٤٣.

[978] مفید رائف العابد: دراسات في تاریخ الاغریق، ص١٦٠؛ طه باقر واخرون: تاریخ ایران قدیم، ص٨٠؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٨١.

لێدەکەنەوە[٩٧٩]، بەتایبەت -وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا - مەسەلەی تۆڵەکردنەوە یەك لەو ئەنگێزانە بوو، کە وایکرد ئەسکەندەر گریکەکانی پێ لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە[٩٨٠].

شایانی ئاماژەپێدانە کە هەریەك لە ئەسکەندەر و دارا چاودێری جموجۆڵ[٩٨١] و کارەکانی یەکتریان دەکرد[٩٨٢]، ئەسکەندەر لەبەرئەوەی لە لایەکەوە زانیبوی کە دارا لە دوای شکانی لە شەڕی گۆگامیلا لە ئەکباتانە(همدان) خەریکی خۆئامادەکردنە بۆ بەردەوامیدان بە شەڕ[٩٨٣]، لە لایەکی تریش لە نێو شارەکانی جێی مەبەستی(بابل و سوس، پەرسیپولس و پازرگادا[٩٨٤]، ئەکباتانە) تەنها ئەکباتانەی پایتەختی هاوینەهەواری ئەخمینیان مابوو، داگیری بکات. بەو مەبەستەش بە خێرایی هێرشی کردە سەر خاکی میدیا[٩٨٥]، بۆ شەڕ شارەکەی گرت وگرتنی پایتەختەکانی ئەودەوڵەتەش وەك یەکێ لە ئەنجامە گرنگەکانی شەڕی ناوبراو هەژمارکراوە،[٩٨٦] دواتر دارا کە زانیبوی ئەسکندەر بەدوایەوە، بەرەو ئەوێ لە پێشڕەوی کردندایە، ناوچەکەی جێهێشتبوو و پەنای بردۆتە بەر باکتریا لە ڕۆژهەڵاتی مەملەکەتەکەی، بەو هیوایەی والی

---

[٩٧٩](٣).H.G.WELIS:THE OUTLINE OF HISTORY(NEYORK:WITHOUT DATE),p٢٣٧;

جایمس هنري برستد: العصور القديمة ، ص٣٠٢؛ فرانتس التهايم :زرتشت واسكندر، ترجمهعلی نورزاد، (تهران:١٣٨٢)، ص١٣٠.

[٩٨٠] بۆ زانینی ڕای تری جیاواز بڕوانە: هارولد لمب: الاسكندرالمقدوني، ص٢٣٠-٢٣١؛ادوين اردويچ گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران، ص١١٥-١١٦؛ رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص١١٥-١١٦.

[٩٨١] هرمان بنگسون: يونان و پارسان، ص٣٢٢.

[٩٨٢] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص١١٠.

[٩٨٣] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٨٤.

[٩٨٤]پازرگادا (PASRGADAE): یەکەمین پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بوو ،لەلایەن کۆرشی گەورەوە بەیادی سەرکەوتنی بەسەر ئەستیاکز دوا پادشای میدیدا دروستکراوە و لە دووری (٥٠)میلی باکوری پەرسیپوڵس هەڵکەوتووە . سامي سعيد الأحمد و رضاجواد الهاشمي: تاريخ الشرق الأدنى القديم، ص١٠٠-١٠٢.

[٩٨٥] جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ص٢٣٨.

[٩٨٦] محمود فهمي: تاريخ اليونان، ص١٦٠.

هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات کە بە ڕواڵەت لە نێو پیاوانی دەوڵەتدا، لە بەهێزترینی لایەنگرانی بوون، بیپارێزن، نەخشەی ئەوانیش هێشتنەوەی پاشەکەیان بوو لە مەڵبەندی دەسەڵاتیان، تا لەکاتی پێویست بۆ پێکهاتن لەگەڵ ئەسکەندەر بیکەنە کارتی فشار[987]، یان وەك و تراوە، کە ویستویانە لەسەر کار لای بدەن و شانشین بۆ خۆیان دروست بکەن، بەڵام بە ڕواڵەت و بەشێوەی کاتی وەك پادشا بیهێڵنەوە، تا بەهۆیەوە لە شکۆی ئەوان زیاد بکات[988].

ئەسکەندەر بۆ مەبەستی گەیشتن بەدارا ڕوودەکاتە هەرێمی باکتریا و دواتر دەبیستێ، کە (بەسوز Bessus والی (ساتراب) باکتریا و بارزایتیز Barzaetes والی ئەرخوسیا[989] و نابارزانیس Nabarzanes) فەرماندەی ئەسپ سوارانی ئەخمینی دارایان دەستگیرکردووە، دوای ئەوەی دەزانن، کە ئەسکەندەر بەدوایانەوەیە و لە کۆڵیان نابێتەوە، بەسوس هەڵدەستێ بە کوشتنی و بەجێیدەهێڵن[990]. بە گوتەی مێژوونوسان کاتێ ئەسکەندەر گەیشتە سەر تەرمی دارا بەکەواباڵا پۆشەکەی (عەبا)خۆی پێچایەوە و بەڕێزەوە بۆ لای دایکی ناردەوە لە سوس و لە ڕێوڕەسمێکی شاهانە بەخاك سپێردرا[991]

بە کوژرانی دارا و ڕووخانی دەوڵەتی ئەخمینی، گریکەکان دوالاپەڕەی تەمەنی فەرمانڕەوایەتی کردنیان هەڵدرایەوە، ناوچەکەش چووە قۆناغێکی نوێی مێژوویی، ئەسکەندەریش نازناوی (گەورەی ئاسیا)ی لە خۆی نا وە بوو بە پادشای ئەو شوێنانەی داگیری کردبوون، دەسەڵاتیشی بەسەر ناوچەیەکی بەرفراوانی ئاسیای ناوەند و دووردا سەپاند، لەسەر ئەو بنەمایەش بە مافی خۆی دەزانی وەك(هەڵگەڕاوان) مامەڵەی لەگەڵ بەربەرەکانیکارانی، بکات و هەموو ئەو والیانەی هێشتەوە کە گوێڕایەڵیان بۆی دەبڕی[992] و (بەسوس) دوای کوشتنی دارا، خۆی وەك

---

[987] الاب میتودیوس زهیراتي: الاسكندر الكبير، ص١١٠.

[988] هارڤی بورتر: موسوعة مختصر التاريخ القديم، ص٢٦٩.

[989] بۆ زانینی شوێنەکەی بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١)

[990] بڕوانە: جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ل٢٣٩.

[991] ا.بتري: مدخل إلى تاريخ الاغريق ، ص٥٨؛ رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٢٧٧؛ سيربرسي سايكس: تاريخ ايران، ج١، ص٣٠٢.

[992] مفيد رائف العابد:دراسات في تاريخ الاغريق ،ص١٦١؛بسام العسلي :الاسكندر الكبير المقدوني ،ص٨٤.

پادشـای ئـەخمینی و بـەناوی ئەردەشـیری چـوارەم، ڕاگەیانـد و هەنـدێ ناوچـەی نێـو قەڵـەمڕەوی ئەخمینی دانیان پێدانابوو، لەبەرئەوە لەسەر ئەسکەندەر بوو ڕووبەڕووی دوژمنێکی نـوێ ببێتـەوە و هەموو هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی دووریش بخاتە ژێر دەستی خۆی و ڕاشیگەیاند، کـە جێنـشینی دارایـە لەبەرئـەوە، چـەکی تۆڵەکردنـەوەی دارای هـەڵگرت، بـەڵام تێبـینی ناهـەمواری ئاوهـەوا بەتایبەت باشوری دەریای قەزوین و بڵاوبوونەوەی زنجیرە چیاو توانـستی بەربـەرەکانی کردنـی ئـەو گەلانە و ئارامگرتنیان لەسەر سەختـــی گـــوزەران، لـەپێناو پاراستنـــی سـەربەخۆییدا کـرد، جگە لەوەش ئەو شوێنە ببوو بە پەناگەیەك بۆ گشت نەیارانی حوکمی ئەسکەندەر (لـە مکـدونی و گریکی ئـەخمینی) و هەســـتکردن بـە شــــوێنەواری ئـەو بەربەرەکانیـە تونـدەش بەتایبـەت لـە (مکـندا = سەمـەرقەند[٩٩٣]ی ئێســـتا) دەرکەوت کاتێك شــــارەکەیان گـێڕایەوە دەسـت خۆیـان و تەواوی سەربازانـی سەربازگەی (حامیە) ئەوتیان لەناوبرد، کە دوو هـەزار گـــریکی لـە خـۆی گرتبوو، لەبەرئەوە پێی وابوو دەبێ شـێوازی شەڕکردنـــی لە جۆری ڕێکخراوەییەوە بگـــۆڕێت بـۆ شـەڕی پارتیزانــــی و نەخـشەکەش سەریگـــرت و توانـــــی لـە مـاوەی نێـوان (٣٣٠-٣٢٧پ.ز)دا دەســـتبگرێت بەســـەر گـرنگترین هەرێمـــەکانی ڕۆژهــەڵات و کـۆنترۆڵی زۆربــەی بەشەکانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بکات[٩٩٤].

لە دوای داگیرکردنـی سـغد و باکتریـا لـە ڕۆژهـەڵات و ناوچـەکانی دەوروبـەری، ئەسـکەندەر بـە سوپایەکی زۆری پێکهاتوو لە سەربازانی گریکی و ئاسـیایی ڕووی کـردە هنـد و دەربەنـدەکانی بـڕی و گەیـشتە بـەنجاب (دۆڵـی هنـدوس) و بـە خـوێنی هـەزاران سـەرباز ئـەو لەشکرکێشییەی ئەنجامدا[٩٩٥].

ئەوە دوا قۆناغی لەشکرکێشییەکەی بوو، کە لە (٣٢٧-٣٢٥پ.ز)ی خایاند و هەوڵیدا لە ڕێیەوە ناوچەکانی دۆڵی هندوس داگیر بکات، بۆ ئـەو مەبەسـتەش هێزەکـەی کـردە سێ بـەش و خـۆی سەرکردایەتی بەشێکی بەدەستەوە گرت و هەریەك لە (بریکادیس و هەفستیون) کـردە بەرپرسـی دوو بەشــەکەی تـرو، ئـەرکی هەریەکـە لـەو سـێ بەشـەش گـرتنی بەشـێك لـە دۆڵـی (کـۆفن = Cophen) -یەك لە لقەکانی هنـدوس- بـوو، سـەریش کـەوتن و لـە بـاکوری ڕۆژئـاوای هنـد

---

[٩٩٣] بۆ شوێنی سەمەرقەند بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١).

[٩٩٤] فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارات، ص٢٢٦-٢٢٧.

[٩٩٥] ف. دياكۆف وس.كۆفاليف، الحضارات القديمة، ج٢، ص٣٩٦.

بەیەك گەیشتنەوە، لە شەڕێکی توندوتیژیش لەسەر ڕووباری (هیداسپس Hydaspas)[٩٩٦] لە (٣٢٦پ.ز) لەگەڵ پورووسی پادشای هند ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و پاش پێگەیشتنی زیانێکی زۆر بە سەربازەکانی بەهۆی بەکارهێنانی فیل لەلایەن هیندیەکانەوە، سەرکەوتنی بەدەستهێنا[٩٩٧]. ئەویش دوای ئەنجامدانی چەندین پەلاماری فیلبازانە کە بوروس و سوپاکەی سەرسام کردبوو هەرچەند(پوروس)یش خۆڕاگرییەکی وای نیشاندا کە سەرنجی ئەسکەندەری ڕاکێشا، هەر بۆیەش دوای یەکلایی بوونەوەی شەڕەکە پێشنیاری هاوپەیمانی خستە بەردەم(پوروس) ئەویش ڕازی بوو ئیتر لەوێ بەدواوە بوون بە هاوپەیمانێکی بەهرەمەند لە چاودێری و پارێزگاری[٩٩٨].

بەمشێوەیە ئەسکەندەر ڕووباری( سەیحون و جەیحونی) بڕی و ڕوویکردە هندو بەرەو باشووریش لە سند ڕەت بوو و گەیشتە دۆڵی(کنج)و هەوڵی پێشڕەوی کردنی زیاتریشیدا، بەڵام سوپاکەی بەگوێیان نەکرد[٩٩٩] و لێی هەڵگەڕانەوەو ناچار بە بڕیاردانی گەڕانەوەیان کرد، بۆ ئەم مەبەستەش سوپاکەی کردە دوو بەش، بەشێکی بە زەریای هندیدا بەرەو کەنداوی فارس(عەرەبی) بەڕێکردو بەشەکەی تریش کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد بە وشکانیدا، لەگەڵ ئەوپەڕی نارەحەتی و بێ ئاوی و نانی و ماندوویەتی بەرەو بابل گەڕایەوە[١٠٠٠].

---

[٩٩٦] ڕووبارێکە لەهیند ئێستا پێیدەڵێن دجلام Djelam: بسام العسلي: الاسكندرالكبير المقدوني، ص٨٧، هامش ٥.

[٩٩٧] فوزي مكاوي: تاريخ العالم الاغريقي وحضارته، ص٢٢٧.

[٩٩٨] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص١٦٥-١٦٦؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٨٨-٨٩.

[٩٩٩] سەبارەت بەملنەدانی سوپاکەی وئارەزووی ئەویش بۆ پێشڕەوی کردن بڕوانە: نسطور ماتساس :مذكرات الاسكندر الكبير، ص٧٧-٧٨.

[١٠٠٠] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەنگاوەکانی داگیرکردنی ڕۆژهەلات بڕوانە: اولريش ولكن:اسكندر مقدوني، ص١٩٩- ٢٥٥؛
J.Bory and others: The Cambridge Ancient History Vol. VI, p.٣٨٦-٤١٧;
سيربرسي سايكس: تاريخ ايران، ج١، ص٣٠٢-٣٦٩؛ جەلای ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ل٢٣٩-٢٤٥.

بەمــشێوەیە ئەســکەندەر ڕۆژهــەڵاتی کــۆنی داگیرکــرد و هێزەکــەی گەیــشتە چــین و گــەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهانی لە هەموو مێژوودا پێکهێناودیارترین گۆڕانکاری سیاسی وکارگێڕی لە ناوچە داگیرکراوەکاندا هێنایەگۆڕێ ، کە تامردیش[١٠٠١] تەمەنــی نەگەیــشتبۆ (٣٣)ســاڵ[١٠٠٢] هەرچەند قەدەر نەیهێشت بەگشت ئاواتەکانــی بگــات، بەڵام بــە هــێرشەکەی و لەناوبردنــی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینــی ،جیاکەرەوە (فاصلە)یەکی ســتەرەکی بۆ مــێژووی کۆن و ســەرەتای سەردەمێکــی نوێ پێکهێنا، نــاو و ســــەردەمەکەی بــوون بــە دەســتپێکی ســاڵ پێــوی تــازە و سەرەتای ڕۆژژمــێرێکی کــۆن، کــە لــە کــلتوری عەرەبــیدا بەڕۆژژمــێری ئەســکەندەر یــا(ژی القرنین) ناسراوە[١٠٠٣].

بە یەکەم سەرکردەش دادەنرێت کە هەڵسابێ بە داگیرکردنی زۆرترین بەشی جیهانی زانراوی ئــەو کات –واتە پــێش دۆزینــەوەی ئوســتڕالیاو هــەردوو ئــەمریکا- هــەموو ئیمپراتۆریەتەکەشــی لــە ماوەی چەند ساڵێکدا دروستکرد[١٠٠٤]، کە وەك دەڵێن خۆری لێ ئاوا نەدەبوو[١٠٠٥]، بەپێی یەك لە سەرچاوەکان پانتاییەکەی لەوپەڕی فراوانی گەیشتبۆ یەك ملیۆن و هەشت ســەدو چــل هــەزار کیلۆمــەتری چوارگۆشــە[١٠٠٦]، ئەگەرچــی ئــەو پانتاییــە لــە دواتــر بــوو بــە چــەند دەوڵــەت و دەسەڵاتداریەتی، بەڵام بەهۆی بازرگانی و بڵاوبوونەوەی زمان و بایەخدان بە یاســا و سیــستەمی گریکی، پەیوەندی نێوانیان هەرمایەوە[١٠٠٧].

---

[١٠٠١] لەبارەی مردنی ئەسکەندەر لە شارەزور یان بابل وهۆی مردنەکەشی ڕای جیاوازی هەیە ، هەندێك نەخۆشــی مــەلاریا و هەنــدێك دەرمانــداوکردنی بــەهۆکار دەزانن،بڕوانــە: الطــبري :تــاریخ الطبري،ج٢،ص١٠؛ریڤون گست: مادة الاسكندر، دائرة المعارف الاسلامية،مج٣، ص٣١٩؛
p١٢٦. RICHARD D.GOFF WORLD HISTORY ,VOL.١,

[١٠٠٢] محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج٣، ص١١.

[١٠٠٣] محمــد الــزين: التقــويم الــسلوقي واهميتــه التاريخيــة والحــضارية، دراســات تاريخيــة ، العددان(٨٥-٨٦)، السنة (٢٥)، آذار-حزيران ٢٠٠٤، ص٣٣.

[١٠٠٤] خالد عبداللاه: عظماء ومشاهير صنعوا التاريخ، ص٩٦.

[١٠٠٥] سيد احمد الناصري: قضية التاريخ القديم، ص١٣٥.

[١٠٠٦] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٥).

[١٠٠٧] نيقولا زيادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي العدد٢٢، ص١٩٩.

ئەمە جگە لە هەوڵی داگیرکردنی دوورگەی عەرەبی وکردنی بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەت، تا لەوێوە دەست بگرێت بەسەر ئۆقیانوسی هیندی و بیکاتە زەریایەکی گریکی بەکار بۆ کردنیشی ، بوو بە کۆنترین ئەوانەی لە پەیوەندی گریکی- عەرەبیدا ناوی تۆمارکراوە[1008] ، هەوڵیشیدا بگاتە ئەو شوێنانەی جیهانی ئاوەدان کە داگیر نەکرا بوون خۆیی‌و هاوسەردەمەکانیشی نەیاندەزانی چەندە و تاکوێیە[1009]، لە بیری گرتنی ئەفریقاو ئەوروپای ڕۆژئاواشدا بوو، بۆ ئەومەبەستەش ڕایسپاردبوو، کە کەلوپەلی لەشکرکێشی ئامادەبکرێت[1010]و بەرنامەی گرتنی ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاستیشی دانا، بەلام نەیتوانی ئەوەی بە دووربینی وئایندەزانی، تێیگەیشتبوو بیکاتە ڕاستی، بەلای ئەوەوە یەکخستنی کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست ولکاندنی بە ئیمپراتۆریەتێك کەیەك کەس بەڕێوەی بەرێت لە یەکخستنی ولاتانی پچڕپچڕ و سەربەرگیر لە ڕۆژهەلاتی دوور [1011]. بەلام تەمەنی هەرئەوەندەبوو، کەدەست بگرێت بەسەر ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیداو هێندە نەژیا تابکاریێ ئەودەوڵەتە جیهانیە دروستبکات، کە بە نیازی بوو[1012] مردنیشی لێدانێکی کوشندەی ئەو ئاواتانە بوو کە لە ناخیدا هەڵیگرتبوون، چونکە کەس لە هاوەڵەکانی دارای ئەو خەسلەتانە نەبوو تا ببێتە شایەنی جێگرتنەوەی ئەسکەندەر و هەڵسێ بە جێبەجێکردنی نەخشەکانی، یان هیچ نەبێ ڕێبگرێت لە گەڕانەوەی سروشتی دەوڵەتەکە بۆ سەر شێوەی پارچەپارچەیی سەردەمی پێش فلیپی باوکی[1013].

ئەو کاتێك ڕابورد کە ئیمپراتۆریەتەکەی بەسەر زەوی سێ کیشوەردا درێژبووبۆوە، وەك خۆشی وتبووی بۆ بەهێزترین کەسانی دوای خۆی بەجێهێشت، دەشێ سەرکردە هاوسەفەر و هاوکارەکانی لە دروستکردنی ئەوشکۆمەندیەدا، بڕوایان وابووبێ کە بە تواناو لێهاتوون [1014]بەلام بەڕێوەبردنی ئەو سنوورە بەرفراوانە پێویستی بە کەسێکی وەك خۆی بەهێز هەبوو،

---

(1008) عبدالمنعم الهاشمي : تاريخ العرب العصر الجاهلي، (بيروت:٢٠٠٦)، ص٣٤-٣٥.

(1009) ارنولد توينبي: تاريخ البشرية، ج١، ص٢٠١.

(1010) عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران ، ج١، ص٢٤٥؛
.RICHARD D.GOFF and others :WORLD HISTORY,P١٢٦

(1011) جايمس هنري برستد: العصورالقديمة ، ص٣٠٥.

(1012) ارنولد توينبي: تاريخ البشرية، ج١، ص٢٠١.

(1013) جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٢١٠-٢١١.

(1014) بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٩٣.

بۆیە دوای مردنی ئەو لەبەریەك هەڵوەشا و[1015] ناکۆکی سەریهەڵدا و جیهانی هیلینی توشی نوچدان (نکسە) بوو گەڕایەوە بۆ شێوەی سەردەمی پڕ ئاژاوە و بچوکیی پێش پێکهێنانی یەکێتی کۆرنسەی ساڵی (٣٣٨ پ.ز).[1016] ئەو مرد، بەڵام کارێکی کرد کە کەس پێش ئەو پێی نەکرا، ئەویش کردنەوەی شوێن پێی ڕۆژئاوا بوو لە ڕۆژهەڵاتدا، سەرچڵییەکەشی شوێنی لەسەر سیاسەت و دین و شارستانیەت و هونەر..داناو پەردەی لەسەر چاخێکی نوێ لادا[1017].

(هنری برستد) لەو بارەوە ڕای وایە، (دەگمەنن ئەو بلیمەت(عبقری)انەی شوێنەواری نەمریان لە ڕێڕەوی مرۆڤایەتیدا بەجێهێشتبێ، بە شێوەیەك، کە کات توانای لەناوبردنیانی نەبێ، بەڵام لە تۆڕەمەی ئادەم کەس هەڵنەکەوتووە، کە لەماوەیەکی ئاوا کورتدا بتوانێت کاریگەری نەمر لە کاروباری مرۆڤایەتیدا دروستبکات)[1018].

شایانی باسە پاش مردنی ئەسکەندەر لە(٣٢٣پ.ز) سەرکردەکان لە بابل بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ئیمپراتۆریەت کۆبوونەوە و دوای دامرکاندنەوەی ناکۆکی نێوانیان کە خەریك بوو ببێتە پێکدادانی چەکداری، ڕێکەوتن کە (فلیپ ئەرهیدایوس)ی زڕبرای ئەسکەندەر[1019]، ببێتە پاشاو وڵاتیش بکرێتە بیست و چوار ولایەت، لە هەر یەکێکیاندا سەرکردەیەك وەك والی دەستبەکاربێتو (بریکادس)یش بکرێتە سەرکردەی گشتی و ڕاپەڕێنەری ئیشوکاری ئیمپراتۆریەت، بەڵام نەبوونی جێنشینێکی شایستەو ئەو زڕبرا کەم هۆشەشی، کە وەك پادشا دەستنیشانکرا تائەو کاتەی ڕوکسانەی هاوسەری ئەسکەندەر منداڵی دەبێ، ئەگەر کوڕ بوو بکرێتە پادشا، وایکرد، کە توانستی ڕاستەقینە لە دەست سەرکردەکاندا بێت لەبەرئەوەش، کە هەریەکە لەو سەرکردانە ئاوات و چاو لەدوویی تایبەتیان هەبوو، پێداگریش بوون لەسەر بەدەستهێنانیان و بەرژەوەندیەکانیشیان یەکی نەدەگرتەوە، ئیتر سێ ڕەوتی جیاواز سەریهەڵدا کە (یومنس) گەورەترین لایەنگری یەکەمیان بوو و داوای یەکپارچەیی ئیمپراتۆریەت و مانەوەی بەدەست بنەماڵەی ئەسکەندەر دەکرد، (ئەنتیغونوس و دیمترووسی) کوڕیشی داوای یەکپارچەییان دەکرد، بەڵام لە چوارچێوەی بنەماڵەی

---

[1015] عبدالحكم حسن صالح: التاريخ العالم، ص٥٢.

[1016] ارنولد توينبي: تاريخ البشرية، ج١، ص٢٠١-٢٠٥.

[1017] اندري بارو: بلاد اشور، نينوى وبابل، (بغداد: ١٩٨٠)، ص٢٢١.

[1018] العصور القديمة، ص٣١٠.

[1019] هەردووکیان کوڕی (فلیپ) بوون، بەڵام دایکیان جیابوو.

خۆیانـدا و ڕەوتـــی سێیەمیـــش ویـستـی دابەشبوونـــی وڵاتیـان هـــەبوو، (سلوقــسو بەتلیموس) لە دیاتریـن هـەوادارانی بـوون، لەبەرئـەوەش، کـە دەسـەڵاتـــی پادشایەتـــی وەك مـافێکـــی یاسایـــی بـۆ بنەماڵـەی ئـەسـکەندەر بەشتێکی پـیرۆز مایـەوە، دوو دیـاردە سـەری دەرهێنـا ئەوانـیش" (یەکـەمیان چـاوڕاو و زەمکـاری سیاسـی = المزایدات السیاسیه بـوو) بەتایبـەت لـە نێـوان ڕەوتـی یەکـەمو دووەم کـە نەیانـدەتوانی نیەتـەکانیان دەربخـەن کەوتنـە شـاردنەوەی ململانێکانیان دژی یەکتر، بە دروشمی دڵسۆزی و داکـۆکی کـردن لـە بەرژەوەنـدی پادشایەتی و (دووەمیش دابەشبوونی سـەرکردەکان بـوو بـە گـوێرەی لایـەنگریان بـۆ ژنـەکانی بنەماڵـەی پادشـایەتـــی) کـە بریتـی بـوون لـە(ئولّمپیـاس) دایکـی ئەسـکەندەر و، (یوریدیکســی) نەوەی فلیپـــی دووەمی باوکـــی ئەسکەندەر و هاوسـەری فلیپـی سێیەمی یەکـەم میراتگـــری تـەختو (روکـسانەی) هاوســـەری ئەســکەندەر)، لـەم دیاردەیەشـەوە دیاردەیەکـی تر دەرکەوت، کە خۆی لە بڕوای هەندێك سەرکردەی کێبەرکێکار لەسەر پێویـستی چۆڵکردنی گۆڕەپانی سیاســی لـە هەنـدێك پیـاوان بـۆ بەرژەوەنـدی ئـەوانی تـردا دەبیـنیەوەو لەوەشـــەوە لـەناوبردنی تێکـــڕای ئەنـدامانی بنەماڵـەی پادشایەتـــی هەریەکـە بـەجۆرێك و توندبوونـی ململانـــێی نێوان هەوادارانـی ڕەوتـی یەکـەم و دووەم، پەیـدابوو و وڵات بـەرەو دابەشـبوون ڕۆیـی[1020]، واتـا ئـەو ئیمپـراتۆریەتە بـەر فـــراوانەی ئەســکەندەر دوای شـــەڕی گـۆگامیلا دەرفەتـــی دروستکردنـی بۆ ڕەخسـا، چـاو لـە دوویـی و بـــیری دەســـەڵاتخوازی و لاسـاییکـردنەوەی ئــەوی، لای ســـەرکردەکان دروســـتکرد.

بۆیـەش لـە نێـو خۆیانـدا کەوتنـە کێبـەرکێ لەسـەر دابەشـکردنی دەسـەڵات و هەریەکەشـیان هەوڵیدەدا خۆی وەك جێنشینی یاسایی ئەسکەندەر بسەپێنێ و هەر لە وەشەوە نـاوی(دیـادۆك = خلفـاء = جێنـشین) یـان بەسـەردابڕاو ئـەوەش ململانێـی خوێنـاوی لێکەوتنـەوە، لـە کۆتایـشدا چەندین دەوڵەت لە جەستەی ئیمپراتۆریەت جیابوونەوە کە گەورەترین و بـەناوبانگترینیان بـریتی بوون لە دەوڵەتی سلوکی کە سلوکسی یەکەم(٣١١-٢٨٠پ.ز) دایمەزراند و کە نزیکەی هـەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەسکەندەری دەگرتەوە لە ئاسیا، مەملەکەتی بەتالمە کـە بـە تلیمـوس یەکەم (٣٢٣-٣٨٢) لە میسر دایمەزراند و لەگەڵ شانشینی مەکدونیا، کـە ئەسـکەندەری لێـوە

[1020] لوکـاس دویلـویس وروبـارتوس وان دراسـپك: دیباجـة برجهـان باسـتان، ترجمـة مرتـضی ثاقـب فـر، (تهران:١٣٧٩) ص٢٠٢-٢٠٣؛ بسام العسلي: الاسکندر الکبیر المقدوني، ص٩٣-١٠٤.

هاتبوو، توندترین ململانێش لەسەر ئەو ناوچەیە بوو، چونکە ئەوێ مەڵبەندی سەرەکی و شوێنی ڕەسەنی ئیمپراتۆریەتەکە بوو و بڕواش وابوو، کە ئەوەی دەسەلاّت بەسەر ئەوێ دابگرێت بەهێزترین پێگەی دەبێ و دەبێتە جێنشینی بەکرداری ئەسکەندەر[١٠٢١].

ئەو دوای هاتنی بۆ ڕۆژهەلاّت و پاش کوژرانی دارای سێیەم، لە توانستی خانەدانانی ئێران ترساو بیری ڕیشەکێش کردنیانی کردەوە تا ژینگەیان لێ بەتاڵ بکات و دڵنیابێت لە دابینکردنی سوپاکەی لەو خاکەدا، بەلاّم پێش جێبەجێکردنی ڕاکەی و بۆ مەبەستی ڕاوێژکردن بە ئەرستۆی مامۆستای نامەیەکی نووسی، ئەو لە وەلاّمدا پێی ڕاگەیاندبوو کە واباشە مەملەکەتی ئەخمینی بەسەر خانەدانەکاندا دابەشبکەی و لە بەرزکردنەوەی پلەوپایە و دابەشکردنی تاج و تەخت، یەك لەوانی تر هەڵمەبژێرە، بۆ ئەوەی هەریەکە لەسەر تەختی خۆی هەست بە سەربەخۆیی خۆی بکات، لەبەرئەوەش لە دەسەلاّتدا (ملك) بایی بوونی گەورە هەیە، ئەو سەرەی تاجی لەسەرنرا، ڕازی نابێت سەرانەبدات، یان ملکەچی کەسی تر بێت، پاشان لە ناویاندا دابڕانی توندو ناخۆشی و کوشتار لەسەر دەسەلاّت و شکۆ و سامان زۆری و جیاوازی ڕەگەز... پەیدادەبێ، لەبەر سەرگەرمیشیان بەوە، لە تۆ ڕاناپەڕن و بیر لە ڕابردوو ناکەنەوە، ئەگەر ڕۆیشتی بۆ دوورترین ناوچەش ئەوان یەکتر بە(هەوڵ و هێز و یارمەتیت) دەترسێنن. ئەویش بەپێی ڕاوێژی مامۆستاکەی جولاّیەوە و ئێرانی پارچە پارچە کرد و بەسەر خانەدانەکاندا، کە دواتر نازناوی (ملوك الطوائف) یان بەسەردابڕا، دابەشکرد،[١٠٢٢] ئەمەش تارادەیەك پەیوەندیەکی گونجاوبوو لە بواری سیاسی وکارگێڕیدا.

واتە بە کورتی مەبەستی ئەو لە دابەشکردنی ولاّت بۆ شانشینەکان و دانانی کاوبەدەست و سەرداری ئەخمینی لەسەر هەریەکێکیاندا بۆ ئەوە بوو کە ململانێیان لە نێودا دروست بکات و گریکەکان لە مەترسی ئەوان دووربخاتەوە[١٠٢٣]،لەسەر ئەو بنچینەیەش وتراوە کە ولاّتی گریك

---

(١٠٢١) JON BOARDA N and others : The Oxford Illusttedhistory of Greece and the Helniestic World(London:٢٠٠١), p.٣١١-٣١٢ ؛ اندرو روبرت برون: تاريخ اليونان، ص٤٤٧-٤٥١

(١٠٢٢) ابن الاثير: الكامل في التاريخ، مج١، (القاهرة: ١٩٧٠)، ص٢٢؛ يحيى الخشاب: التقاء الحضارتين العربية و الفارسية، ص٧-٨.

(١٠٢٣) جورج رو: العراق القديم، ص٥٥٢.

پـێش ئەسـکەندەر پەرتـەوازەبوو یـەکخرا دوای شـەڕی گۆگـامیلاش ئیمپراتۆریـەتی ئـەخمینی یەکخرابوو پەرت پەرتکرا[١٠٢٤].

لەبەر هەستکردنی بەگرانی فەرمانڕەوایەتی ئـەو هـەموو گەلـە جیاوازانـە، بـێ ڕاکێشانی دڵـی نەوەکانی[١٠٢٥] و گۆڕانی هەڵوێستی بەرامبەر تەخمینیەکان دوای کـوژرانی دارا و خۆناسـاندنی، وەك پاشای ئەوان[١٠٢٦] وسەرسام بوونی بە هێز وخۆڕازاندنەوە و توانستی پاشاکانیـان، میتـۆدی تاکڕەوی (فردمحـوری) پەسـندکرد و خواسـتی بـەردەوامی ڕەوشـی بـاڵایی دەسەڵاتیـشی، ناچـار بەڕووکردنە لای ڕۆژهەڵاتیان ونواندنی کەم میهری لەگەڵ گریکەکان کرد، چونکە ئـەو هێزخـواز (قــدرت طلــب) و سروشــتێکی ســتەمکاری هــەبوو، ڕووبــەڕووی دەوڵــەتێکی گــەورە و دامودەزگایــەکیش ببــۆوە کەئاســان نــەدەگۆڕا[١٠٢٧]. بــە نیــازیش بــوو ڕۆژهەڵاتیانــە، لــە مامەڵەکردندا مەودایـەك لـەنێوان خـۆیو ژێردەستـەکانیدا - بـەمیرە گەورەکانیـشەوە- دابـنێ، بەهۆی غروری سەرچاوەگرتوشی لە سەرکەوتنی بەسەر ئەو هێزانـەدا کـە بـە ژمـارە لـەهی خـۆی زیاتربوون، مەزەندەی بۆ سوپا و هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان لە دەستدابوو، ویستی ستەمکاریش کـە، بـۆ فـەرمانڕەوای گـەورە خاسـیەتێکی دەگمـەن نیـە، وایلێکردبـوو فەرمانبـەرانی بێـورە وماستاوچی لا پەسندتربن، لـە نـەجیب زادەکـانی گریـك، بەتایبـەت کـە ئـەوان لەسەرکەشـی و ڕقەبەرایەتی سڵیان نەدەکردەوە[١٠٢٨].

ئەوانیش هەستیان پێیدەکرد و سەریان سوڕمابوو لەوەی، کە بەردەوام هەڵسوکەوتی بەرامـبەریان دەگۆڕێ و لـە نـەریتی پادشـایەتی وڵاتـی خۆیـان دووردەکەوێتـەوە و بـەرەو تـاکڕەوی لادەدات و کەوتۆتە ژێـر کاریگـەری دەسـەڵاتی ڕەهـای پادشـایانی ئـەخمینی و وەك یـەك سـەیری سـەرکردە گریکـی و ڕۆژهەڵاتیـەکان دەکـات، لـە کاتێکـدا، کـە ئـەوان بەسـەرکوتکردنی بەربـەرەکانی ڕۆژهەڵاتیان و هەوڵدان بۆ کوشتنی دارا ماندوو ببـوون، بێگومـان ئـەوەش کەڵەکـەبوونی ڕقـی سەرکردە گریکیەکان و بیری پیلانگێڕیانی بەدوای خۆیـدا هێنـاو دەسـتی ئەسکەندەریـشی بـردە

---

[١٠٢٤] ف.دیاکۆف و س.کۆفالیف: الحضارات القدیمة، ج٣، ص٣٩٦.

[١٠٢٥] زوبیر بلال اسماعیل: اربیل في ادوارها التاریخیة ، ج٢، ص٩٩.

[١٠٢٦] طبري: تاریخ الرسول والملوك، ص٧.

[١٠٢٧] رضا شعباني: مرور کوتاه برتاریخ ایران، ص٨٤.

[١٠٢٨] الفرید فن گوتشمید: تاریخ ایران، ص٣٥.

نـاوخوێنی چـەند کـەس لـە نـزیکترین سـەرکردەکانی[1029]، کـە بـریتی بـوون لـە(فیلوتـاس و پارمنیون و کلیتوس و کالستنس) کە ڕۆڵـی هـەرە کارایـان هـەبوو لـە گەیـشتن بـەو مەقامـە، ناپەیدایی چەند ساڵی ئەسـکەندەر بەتایبـەت لـەکاتی خـەریکبوونی بـە لەشکرکێـشی بـۆ سـەر هیندستان و دەنگۆی کوژرانی، کاریگەری خراپـی هـەبوو و بوونیـادی ئیمپراتۆریـەتی سـست و ناپایـەدارکرد، چـەند سـاترابێك، لـە نێویانـدا، (مەکـدونی و پـارس) تـا ڕادەی دروسـتکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ ڕۆیشتن و سەرکردەیەکی گریکیش بەناوی (کلنارخ) لە میـسر ڕێکخراوێکـی دارایی سەربەخۆی دامەزراندو لاڕێیانەش باقی پایەبڵندەکانی گریکیو نـاگریکی بەرکـەنارکرد، (هارپالوس=گارپاڵ)یش کە بەخەزنەداری گشت ئیمپراتۆریەت دەژمێـردرا، پارەیـەکی زۆری نـاو گەنجینەکانی تالانکرد، ئەمانە وایانکرد کە ئەسکەندەر هەنگاوی بنبڕکەر هەڵبێنێ‌وچەند والیو کاربەدەستی بلندپایەی لە سێدارەدا و ژمارەیەکیـشی بەرکـەنار کـردو (هارپـالوس) لـە ترسـی گیانی ڕایکرد و لە(کلنارخ)یش خۆشبوو[1030].

دەکرێ لە دانانی ترس بە جوڵێنەری ئەسکەندەر لە هەڵسان بە کوشتنی ئەو سەرکردانەو دانـانی (همفـستون)ی ئـاژاوەگێڕ و بـێ کەسـایەتی و کـەس چـاکەلێنەدیو لـە بەرامبەریاندا بـە خۆشەویـسترین ونـزیکترین وتـەنها کەسـی دەرگـای سـەڵتەنەت، بەنیـشانەی خـراپ و بـەو شینگێڕیەش کە بۆ مردنی نـاوبراو، بـەدەرکردنی بڕیـاری بـڕینی یـاڵ ودەمـی ئەسـپ وئێـستر و ڕوخانـدنی شـورەی شـاران وقـەتڵوعامکردنی زۆری خـەڵك وسـوتاندنی لاشـەکەی، لـە کۆتەڵـە دارێکـدا کـە بەهاکـەی بـە دوازدە هـەزار تالـنـت مەزەنـدەکراوە لـە پێناوئاسـودەکردنی گیانیدا نیشانیدا و نەخشەی دانانی گۆڕێکی گەورە و قایم وەك هەرەمەکانی میـسر بۆ(فلیپ)ی باوکی و بەکەمزانینی پێشنیاری هەڵکەندنی وێنەیەك بۆ خـۆی، کـە هــەموو قــەدی چـیـای( ئـاتوس) لـە (تراقیـا) دا بگـــرێت ، وەك لادان لـە دەســـتوری گـــریك وجیـــی نیگـەرانی هـەموان [1031]، لـەوەش کـە بـە قـسەی خـۆی لـە ڕابـواردن وناچـارکردنی ڕەعیەتـەکانی بـە گوێڕایەڵی کردنی کوێرانە، بەوەش کە وتویەتی ( مانای گـەورەیی )زۆرجـار وایلێـدەکات بـەرەو

---

[1029] الاب میتودیوس زهیراتي: الاسکندر الکبیر، ص١١٢-١١٣.

[1030] ادوین اریدوبیج گرانتوسکی و دیگران: تاریخ ایران، ص١١٩.

[1031] الفریـد فن گوتـشمند: تـاریخ ایـران، ص٣٦-٣٧؛چـون جـنتر: الاسـکندر الاکبر، ص١٢٥-١٢٦.

تورەیی بڕوات[١٠٣٢] ،ئەنجامێکی تری لەشکرکێشیەکە بەتایبەت دوای سەرکەوتن لە شەڕی گوگامیلا دەستنیشان بکەین، ئەویش ڕا لەخۆیی و بالآدەستبوون و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی تایبەت و گوێنەدانە بە بەرژەوەندی گشتیی، کە بوو بەهۆی تێکدانی سنوورەکانی پەیوەندی و فەرامۆشکردنی ڕابردوو، بوونی هەڵوێستی لەو جۆرەش لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، لاوازی ئینتمای میللەتی بۆ دەوڵەت لێدەکەوێتەوە و تەلی چاوەڕوانیەکانی خەڵکیش لە حوکمڕانان، دەپسێنێ، دەرفەتی لاڕێیکردن و وابەستەنەبوونی میللەت بەپرێنسیپە گشتییەکان، دەرەخسێنێ و... دەشبێتە هۆی شێواندنی زەمینەی تەندروستمانەوەی پایەداری دەسەڵات.

هەروەها ئەسکەندەر لە ئەزموونی سیستەمی دەوڵەتشاری گریکی بۆی دەرکەوتبوو، کە سیستەمێکی وا بواری کێبەرکێکردن ولاوازی دەدات وکاتی جیابوونەوەش کۆتایی پێهاتووە، بۆیە پێویستە ئیمپراتۆریەت هەمووان کۆبکاتەوە و دەیویست هەموو خەڵکی هاونیشتمانی یەك دەوڵەت بن و یەك سیستەمی گوزەرانیان هەبێت، وەك ئەوەی لە زمانی (بلۆتارك)ەوە وتراوە، کە (مرۆڤایەتی هەموو یەك میگەلە و دەبێ لە خاکی هاوبەشدا بژیەت)[١٠٣٣]. ئەو خوازیاربووە ئەورووپا و ئاسیا بکاتە یەك وڵات و باشیەکانیان کۆبکاتەوە[١٠٣٤]، بە واتایەکی دی هەوڵیداوە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا تێکەڵبکات..[١٠٣٥].کەوابێ نیازی پەرتکردنی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی بەپێی ئامۆژگاریەکانی ئەرستۆی مامۆستای، کەپێشتر باسمانکرد، وەك تاکتیکێکی سیاسی هەر بەو مەبەستە بووە، کە لەڕێی لاوازکردن و نانەوەی دووبەرەکی لە نێوانیاندا سەرەتا کۆسپەکانی ڕێی زاڵبوونی خۆی بەسەریاندا کەمبکاتەوە وشەڕی ئەوانەی مل بۆ دەسەڵاتی ئەو نادەن بە هەندێکی تر ببڕێنێتەوە. ئینجا بکەوێتە جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی تری ڕێی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە.

لەو ڕووەشەوە ئەو پرۆسەی فراوانکردنە کە بەنسبەت جیهانی گریك ئەنجامدرا، شوێنەواری سەرەکی بەجێهێشت، کە خۆی لە گۆڕانکاری لە سیستەمی شار دەبینیەوە، بەوەی لەسەر حسابی ئەوان ئیمپراتۆریەتی گەورە دروستکران و زمانی گریك بوو بە زمانی ڕەسمی و سیستەمی

---

[١٠٣٢] نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص٣٢-٣٣.

[١٠٣٣] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي، ص٧١.

[١٠٣٤] الموسوعة العربية العالمية، الاسكندر الاكبر،(رياض :١٩٩٩)، ج٢، ص٢٣.

[١٠٣٥]فليب حتي: موجز تاريخ الشرق الادنى القديم، (بيروت: ١٩٦٥)، ص٩٢.

پادشایەتی لەولایەتەکاندا چەسپا و پادشاکان دەسەڵاتی ڕەهایان هەبوو و پەیڕەوی حوکمی بیروکراسیان دەکرد[١٠٣٦].

لە سەرچاوەیەکیشدا هاتووە کە (ئەسکەندەر تادەهات پێداگری لەسەر یەکگرتنی دوو جیهانی ڕۆژهەڵات ورۆژئاوا پتەوتر دەبوو، هەڵگەڕانەوەی سەربازەکانی هەند و یاخیگەری نزیکترین هاوڕێ سەربازەکانی پادشایان والێکرد، کە لە ڕاییکردنی کاری سیاسی لە دیدی گەیشتن بەو ئامانجە کە بەدوایدا وێڵ بوو، پەلە بکات و ژنخواستنی خۆی و سەربازەکانیشی –کە دواتر باسی دەکەین- هەر لە چوارچێوەی ئەو پەلەکردنەدابوو[١٠٣٧].

لەڕاستیدا ئەو بە پرۆسەی فراوانخوازی خۆی توانیبووی لە بەدیهێنانی ئەو شێوەیە لە ئیمپراتۆریەت نزیك ببێتەوە، بەڵام بۆ دابین بوون و گرەنتی بەرقەرارمانەوە و تەواوکردنی –کە بۆی لە تێکۆشاندا بوو- هەر بەتەنها داگیرکردن بەسنەبوو. بۆیە دەشێ بڵێین لەهەر گۆڕانکارییەکی نەخشە بۆ کێشراو لە بوارە جیاجیاکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری ...هتد، دا لە پشتی یاریکردنی ڕۆڵی سەرەکی و دروستی خۆی، کە گۆڕانکارییەکانی بۆ ئەنجامدراوە، پاڵنەرێکی سیاسیش هەبووە و ئەگەرچی لە میانەی ئەنجامی (سیاسی)یش ئاماژەی پێ نەکرابێ.

یەکێکی تر لەو بەرەنجامانەی لە دوای شەڕی گۆگامیلادا لەسەر ئاستی سوپاکەوتنەوە، گونجاندنی بوو بەگوێرەی پێداویستی هەلومەرجی نوێ، ئەویش کاتێك کە ئەسکەندەر هەستیکرد، کە واچاکە باری چەکدارانی سوك بکات، چونکە تێکهەڵچوونەکان سروشتی خێرایی و ڕاونانیان وەردەگرت، بۆیە بە پێویستی زانی کە بە پێی ئاڵۆزی و سەختی گۆڕەپانەکانی شەڕ(فەیلەقەکان) بکرێنە(سریة)و چەکەکانیشیان سوك بکرێن، تا توانستی فراوانتری جوڵەیان پێ ببەخشێ و یەکەمین گۆڕانکاریشی لە ساڵی(٣٣١پ.ز) ئەنجامدا، کاتێك کە بۆ یەکەجار لە سوسی پایتەختی کارگێڕی دەوڵەتی ئەخمینی لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشت، یەکەم وەجبەی سوپا لە ڕێی یەکێك لە سەرکردەکانەوە پێگەیشت کە لە(١٥)هەزار چەکداری سوارە و پیادەی گریکی پێکهاتبوو - واتا بەوەندە سوپایە وازی نەهێنا کە لەگەڵیدابوو،- بەڵام گۆڕانکاری هەرە گەورە و ڕیشەیی لە ساڵی(٣٢٩)بوو کە لە سنوری

---

[١٠٣٦] H.D. AMOS and A.G.p. lang :THES WERE THE GREEKS, p.١٩٠.

[١٠٣٧] رمان گيرشمن: تاريخ از اغاز تا اسلام، ص٢٧٩.

دابەشکردندا نەمایەوە و تیپەری بۆ پەیکەر و پێکهاتەی سوپا ئەویش بەهۆی شێوازی شەڕی پارتیزانی کە لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات تووشی بوون، کاتێك ئەو پەلە سەربازیانەی(سرية) لە سوس پێکیهێنابوون، دابەشکرد بۆ یەکەی بچوکتر و ئەوەنددەش کە توانی بە سوارە پشت قایمی کردن، ئەو چەکە ئەخمینیانەشی دەست خستن کە بەگونجاو لەگەڵ شێوازی شەڕی نوێی بەسەرداداان و پاشەکشەکردن (کروفر)ی دەزانین، لەگەڵ هەموو یەکەیەکیش ژمارەیەك ڕم هاوێژو تیرهاوێژی- بێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەزیان-، ئامادەکرد بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست، وەك تیپی(فرقة)ی سەربەخۆ لە باقی تیپەکانی تر، هەڵسن بە بەرپەرچدانەوە و پەلامار و ڕاوەدوونانی خێرا، کە مەکدونیەکان لەبەر ناشیبوونیان لە سەرەتادا زیانی زۆریان لێکەوت، بەڵام دواتر فێربوون و باشتریشیان کردو بەهۆی ئەو شێوازەش توانیان سەرکەوتنی باش بەدی بهێنن، لەوەشدا زۆری سەربازانی سغدی و باکتری، کە تیپێکی یەدەگی بۆ سوپاکەی لێ پێکهێنابوون، لەگەڵ دەستخستنی ئەسپی هەرێمەکە کە لەگەڵ ژینگەکە و ئەو جۆرە شەڕانە ڕاهاتبوون، یارمەتیدەری بوون[١٠٣٨].

لە سوپای ئەسکەندەر دەستەیەك هەبوو کە پێکهاتبوو لە نهێنی پارێز(امانة السر)، پاراستن(المحفوظات)، ڕۆژانە (اليوميات)، نەخشەسازی پرۆژەکان(المخططات والمشاريع) زەوی پێو(المساح)، دەزگای لێکۆڵینەوەی جوگرافی و مێژوویی(مصلحه الجغرافيه والتاريخ) لەگەڵیشیاندا پسپۆڕ و زانایان بۆ لێکۆڵینەوە و پشکنین هەبوو[١٠٣٩].

هەروەها ئەو پێی وابوو کە بۆئەوەی سوپا تێکڕا لە گریکیەکان پێك نەیەت و لەگەڵ ڕۆژهەڵاتیەکان تێکەڵی یەکتربن و لەیەك نزیك ببنەوە، پێویستە لە ڕوانگەی سیاسیەوە، نوێکاری تێدا ئەنجام بدات، بۆ ئەومەبەستەش دە هەزار جەنگاوەری بە ئەزموونی گریکی بەرکەنار کرد و کەسانی ڕۆژهەڵاتی لە شوێن دانان و بڕیاریشیدا کە سێ هەزار منداڵی ئێرانیش بێنێتە ناو بەشە جۆر بەجۆرەکانی سوپا، تا فێری هونەری جەنگی بن[١٠٤٠].

---

[١٠٣٨] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص٩٧-٩٨.

[١٠٣٩] جمعة عبدالله: ارض كردستان... بداية الصراع بين الشرق والغرب، مجلة سردم العربي، العدد(١٩)، السنة الرابعة، ٢٠٠٨، ص٦٠.

[١٠٤٠] حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل از اسلام، ص١٤٤.

لـە سەرچـاوەی تریـشدا هـاتووە کـە لـە سـاڵی(٣٢٤پ.ز) نزیکـەی(٣٠)هـەزار گـەنج لەلایـەن فەرمانڕەواکانی ڕۆژهەڵات دیاریکران تا لەسەر مەشق و ڕۆشنبیری گریك ڕابهێنرێن، هاتنـە نـاو سوپای گریك و سەرکەوتنیش لە ئەزموونی پێگەیاندنیان ئەسـکەندەری دڵخۆشـکرد[١٠٤١]. ئـەو گەنجانـە بـە(ئـەپیگونوی) نـاودەبران و ئامـانج لـە هێنانیـان ئاوێتـەکردنی ڕەگـەزی(گریکـی- ڕۆژهـەڵاتی)و پێکهێنـانی یـەك نەتـەوەی نـوێ بـوو لێیـان ئـەویش بـە مەبەسـتی بـەهێزکردنی ئیمپراتۆریەتی نوێ و بەردەوامبوونی، هەمووشیانی بە چـەکی مـەکدونی و لـە ژێـر سیـستەم و بەرنامەی ئەوانیش، لە نێو بەش و لقـەکانی ئـوردودا ڕێکخـست، تەنانـەت چـوونە نـاو دەسـتەی سوارانی هەڵبژاردەش کە ئەمە نارەزایی خانەدانەکانی مەکـدونی بـەدوای خۆیـدا هێنـا کـە لـەو بەشەدا بوون[١٠٤٢].

ئەســـکەندەر بە پەیڕەوکردنـــی ئەو سیاسەتەی ڕۆژ بـە ڕۆژ ژمـارەی خزمەتگوزارانـی ئێرانـی و ڕۆژهەلاتـی لـە سـوپاکەدا زیادیـان دەکـرد. تـا ئـەو ڕادەیـەی کـە گەیـشتە (سـند) تـەنها ٣/٤ سەربازەکانی مـەکدونی بوون[١٠٤٣]. بەمشـێوەیەش سـوپاکەی بەرەبەرە ڕەگەزی بیانـی دەهاتـە پاڵو بە ڕۆژهەلاتی دەبوو، هەرچەندە فەرماندەکانیان هەر لە ژێر چاودێری توندی گـریکەکاندا دەمانەوە، ئەو سـوپاکەی کردبوو بەچەند یەکەیـەك کـە تیایـدا خانـەدانانی گریکـی و میـدی و ئەخمینـی لەپاڵ یەکدا ڕێکخرابوون و لە نێو شـانزە ڕیزی هەریەکەیەك (ڤالانکس)ێکدا، ڕیـزی یەکەم و شـانزەهەم لە گـریکەکان و دوانزە ڕیزەکەی تریـش ئاسیایـی تـەیارکرا و بەچـەکی سـوك بوون، هەموو ئەو ڕەفـتارانەش دوودڵـیان بـۆ گـریك و مەکدونـیەکان دروسـتکردو لەلای ئەوان زیاتـر وەك پادشـایەکـی ڕۆژهەلاتـی دەردەکەوت[١٠٤٤].

بڕیاردانیشی بە ناردنەوەی سەربازە بەتەمەنەکان لە(٣٢٤پ.ز) بۆ وڵاتـی خۆیـان ئـەو گومانـەی لەلای ئەوان سەلماند، پێیان وابوو کە دەیەوێ وردە وردە لـە کـۆڵ خۆیـان بکاتـەوە، گواسـتنەوەی ناوەنـدی ئیمپراتۆریـەتیش بـۆ ئاسـیاو لەگـەڵ سیاسـەتی گیـانی ئـاودرا و بـە سـۆزی بەرامبـەر

---

[١٠٤١] چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص١٢٤؛ بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٩٠؛ ابواليزيد علي المتيت: تطور الفكر السياسي، ص٢٤.

[١٠٤٢] الفريد فن گوتشميد: تاريخ ايران ، ص٣١.

[١٠٤٣] مرتضى راوندى: تاريخ اجتماعي ايران، ج١، ص٥٨٨.

[١٠٤٤] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٩٠.

ئاسیاییەکان دەهاتەوە، ئەوەش کە بوو بە یارمەتیدەری ئەو دڵنیایی بوونەیان، گرنگیدانی زۆر و پەرۆشی بوو، بۆ دروستکردنی شاری نوێ و نشینگەی سەربازان لە هەموو لایەکی ئیمپراتۆریەت، کە دەکرا بەهۆیانەوە سیاسەتی تێکەڵکردن و یەکسانی بچەسپێنێ، کە ئەسکەندەر مەبەستی بوو و کاریشی بۆ دەکرد، بەڵام خۆ بەگەورە زانانی هاوڕێی پێ ڕازی نەکراو هەموویان بەنهێنی و هەندێ جار بە ئاشکرا ڕەتیانکردەوە، لەبەرئەوە جگە لە پاسەوانەکان و تیپی ڕۆژهەڵاتیەکان، هەموو سەربازەکان وروژان و داوای گەڕانەوەیان کرد، ئەمەش تورەبوونی ئەسکەندەر و گرتن و لەناوبردنی ڕێبەرانی ئەو کێشەیەی بەدواداهات پاش پێشکەشکردنی وتارێکیش بەردانی سوپا(تسریح الجیش) ڕاگەیاند و دوای دوو ڕۆژیش داوای لە فەرمانڕەوا ئەخمینیەکان کرد که یارمەتی بدەن لە دروستکردنی سوپایەکی ڕۆژهەڵاتی (بەناو و ڕاهێنانی)مەکدونی، ئەو هەڵسوکەوتە و وتارەکەشی کاری لە سەربازەکان کردو وایکرد بگەڕێنەوە و داوای لێخۆشبوون بکەن و دوای پێداگری زۆریان ئەسکەندەریان چاکردەوە و بەو مەبستەش ئاهەنگێکی سازکرد و لەگەڵیان پێکهاتەوە[١٠٤٥].

هاوسەرگیری سیاسیش یەك لەو شێوازانە بوو کە ئەسکەندەر و هەندێك لە یارانی پەنایان بۆ بردووە، بۆ خۆی یەکەمجار (روکسانەی )کچی (ئوکسارتسی) فەرمانڕەوای سوگد(سغد)ی وەك هەوڵێك بۆ نزیکبوونەوە لێیان خواست، ئەویش پاش بەخۆداچوونەوە و هەستکردن بە مامەڵەی توندوتیژ و هەڵسوکەوتی دڕندانە لەگەڵیان لە کاتی ژێردەستکردنیاندا، بەمەبەستی نیشاندانی ڕێز بەرامبەر ڕەگەزی(ئەخمینی) بەتایبەت و قایلکردنی میرەکانی ڕۆژهەڵات و دانانی سنوورێك بۆ شەڕ بە گشتی، بەم کارەشی بەدحاڵیبوونێکی بۆ گریکەکان بەدوای خۆیدا هێنا،[١٠٤٦] ئاهەنگی هاوسەرگیریەکەش بە گوێرەی نەریتی ناوچەکە ئەنجامدرا[١٠٤٧] ، دواتر ستاتیرای کچی دارا و بارساتیسی کچی ئەردەشێری سێیەمی خواست[١٠٤٨]. وتراوە کە ئەسکەندەر هەردووکیانی لە یەك ڕۆژدا گواستۆتەوە و بەم کارەشی –لە بیری خۆیدا- خۆی بە هەردوو باڵی

---

[١٠٤٥] مفيد رائف العابد: دراسات في تاريخ الاغريق، ص٦٧-٦٨.

[١٠٤٦] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص٨٥.

[١٠٤٧] فرانتس التهايم: زرتشت واسكندر، ص١٠٩؛ هرمان بنگسون، يونان وپارسان، ص٣٢٥.

[١٠٤٨] ميخائيل ميخائيلوويچ دياكونوف: تاريخ ايران باستان، (تهران:١٣٨٤)، ص١٦٨.

بنەماڵەی پادشایەتییەوە، بەستۆتەوە، کە کێبەرکێی دەسەڵات وەرگرتنیان لە نێواندا بووە[١٠٤٩]،
ناچارکردنی هەندێك لە ئەفسەرەکان و هاندانی سەربازەکانی تریش بۆ لاسایی کردنەوەی، دەچێتە چوارچێوەی هاوسەرگیری سیاسی و زۆر لە نووسەرانیش بەمشێوەیە لێی دەڕوانن، لەو بوارەوە لە سەرچاوەیەکدا هاتووە کە ئەسکەندەر بەوکارەی مەبەستی نیشاندانی نموونەیەکی باڵای جوامێری نەبووە، بەڵکو مەبەستێکی سیاسی هەبووە و پەندیش لە مێژوو بە ئەنجامەکانییەوە پەیوەستە نەك بە نیشانەکانی ....کە لێکۆڵەرەوانی بواری دەروونی ئیشی تێدادەکەن، ئەو زانیویەتی کە سوپای ئەو ئەوەندە نیە کە بەهۆیەوە بتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ دەست بەسەر ئەو وڵاتانەدا هەر لە ئاسیای بچووکەوە، تاهند، بگرێت، لەبەرئەوە باشترین ڕێگا بۆ باڵادەستی گریك، لەجێی دەست بەسەرداگرتن و هێز، پێکهاتن و هاوسەرگیرییە[١٠٥٠].
(ویل دیورانت)یش ژنهێنانەکانی بەتەنها ئامرازێك لە ئامرازەکانی فەرمانڕەوایەتی دەزانێت و پێی وایە کاتێك ئەسکەندەر خۆی لەناو ئەم میللەتەدا بینیوەتەوە ، تێگەیشتووە کە ئەو گەلەی پەلاماریانداوە لەخۆیان پێکشەوتووتر و شارستانی ترن، لەبەرئەوە بیری هاوسەرگیری بەخەیاڵدا هاتووە، کە یەکەمجار خۆی ئەنجامیداوە و داواشی لە سەربازەکانی کردووە لاسایی بکەنەوەو بە هەزارانیش بەگوێیان کرد[١٠٥١].
سەرچاوەیەکیش ئاماژەی بەوە کردووە، کە (هاندانی هاوسەرگیری لەگەڵ ڕۆژهەڵاتیان و ئەنجامدانی ڕێ و ڕەسمیش بۆی، دیمەن(مشهد)ێکی هێما ئاسایە و جگە لە کارێك کە هیوایەکی سیاسی ئاراستەی کردووە، هیچیتر نیە[١٠٥٢]. لای نووسەرێکی تریش ئەو ئاهەنگی هاوسەرگیریە جگە لە ئامرازی نزیکبوونەوەی گەلان لە یەکتری، بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگی وردی نێوان مەبەستی ئاشتی و ئامانجی شەڕ، شتێکی تری لێناخوێندرێتەوە[١٠٥٣].

---

[١٠٤٩] چون جنتر: الاسكندر الاكبر، ص١٢٣.

[١٠٥٠] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، (الاسكندرية:دت)،ج١، ص١٧٥.

[١٠٥١] ابطال من التاريخ، ص١٣٠-١٣١.

[١٠٥٢] سير هارولد ادريس بل: الهلينية في مصر، ص٤٨.

[١٠٥٣] بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص١١٤.

لەم پرۆسەی هاوسەرگیرییە سیاسیە هەندێك سەرکردەی ڕۆژهەلاتیش سوودیان بینی و لە داوێنیشیدا ئارامی ناوچەکانی خۆیانیان پاراست، لە نێویاندا (ئەترۆپات)ی والی(ساترابی )مادی بچوك کە ژیرانە و وەك بیرکردنەوەش لە داهاتووی سیاسی خۆی کچی دایە (بریکادیس)[1054] و ئەو خزمایەتیەش بەکەڵکی هات، چونکە ئەو لەلایەن ئەسکەندەرەوە لە جێی (ئۆکسادات )ناوێك کرا بەوالی میدیای بچوك، چونکە (ئۆکسادات)-کە بە گومانی لایەنگری ئەسکەندەر لەلایەن داراوە زیندانی کرابوو هەر لەبەرئەو هەڵوێستەش کرا بەفەرمانڕەوا-لە ئاستی جێبەجێکردنی ویستەکانی ئەسکەندەردا نەبوو ئەترۆپات، چونکە ئەسکەندەری دڵنیاکرد ، کە لەوالی پێشوو دڵسۆزتر بێت و باشتر فەرمانەکان جێبەجێ بکات، بۆ سەلماندنی نیەت پاکیشی نەیارێکی ئیمپراتۆری بەناوی ( باریاکس BARIAKS)، کە نازناوی پادشای میدیاوئەخمینی لەخۆی نابوو ،بەدەستەوەدا ، جگە لەوە کاتێك ئەسکەندەر لە لەشکرکێشی بەرەو هیندستان گەڕایەوەو سەرقاڵی سزادان و قەلاچۆکردنی فەرمانبەرو ساترابە یاخیبوەکانی بوو لە ئەترۆپات قایل بوو، ماوەیەك لای خۆی هێشتەوە و ئیتر ئەویش خۆی لەگەڵدا ڕێکخست وهاتوچۆی دەکرد و بەشداری هەندێك جەژن و بۆنەکانیشی دەکرد و لە تەنیشت ئیمپراتۆر ڕادەوەستا بە کردەوەی سەیر، سەرنجی ئەوی کێش دەکرد و کردی بە والی دواتریش کە کچەکەی خۆیدایە (بریکادس) زیاتر شوێنی خۆی کردەوە، بۆیە لە دوای مردنی ئەسکەندەر لە کۆنگرەی بابلی ساڵی٣٢٤پ.ز ی نەفسەرە پایە بڵندەکانی ئەسکەندەر کە (پیتۆن) ناوێك کرا بە ساترابی مادی گەورە، کە بەگرنگترین ویلایەتەکانی ئێران دادەنرا، ئەترۆپات لەبەر نزیکی لە بریکادسی زاوای بەیەك لە بالادەسترین فەرمانڕەواکانی ولات دەژمێررا لەگەڵ ئۆکساتی خەزوری ئەسکەندەر لەو کەسایەتیانە بوون کە لە پلەوپایەکانی خۆیاندامانەوە، لەبەرئەوەش کە ئەترۆپات تێکەڵی شەڕی میراتگرانی ئەسکەندەر نەبوو سەربەخۆیی خۆی پاراست، دوای مردنی زاواکەشی کە سەردارەکانی ئەسکەندەر سەرلەنوێ ساترابەکانیان دابەشکردەوە میدیای بچوك بەر ئەو دابەشکردنە نەکەوت ئەوەش مانای وایە وەك

---

[1054] یەکێك بوو لە فەرماندەکانی ئەسکەندەر ولە دوای مردنیشی بوو بە سەرکردەی گشتی سوپا وچاودێر بەسەر کاروبارەکانی ئیمپراتۆریەتدا لە ساڵی ٣٢١پ.ز کوژرا: نفس المرجع، ص٩٣.

دەوڵەتێکی سەربەخۆ سەیرکراوە، لەم کاتەش بەدواوە میدیای بچوك، کە بە(ئەترۆپاتین)[1055] ناوزەندکرا دەبێتە یەکەمین دەوڵەتی ڕۆژهەلاتی کە سەربەخۆیی خۆی بەهۆی والیەکەیەوە لە داگیرکاری گریکەکان پاراست[1056].

ئەسکەندەر دوای گەڕانەوەی بۆ بابل پاش لەشکرکێشیەکەی بۆ ڕۆژهەڵات، کە زەینی پڕبوو لە پرۆژەی گەورە، بڕیاریدا کە بابل لە میسوپوتامیا و ئەسکەندەریە لە میسر بکاتە دوانە پایتەختی ئیمپراتۆریەتەکەی، بیری پێکەوە بەستنەوەیانی لە ڕێی دەریاوە بە دەوری نیوە دوورگەی عەرەبیدا کردەوە، کە نەخشەی بۆ داگیرکردنی لەنزیك وەختدا، بۆ کێشابوو[1057]. ئەوەش دەستبردن بوو بۆ دانانی نەخشەیەکی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و هەرێمەکانی ژێردەسەلاتی و دەیەویست ئەسکەندەریە بکاتە مەڵبەندی بەڕێوەبردنی بەشی ڕۆژئاوا و بابلیش ناوەندی بەڕێوەبردنی بەشی ڕۆژهەلاتی ئیمپراتۆریەتەکەی بێ[1058].

دانانی بابل بە پایتەخت و هەژمارکردنی وەك سەنتەری ئیمپراتۆریەت، لەبەرئەوە بوو کە هەم بۆ پەیوەندی نێوان تێکڕای بەشەکانی جیهان گونجابوو هەم ئەو کارە لەگەڵ ڕێساو ڕەسمی ئەو

---

[1055] بەڕای یەك لە مێژوونوسان سنووری ئەترۆپاتین لە باشوری ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ تا سەر چۆمی ئاراس ولەوێشەوە تا دەریاچەی قەزوین وئینجا بە قەزوین وزەنگانـدا ڕووە و هەمەدان(ئەکباتانا)لەوێشەوە بۆ ئەردەلان، خاکی کوردستان و کەمێك لە خاکی سۆران وبابان تا دەگەیشتە کێوەکانی هەکاریش لە سەرەوە-بە گوزارشی نوێ -گرتۆتەوە وپایتەختەکەشی شاری پەرسیپەبوو ئەو توێژەرە ئاماژە بەوەش دەکات کەلە دەورەی سلوکیدا هەندێك لە کوردەکان ڕاستەوڕاست بوونە پاشای تیرەکان واتا (ملوك الطوائف)هەرناوچەیەك لە ژێردەستی میرێکی خۆجێییدا بووە، بەمشێوەیە لە کێوی زاگرۆس سێ حکومەت ولە ئەترۆپاتینیش حکومەتیان هەبووە ،کە پەشێویش کەوتە ناوسلوکیەکان هەریەك لە ئەترۆپاتین وکاردۆخی وسرتی لە دەوڵەتی سلوکی جیابوونەتەوە و لە ماوەی حوکمڕانی جێنشینانی ئەسکەندەر، کە مەملەکەتەکەیان لە نێوخۆیاندا دابەشکرد، ئەترۆپاتین بەسەربەخۆیی ماوەتەوەو میرنشینی تریش لە ئارادابوون: حوسێن حوزنی موکریانی: کوردستانی موکریان یا ئەترۆپاتین، (ڕەواندز:١٩٣٨)، ل٨٥-٨٨.

[1056] بڕوانە:

STRABO:THE GEOGRAPHY ,BOO .V,p٣٠٣ ؛ ئی.م.دیاکانۆف: میدیا ،ل٦٠٤- ٦١٧ .

[1057] نسطور ماتساس :مذكرات الاسكندر الكبير ،ص١١٨؛جورج رو: العراق القديم، ص٥٥٣.

[1058] عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم ، ج١، ص٢٦٦.

بنەماڵانە دەهاتەوە، کە پێشتر حوکمی ئەو ناوچەیەیان کردبوو[1059]، لەلایەك و لەلایەکی تریشە وە دەیویست ئەو سەروەری و ڕۆڵەی بۆ بگێڕێتەوە کەپێش کەوتنی بەدەست ئەخمینیەکان لە(539پ.ز) هەیبوو . بەلایەوە باشتر لە هەر شارێکی دی ، ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای قەڵەمڕەوەکەی بەیەکتریەوە دەبەستەوە، هەر لەبەرئەوەش بوو کە لەسەردەمی جێنشینەکانیدا بوو بە بۆتەی تێکەلاوبوونی ژیانی گریکی و ڕۆژهەلاتیان[1060].

جموجۆڵی ئەو تەنها کۆچێك یان داگیرکارییەکی بێ ئەنجامی ناچەسپاو نەبوو، بەڵکو بزاوتێکی ئیستعماری ڕوون بوو، بریندار و پێکراوەکانی لەوێستە دابینکراوەکانی سەر ڕێگا جێدەهێشت و دەیکردنە کشتیار و جێگیری دەکردن، هۆزەکانیشی دوای بەسەردا سەرکەوتنیان لە شوێنی دیاریکراو بە زۆر نیشتەجێدەکرد ،پیاوێکی دەوڵەتی و پادشایەکی دەسەلات ڕەهاش بوو و تەواوی کاروبارەکانیش بە ئیرادەی ئەو، ئەنجامدەدران، بەلام یەك ئەنجومەنی ڕاوێژکاری لە گەورەپیاوان و کسانی بە ئەزموونی دەوروبەری خۆی پێکهێنابوو کە دیدو بۆچوونی خۆیان لە کارەکاندا دەردەخست[1061] . کەچی یەك لە مێژوونووسان پێی وایە کە ئەوە، پێش هاتنە ئێران کاری پێدەکرا، بەلام دوای هاتنی بۆ ئەو ناوچەیە زانیویەتی، کە ناشێ لێرە وەها کارێك پەیڕەو بکرێت، چونکە ڕەفتاری مەکدونیەکان و ڕۆژهەلات زۆر لەیەك جیاواز بوو، چاوپۆشین لە جیاوازی نێوان گریك و ئێرانیە بێگانەکان، دەبوو بەهۆی بێزاری خەلکی ناوچەکە لەبەرئەوە ڕێکخستنی ئەوانی لەبەرچاو گرت[1062].

ئەسکەندەر بەپێی ڕێوڕەسم و دەستوری ناوچەکان لە هەموو جێگایەك خودان یەك پایەو هەڵوێست وپێگە نەبوو ، لە مەکدونیا وەك فلیپ و پادشاکانی پێشین، پادشاو سەرکردەی سوپا بوو و بۆ گریکەکانیش، سەرکردەی یەکێتی کۆرنسە بوو و بە گوێرەی گەلالەنامەی یەکێتیەکەش ئەرکەکانی بەتۆڵەسەندنەوە و ڕووخانی دەوڵەتی ئەخمینی کۆتایی دەهات، لە ئاسیاش خۆی بە دەسەلاتداری ڕەهاو جێنشینی یاسایی پادشایانی ئەخمینی دەزانی، هەرچەندە

---

[1059] الفريد فن گوتشميد: تاريخ ايران ، ص28.

[1060] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج1، ص252.

[1061] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج1، ص 420؛ جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص69

[1062] حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل از اسلام ، ص141.

حوکمڕانی ئاسیاش لە هەموو شوێنێك وەك یەك نەبوو بۆ نموونە لە میسر فیرعەون و پایەی خوایی هەبوو کەچی لە بابل وەك کۆرش و دارا حاکمی شاربوو، بەڵام خودا نەبوو، وەك والی چاودێری پادشاکانی فینیقیەو قوبرسی، دەکرد... ئەو جۆرە دابەشکاریەش لە ئیمپراتۆریەت تا مردنی هەرمایەوە و هیچ ڕێکخستنێکی یاسایی تازەی بۆ بەڕێوەبردنی گشتی بەدینەهێنا و هەروەك شای مەکدونیە مایەوە و سەرکردایەتی یەکێتی کورنسە و سەڵتەنەتی ئاسیاشی بە پەیوەندی تایبەتەوە پەیوەستکرد، کەسایەتی ئەویش مەرجی یەکێتی گشت ئەو ئیمپراتۆریەتە جیهانیە بوو[١٠٦٣].

ئەسکەندەر باش دەیزانی کە پایەدار مانەوەی تواناکەی لەسەر خەڵکی ئەو خاکە بەرفراوانە کە خودانی باوەڕ و سروشتی جۆراوجۆر بوون، تەنها بەهۆی چەکەوە مەیسەر نابێ بۆیە کۆششی کرد تا پاڵپشتی کۆمەڵایەتی لە نێو خەڵك پەیدابکات و فراوانی بکات، بۆیەش هەوڵی جۆراوجۆری دا تاڕابەر و خانەدانانی ناوچەکان بۆ لای خۆی کێش بکات. ئەو ناچاربوو چاودێری کردنی کاروباری خەڵکی ولایەتەکان، کە بەدەست کاربەدەستە ئەخمینیەکانەوە بوو هەروەکو خۆی بهێڵێتەوە، دەیەویست ئەخمینیەکان و مەکدونیەکان (بەتایبەت خانەدانانی ئەو دوو میللەتە) یەك پێبگرێت و حکومەتێك دروست بکات، کە مەکۆی ئاسوودەیی بۆ هێزنواندن و چەکی سەرکەوتووانە بێ بۆ ستەمکاری، بەهۆیەوە فەرمانڕەوایەتی بەشەکانی تری ئیمپراتۆریەت بکات، بەڵام ئەو ئامانج و ئامرازەی کە ئەو بۆ بەرەو پێشبردنی مەبەستەکەی هەڵیبژارد لە خەیاڵی خاو زیاتر نەبوو، چونکە مەرجی دیاریکراو (عەینی) بۆ بەدیهێنانی ئەو جۆرە بنکەیە نەبوو[١٠٦٤].

ئەو تەنانەت بۆ دەروازەی چادرگاکەشی پشتی بە پاسەوانی ئەخمینی بەستبوو، دواتر بەڕێوەبردنی دیوانەکانی زیادکرد و بەشێکی بۆ کاروباری گریکەکان و یەکێکیش بۆ ولاتە داگیرکراوەکان تەرخانکرد[١٠٦٥]، وەك جەختکردنەوەش لەسەر ئەو زانیاریە لە سەرچاوەی تر هاتووە، (ئەسکەندەر دوای هاتنی بۆ وڵاتی ئێران -ڕەنگە مەبەست ئەو ناوچەیە بێت کە لە ژێر دەستی ئەخمینیدا بووە- بۆی دەرکەوت کە بەڕێوەبردنی وڵاتێکی وەها فراوان بە تەنها بە دەستی

---

[١٠٦٣] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: اولرش ویلکن: اسکندر مقدونی، ص٣٠٣-٣٠٤.

[١٠٦٤] ادوین آریدو ویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران ، ص١٢٢-١٢٣.

[١٠٦٥] الاب میتودیوس زهیراتی: الاسکندر الکبیر، ص١١٢.

مەکدونیەکان، کارێکی ئاسان نیە و ناکرێ بۆیە دەبوو هەرچی زوترە پایەی شیاو بداتە کەسانی شایستەی ناوچەکە و بۆ ئەنجامدانی ئەو نەخشەیەش سەرەڕای نارەزایی هاونیشتمانانی، بە کردار هەنگاوی نا، فەرمانبەری بەڕێوەبردن و زۆر لە شارەوانانی لە شوێنی خۆی هێشتەوە و توێژی لاوانی بەلای خۆیدا، ڕاکێشاو جگە لە بڕیاری فێرکردنی بەشێك لە گەنجان - کە باسمانکرد- بەڵێنی پێدان کە ئەگەر لەگەڵیدا، دڵسۆزانە هاوکاری بکەن، لە شانازیەکانی ئایندە لەگەڵ گریکەکان(مکدونیەکان)دا بەشدار دەبن، یارانی ئەسکەندەر لە ئامانجی بالآی پاشاکەیان ئاگادار نەبوون، بەزیادبوونی ژمارەی دەرباریانی ڕۆژهەلآتی، ئیرەییان دەبرد و هەندێکیان لێی یاخی بوون، بەلآم ئەو هەنگاوانە سوربوونی ئەویان لەسەر یەکێتی ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوا زیاتر کرد و بەردەوامیش خانەدانانی دەهێنایە پێشەوە و زۆر شتی تریشی ئەنجامدا کە لە شوێنی خۆیدا لێیان دەدوێین[1066].

هەوڵی جیاوازی نەکردنی ئەو لەنێوان سەرکەوتوو ژێرکەوتوو و پشتبەستنی بە یەکێتی خەلکی گریك و ئێران بۆ پێکهێنانی میللەتێك لێیان، نیشانەی ئەوەیە کە سەرەڕای جیهانگیری، لە باش بەڕێوەبردنیشدا، بەهرەمەند بووە[1067].

دەڵێن (ئەرستۆ) سەرەتا بە ئەسکەندەری وتبوو کە لەگەڵ بەربەرەکان(ناگریك) وەك کۆیلە و لەگەڵ گریکیەکان ئازادانە ڕەفتاربکە، بەلآم ئەسکەندەر لە نێو کۆمەڵی پیاوماقولآنی ڕۆژهەلآتی(ئێرانی)دا ئەو پلەیەی لە ئەدەب و فەرهەنگ و کرداری ڕەسەن بینیبووی کە کەمتر لە کۆمەڵی پڕ ئاشوبی دیموکراسی گریکدا بەدی کردووە و بەچۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتەش لەلایەن پادشایانی ئەخمینی سەرسام دەبێ، نازانێ چۆن گریکەکان دەتوانن لەجێی ئەوان حوکمڕانی بکەن، تا گەیشتۆتە ئەو ئەنجامە کە تەنها ڕێی بەردەوامیدان بە داگیرکاری ئەوەیە، کە خانەدانەکانی ئێرانی ڕازی بەڕێبەرایەتی کردنی خۆی بکات و لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا سوودیان لێ ببینێ[1068]. لەوانەشە بیری بەشداری پێکردنی ئەخمینیەکان لە حکومەتدا لەبەرئەوە بووبێ کە پێی وابوو، لەگەڵ گریکەکان دوو ڕەگەزی شایەنی زاڵبوونن

---

[1066] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٢٧٥؛ مرتضی راوندي: تاريخ اجتماعي ايران، ج١، ص٥٨٧.

[1067] البرماله: تاريخ البرماله ،ج١، ص٢٩٩.

[1068] مرتضی راوندي: تاريخ اجتماعي ايران،ج١، ص٥٨٨-٥٨٩.

بەسەر گەلانی ئاسیادا، دەشێ سەرچاوە ئەو دیدەش لەوەوە هاتبێ کە ئەو گەلە جیا لە گشت گەلانی ئاسیا، توانیویانە دەریای ناوەڕاست ببڕن و بگەنە ئەوروپاو زۆرجار گریک و هاوپەیمانەکان بشکێنن[(١٠٦٩)].

ئەو لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا، پەیڕەوی لەڕەوش و کارو فیکری شاهانی ئەخمینی دەکرد، بەوەش زانی سۆزی خەلکی بۆ خۆی کێش بکات و لە ڕێکخستنی وڵات و پلانی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا، وەك ئەوان مەملەکەتی بەسەر چەندین ولایەتدا دابەشکرد و سەرەڕای هێشتنەوەی زۆر فەرمانبەر و سەردارانی خۆجێی لە شوێنی خۆیان -وەك باسمانکرد- بۆ پێشگرتنیش لە بیری ڕزگاریخوازی، جگە لە والیە ناوچەییەکان، فەرمانەدەی بەهێزی خەلکی گریکیشی بۆ ناوچەکان دیاریکرد[(١٠٧٠)].یان دەکرێ بڵێین ئەو بۆی نەلوا گۆڕانی بنچینەیی لە هەلومەرجدا بکات، بەڵکو شوێن نەخشەی دارای یەکەم کەوت و لەسەر ولایەتەکان والی دانان، کە بەگریکی (ساتراب) یان پێدەگوترا و لە زۆر کاروباری تریشدا، هەمان تەشکیلاتی ئەوی پەیڕەودەکرد، لەگەڵ جیاوازی ئەوەی کە دوو کاربەدەستی تر، لە ناوەندەوە بۆ بەشداری لە حوکمڕانیکردنی والیدا دیاری دەکران، یەکیان بەرپرسی کاروباری سەربازی بوو ئەوی تریش هی دارایی، کە لە جێی وەزیری دارایی ئەمڕۆ بوو، لە حاڵێکدا کە کاروباری دارایی پێشتر لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی ولایەتەکان دابوو[(١٠٧١)]، ئەمەش مانای وایە کە ئەسکەندەر دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردن و ئابوری و سەربازی لە یەکتر جیاکردۆتەوە[(١٠٧٢)].

ئەو لە پارێزگاریکردنی ڕێکخستنی ساتراب نیشنی بەشێوەی پادشایانی ئەخمینیدا تەنها لەگەڵ هند، مامەڵەی جیاوازبوو، کە ڕێیدایە پادشاکانی، خۆیان ناوچەکە بەڕێوەببەن، ساتراب نیشنە باڵاکانی ڕۆژهەڵات کە لە ژێر دەسەڵاتی گریکەکاندا بوون بە ڕواڵەت چواردەدانە بوون، کە نزیکەی تێکڕایان لە دوادواکانی دەسەڵاتی ئەخمینیدا سەربەخۆییان بەدەستهێنابوو، ئەسکەندەر وەك وتمان لە سەرەتادا بۆ دانانی بەرپرسی سەر ولایەتەکان زیاتر ئێرانیەکانی دیاریدەکرد، بەڵام

---

(١٠٦٩) اندري بارو:بلاد اشور نينوى بابل، ص٢٢١.

(١٠٧٠) مرتضى راوندي: تاريخ اجتماعي ايران، ج١، ص٥٨٨.

(١٠٧١) حسن پيرنيا: تاريخ ايران قبل از اسلام، ص١٤١-١٤٢؛ محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص٤٢٠.

(١٠٧٢) خسرو گوران: كوردستان لە مێژوودا، چاخە کۆنەکان، ص١٠٧.

ئەو ڕەوشە بەجێگیری نەمایەوە، بەڵکو لە گۆڕانکاریەکانی دواییدا بە زۆری مەکدونیەکانی خستە شوێنیان، بەشێوەیەك کە لەسەروبەندی مەرگی ئەسکەندەردا، تەنها سێ ولایەت مابوون کە والیەکانیان لە ڕۆژهەڵاتیان بن، ئەو ویستویەتی وردە وردە هەموو ساترانشینەکان بخاتە ژێردەستی فەرمانەدە گریکەکان و بەدانانی فەرمانبەرانی کاروباری دارایی و سەربازی کە ئاماژەمان پێدان، کە سەر بەوالی نەبوون لەگەڵ لێسەندنەوەی مافی سکەلێدان -هەندێکیان نەبێ لە نێویاندا مازیوسی والی بابل- کە پێشتر لێی بەهرەمەندبوون و بە چاودێریکردنی سەربازانی بەکریگیراویش، بەرەبەرە لە توانستی ساترابەکان کەمکرایەوە[١٠٧٣].لەوەشەوەیە کە وتراوە ئەسکەندەر دوای داگیرکردنی ناوچەکان شانشینێکی گەورەی دروستکرد کە لەچەند میرنشینێك پێکهاتبوو و میرەکان هیلینی بوون و تاجێکیان لەسەر دەنا کە ئارمی تایبەتی پێوەبوو و لەلایەن ئەسکەندەرەوە دانرابوو، ببوو بەنیشانەی پاشایەتی و هەر کەسێك ببایە بە فەرمانڕەوای هەر ناوچەیەك دەبوو بەکاری بهێنێ تاوای لێهات دواتر بوو بەنەریت و هەموو پادشا هیلینیەکان بەکاریاندەهێنا[١٠٧٤].

یاسا بزربوو یەکسانیش لەنێوان دەسەڵاتداران و بێدەسەڵاتدا نەمێنێ، دواتریش ئەسکەندەر بۆ داگیرکردن دوو ئامرازی بەدەستەوە گرتبوو، یەکیان ئیمپراتۆریەت بوو کە هەموو هەرێمەکانی لەنێو خۆدا ڕێکخستبوو، ئەویتریش مەڵبەندە پەرتەوازە (المراكز المتفرقة)کان بوون کە لە شوێنی تایبەت و دیاریکراو(معین) بوون و نیشتەجێبووە تازەکانیان تێدا کۆدەکردەوە، واتە ئامرازێکی سیاسی و یەکێ کرداری، یان سیاسەتی کۆکردنەوە ڕووە و ناوەوە کە هەرێمەکان بۆ یەکبوون و یەکێتی(الاتحادوالوحدە)هان دەدات و سیاسەتی فراوانخوازی خاڵ و مەڵبەندەکان و بڵاوبوونەوە لە دەوروبەریاندا[١٠٧٥].

ئەو شارە زۆرانە، کە دروستکران[١٠٧٦] و کۆچەری گریکیان تێدا جێگیرکرا، لە ڕووی گەورەییەوە لە شارەکانی گریك جیاوازبوون و خاوەنی خۆریبەریش نەبوون، سلوقیەکانیش بەگوێرەی دەسەڵاتی ساترابە(ولایەت)کان و دەزگای بەڕێوەبردن کە لەئەخمینیەکانیان وەرگرتبوو

---

(١٠٧٣) الفريد فن گوتشمد: تاريخ ايران ، ص٢٨-٣٠.

(١٠٧٤) John Boardan and other: THE OXFORD Illustd history of Greece and the hellnnes, p.٣١١.tic, p.٣١١.

(١٠٧٥) جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص٧٢.

(١٠٧٦) بۆ زانیاری لەسەر بەشێك لە شارەکان و شوێنی هەڵکەوتنیان بڕوانە: نەخشەی ژمارە(٥)

و بەو شێوازە کە لەلای گریکەکانی سەدەی پێنجەم بە ڕژێمی زۆردارانی بەربەری، ناسرابوو، حوکمڕانیان دەکرد، واتە شێوە بەڕێوەبردنێك دەرکەوت، کە لەنەریتی میسریە کۆنەکان و مسیوپۆتامیا وەرگیرابوو، نازناوی شێوە خواییان وەرگرت، وەك پادشایانی کۆنی ئەخمینی بەتالیمە (بەتالیسە)کانی میسریش پەرستنی فیرعەونییان زیندووکردەوە و نازناوی(سوتیرا = دڵسۆز)یان وەرگرت[1077]. واتە ئەو دەوڵەتانە کە دوای مردنی ئەسکەندەر و لە دابەشبونی ئیمپراتۆریەتەکەی دروست ببوون، هەموویان سروشتی پادشایەتیان هەبوو.... بەمەش لە جێی سیستەمی دەوڵەتی شار کە لە سەردەمی پێش ئەسکەندەر پەیڕەودەکرا، پادشایەتی ڕەها هاتە ئارا، کە ئیرادەی ئەو یاسا بوو، بۆیە فرمانی بەسەر ژێردەستەکاندا دەکردو موڵكوماڵیانی هەڵدەسوڕاند، بەهۆی ئەوەش، کە پیاوێکی نائاسایی و لە هەمووان بە ژیرتر دەزانرا، وایکرد کە دەنگدانی گەل لەسەر جۆرە حوکمە گوازرایەوە بۆ ئیمپراتۆرەکانی ڕۆمان، ئەویش دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ئەسکەندەر[1078].

---

[1077] ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم، ج١، ص٢٥٧.

[1078] ابو اليزيد علي المتيت: تطور الفكر السياسي، ص٢٤-٢٥.

## تـــەوەرەی دووەم
## لە بـواری ئابــوری و کۆمـەڵایەتیدا

بەرەنجامــەکانی شـەڕی گۆگــامیلا جۆراوجۆربـوون و ئـابوری و کۆمەڵایـەتیش لـە کایـە هـەرە گرنگەکانی کۆمەڵگابوون کە بە شەڕی گۆگامـیلاو ئەو پێشهاتانەی لە ئەنجامی گۆڕانکاریەکانی دوای ئەو شەڕەدا هاتنە ئاراوە، کاریانتێکرا، بەتایبەت کە زانیمان زۆربوونی ژمارەی دانیـشتوان و ڕێژەی بەتاڵەو خراپی باری ئابوری و ئەو بارودۆخە ناهـەموارەی کـە لـەدوای شـەڕەکانی نێـوان دەوڵەتــە شــارەکانی گریکــدا، خولقــا، هۆکــاری زۆر نــەدەری پێکهــاتن و هاوهەڵوێــستبوونی گریکــەکان بــوو لەگــەڵ ئەســکەندەر، لەســـەر لەشکرکێـشی کـردن بـۆ ڕۆژهــەڵات و میللــەتانی ڕۆژهەڵاتیش بەهۆی داگیرکردنی وڵاتانیان لەلایەن ئەخمینیەکان و باج و سـەرانەی جـۆراو جـۆرو گوێنـــەدانی کاربەدەســـتان، بـــە بـــاری گـــوزەرانی خـــەڵك و خـــەریکبوونیان بـــە تێرکردنـــی ئارەزووەکانیان، ژیانیان لەوان خۆشتر نەبوو.

گریکەکان، لـەو دەشـتە بەرفراوانـەی شـەڕەکەی تێـدا ئەنجامـدرا دەسـکەوتێکی سەرسـوڕهێنەرو کەلوپەلی گرانبەهایان دەستکەوت، لە نێویاندا فیل و ژمارەیەکی زۆر گالیسکەی ئامادەکراو و شمشێرو نێزەی زێڕو شتی تریش هەبوو[(١٠٧٩)].

هەروەها شەڕەکە ڕێگای خۆشکرد بۆ ئەسکەندەر و سوپاکەی، کـە بـچنە نـاو شـاری بـەناوبانگی بابل و پاشان سوس و پەرسیپولس و ئەکباتانە[(١٠٨٠)] و دەستبگرن بەسەر گەنجینەکانی پاشـایەتی

---

(١٠٧٩) هارولدلمب: الاسکندر المقدوني، ص٢١٦.

(١٠٨٠) بۆ زانینی شوێنی ئەو شارانە و زۆر شاری تری ڕۆژهەڵاتیش بڕوانە:پاشکۆی ژمارە(١و٥).

و سەروەت و سامان و شتومەکی سەرنجڕاکێش و گرانبەها لە زێڕو زیوو، فەرش و گەواهێراتی ئەخمینی و ئەو پەیکەرو شتومەکانەش کە خشایارشا لە وڵاتی گریکەوە هێنابوونی، دەستیان گەیشتە ئەو هێزە کێشکارە (جازیە) و وەســـوەســـە ئەنگێزانەی کە زیندەگی (پادشایانی ئەخمینی)یان پڕ لە شکۆو گەورەیی نیشاندەداو چەندین سـەدە و ساڵ بوو بە شێوەی چێژکـی سەرســامکەر هەواڵی زێڕو زیوو حەرەمــسەرای شاهانەیان، بە دنیای گریکدا پەخش ببوو[١٠٨١].

ئەو پارە و زێڕ و زیوەش کە لە میانەی پرۆسەی داگیرکاریەکە و لە خەزینەکانی پادشایەتی دەستی ئەسکەندەر و سوپاکەی کەوت و بەبڕو ژمارە و ئامـاری جۆراوجۆر خراوتەڕوو، جێی گومان کردنیش نیە، چونکە بە درێژایی چەندین ساڵ و لە هەموو گۆشە و کەنارێکی ئاسیاوە، ئەو هەموو زێڕو زیوو و کەرەسانە بە زۆر لە دانیشتون سەنراوە و فەرمانڕەواکانی ئەخمینـی بۆ ڕۆژی ڕەش،هەڵیانگرتبوون، وڵاتەکەش بۆ خۆی بەهۆی ئاووهەوا و بازرگانی کردنەوە بەسەروسامان و دەوڵەمەند بووە[١٠٨٢].

بۆ نموونە وتراوە کە ئەوەی لە ئەربیل (هەولێر)لەلایەن گریکەکانەوە دەستی بەسەرداگیرا، بڕی چوار هەزار تالنت بوو[١٠٨٣]، کە بە(بیست ودووملیۆن فرانکی زێڕ)یان(سەدو دوانزە ملیۆن ریاڵ )خەمڵێنراوە[١٠٨٤]، ئەوەش کە لە سوس هەبوو، بە پەنجا هەزار تالنت لەگەڵ پارەوماڵ و سامانی پشایەتی و شتومەکی تریش کە لە وڵاتی گریك هێنابوویانن لە نێویاندا دوو پەیکەری لەمس دروستکراو کە دواتر ئەسکەندەر بۆ ئەسینای گێڕانەوە[١٠٨٥]، کە بە نزیکەی دوانزە

---

[١٠٨١] عبدالحسین زرین کوب: تاریخ مردم ایران، ج١، ص٢١٣.

[١٠٨٢] سیربرسي سایكس: تاریخ ایران، ج١ل، ص٣٤٩؛ جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی کورد و هاوسێکانی، ل٢٣٨.

[١٠٨٣] فیلافیوس آریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٤٣، هامش ١.

[١٠٨٤] حسن پیرنیا: تاریخ ایران باستان،ج٢، ص١٢٥٠، هامش ١.

[١٠٨٥] فیلافیوس آریانس: ایام الاسکندر الکبیر في العراق، ص٤١-٤٢؛ هارولدلمب: الاسکندر المقدوني، ص٢٢٣.

ملیۆن(پاوەن) لێکدراوەتەوە و هەیشە بە چل هەزار تالنتی زێڕ و زیوی بەسکەنەکراوی نەخت(غیر مسکوك نقداً) و نۆ تەنیش زێڕ، نیشاندراوە[١٠٨٦].

لە سەرچاوەیەکی تریشدا هاتووە کە دوای گرتنی بابل و سوس، خەزێنەیەکی پەنجا هەزار تالنتی دەستی بەسەرداگیراوە[١٠٨٧]. نووسەرێك پێی وایە ئەو بڕە پارەیە ئەگەر تالنتی زیو بووبێ بەهاکەی دەکاتە شانزە ملیۆن و پێنج سەدو پەنجا هەزار پاوەن، بەڵام ئەگەر زێڕبێ دەکاتە سەد و سی و دوو ملیۆن و چوار سەد هەزار لیرەی ئینگلیزی[١٠٨٨]، لە شوێنێکی تریشدا هاتووە کە لە شوش چل هەزار تالنت زیو و و نۆ هەزار دریك(سکەی زێڕ) دەستی ئەسکەندەر و سوپاکەی کەوتووە[١٠٨٩] کەچی (بلوتارك) ئاماژەی بە چل هەزار تالنتی نەختینە و کەلوپەل و سامانێکی زۆری گرانبەها، کە بەهاکەی بە پێنج هەزار تالنت دەخەملێنێ، کردووە[١٠٩٠].

ئەوەش کە لە خەزێنەکانی پەرسیپۆلس(تخت جمشید) چنگ کەوتووە و پاسەوانەکان نەیانتوانیوە حەشاری بدەن جگە لە گەواهێرات و کیسەی زێڕی جۆراوجۆری بێشومار، بە سەدو هەشت هەزار تالنت مەزەندە کراوە[١٠٩١]. لە جێگایەکی تریش نووسراوە کە ئەوەی پەرسیپۆلس سێ بەرامبەر ئەوەی سوس بوو و بە سەدو بیست هەزار تالنت واتە بە نزیکەی چل و دوو ملیۆن پاوەنی ئینگلیزی نیشاندەدات و لەگەڵیشیدا ئاماژە بەبڕی شەش هەزار تالنت بەرامبەر بەدوو ملیۆن و سەد هەزار پاوەندی خەزێنەکانی پازرگادا دەکات، کە بێ شەڕ ڕا دەست بووە[١٠٩٢]. سەرچاوەیەکی تریش بەهای سامانی دەستکەوتوی پەرسیپۆلس بە دوو ملیۆن و حەوت سەد هەزار دۆلاری ئەمریکی لێکداوەتەوە و لەلای هەندێکیش پارەی دەستبەسەرداگیراوی ئەو شارە بە سەد و بیست هەزار تالنت و بە بەهای بیست و هەشت ملیۆن و دوو سەد و نەوەد هەزار

---

(١٠٨٦) فیلافیوس آریانس: ایام الاسکندر الکبیر فی العراق، ص٤٢، هامش١.

(١٠٨٧) هیرمن کندر و ڤیرنر هیلغیمن: الیونان انحطاط الپولس مقدونیا اطلس – dtv، تاریخ العالم، (بیروت:٢٠٠٣)، ص٦٥.

(١٠٨٨) سیربرسي سایکس: تاریخ ایران، ج١، ص٣٤٧. وهامش(٤) في نفس الصفحة.

(١٠٨٩) اولرش ویلکن: اسکندر مقدوني، ص١٩١؛ هرمان بنگسون: یونان و پارسان، ص٣٢٢.

(١٠٩٠) السیر، ج٣، ص١٢٨٩.

(١٠٩١) لویس پل تاد ودیگران: تاریخ تمدن وزندگی مردم جهان ، ص١١٤.

(١٠٩٢) اولریش ویلکن :اسکندر مقدوني، ص١٩٥.

لیەی ئیستەرلینی-یان پاوەند- خەملێنراوە، لەگەڵ گەلێك كەلوپەلی تری بەنرخ كە دوانزە هەزار ئەسپ و پێنج هەزار وشتر یان دە هەزار ئێستر و پێنج هەزار وشتر لە گواستنەوەیاندا بەكاربراوە[1093]. لە جێیەكی تریش بیست و حەوت ملیۆن و شەش سەد هەزار لیرە وەك بەهای سامانی دەستكەوتووی گەنجینەكانی شاری ناوبراو تاماژەی پێكراوە[1094]. مێژوونووسێكیش هەموو ئەو پارانە بە چوار هەزار و شەش سەد تەن زیو نیشاندەدات و بەباج و سەرانە(جزیە)ی سیانزەساڵی هەموو هەرێمەكانی ئیمپراتۆریەت دادەنێ[1095].

هەموو ئەو پارانە و هی گەنجینەی نوێنەرەكانی پادشاش لە هەرێمەكان و ڕەوانەكردنی بۆ بازاڕ و دانەوەی قەرزی سەربازان، پێشكەشكردنی بەخشش لێی، بوو بە یارمەتیدەری وە جوڵە خستن و بەكاربردن و دەستاو دەستكردنی و بنیاتنانی پرۆژە و بە دواشیدا گەشەكردنی بواری ئابوری هات، پاشان جیهانی كۆن دەوڵەمەند بوو و بە كۆبونەوەی پارەی زیاتریش لە دەستی خەڵكدا، بازرگانی بوژایەوە[1096]، وەگەرخستنی بەشێكی زۆری زێڕی كەڵەكەكراو لەلایەن ئەسكەندەرو سەرمایەگوزاری حكومەتیش لە سوپاو هێزی دەریایی و شارە نوێیەكان و شێوازەكانی بیناسازی گەشەی پێشەگەری، لێكەوتەوەو هەوڵی پەیدابوونی زۆرتری كۆیلەش لە شارە پیشەسازیەكاندا، زیادیكرد، چونكە بەشێكی زۆری گریكەكان خەریكی بازرگانی كۆیلە بوون و زۆر لەوانەش كە لە جەنگەكان بە دیل دەگیران بە كۆیلەیی دەفرۆشران، جاری واش هەبوو كە خانەوادەی دیلەكە پێش ڕەوانەكردنی بۆ بازاڕ، ئازادیان بۆ دەكڕینەوە[1097].

لەو كاتەدا كە ئەسكەندەر لە ئاسیا سەركەوتن دوای سەركەوتنی بەدەستدەهێنا وڵاتی گریك بە سەردەمێكی تاقەت پڕوكێن و سەختدا، دەگوزەرا، وشكەساڵی و قاتیوقڕی یەخەی شارەكانی گرتبوو لەساڵی(٣٣٠ تا ٣٢٤پ.ز) درێژەی هەبوو، ئەم بارودۆخەش ئەسكەندەری والیكرد هەڵوێست وەربگرێت، لە نووسراوەكانی تایبەت بەو سەردەمەشدا باس لە

---

[1093] سیربرسی سایكس: تاریخ ایران، ج١ ،ص٢٩٤؛ جەلالی ئەمین بەگ: مێژووی كورد و هاوسێكانی، ص٢٣٨.

[1094] هارفی بورتر: موسوعة مختصر التاريخ القديم، ص٢٩٥.

[1095] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص٦٥.

[1096] نفس المرجع، ص٧١.

[1097] لوكاس دوبلويس و روبارتوس وان دراسپيك: ديباچه بر جهان باستان، ص٢١٣-٢١٤.

ڕەوانەکردنی دانەوێڵە بۆ ئەو وڵاتە کراوە و جگە لە ئەسپارتە، نزیکەی تێکڕای شارەکان، وەك وەرگری دەغڵ و ئازوقە ناویان هاتووە، جگە لەوەش کەم و زۆر سەرتاسەری وڵاتی گریك، چالاکانە و بێ جیاوازی، لە لەشکرکێشی ئەسکەندەر سوودیان بینیوە، چ ئەوانەی سەرباز یان کرێگرتە(المرتزقە) بوون یان ئەوانەی بەناونیشانی کارمەندی دەوڵەت و دیوان لە خزمەت شای مەکدونیدا بوون[١٠٩٨]، ئەمەو دابەشکردنی دیاری و بەخشش و بەو پرۆسەی داگیرکردنی ڕۆژهەڵاتەش، کە بازاڕێکی فراوانی بۆ دروستکراوەکانی گریك کردەوە، بارودۆخی ئابوری شارە گریکیە ڕەسەنەکانی بەشێوەیەکی هەستیار، باشکرد[١٠٩٩] هەموو ئەو بەخشش و دەستکەوتانەش بەرەنجامی شەڕی گۆگامێلا بوون.

لەگەڵ وەجوڵەکەوتنی پێشکەوتنی ئابوری بەهۆی دەستکەوتنی زێڕو زیوی زۆر و کەلوپەلی گرانبەها و مسۆگەربوونی تفاقی سوپایەکی بەردەوام و ئیدارەکردنیان و فراوانبوونی جیهانی تازەش لە چاو جیهانی گریکی[١١٠٠]، زەمینەی گەشەسەندنی هەمە لایەنەی ئابوری لەو دەوڵەتەدا، ڕەخسا، ئەگەر مردن لە ئەسکەندەر گەڕابا بەوە و بەوپاشخانە فەلسەفیە و ڕۆشنبیریەی هەیبوو لە هەوڵی دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی گریکی-ئەخمینی فرە سیستەم بە گوێرەی هەلومەرجی هەر ناوچەیەك دابوو، کەتیایدا سوپا و ئابوری و پارە یەکبخات و شاری نوێش وەك مەڵبەندی بازرگانی لەسەر بنەمای جوگرافی دروستبکات[١١٠١].

ئەسکەندەر لە میانەی داگیرکاریەکانیدا بە سیستەمی جۆراوجۆری سیاسی گەیشت و رازیش بوو کە هەر وڵاتێك شێوەی حکومەتی خۆی پەیڕەو بکات کە لەگەڵ ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕیدا گونجاوە[١١٠٢]، بەڵام تێکۆشا تا یەکپارچەیی ناوچە داگیرکراوەکان پایەدار و پتەوبکات، یەکێکیش لە ڕێبازەکانی کە بۆ ئەنجامدانی ئەو تێڕوانینە گرتیەبەر، ڕەواج پێدانی سیستەمی یەکپارەیی بوو لە سەرانسەری ئیمپراتۆریەتدا و

---

[١٠٩٨] هرمان بنگسون: یونان و پارسان، ص٣٣٣.

[١٠٩٩] نیقولا زیادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، العدد (٢٢)، ص١٨٩.

[١١٠٠] ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم، ج١، ص٢٥٨.

[١١٠١] عبدالمجيد عبدالملك: ساحل بلاد الشام والصراعات الدولية، الكتاب الاول، ص٤٩-٥٠.

[١١٠٢] ابو اليزيد علي المتيت: تطور الفكر السياسي، ص٢٤.

لەسەر بناغەی ئاڵوگۆڕی سوننەتی گریکی کۆن کە لە بەهای شت، پارەیان دەدا، زێڕو زیو(بەپێی کێش) بە ئامرازی ئاڵوگۆڕ دەژمێردران، بۆ ئەو مەبەستەش سکەی زێڕ (استاتر)و زیو(دەرهەم و تترا دەرهەم) لە خانەی سکەلێدانی ئیمپراتۆریەت لێدەدران و بێگومان گۆڕینی گەنجی ئەمبارکراو و هەڵچنراوی شاهنشایی ئەخمینیش کە دەستی بەسەرداگیرا، بەدراو[1103] بوو بە هۆی پێشکەوتنی پەیوەندی (کالایی – دراوی)و فراوانبوونی زەمینەی ئاڵوگۆڕی دراو لە شارەکان، کە تائەو کاتە ئاڵوگۆڕ(شت بەشت) بوو[1104].

کۆکردنەوەو پرۆسەی وەرگرتنی مالیات و تێکڕای کاروباری ئابوری لە دەست یەك فەرمانبەر کە سەر بە والی نەبوو، ڕێکخستنیان لە ژێر چاودێری سەرۆکی خەزنەداران، کە ئەویش پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە پادشاوە هەبوو، لەگەڵ لێسەندنەوەی مافی سکەلێدان لە نزیکەی هەموو والیەکان و بەناوەندکردنی، لەگەڵ سیستەمی یەك پارەیی، هەم لە پتەوکردنی بناغەی حکومەتی ناوەندیدا کاریگەری هەبوو هەم لە ئاسانکاری بازرگانی و دانوستان، کاریشی کردە سەر یەکێتی حکومەت و هۆی جۆراوجۆر پتەوکردنی بۆنەی ئەنجامگرتوو لە پەیوەندی ڕامیاری، فەرهەنگی نێوان لایەن و بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەو وڵاتە بەرفراوانەی فەراهەمکرد[1105].

ئەمانە و بە جیهانیکرانی دارایی ڕۆژهەلات و کەوتنە بازاڕی (زێڕی ئەمبارکراو)یش، مەرجی پێکهاتنی ناوچەیەکی ئابوری بەرفراوانی بەدەستهێنا[1106]. لە سەردەمی ئەسکەندەردا بازرگانی ڕۆژهەلاتی دوور، ڕێگای بەرە و ئەو ناوچانە بڕی، کە دەریای ناوەڕاست دەوری دابوون[1107].

بوونی هەنگاوی ئەسکەندەر بە پێشینەی قەیرانی هەلاوسان و بەرزبوونەوەی بەهای شت لە تەواوی ماوەی پەراگەندەبوونی گریکەکاندا، ئەویش بەهۆی ڕەواجی دراو وئاسان هەلگرتنی لە

---

[1103] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٢١)،کە نموونەیەك لە دراوی سەردەمی ئەسکەندەر نیشان دەدات.

[1104] ادوین اریدوویچ گرانتوسکی و دیگران: تاریخ ایران ، ص١٢٢.

[1105] میخائیل میخائیلوویچ دیاکونوف: تاریخ ایران باستان، ص١٧٤؛ رومان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٢٨٢-٢٨٣.

[1106] هرمان کندرو ڤیرنر هیلغمین: اطلس – dtv، تاریخ العالم، ص٦٥.

[1107] حسن کریم جاف: الوجیز في تاریخ ایران، ج١، ص٥٧.

مامەڵە وگەڕاندا، لایەنی نەرێنی لە سیاسەتی دارایی ئەودا، دەرخست[1108]. ئەمە لە وڵاتی گریکیش، بەهۆی کاریگەی بەردەوامی پەخشان بوونی بڕی زۆری زێڕ و زیوی ڕۆژهەڵات و لێدانی کرێی سەربازان، ئامادەیی هەبوو[1109].

لەبەر ویستی ئەسکەندەریش بۆ چارەسەرکردنی گرفتی زۆری دانیشتوان و ڕەخسانی ئەو دەرفەتەش، دوای شەڕی گۆگامێلا، پڕۆژەکەی وەك پڕۆژەیەکی ئابووری وکۆمەلایەتی، دێتە بەرچاو، بەهۆی هەلومەرجی نوێش، دروستکردنی بنکەی سەربازی بۆ پاسەوانی ڕێگا بازرگانیەکان و مسۆگەری ملکەچبوونی خەڵکی ناوچەکە، بۆ دەسەلاتی تازە و دروستکردنی بازاڕێکی گەورەتریش لەوانی پێشوو بۆ بازرگانی ئەو جیهانە فراوانە، کە ڕێگاکەی لە سندەوە بۆ ناوەڕاستی ئاسیا و تا دەریای ناوەڕاست و وڵاتی گریك لەوێشەوە بۆ ڕۆژئاوا دەچوو، بەپێویست زانی، بڕواش وابوو کە گریکەکان بەهۆی ئەزموونی فراوانی دەریایی وشکانی لە ئاستی کردنەوەی وەها بازاڕێکدان[1110].

بەپێچەوانەی شاکانی ئەخمینی لە جیاتی پڕکردنی ئەمبارەکان، گەنجینەی وڵاتی کردە دراوو دراوەکەشی یەکخست، بەدڵفراوانیشەوە دیاری و بەخشیشی دابەشدەکرد وسەربازەکانیشی کردە ساماندار و مەمالیکەکانی دەوڵەمەند کرد، بواری بۆ خەڵکی هەژاری وڵاتی گریکی دەست جەنگە زۆر و درێژەکان ڕەخساند، کە کەسوکاریان بە مەبەستی کارو پیشەی جیا لە سەربازیی بەکرێ (المرتزقە)، لە خزمەت پاشا ڕەوانەی دەرەوە بکەن، زۆریان وڵاتی خۆیان و جێهێشت و لەگەڵ سەربازە پیر و خانەنشینەکان لە داگیرگەو شارە دروستکراوەکانی پاشای گریکدا، گیرسانەوە و بوونە هۆکاری پێکهێنانی مەڵبەندی ئابووری سەرنجڕاکێشی بازرگانی ودۆزینەوەی کڕیاری زۆر لە سەرباز و کرێکارانی ڕۆژئاوایی و سەرنجی ڕۆژهەلاتیانیشیان بۆ زیندەگی خۆیان و کۆبوونەوەیان لەو ناوەندانەدا ،زیاترکێشکرد، بەهۆی هەلومەرجی تازەش شێوازی کۆن گۆڕاو

---

[1108] ادوین اریدوویچ گرانتوسکی و دیگران: تاریخ ایران ، ص١٢٢.

[1109] ج.هـ. ایلیف : فارس و العالم القدیم،تراث فارس، ترجمة محمد صقر خفاجة،(دم:١٩٥٩)،ص٤٥.

[1110] نیقولا زیادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، العدد (٢٢)، ، ص١٩٠-١٩١.

جـادەو کـەناڵ و پەیوەنـدی نێـوان شـارەکانیش بـواری دایـە بازرگانـەکان ، کـە زۆرتـر لـە نێـو مەمالیکەکاندا دەسەلآت پەیدابکەن و کاری بازرگانیش گەورەتر لە جاران ڕۆڵ بگێڕێت[1111].

هەروەها ئەسـکەندەر لە پێناو داهاتی زیاتر و دەستگرتن بەسـەر ناوچـە دەوڵەمـەندەکـانو بەستنەوەیان بە یەکتر و لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست دریغی نـەکرد، ڕەنگـە وروژانـی بـیرو ویستی داگیرکردنی دورگەی عەرەبیش، لە ناوبانگی چاکی بخور و داهاتە بەنرخەکـەیو فراوانـی کـەنارەکانی و دەوردرانـی بـە دورگـەو وێـستگەو بەنـدەری گونجـاو بـۆ کەشـتیوانیو ئەگـەری دەوڵەمەندی ئەو شارانەی، دوای داگیرکردن لێی دروستدەبن[1112]، سەرچاوەی گرتبێـت خوازیـار بووبێ لە ڕێی گرتنی ئەوێوە بگاتە کەنارەکانی ئۆقیانوسی هینـدی وکۆنترۆڵی بازرگانی ئاسـیاو ئەفریقیا بکات[1113].

گرنگیدان بە بابل و هەوڵی گێڕانەوەی دەورانی گەشانەوەی، چونکە دەیزانی کە جگـە لـە بـوونی وەك مەڵبەندێکی شارستانی وسیاسی، بەتایبەتیش بەهۆی بوونی بانکەکان تیایـدا کـە بـەکاری کڕین وفرۆشتن و قەرزدان هەڵدەستان و پێشتر ئاماژەمـان پێکـرد، مەڵبەنـدێکی ئـابوریش بـوو، ئەویش بە هێشتنەوەی (مـازیوس) وەك والی بەسەریەوە، پێدانەوەی مـافی سکە لێـدان، هـەروەها لە ڕێی چاکسازی وسازکردنەوەی کەناڵەکانی، دەیسەلمێنن کە" پێی وابـووە هـیچ میللـەتێك بـێ ئابوریەکی ساغلەم نـاتوانێ بـەردەوامی بـە ژیـانی خـۆی بـدات "[1114]. ڕاسـپاردنی ئەنـدازیار و هونەرکاران بۆ لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی چاککردنی ڕێگای گەیانـدنی بابـل بـە دەریـاو لابردنـی کۆسپی ڕێی دەریـاوانیو کردنـی بەچـەقو ناوەنـدی بازرگـانیو دەریـایی ئاسـیا، دروسـتکردنی حـەوزێك لـە شـێوەی بەنـدەر بـۆ کەشـتی بازرگـانی و هـەنگاونان بـۆ کـۆنترۆلکردنی کـەناری ڕۆژهەڵاتی کەنداوی عەرەبی(کەنداوی فارسی)و بنیاتنـانی شـاری ئەسـکەندەریە لـە ئاوڕێژگـەی ڕووباری دجلـە ، تـا ببێتـە مەڵبەنـدێکی بازرگـانی و گـرنگترین شـارەکانی ناوچـەکە بەیەکـەوە ببەسـتێتەوە، سـەرلەنوێ دروسـتکردنەوەی شـارەکەش بـەناوی (خـاراکس میـسینی-Carax

[1111] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٢٨٢-٢٨٣.

[1112] عبدالمنعم الهاشمي: تاریخ العرب، العصر الجاهلي، (بیروت:٢٠٠٦)، مج١، ص٣٥.

[1113] جلال یحیی: التاریخ الاوروبي ، ص٧٤.

[1114] هرمان بنگسون: یونان وپارسان، ص٣٣١.

(messene)[1115]، وەك بەشێك لە پرۆژەی دەست بەسەرداگرتنی وڵاتی عەرەب و کردنی شارەکە بە بەندەری سەرەکی بازرگانی نێوان وڵاتەکەو هند[1116]، لەگەڵ دروستکردنی بەندەرو خۆشکردنی ڕێگاو هەڵکەندنی جۆگا، لە ڕێی هێنانی ئەندازیاران لەگەڵ خۆی بۆ ئەو مەبەستەو گونجاندنی ڕووباری دیجلەوفورات بۆ کەشتیوانی،[1117] بەڵگەی سەلێنەری ئەو بیرەی سەرەوەی ئەسکەندەرن، کە لەدوای شەڕی گۆگامێلا کاری بۆ کرد.

هاتنە ئارای شانشینی ئەسکەندەر و گۆڕانی بەسێ سەڵتەنەتی هلنستی لەدوای مردنی، لە ڕوانگەی ئابوریەوە بەیەك بارگۆڕانی(انقلاب) ڕاستەقینەی دنیای ئەو سەردەمە دەژمێردرێت، بۆ یەکەمینجار بوو کە دوورترین بەشەکانی جیهان، تەواو بەیەکەوە پەیوەست بن، تا ئاستێك، کە بچوکترین پەشێوی لە ناوچەکان کاریگەری بۆ ناوچەکانی تریش هەبوو، هەرگیز ئابوری بە ئەندازەی ئەوچاخە نەبۆتە پاشکۆی بارگۆڕانە سیاسیەکان و بە قووڵی نەکەوتۆتە ژێر کاریگەریانەوە، شوێنی سکە لەو مەیدانەدا زۆر دیاربوو، ئەو سامانەی کە بەهۆی پرۆسەی داگیرکردنەوە گەیشتە بازاڕەکانی جیهان بە ڕادەیەك جێی سەرنج بوو، کە بەهای زێڕو زیوی بەرێژەی پەنجا لەسەد کەمکردەوە و ئەوەش لە مێژووی جیهاندا کەم وێنە بوو، ئەمەش مانای وانییە هەلومەرجی ئابوری لە سەردەمی جێنشینەکانی ئەسکەندەردا هەمیشە لەیەك ئاستدا بووبێ، بەڵکو بەرزی ونزمیو گەشەکردن و قەیرانیشی تێکەوتووە، بەگشتی سلوکیان خودانی ڕێگای گەورەی نێوان قارەکان بوون کە لە ئێران ڕەتدەبوو و بەلای چین و هنددا دەڕۆیشت، ئەوان ئەو ڕێگایەیان فراوانترکرد و بارودۆخەکەیان باشترکرد، ڕێگاکان لە دەریای سورەوە تا هند لە ڕێی بنکەی تایبەتی سەربازیەوە پارێزگاری دەکران و کاروانسەرا و ئەمباری ئاو لە بیابانەکان دروستکران و زۆری کەناڵەکان لەسەرسەرمایەی کەسان لێدەدران ، خێرایی پەیوەندی و

---

[1115] محمد الاسعد بن ابوبكر الحفصي:الغزواليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٥٤.

[1116] سامي سعيد الاحمد: تاريخ الخليج العربي من اقدم الازمنة حتى التحرير العربي، (بصرة:١٩٨٥)، ص٣٢٢.

[1117] جلال يحيى :التاريخ الاوروبي، ص٧١.

هەڵگرتن و گواستنەوەش، گەیشتبۆ دواپلەی خۆی و لە ڕێی کەنداوی عەرەبی(فارسی)دا پەیوەندی نێوان هند لە ڕۆژهەڵات و دەریای سوور لە ڕۆژئاوا دابیندەکرد[1118].

واتە ئاسیای بچووك و ناوەڕاست و ناوچەی عەرەبی‌و هندو چین، تێکرا بازرگانیان لەگەڵ وڵاتانی دەریای ناوەڕاستدا دەکرد و لە هەندێك ناوچەی گریکدا ژیانی مادی، مەودای فراوانتری وەرگرت و زانستی گریکیش پێشکەوت گریکەکان بە ئیستیغلال کردنی گەلان وبەهۆی شەڕ و وێرانکاری، توانیان بنەکەیەکی مادی بۆ ئامانجێکی گەورە دروست بکەن و لە ژیانی ئابوری و ڕۆشنبیریدا پەیڕەوی بکەن[1119].

بەروبومی کەمبەها کە پێشتر پشکی زۆری لە ئاڵوێری بازرگانیدا هەبوو، دایەکزی وشتی جوانکاری وناسك جێی گرتەوە، لەو بوارەشدا زیادبوونی خواست لەسەر کەرەستەی خاوی وەك تەختەو فلزی هیندی ئێرانی نموونەیەکی دیارن، هەرچی شتومەکی تری ئاڵوگۆڕکردنیشە بەپێی هەرێمەکان جیاوازبوون بۆ نموونە ئێران سەرەڕای هەوڵی ڕزگارکردنی بازاڕ بە گژوگیای خۆماڵی لە شتی لە دەرەوە هێنراو جلوبەرگ وفەرش وگەنمی دەنارده دەرەوە و لە بەرامبەر ئاسن ومسیش زێڕیان لە هیند و باکتریاو ئەرمەنستان وقەفقاس بۆ دەهات[1120].

لە سلوقیەوە زێڕو بەهاراتو بخورو بەردی بەنرخ و لە بەروبومەکانی میسۆپۆتامیا، وەك گەنم و جۆو خورما و خوریيان دەنارده سوریا، دەکرێ بوترێ، کە پەیوەندی بازرگانی لەو سەردەمەدا لە نێوان ئەوروپاو ئاسیاو بەشێکی ئەفریقیا لەوپەڕی چالاکیدابوو[1121]، لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیە ئابوریەشدا، کە لەدوای شەڕی گۆگامیلا دەرفەتی دروستبونی ڕەخسا، پەروەردەکردنی ڕووەك و ئاژەڵی هەندێك ناوچە لە هەندێك شوێنی تر بڵاوبۆوە، کە پێی نامۆبوون بۆ نموونە" گریکەکان هەڵسان بە چاندنی زەیتونو ترێ لە ئاسیای بچووك و ڕەشە وڵاغیان بردە ئەفریقیا[1122]، ئیتاڵیەکانیش پەمۆ و لۆکەو کونجی و گوێزی ڕۆژهەڵاتی و زەیتون و خورما و هەنجیر، لەگەڵ

---

[1118] رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٣٠٦-٣٠٨؛ طه باقر وآخرون: تاريخ ايران قديم، ص٨٨-٨٩.

[1119] ف.دياكۆف و س.كوفاليق: الحضارات القديمة، ج١، ص٣٩٩.

[1120] رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٣٠٨-٣١٠.

[1121] جورج رو: العراق القديم، ص٥٥٧.

[1122] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص٧٣.

مراوی و گای ئاسیاییان بۆ بەخێوکردن، بردە وڵاتی خۆیان[1123]. وایلێهات، کە دواتر بۆ مەبەستی بازرگانی کاڵای ڕۆژهەڵاتی بڕواتە ئەوروپاو لەوێشەوە کەلوپەل بەپێی پێویست بێتە ڕۆژهەڵات، هەرچی سکەش بوو لە سەردەمی سلوقیدا لە سەرانسەری وڵات وەك یەکی لێهات بەناونیشانی پارەی فەرمی لێدەدرا[1124]، زەویش بەیەکێك لە مەسەلە گرنگەکان دادەنراو کۆنترۆڵکردنی چەکێکی بەهێزی سیاسەتی ناوخۆ بوو کە سلوقیەکان دەستیان پێوەگرتبوو[1125].

بەگشتی دەوڵەتی سلوقی وەك یەك لە میراتگرانی ئەو ئیمپراتۆریەتەی دوای شەڕی ناوبراو دروست بوو، لە ڕووی ئابوریەوە دامەزراوەیەکی سەرمایەداری، خاوەن ڕێکخستنی دارایی ڕێکوپێك بوو، بەلاَم بە زۆری پادشاو کەسانی دەربارو دارودەستەکەی لەگەڵ ئەوانەی، کە خودانی هەندێك ئیمتیازاتی وەك خەریك بوون بە کارو بازرگانی نێو دەوڵەتی بوون، لەو سامانەی وڵات بەهرەمەند بوون و سودیان لێدەبینیێ، زۆری و جۆراوجۆری باجەکان و ،خەرجیش کەبۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی پاشاو سوپاو پەرستگا تەرخان دەکرا، باری شانی خەلکی زۆر قورسکردبوو[1126].

بەمانە و بەوەش کە پەرستگاکان ڕۆڵی بانکیان دەگێڕاو زێڕی تێدا هەڵگیراوی، لە بەرامبەر سوود بە قەرز دەدرا خەڵك، سەردەمێك داهات، کەمرۆڤی خۆشگوزەران بەتایبەت بێزارانی گەمەی سیاسی، جگە لە کەسی سەرچڵ وجەربەزە، ئەو کەسە بوو، کە سامانی زۆری هەبێ،ئیتر خەڵك هیچ پێگەیەکی نەبوو مەگەر یەك لە دەسەلاَتداران هەنگاوێکی باشی بۆ چاکەی ئەوان هەڵێنابا [1127].

---

[1123] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٣٠٩.

[1124] د.محمود زنجاني: تاریخ تمدن ایران باستان، ج١، ص٤٢٧.

[1125] بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی زەوی گرنگی پێدانی بڕوانە: جماعة من علماء الاثار السوفیت:العراق القدیم، ص٤٧٧-٥٠٦.

[1126] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از اغاز تا اسلام، ص٣١٠-٣١١؛ طه باقر وآخرون: تاریخ ایران قدیم، ص٨٨-٨٩.

[1127] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغریقیة، ج١، ص١٩٠-١٩١.

ئەسكەندەر وەك يەكەم سەركردە لە مێژوودا ئیمپراتۆریەتێكی جیهانی دروستكرد و تیایدا هاوسەنگی لە نێوان ئامانجی ئاشتی ومەبەستی شەڕدا بەدیهێنا، بەمەش دەركەوتنی شارستانیەتێكی نوێی مسۆگەركرد، كە تائێستاش پاشماوە نیشتوەكەی (رواسب )لە ناخی نەوە دوای نەوەكاندا ماوەتەوە،[1128] كەچی یەك لە نووسەران پێشنیاری ئەسكەندەر بۆ ئاوێتەكردنی میللەتانی خاوەن فەرهەنگی جیاواز و تێپەڕاندنی بیری تێكەڵكردنیش لە دروشم و ڕەنگدانەوەی لە ڕەفتارەكانیدا بەتایبەت لە مامەڵەكردنی لەگەڵ میسری وبابلیەكان، بە ئامانجی دروستكردنی ئیمپراتۆریەتێك لەسەر بنەمای لێكتێگەیشتن وهاودڵی، قابیلی بەدیهاتن نەبوو چونكە لەو بوارەدا چەند نەوە پێش سەردەمی خۆی كەوتبوو بۆیە دوای مردنی ئەنجومەنی ئەفسەران زۆر پێشنیار و پێشدەستەكانی ئەویان هەڵوەشاندەوە[1129].

هەندێك بەوە كە ئەسكەندەر وتویەتی((هەموو خەڵكی بران، ئەوەی دڵیانی هۆگری یەكتر كردوە ئەوەیە كە منداڵی خوان))[1130] یان كە گوایە بەزیوانی پەرستگای ئامونی وتووە كە ((خوا باوكی گشت مرۆڤەكانە)) بە یەكەمین كەسی ڕاگەیەنەری ڕاشكاوانەی بیری یەكێتی مرۆڤایەتیو وتەكەشی بە یەكەم ڕاگەیەنراوی برایەتی مرۆڤ دادەنێن[1131].

هەرچەندە پێش ئەویش پێغەمبەرو داناو فەیلەسوف و فەرمانڕوا هەبوون كەداوای برایەتی ویەكێتی نێوان خەڵكیان كردوە، بەڵام هیچ حوكمڕانێكی تری پێش خۆی هێندەی ئەو هەنگاوی كرداریی، بۆ بەدیهێنانی ئەو حەزە (یەكێتی جیهان) هەڵنەهێناوە[1132].

دەشێ سەرەتای ڕێخۆشكردنی بڵاوبوونەوەی گیانی برایەتی لای گریك بۆ بەر لە هاتنی ئەسكەندەر بگەڕێتەوە، كاتێك شارەكان لە بری شەڕ بۆ چارەسەری ناكۆكی پەنایان دەبردە بەر (تحكيم) كە مەینەتیەكانی شەڕی كەمدەكردەوە و، بە دانانان بە پیرۆزی پەرستگاكان و قەدەغەی دەستدرێژی كردنە سەریان، برایەتیان لە نێودا بڵاوبێتەوە[1133] بەڵام ئەسكەندەر دوای شەڕی گۆگامێلا چوارچێوەی وڵاتی گریكی تێپەڕاند و پەیوەندی و تێكەڵاوی نێوان ڕەگەزەكانی

---

[1128] بسام العسلي :الاسكندر الكبير المقدوني، ص٥.

[1129] هرمان بنگسون: یونا و پارسان، ص٣٣٠.

[1130] سير هارولد ادريس بيل: الهيلينية في المصر، ص٤٨.

[1131] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١١٠.

[1132] فليب حتي: موجز تاريخ الشرق الادنى القديم، ص٩٣.

[1133] د.محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج٢، ص١٣.

(گریـك-رۆژهـەلات)ی بەتاکـە ڕێگـەی پراکتیکـی بـۆ دابینکردنـی حـوکمڕانی ئیمپراتۆریەتـە بەرفراوانەکەی دیاری کردبوو[1134] .

بڕواش وایە کە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتەی لە میوانداری(وەلیمە) [1135]ئۆپیس(Opis)[1136] ی ساڵی (٣٢٤پ.ز) ئاشکرا کردووە و ئەویشی بە زەماوەندکردنی خۆی و سـەربازەکانی لەگـەڵ ژنانی ڕۆژهەلاتدا پراکتیزەکرد [1137] کە هەندێك وەك مـەبەستی یەکێتی ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوای تێدەگەن[1138] ئەمەش بـەرەنجامێکی دیـاری کۆمـەلایـەتی لەشکرکێـشیەکەیە بـۆ ئاوێتـەکردنی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا .

کەچی(عبدالحسین زرین کوب) لەوتەکەی ئەسکەندەر بـۆ یـەکێتی گـەلان دیدگایـەکی فەلـسەفی وەك هی ڕەواقیەکان -دواتر باسی دەکەین-نابینێ و پێیوایە ئەگەر نزاکە هەڵبەستراو نەبێ، ئەوە هێندەی دروشمێکی سیاسی و سەربازی بووە هێندە مرۆیی و ئازادیخوازانە نیـە، ئـەو برایەتیـەش کە گوزارشی لێکراوە هەر لە زنجیردا بوونی هەبووە، بۆ سەلماندنی ڕاکەشی، ئاماژە بـەوە دەکـات کەچـەند هەفتەیـەك دوای ڕووداوەکـە نزیکـەی هـۆزێکی تـەواوی بـۆ ئاسـوودە بـوونی گیـانی

---

[1134] عبدالحسین زرین کوب: تاریخ مردم ایران، ج١، ص٢٥٢.

[1135] بەکورتی کە ئەسکەندەر ویستی سەربازە پیر و پەککەوتە و بریندارەکان بنێرێتـەوە گریـك، نزیکـەی هەموو سوپاکەی نیگەران بوون و داوای گەڕانەوەیان کرد، ئەویش دوای کوشتنی سەرانی ناڕەزاییەکە، لە وتارێکدا لۆمەی کردن کە چاکەی ئەو و فلیپیان لە بیر نیە، بۆ (بەربەرەکان ) بەجێی دێڵن ، داواکەیانی قبووڵکردو ویستی لە ڕۆژهەلاتیەکان سوپایەك دروستبکات کەچی گریکەکان پەشیمان بوونـەوە، پاش پێداگیری زۆریـان بۆ لێبـوردن لێیـان خۆشبوو لـە ئۆپیس بـۆ نوێنـەری گشت میللـەتانی قەڵەمڕەوەکـەی میوانداری سازدا و لە میانەی پاڕانەوەیەك لە خوا خوازیاری، بەخشینی ئاسودەیی وگونجان و هاوکاری مەکدۆنی و ئەخمینیەکان لە بەڕێوە بردنی ئیمپراتۆریەتەکەیدا بوو، بڕوانە: نسطور ماتـساس :مذکرات الاسکندر الکبیر،ص٩٥-٩٨؛ الاب میتودیوس زهیراتی: الاسکندر الکبیر، ص١٢٣-١٢٥ .

[1136] تا ئێستا یەکدەنگی لەبارەی دیاریکردنی شوێنی ئۆپیس نیە، هەندێك بە تیسفۆن یـان سلوقیای تێدەگـەن وهەشـە پێیوایـە دەکەوێتـە باشـوری سـامەڕا و بەشـێکیش گـردی ABER هەڵکـەوتوو لـە لای ڕاستی ڕووباری دیجلە، لەوشوێنە کە بە ڕووباری عوزێم دەگات بە شوێنی شارەکە دادەنێن و وە هەندێك دەڵێن دەکەوێتـە سـەر ڕێگـای نزیـك تکریـت بڕوانـە: جابرخلیل ابـراهیم، مطقة الموصـل في فترة احـتلال الاجنبي، ص١٤٢، هامش٣.

[1137] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٧٥.

[1138] بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە لێکدانـەوەی پاڕانەوەکە بڕوانـە الاب میتودیـوس زهیراتـی :الاسـکندر الکبیر، ص١٢٣، هامش ١٤ .

هیمفستونی هاوڕێی کرده قوربانی وگشت ئەفسەرەکانیشی- جگە لە سلوقس- بە مردنی ئەو، لە ژنە ڕۆژهەلاتیەکانیان جیابوونەوە،[1139] سەرچاوەیەکی تریش ئەو جیابوونەوەیە وەك بەڵگە بۆ چێژ وەرنەگرتنی جێنشینەکانی لە دیدی ئەسکەندەر بۆ برایەتی و یەکسانی ڕەگەزەکانی مرۆڤ و نارەزاییش لە بەرامبەر بە واقیعبوونی ئەودیدە، لێکدەداتەوە[1140] .

بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەو ئارەزوویەکی جیهانی (الطموح العالمي) هەبووە، ئەویش پاڵی پێوەناوە هانی گریکەکان بدات بۆ تێکەڵاو بوون وکارکردن لەگەڵ ڕەعیەتەکانیدا، کاریگەری ئەوەش کاتێك دەرکەوت، کە کەسانی ڕۆژهەلاتی هاتنە ناو ریزی سوپاکەی و زەماوەندی لەگەڵ روکسانەی شاژنی سغدی و (ستاتیرا)ی کچی (دارا) کرد و زیاتر لە دە هەزار سەرباز ژنی ڕۆژهەلاتیان خواست[1141] ، ئەو جگە لەو دوو ژنە، (پاروساتیس)ی کچی (ئەردەشیر)ی سێیەمیشی خواست و بەشێوەی جۆراوجۆریش پرۆسەی هاوسەرگیری هاندا و هەشتا ئەفسەریش لە نزیکەکانی کچانی ناوچەکەیان هێنا[1142].لە نێو کەسە نزیکەکانی (ئەسکەندەر)، (سلوقس) (اپامە)ی کچی(پسی تامن) سەرداری باکتریای خواست، کە پیاوانە لە بەرامبەر سوپای ئەسکەندەر جەنگاو تا کوژرا دەستی هەڵنەگرت، (پریکادیسی) دۆست و نزیك و جێی پشت پێ بەستنیشی کچی(ئەتروپات) ساترابی مادی خواست[1143] .

لە ڕاستیدا ئەو مەسەلەی ژن و ژنخوازیە تاکتیکێکی سیاسی بوو و ئەسکەندەر بۆ کردنەوەی جێپێی خۆی لەناو گەلانی ناوچەکە و نەهێشتنی کۆسپەکانی سەر ڕێگای و سەقامگیرمانەوەی دەسەلاتەکەی پەیڕەوی کرد، بەلام ناکرێ نکوڵی لەوە بکەین کە هەموو ئەو شتانە بەدیونێکیاندا و خودی هاوسەرگیریش کە مانای دروستکردنی خێزانی دەگەیاند، خێزانیش بنچینەی دروستبوونی کۆمەڵگاو دەشبوو بەهۆی تێکەڵاوی خوێنیو ئاشنایەتیو ئاوێتەبوونی کەلتورەکانو ئەگەر بەردەوامیش بایە، نەوەیەکی گریکی ڕۆژهەلاتی لێدەکەوتەوە، وەك کاری کۆمەلایەتیش لە نێو ئەنجامە کۆمەلایەتیەکاندا جێدەگرن بۆیە لێرەش ئاماژەی پێدەدەین،

---

[1139] تاريخ مردم ايران، ج١، ص٢٥٣.

[1140] ارنولد توينبي: تاريخ الحضارة الهيلينية، ص٢٣٤.

[1141] ابو اليزيد علي المتيت: تطور الفكر السياسي، ص٢٤.

[1142] بڕوانە: نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص٩٣-٩٤؛ ميخائيل ميخائيلو ويچ دياكونوف: تاريخ ايران باستان، ص١٦٨.

[1143] مري بويس وفرانتز گرنر: تاريخ كيش زردشت، پس از اسكندر گجسته، ج٣، ص١١.

پرۆسەی هاوسەرگیری ئەسکەندەر و دە هەزار سەرباز و هەشتا ئەفسەرەکەش بە کۆمەڵ و لە میانەی ئاهەنگێك بەڕێوەچوو کە پێنج ڕۆژی خایاند،[1144] ئەویش بە ئامادەبوونی میوانێکی زۆر کە نوێنەرایەتی گەلانی ناو ئیمپراتۆریەتەکەیان دەکرد و لە ساڵی(324پ.ز)[1145] و لە شاری (سوس ) بەڕێوەچوو، لەو ڕووەشەوە کە بە ڕاستی وەك جێنشینی پادشایان بناسرێت، ئەسکەندەر ڕێورەسمی دەرباری قبوولکرد و لە مەراسیمێکی گەورەدا بە جلوبەرگ و تاجی شاهانەی ئەخمینی، هاتە دەرەوە و بە شێوازی ڕۆژهەڵاتیانەش، هەموو خەڵك لە بەرامبەریدا بەچۆکداهاتن (کڕنوشیان برد )[1146].

شایەنی باسە کە بەگوێرەی ئاداب و ئاکاری باوی گریکیان هاوسەرگیری لەگەڵ ژنانی ناگریکی، ناپاسایی دەژمێردرا کەچی بەو پرۆسەیە و ناچارکردنی هەندێك لە ئەفسەرەکان و هاندانی سەربازەکانیشی بۆ شوێنپێهەڵگرتنی،-وەك ئەنجامێکی کۆمەلایەتی لەشکرکێشیەکە و دوای شەڕی گۆگامێلا -ناپابەندی خۆی پیشانداو ئەو دەستورەی خستە ژێر پێی، زۆر لە سەربازەکانیش بەگوێیان کرد، دەشێ ژیانی سەربازی و دووروودرێژی ماوەی دوورکەوتنەوەیان لە کەسوکار، بۆ پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتە و وەڵامدانەوەی داوای پادشاکەیان، هاندەربووبێ[1147].

شار دروستکردنیش وەك ئەنجامێکی تری لەشکرکێشیەکە و بەتایبەتیش دوای سەرکەوتن لە شەڕی گۆگامیلا، لە گرنگترین ئەو کارانە بوو کە ئەسکەندەر هەنگاوی باشی بۆ هەڵێناو لە سەردەمی جێنشینەکانیشیدا، بەردەوامی هەبوو.ئەو لە ماوەی کەمتر لە پانزە ساڵ و لەمیانەی پێشڕەویکردن و بەزاندنی سنووری جیهانی زانراودا و بە درێژایی ئەو دووریەی بڕیبوی، کەوتە بنیاتنانی شار[1148] و نزیکەی هەموو یان زۆربەشیان ناو لێنا ئەسکەندەریە[1149]سەرچاوەکان

---

[1144] محمد جواد مشكور: تاريخ ايران زمين ، ص٤٩؛ مرتضى راوندي: تاريخ اجتماعي ايران،ج١، ص٥٨٠.

[1145] الفيلد مارشال فيكونت مونتجميري: الحرب عبر التاريخ، ص١١٠.

[1146] البرمالة: تاريخ البرمالة، ج١، ص٣٠٦.

[1147] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص٦٩-٧٠.

[1148] ژمارەیەکی زۆر لەو شارانە لە پاشکۆی ژمارە(٥)دا خراونەتە ڕوو.

[1149] كلود نودين و اخرون: اليونان ، شبابنا ، موسوعة لاروس، تاريخ العالم ،الطبعة الاولى ،ترجمة فريد انطونيوس، (بيروت:٢٠٠١)، ص٢٢.

ئاماژە بەحەفتا شار دەکەن، کەچی هەندێك لەم ژمارەیەدا زیادەڕۆیی دەبینن و تەنها گێڕانەوەی نیوە یان کەمتر لە نیوەی ئەو ژمارەیە، بۆ ئەسکەندەر بەدروست دەزانن[1150].

هەیە فرمانی دروستکردنی تەنها دوانزەی دەداتە پاڵ، کە هەموویان بە ئەسکەندەریە ناونراون[1151] سترابۆ تەنیا لە هەرێمی باکتریا ئاماژەی بە دروستکردنی هەشت شار کردوە[1152] و لە نووسینێکیشدا ئاماژە بە کۆدەنگی توێژەران لەسەر بیست تا بیست و پێنج دانە، کراوە تیاشیدا هاتووە کە هەموو شارەکان وەك(ئەسکەندەریە لەمیسر) لە نوێیی دروستنەکران، بەڵکو هەندێکیان وەك(هیرات و قەندەهار) لە ئەفغانستانی ئێستا، کۆشکی شاهانە بوون و کرانە شار هەشبوو وەك(ئەسکەندەرونە) لە(وڵاتی شام) فراوانکرا و ڕوخسارێکی گریکیانەی پێدرا شاریش هەبوو وەك(ئەزمیر لە تورکیا) تەنها نەخشەی بۆ کێشراو لە دوای مردنی ئەو تەواوکرا، نموونەی تریش هەبوو کە بەگوێرەی هەمان پرۆگرام وەك لاسایی کردنەوەی هەمان نەخشەی ئەویش لەلایەن جێنشینەکانییەوە دروستکران[1153] و بنیاتنانی زیاتر لە شەست شاریش دراوەتە پاڵ سلوقیەکان و ئەوانیش بەشێکیان شوێنی نیشتەجێ بوونی کۆن بوون و لە ژێر ناوی گریکی و بەپێی دەستوری ئەو نوێ کرانەوە و هەندێکیش دانیشتوانیان کەم بوو، قەرەباڵغ کران، ژمارەیەکیش بە تازەیی و لە شوێنی گونجاو دروستکران، شار هەبوون کە ژمارەی دانیشتوانیان لە چەند سەد کەسێك تێنەدەپەڕی هی هەندێکیش لە چەند هەزار زیاتربوون، هەندێك لەو شارانە وەك سەربازگە بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی شڵەژاوی ناوچەکە

---

[1150] بڕوانە:

John Boardan and others: The oxford Illustrated history of Greece and the hellenestic world, p.٣١٥;

ادوین آریرورویچ گرانتۆسکی ودیگران: تاریخ ایران ، ص١٢٣.

[1151] الطبري: تاريخ الطبري ،ج٢، ص١١؛ريفون گست : مادة اسكندر ،دائرة المعارف الاسلامية،مج٣ ،ج١٧،ص٣٢٠.

[1152] STRABO:THE GEOGRAPHY BOOK V,p.٢٨٣.

[1153] نيقولا زيادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، العدد (٢٢)، ص١٨٨-١٨٩.

له كاتی ڕوودانی یـان مەبەسـتی بازرگـانی دروسـت دەكـران بەشێكیـشیان وەك دیـارترین شـار دەركەوتن بوونە ناوەندی گەورەی كەلتوری[1154]

جیاوازی سروشت و قەوارە و ئەركە سەرەكیەكانی ئـەو شـارانە،[1155] و زاڵـی شـێواز گـریكیش بەسـەریاندا، ڕەنگـە لـە جیـاواز نیـشاندانی ژمـارەی شـارەكان لـە سەرچـاوەكاندا و لـەوەش كـە وایكردووە هەریـەك لـە نووسـەران لـە دیـدی خۆیانـەوە، ئەنجامـدانی ئـەو پرۆسـەیە لـە ئامـانجی جیاوازدا، لێكبدەنەوە، ڕۆڵی هەبووبێ.

سەرچـاوەیەك كـە ئـەو مەسـەلەیە لـە میـسر و خۆرئـاوای ئاسـیا، بـە گـەورەترین دەسـكەوتی (مستدیم) ئەسكەندەر و جێنشینەكانی دەزانێ، پێیوایە كە هۆكارەكانی پشتی ئەو نەخشەیە بـە تەواوی دیارنین ونەزانراوە داخۆ مەبەست لێی، دامەزراندنی تۆڕی بنكە سـەربازی و سیاسـیەكان بوو، یان بە نیازی فراوانكردنی پانتایی كاریگەری شارستانیەتی گریك و شێوازی ژیانیان بـوون لە ڕۆژهەڵات، بەڵام ئەنجامەكە بە ڕوونی لـە بەهلینـستی (مهلنـسا) بـوونی ڕۆژئاڵاهـەتی نزیـك، ئـەویش بـە پلـەی جیـاواز و لـە گـۆڕینی قـووڵی شـێوازی ژیـانی شـاریانە، لـە ناوچـەكەدا، دەبینێ[1156].

هەیە لە گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنە گرنگە لە سەرەتادا ئامانجی سەربازی بەدی دەكات، تا ئابوری و دەوڵەتی، بەڵام گرنگـی ئـەو سیاسـەتە بەرەبـەرە سـنووری نیـەتی ئەسـكەندەری تێپەڕانـدووە و بەتایبەتیش جێنشینەكانی، كە توندتر و ڕێكخراوتر پەیڕەویان لێكرد، وای لێهـات ئـەو شـارانە دواتر ببنە پاڵپشتی بەهێزی دەوڵەت[1157].

بەواتە پرۆسەكە بە پلەی یەكەم بۆ مەبەستی جەنگ و بەدیهێنانی بنكـەی سـتراتیژی ئەنجامـدرا و بە زۆریش لەو ناوچانە، دروستكران كە بۆ سەقامگیری دەسەڵاتی ئەسكەندەر، گرانبوون، كەچـی

---

[1154] John Boardan and others: The oxford Illustrated history of Greece and the hellenestic world, p.٣١٥-٣١٦.

[1155] نقولا زيادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، العدد(٢٢) ، ص١٨٩.

[1156] جورج رو: العراق القديم، ص٥٥٥.

[1157] ميخائيل ميخائيلوويچ دياكونۆف: تاريخ ايران باستان، ص١٧٤-١٧٥؛ مرتضى راوندي: تاريخ اجتماعي ايران،ج١، ص٥٩٣.

دواتر هەندێکیان بەتایبەت کە دانیشتوانیان سەرباز نەبوون، بوون بەمەڵبەندی پیشەسازیو بازرگانی[1158].

کردنی ئەو شارانە بە ناوەندی بڵاوکردنەوەی شارستانیەتی هیلنی، یەکێکی تر لەو مەبەستانەی پشت دروستکردنیانەوە دەبینرێت، بڵاوبوونەوەش لە هەزاران کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕێیانەوە -ئەوشارانە-، وەك گۆڕانێکی کەلتوری، بێگومان لە ئەنجامە کاریگەرەکانی لەشکرکێشەکە[1159] و شەڕی گۆگامیلا بوون.

بەوەش کە گریکەکان(شار) بە مەڵبەندی سروشتی ژیانی سیاسیو ڕۆشنبیری دادەنێن، هاوڕێ لەگەڵ دروستکردنی شارەکاندا پەروەردە و دابونەریتی کۆمەڵایەتیشیان هێنایە ناوەوە[1160].

ئەسکەندەر بڕوای وابوو کە شارستانیەتی گریك چارەسەرە بۆ جیاوازی بیروباوەڕ و تێڕوانین و فەلسەفە و ڕای کۆمەڵایەتی خەڵك، خۆشی بە پەیامبەری شارستانیەتی گریك واتە هزر و فەلسەفەو ئەدەب و هونەر، ئابوری، پیشەسازی....، بۆ هەموو مرۆڤایەتی، دادەناو پێشی وابوو کە لەسەریەتی ژینگەیەك بۆ هلینیەت دروستبکات، کە تیایدا گەشە بکاتو ڕۆڵی خۆی ببینێ، ئەو ژینگەیەش کە ئەو دەیتوانی تێیدا گەشە بکات و پێشبکەوێت و کاریگەری هەبێت، (شارە)، بۆیە دەبوو شار دروست بکات و بە خەڵکی گریك ئاوەدانیان بکاتەوە، تا بەهۆیەوە شارستانیەت بڵاوبێتەوە و نەخۆشیە مرۆڤایەتیەکانیش لەناوبچن[1161] کە ئەمەش بەرەنجامی قووڵی کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە.

هەندێك بۆ قسەکردنی لە بارەی دروشمو مەبەستی برایەتی، ئەو مەسەلەیە دێننە گۆڕێ و زۆرترین شارە دروستکراوەکانی ئێران و ئاسیای ناوەڕاست و هندستان بە نیشانەی هەوڵی ئەسکەندەر بۆ بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی(شار)ی گریکی، لەو ناوچانەدا کە شارەزای نین، دەژمێرن[1162].

---

[1158] ادوين آريدويچ گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران ، ص١٢٤.

[1159] John Boardan and others: The oxford Illustrated history of Greece and the hellenestic world, p.٣١٥.

[1160] جلانڤيل داوني: انطاكية في عهد ثيودوسيوس الكبير، (بيروت:١٩٦٨)، ص٢٩.

[1161] نيقولا زيادة: حكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، عدد (٢٢) ، ص١٩١.

[1162] ادوين آريدو ويچ گرانتوسكي وديگران: تاريخ ايران ، ص١٢٣.

ئەمــەش مانــای وایــە، کــە شــارەکان چ ئەوانــەی وەك قــەلاّ و ســەربازگە لــە شــوێنی ســتراتیژی هەڵکەوتوون، چ وەك شاری بازرگانی، یان بەڕێوەبردن و لە ناوچـەی ناوەنـد هەڵکـەوتبن، یـاخود مـەڵبەندی پشوودان بووبن و کەوتبنە سەر ڕێگا، ئەوانـەش کـە بـۆ نیـشتەجێکردنی ڕەوەنـدەکان بنیاتنرا بوون، تێکڕا لەگەڵ ڕاییکردنی ئـەو مەبەسـتەی بـۆی دروسـتکرابوون، ببوونـە ناوەنـدی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و شارستانیەتی گریکیش[1163].

پەرپێـدانی شـاران، لـە حاڵێکـدا کـە ئامرازێـك بـوو بـۆ بـەگریکیکردنی سـەر زەمـینی تـازە ڕێگایـەکیش بـوو بـۆ بـە زۆر نیـشتەجێکردنی دانیـشتوان و پەیـداکردنی داگیرگـەی نـوێ، ئـەو هۆکارەش بۆ پادشا، کاریگەرترین ڕێگای بەهێزکردنی توانای ئابووری و دەسەڵاتی سیاسی بـوو- کەشەڕی گۆگامیلا دەرفەتی دەستخستنی ڕەخساند-، چونکە زەویەکانی شـاری پێـوە پەیوەسـت دەبوون و باجیشی لە دانیـشتوان وەردەگـرت و سـەربازە پەککـەوتوو دیلـەکانیش کـە دەبـوو لـە خاکی خۆیان دوور بخرێنەوە- تیدا نیـشتەجێ دەکـرد، لەگـەڵ خـەڵکی ڕۆژهـەڵاتیش تێکـەڵاو و شارەزای یەکتر دەبوون، بۆ بینـاسازی و ئاواکـاریش سـوود لـە کۆیلـە و دیلـەکان دەبینـرا[1164].

جێـی ئامـاژەیـە کـە ئەسـکەندەر لـە شـارە نوێیـەکانـدا گریـك وخـەڵکی ڕەسـەنی ناوچـەکەی تێکەڵدەکرد -کەچـی پـەیڕەوکردنی ئـەو سیاسـەتە دوای خـۆی لـە هـەموو ناوچـەکان وەك یـەك بەردەوام نەبوو، بۆ نموونە بەتالیمەکان نەیاندەویست تێکەڵی میسریەکان بن[1165].

ئەو بۆ ئەو مەبەستە جگە لە دیل و پەککەوتە و بریندار -کە باسمانکرد- لـە سـەردەمی خۆیـدا ژمارەیەکی زۆر (گریك)ی بۆ ئێران کۆچ پێکرد ولەو شارانەدا نیشتەجێی کردن[1166].

بنیاتنانی شارەکانو کۆچپێکردنی ئەوروپاییەکان بۆ ئاسیاو-هەوڵی بردنی ئاسـیاییەکانیش بـۆ ئەوروپا -وەك دوو ئەنجامــی لەشکرکێشــی وشـــەڕەکان- بـۆ پتـەوکردن و بـەردەوامی دان بـە چالاکــی و هەنگاوەکانــی و بـە مەبەسـتی ئاوێتـەی یەکـــتری کـــردنی هـەموو دانیـشتوانی ئیمپراتۆریەتە بەرفراوانەکەی، پێکهێنانــی نەتەوەیەکی نوێ لێیان -دەشێ بەشێکـــی- لـەوەوە

---

[1163] جلال یحیی: التاریخ الاوروبي ، ص٧٢.

[1164] نینا ویکتورونا پیگولوسکایا: تاریخ ایران باستان، ص٩٢-٩٣.

[1165] مصطفی العبادي: العصر الهلنستي(مصر)، ص١١٠-١١١.

[1166] STRABO:THE GEOGRAPHY BOOK, IV ,p.٢٢٩.;

شمس الدین سیدان: نهاوند در هزارەهای تاریخ، (تهران:١٣٧٩)، ص١٢٥.

سەرچاوەی گرتووە، کە خەڵکی مەکدونیا بە تەنها نەیدەتوانی پێداویستی زۆری ئەسکەندەر، بەهێزی مرۆیی، کە دەرەنجامی پرۆسەی فراوانکاری دەوڵەت بوو، پڕبکاتەوە، هەر لەو رووەشەوە بوو کە ژمارەیەکی زۆری لێیان، لە ناوچەکانی(باکتریاو سغد)، نیشتەجێکرد، بەمەش هەم داگیرکەر، بۆشایی دوور مەودای نێوان ناوچەکە و ناوەندی، پڕکردەوە و هەم قازانجی تایبەتی نیشتەجێکراوەکانیش، کە لەگەڵ پەیوەندیەکانی ئەسکەندەر هاوئاهەنگ بوو، بەدیهات[١١٦٧].

دەشکرێ بوترێ، کە بارودۆخی زاڵ، تێکەڵاوبوونی ئەوروپای بە ئاسیا سەپاندووە، بەتایبەت کە لەو کاتەدا، ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی پاش جەنگی گۆگامیلا نەمابوو چارەنووسی ناوچەکەش، بەدەست مەکدونیەکانەوە بوو لە پێناو چەسپاندنی دەسەڵات و چاککردنی بارودۆخیش لە ناوچەکەدا، ناچاربوون پشت بەو یارمەتیە ببەستن کە بەکرێگیراوە (مرتزقە) گریکیەکان، لە(سەرباز و زاناو پیاوانی ئابوری و بەڕێوەبردنی کارو هونەرمەندان) پێشکەشیان دەکردن، ئەمە و هەندێکیش هەرخۆیان بۆ پەیداکردنی بژێوی روویانکردە رۆژهەڵات ودوای مردنی ئەسکەندەریش رێژەی هاتنیان لە زیادبووندابوو، تێکرای ئەوانەش کەباسکران، هەڵگری شارستانی و رۆشنبیری هیلینی بوون و لەگەڵ خۆشیاندا هونەر و ئەدەب و شێوازی باوی ژیان و سیستەمی شارستانیەتی و یانەی وەرزشی و رۆشنبیری و ئاهەنگەکانیان دەهێنا، چونکە لە نیشتیمانی خۆشیان دووركەوتبوونەوە، ناچاربوون تێکەڵی رۆژهەڵاتیەکانبن کە لە نزیکیانبوون، لەوەشدا چاکە بۆ ئەسکەندەر دەگەرێتەوە، کە دەرگای بۆ کردنەوە[١١٦٨].

لە راستیدا نەخشەی ئەسکەندەر وابوو، کە هەرچی زیاترە خەڵکی گریك و رۆژهەڵاتیان لە یەکتری نزیك بکاتەوە، ئەوان بهێنێتە رۆژهەڵات، ئەمانیش بباتە گریك، بەڵام لەم رووەوە هەر یەکەمیانی بۆ ئەنجامدرا[١١٦٩]، رۆژهەڵاتیەکان(ئێرانیەکان) ملیان نەداو لە سەردەمی سلوقیشدا، ئەم هەوڵە هەر بەردەوام بوو، بەڵام بێئاکام بوو[١١٧٠].

---

[١١٦٧] الفريد فن گوتشميد: تاريخ ايران، ص٢٨.

[١١٦٨] هارولد ادريس بيل: الهلينية في مصر، ص٤٩.

[١١٦٩] ميخائيل ميخائيلو ويچ دياكۆنوف: تاريخ ايران باستان، ص١٧٥.

[١١٧٠] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص٤٢٦.

لەمیانەی ئەو هەوڵەشدا ژمارەیەکی زۆر خەڵکی گریك لەلایەن ئەسکەندەرەوە کۆچیان پێکران هێنرانە ناوچەکە و جێنشینەکانیشی هەمان ڕێگایان گرتەبەر، کۆچەرانیش لە ئاسیای بچووك و شام و عێراق و ئێران و تورکستان بگرە تاسنووری هند، جێگیرکران[1171]. جێی ئاماژە پێکردنە، کە سلوقس تەنها کەسێك بوو، کە تێکۆشانی توندی کرد بۆ بەردەوامبوونی کۆچ پێکردنی خەڵك، کە لەلایەن ئەسکەندەرەوە دەستی پێکرابوو[1172]. لەو بارەشەوە بەمەیلێکی گریکیانە وتراوە کە ئەو، -واتا سلوقس- شارستانیەتی گریکی لەجیهانی بەربەریدا، لەڕێگای دروستکردنی شاردا، بڵاوکردەوە و بەوەش بەرەبەریەتی لەناوبرد[1173].

سەرەڕای ئەمانە بە هەزاران بازرگان و پیشەوەری گریکی بە ئومێدی قازانج و ئەنجامدانی مامەڵەی سوودمەند لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا، بەدوای ئۆردوی ئەسکەندەردا، بەڕێکەوتن، زۆر لەوانە بە بەکارهێنانی ئەزموونی پڕ بەهای خۆیان، لە شارە گریکیەکاندا نیشتەجێ بوون، پەیوەندیشیان بە ناوەندە بازرگانیەکانی گریك، فراوانبوونی مامەڵەی بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئاسان کرد، پەرەسەندنی پەیوەندی ئابوریش کۆمەکی بە پشکنینی جوگرافیایی و دەسەڵاتی هونەری و زمان و زانیاری گریکی، لە ڕۆژهەڵاتدا، کرد[1174] واتا تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی گریك بە ڕۆژ هەڵاتیەکان یارمەتیدەربوو بۆ پەیوەندیە ئابووریەکان و تێکەڵاوی بازرگانان.

ئەمەو بارودۆخی ئابوری و نیشتەجێ بوونی باوی سەردەمی هیلنستی، کاریگەری جۆراوجۆری لەسەر شارە کۆنەکانیش هەبوو، بۆ نموونە نەمرودی وەك گوندێکی هەڵکەوتوو لەسەر ڕێگای دیجلە، بوژاندەوە و شارەکانی وەك نەینەوا و ماری دوای چەندین ساڵ لە چۆڵکران، ئاوەدانکرانەوە[1175] واتا لە ڕێی ئاوەدانکردنەوەی شارە کاولبوەکان و بنیادنانی شاری نوێ، هەلومەرجی تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی وئابوری لە نێوان ڕۆژهەڵات و

---

(1171) رضا شعباني: مرور كوناه بر تاريخ ايران، ص٨٣.

(1172) الفريد فن گوتشميد: تاريخ ايران، ص٤٨؛ شمس الدين سيدان: نهاوند در هزارەهای تاريخ، ص١٢٦.

(1173) جلانڤيل داوني: انطاكية في عهد ثيودوسيوس الكبير، ص١٢٥.

(1174) مرتضى راوندي: تاريخ اجتماعي ايران، ج١، ص٥٩٤.

(1175) جورج رو: العراق القديم، ص٥٥٧.

ڕۆژئاوادا برەوێکـــی دیاری بەخۆوە بینـی. بەشێکی زۆری خەڵکی بیابان و دەشتەکانیش، بوونە شارنشین و لەو شارانەدا نیشتەجێ بوون، بەمەش کۆمەڵێك خەڵك لـەجیاتی خـەریك بـوون، بـە ڕەنێوهێنانی کشتوکاڵ، کەوتنە کارکردن، لەبواری بازرگانیدا[1176].

نووســەران ســەبارەت بـە ڕەوشـی ژیـانی خـەڵك لـە ژێـر سـایەی ئـەو دەســەڵاتە و پرۆســەی لەشکرکێشیەکە و کاریگەری و ڕەهەندەکانی،هاوڕانین. هەیانە بەگشتی ئەرێنیانـە لێیـدەڕوانن و لەمیانەیدا بەرژەوەندی گشتی بەدیدەکەن، کەڕەنگە جگە لەسەرسامیان بـە شارسـتانیوکەلتوری گریـك وبریـار و کـارە دیارەکـانی ئەســکەندەر وەك دروســتکردنی شــار و بەســەربازگرتنی ڕۆژهەڵاتیان و پرۆسەی هاوسەرگیری...هتد، کە زۆرجار زەقدەکرێتەوە، کرابێتە سەنگی مەحەك و ڕووی نێگەتیڤی ڕەوشەکە پەردەپۆش بووبێت. هەرچەند ناکرێ لە هەموو ئەوانە نەرێنی بـڕوانین و شوێنیان لەسەرکایە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگا لەبەرچاو نەگرین، بەڵام ئەوە بێ هەڵـسەنگاندنی دروست، ناکرێ. چـونکە ئاسـاییە شـتی لـەو جـۆرە زۆرجـار تـەنها بـۆ چاوبەسـتەیی وتـەکتیکی چەسپاندنی دەسەڵات، بن،[1177] کەئێمەی کورد پێـی نـامۆنین وبـەردەوام بەسـەرماندا ئـەزموون دەکرێت، بۆیە دەبێ لە تاوتوێکردنی وەها پرسێکدا، پرسیاری گرنگ ئەوەبێت، کەداخۆ تاچـەند ئەوشوێن دانانە وەك وەڵام لە ئاستی پێداویستی گەلاندابووە ؟ تـاکوێ ئـەو تـەرزی بیرکردنـەوە و ڕەفتارە چۆتە قاڵبی ئاکاریو لە گیانی بەردەوامی (روحیە الاستمرار) ، بەهرەمەند بووە؟

ئەسکەندەر یەکەم گریکی خـاوەن بـیر وکـردار بـوو، کـە پێـی وابـوو هیلینـزم لـە وڵاتـی گریـك سـەریهەڵداوە، بـەڵام بـەوێوە ناوەسـتێ و گـەلانی تـریش دەتـوانن قبـووڵی بکـەن، بەشـداری پێشخستنی بکەن، لە کاتێکدا واباوبوو، کە جگە لە خۆیـان کەسـی تـر، گونجـاوی سـەربەخۆیی نیە، بەڵکو بۆ ئـەوە ئافەریـدە بـوون، کـە ببنـە کۆیلـە و بـەکاری جۆراوجـۆر هەڵـسن، تەنانـەت ئەرستۆش وای دەبینی[1178].

ئەو ئەگەرچی بڕوای وابوو، کە یەکخستنی وڵاتی داگیرکراو پێویستی بـە بڵاوکردنـەوەی هونـەرو ئەدەب و فەلسەفەو سیستەمی سیاسی و ئابوری و پەیوەندی کۆمەڵایەتی هیلـینی هـەبوو، لـەو

---

[1176] جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص٧٢.

[1177] يورف يوسهوفر: ايران باستان ، ص١٤١.

[1178] نيقولا زيادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، العدد(٢٢)، ، ص١٩١.

ڕێگایەشدا تێکۆشا، کەچی لە ماوەی کەمی فەرمانڕەوایەتیدا، نەیتوانی ئیشی دوور مەودا بکات، ئەوەی لە دەستی هات نەخشەدانان و ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای جێنشینەکانی بوو[1179].

ئەو لەمیانەی داگیرکاریەکەیدا، بواری کارکردنی لە سوپاو بازرگانیدا، بۆ دانیشتوانی ئەو وڵاتانە کردەوە کە داگیریکردن، بەوەش ئاراستەی توانستی زۆری مرۆیی، بۆ دروستکردنی بینای ئاشتی و شەڕ، مسۆگەرکرد و کەرەسەی پێویستیشی بۆ گەشەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی دابینکرد، بەوەش زەمینەیەکی بە پیت، بۆ بەیەکگەیشتنی ژیاریەکان، ڕەخسا[1180] کەتێکەڵاوی ئابوری و کۆمەڵایەتی، بنەما پتەوەکەی بوو.

گرنگی پەلامارданی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی، لەوەدابوو کە بوو بەهۆی نزیکخستنەوەی ئابوری و ڕۆشنبیری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، دروستکردنی شارەکانیش بەوە کە بوون بەمەڵبەندی تێکەڵاوکردنی گریك و-مەکدونیەکان، بە خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە و ئاڵوگۆڕی دەسکەوتە ڕۆشنبیریەکان، ڕۆڵی فراوان و قووڵیان لەو نزیکبوونەوەیە یاری کرد[1181].

جێی ئاماژەیە، کە تێکەڵاوی گریکی و ڕۆژهەڵاتیەکان هەر ئەوەنەبوو کە ئەوان خوونەریتی خەڵکی گریك وەربگرن، بەڵکو ئەوانیش زۆر داب و دەستوری ڕۆژهەڵاتیانیان پەسندکرد و فریوخواردوویی و کەمتەرخەمی و خراپکاری جۆراوجۆریان، لە ڕۆژهەڵات، زۆر چاکەی باب و باپیرانیانی لە بیربردنەوە[1182].

بەتایبەتیش ئەو کاریگەریە لەسەر ئەسکەندەر و هاوڕێکانی، دیاربوو، لەو بارەوە وتراوە کە گوایە ئەسکەندەر بەرێزەوە لەگەڵ هەندێك نەریت و ڕەوشتی ئێرانیان، هەڵسوکەوتی دەکرد، بە ڕاشکاوی بە مەکدونیەکانی سەرکەشی دەوت، کە ئێمە نەریت و ڕەوشتی خۆمان بۆ بیانیان بەبەین، دەبێ هەندێك نەریت و ڕەوشتی ئەوانیش پەسندبکەین[1183].

---

(1179) نفس المرجع،ص١٩٥.

(1180) بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني، ص١١٤.

(1181) ف. دياكوف و س.كوفاليف: الحضارات القديمة، ج٢، ص٢٩٧.

(1182) الفريدفن گوتشميد: تاريخ ايران ، ص٣٥؛ حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، ج١، ص٥٧.

(1183) مرتضى راوندي: تاريخ اجتماعي ايران، ج١، ص٥٨٧.

ئاستی هاوبەشکردنی گەلان لە شارستانیەتی هلنستی و ڕادەی کاریگەری ئەو ڕەوشەش، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە، بۆ نموونە بەشداری ئەخمینیەکان لەو شارستانیەدا زۆر سنووردار بوو ئەویش لەبەر دوریان لە بێشکەی هیلنیەت و ئەو دوژمنایەتی و ڕقەش کە بەهۆی شەڕەکانی پێشوو لە نێو ئەو دوو گەلەدا دروستببوو و لەبەرئەوەش، کە نەتەوەیەکی ڕەسەن و خاوەن شارستانیەتێکی ڕیشە قووڵن -ئەوە بۆ نەتەوەکانی وەك میدی و بابلی... هتد ڕاستە- بە پێچەوانەی ئاسیای بچوك، کە پێش ئەسکەندەر بە چەندین سەدە، لەلایەن گریکەکانەوە داگیرکرابوو و لەسەر کەناری دەریاش شاری گریکی گەشەسەندو هەبوون کە ڕۆڵی گرنگیان گێڕا[1184].

هەروەها ناوچەی فورات زۆر نەکەوتبووە ژێر کاریگەری ڕەوتی هیلینستی، هێندەی کاری لە وڵاتی شام، لە ڕۆژئاوای ئەو ڕووبارە کردووە، بە گشتیش هەوڵی هلنستی بە شێوەیەکی قووڵ لە ڕۆژهەڵات، سەرکەوتوو نەبوو، چونکە چینی فەرمانڕەوایەتی گریك، کەمبوو و بەهێواشیش لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە تێکەڵ دەبوون و گرنگیدانیان تەنها لە شارەکاندا کورتکردبۆوە و گوندەکان پشتگوێ خران، ئەمەش وایکرد خەڵکی لادێ، هەر لەسەر زمان و نەریتی خۆیان بمێننەوە و زۆر نەکەونە ژێر کاریگەری ئەو جوڵانەوەیە[1185].

لەو کاریگەریەش کە هەبووە، تایبەتمەندی گەلانی ناوچەکە ڕۆڵی تێدابینیوە، بۆ نموونە سروشتی میللەتی فارس(ئەخمینی)-سەرەڕای سنوورداری بەشداربوونیان لە شارستانی هیلینستی کە ئاماژەمان پێدا- وا هەڵکەوتووە، کە مەیلی وەرگرتنی شێوازی بیانیان زۆر بووە و زۆر کاریان تێکراوە، وتراوە کە (هێرودۆت)یش تێبینی ئەو مەیلەی کردووە، پێی وایە کە هیچ گەلێك وەك(فارس)نیە، کە بەئامادەیی تەواو نەریتی بێگانە، وەربگرێت، ئەوان ئەگەر شێوەیەك لە شێوەکانی خۆشگوزەرانیان بیست، دەیکەنە شتی تایبەتی خۆیان[1186]. خەڵکی تریش هەیە کە توانای پێشکەوتن و قبوولکردنی شتی نوێ وەرگرتن و خاوەندارێتیان بۆ ڕەوتە نوێیەکانی

---

[1184] فليب حتي: موجز تاريخ الشرق الادنى، ص١٠١.

[1185] تغريد جعفر الهاشمي وحسن حسين كعلا: الانساب تجليات الازمنة، تاريخ وحضارة بلاد الرافدين- الجزيرة السورية، (دمشق:٢٠٠١)، ص٢٨٩.

[1186] دونالد ولبر: ايران ماضيها وحاضرها، ص٣١.

شارستانی و تواندنـەوەی لـە بۆتـەی کـەلتوری خۆمـالّی و تێکـەلکردنی بـە سروشـتی تایبـەتی خۆیان، لە تایبەتمەندی گەلانی ناوچەکە دەزانیّ[1187].

هەلّبەتە کاریگەری شارستانیەتی گریك تاچەندین سەدەش لە ئێران هەرمابوو، ئەوان توانیبویان لە هونەری بیناسازی و پەیکەرسازی و بـاقی پیـشەسازیەکانی تـری نایـابی گریکـەکان، بـەهرە وەربگرن، بەلاّم ئەم کاریگەریە، کەمتر لە گیاندا رِەنگیداوەتەوە، لە راستیدا چـونکە داگیرکـاران خۆیان بەرەگەزی بالاّتر دەزانی، هەولّی بەگریکیکردنی رەوشت و رەفتار و شارستانیەتی خەلّکی ناوچەکەیاندەدا، هەلّبەتە ئەو تەگبیرە تـا ئەندازەیـەك، کاریگـەری هـەبوو، کـە توانیـان هەنـدێك دابونەریتیان پێ قبوولّ بکەن، بەلاّم زۆربەی خـەلّك، پارێزگارییـان لـە دیـن و بیروبـاوەرِ و بـاقی ئادابـەکانی خۆیـان کـرد، رۆلّـی سەرەکـیش لـە جێبەجـێ کردنـی ئـەو نەخشـەیە بـۆ سـلوقیـەکان دەگـەرِێتـەوە کـە بەردەوامبـوون لەسـەر کـۆچپێکردنـی گـریکـەکان و سـووربوون لەسـەر بلاّوکـردنەوەی رەگـەز و فەرهەنگـی خـۆیان لە ناوچەکـەدا[1188].

یەکێکی تر لـەو شـتانەی کـە لـەو سـەردەمەدا ئامـادەیی هـەبوو بەنسبەت گریکـەکان کـە لـە هەرەسـهێنانی سیـستەمی شـارو پیرۆزیـەکانی و ئـەو بۆشـاییەش کـە دروسـتیکردبوو و بـە بەخواکردنی پادشا پرِ نەدەکرایـەوە، هـەروەها لـەو شـەرِ و شـۆرِانەش کـە لـەنێو جێنـشینەکانی ئەسـکەندەر سـەریهەلّداو لـە شێوازی ژیـانیش کـە ململانـێ لـە پێنـاوی سـاماندا، پایـەکانی پێکـدەهێنا، سەرچـاوەی گرتبـوو، هـەروەها لــە ئــەنجامی داگیرکاریــەکانی ئەســکەندەر و هاتنەدەرەوەی سامانی کەلّەکەکراوی ناو گەنجینەکانی ئەخمینی و ئاسانی گواستنەوە، لـە نێـوان شارەکاندا، بازرگانی ئەوەی پێویست بوو، چالاك بوو و ژیانی ئابوریش گەشەی کـرد و سـامانی دەولّەمەندەکانی زیاترکرد و هەژارەکانیشی هارِی، خێرا دەستاو دەسـتکردنی شـتومەك و شـەرِۆ شۆرِیش، لە هەلاّوسانی ئابوری و بەرزبوونەوەی نرخ، شـوێنی هـەبوو، ئـەوەش لـە ژیـانی گـشتی خەلّکدا رەنگیدایەوە، دەولّەمەندانی خستە ناو ژیانی رابوون و هەواو هەوەس و ، کەچی هـەژاران کەوتنە جێهێشتنی نیشتمان و گیانی بێزاری و تورِەیی تیایاندا سەریهەلّدا[1189].

---

[1187] تغريد جعفر الهاشمي وحسن حسين كعلا: الانساب تجليات الازمنة ، ص٤٩٤.

[1188] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص٤٢٥.

[1189] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية،ج١، ص١٨٧.

واته دژایەتی چینی هەژار و دەوڵەمەند و کەلێنی نێوانیان لە فراوانی و زیادبووندا بوو، لەگەڵ بەرزبوونەوەی نرخی شتەکانیشدا، کرێی کرێکار هاتبۆ خوارەوە و چینی خوارەوەش ناچاری قەرزداری کرابوو، هەوڵی لێکۆڵینەوەش لە کێشە کۆمەڵایەتیەکان وجموجۆڵ بۆ لابردنی قەرز و دووبارە دابەشکردنەوەی ناوچەکان و ئازادکردنی بەندیەکان، کە لەئارادا بوو ، بەگشتی سەرکەوتوو نەبوون، یارمەتی دەوڵەمەندانیش کە بەویستی خۆیان و بەشێوازی جۆراوجۆری وەك پێدانی دانەویڵە بە هەژاران و بەنرخی کەم یان هەندێك جار بێ بەرامبەر و بەشداری پێکردنی خەڵك لە بواری ڕۆشنبیری، چارەسەری کێشەکانی پێنەکرا، تەنها ئەوانە کە هەوڵی چارەسەری ڕیشەییاندەدا، سەرکردە شۆڕشگێڕ و فەیلەسوفە یوتۆپیەکان بوون، هەروەها لە کۆمەڵگای هیلنستیدا کۆیلایەتی هەر بەردەوام و زیاتر گەشەیکرد و بەخراپیش ڕەفتار لەگەڵ کۆیلەدا دەکرا[1190]. لەو بارەوە وتراوە کە (هیلنستی، شێوەی گەشەکردوتری کۆمەڵگای کۆیلەداری گریك نیشاندەدات کە لە زۆر لای ڕۆژهەلاتیش بلاوبۆوە، ئەو ولاتە ڕۆژهەلاتیانەش کە لە ژێر قەڵەمڕەوی فەرهەنگی و ئابوری دەریای ناوەڕاستدا قەراریان گرتبوو، بەنۆبەی خۆیان لەو پێشکەوتنەدا پشکیان، هەبوو)[1191].

لە نێو ئەو شتە قێزەونانەی لەو سەردەمەدا ئەنجامدراون، ڕەواییدانی ئەسکەندەر بوو بە داگیرکەر تا لەبڕی کوشتنی پیاوان و بەدیلکردنی ژن و منداڵ، هەموو دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکە بفرۆشێ، بەلام مەمالیکە جێنشینەکانی ئەو نەریتە دزێوەیان لەناوبرد[1192] و ئەو هەزاران کەسی بۆ ئاسودە بوونی گیانی هەفستون کردە قوربانی، لە کاتێکدا نەریتی قوربانی کردنی بە مرۆڤ لەلای پادشایانی ئەخمینی پەسەند نەبوو وتراوە، کە دارا یەکەم نوێنەری ناردە قرتاجینە تا ڕۆیشتن لەسەر ئەو نەریتە کۆتایی پێ بهێنن[1193].

---

[1190] IRWIN ABRAMS and others: Ahistory of world civilization,(chicago:١٩٦٣) v o l .I, p.١٥٢.

[1191] آ.برگرودیگران: تاریخ جهان باستان، ج٢، ص٢٥٥؛ ف.دیاکۆفوس.کۆفالیف: الحضارات القدیمة، ج٢، ص٣٩٩.

[1192] محمود ابراهیم السعدني: تاریخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ص١٣.

[1193] حسن پیرنیا: تاریخ ایران قبل از الاسلام، ص١٤٢.

لە سەردەمی هلنستیداو لە نێو بنەماڵەی دەسەڵاتداراندا — وەك نموونەی كاریگەری خراپی رۆژهەڵات لەسەر گریك — هاوسەرگیری نێوان خوشك و برا پەیدا بوو كە پێشتر نەبوو و گریەكەكان لێی پەست بوون، یەكەم كەسیش بەتلیموسی دووەم فیلادلفوس بوو و كە لەگەڵ ئەرستیوی خوشكیدا ئەنجامیدا، هەروەها دیاردەی كوشتنی براو خوشك و دایك و ژن وەك گرنگترین خاسیەتی كۆشكی پادشایەتی مەكدونی، ئامرازێكی ئاسان بۆ پاكتاوكردنی جەستەیی، لەو سەردەمەدا بڵاوبۆوە[1194]. كە ئەمە پرۆسەیەكی باوی سەردەمی ئەخمینیەكان بوو، كە پێشتر لێی دواین.

شوێنەواری زاڵی ژیانی مادی لە پەیوەندی كۆمەڵایەتی نێوان خەڵك و لە ئەدەب و هزر و هونەر و زانستیشدا، دیاربوو، پەیوەندی كۆمەڵایەتی لەسەر ئاستی چینە باڵاكانی نزیك لە دەسەڵات، لەسەر بنەمای مەراییكردن، بوو بەو شێوەیە كە لە دەرباری پادشایان بەڕێوە دەچوو، ئافرەتانیش بەهرەمەندبوون لە ئازادی و دەگەڕان بە دوای پیاوانی ڕابواردنخواز و جوانی دۆست و نەریتی ریش تاشین بڵاوبۆوە، هەروەها هەوڵی سنووردارکردنی منداڵ زۆری درا[1195]، و رێگە بە كوشتنی منداڵ بە زۆریش كچان، درا، چ لە سكی دایكیاندا یان بەزیندویی[1196].

لەو سەردەمەدا هۆكارەكانی خۆشگوزەرانی و ڕابواردن بۆ دانیشتوانی فەراهەم بوون، كە پێشتر لەوێنەیان نەبوو، دەوڵەمەند كەوتنە دروستكردنی خانوو بەبەرد لە جیاتی قوڕ، بەرهەیوانی بە كۆڵەكە یان بەهەر چوارلادا دروستدەكرد، بەڵام زۆربەی ژوورەكان هەر لەسەر شێوەی كۆن بوون، بەرد ڕێژ نەكرابوون(بدون تبلیگ) كەچی هۆڵی دانیشتنی گەورە ڕاخرابوو بەفەرش(فیسفیسا)ی جوان و دیوارەكانیشی دەنەخشێنران بە وێنە و ژوورەكەشی -ئەگەر سامانی خاوەنەكەی تێی هەڵێنابا-، مەڕمەڕ دەكرا، كەلوپەلی ناوماڵیش لەهی پێشان جوانتر بوو، كە پێگەیشتوویی و سەلیقەی دەگەیاند، بۆ یەكەجار بۆ پێداویستی ماڵ، ئاو بۆریكێشكرا، كە جاران بەقاپ و قازان لە دوورەوە دەیانهێنا[1197].

---

[1194] محمود ابراهیم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ص١٦-١٧.

[1195] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٨٨.

[1196] IRWIN ABRAMS and others Ahistory of world civilization, voll.I, p.١٥٢.

[1197] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٠-٣٢١.

هەر لە بارەی ئەو سەردەمەوە یەك لە نووسەران نوسیویەتی کە لەگەڵ دەرکەوتنی بیری جیهانگەرایی و زمانی هاوبەش و تەشەنەکردنی گیانی برایەتی - کە لە شوێنی خۆیان لێیان دواین- باس لە زۆر تایبەتمەنی تری وەك بەرزبوونەوەی پایەی ئافرەت و پەیدابوونی یانەی پیاوان و ژنان بەتایبەت لە ئەسکەندەریە و ئەسینا، سەندیکای پیشەیی کۆمەڵایەتیو دینی، بەڵام هەموویان تەرخان بوون بۆ چینی دەسەڵاتداران و کاربەدەستە جۆراوجۆرەکانی گریك، گەلی حوکمکراو و چەوساوە هیچ پشك و بەشداریەکی ئەرێنیان تێدا نەبوو، بەواتە گەلانی ناو ئیمپراتۆریەتی مەکدونی یان مەملەکەتە نوێیەکانی هیللنستی لە ڕۆژهەڵات سوودی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان لەوە نەبینیوە کە لەخاکیان دەگوزەرا، چونکە داگیرکەر سوود بە گەلی داگیرکرا و ناگەیەنێ، پێی وایە ئەو هەموو خاسیەتانەی پێشتر باسکران و بوونە جێی باسکردن و پیاهەڵدان، جگە لە ئیمتیازی چینی فەرمانڕەوا، کە لەسەر حسابی گەلانی ستەملێکراو بەدەست هاتوون، هیچی تر نیە، ئەمەش شتێکی نوێ نییە، خۆشگوزەرانی ئەو چینە دیاردەیە کە لە هەموو کۆمەڵگا و شارستانیەتێك ئامادەیی هەیە، ئێستاشی لەگەڵدابێ، تەنانەت ئەگەر کۆمەڵگاکە هەژار بێت و لە برسانیش بناڵێنێت[1198].

گومانی تێدانیە کە لە ژێر سایەی داگیرکەردا چاوەڕوانیکردنی ئازادی و بەختەوەری بە بەرنامە، بۆ گەلی ژێردەستە، وەك نووسینی سەربەفرە و جێی دڵخۆشی و هیوا بەخشین نیە، تەنها لە کاتێکدا نەبێ کە کاری لەو جۆرە پەرە بە نەخشەی گەیشتن بە ئامانجەکانی داگیرکەر بدات و لەگەڵیان ناکۆك نەبێ، زۆریش ئەستەمە ڕێبکەوێ، بەرژەوەندیەکانی هەردوولا سەد لەسەد، وەك یەك بێنەوە، بەڵام زیادەڕۆیی و دەمارگیریشە پێمان وابێ سەرلەبەری پرۆسەکە و ئەو کارانەش کە لە میانەیدا ئەنجامدراون، بچوکترین سوودی بۆ ئەو گەلە تێدا نەبووبێ، بەتایبەت کە دەزانین لەگەڵ هەموو جیاوازیەکانی نێوان ئەو دووبەرەیە، هێشتاش دەرفەتی هەندێك(لەیەکچون) دەمێنێ، تەنانەت قەدەغەکردنی نەریتێکی خراپی جێگرتوو لەناو گەلی ژێر دەستدا کە لەلای داگیرکەر پەسەند نەبێ، یان چەسپاندنی دابێکی باش کە میللەتی ژێردەستکراو و پێی نامۆبێ و لە شانی گرانبێ، بەشی خۆی سوود دەگەیەنێ، ماقوولیش نیە ئەو هەموو خاسیەتە چاکانەی دراونەتە پاڵ ئەو سەردەمە لە بچوکترین درزیشەوە، نەڕواننە سەر بەرژەوەندی گشتی،

---

[1198] محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج١، ص١٢-١٤.

ڕەنــــگە یاســـاغ کـــــردنی دوو نەریـــتی کۆمـەڵایـەتی قیێــزەون وەك نموونـە مەبەســــتەکەمان ڕوونـــتر بکاتەوە.

خەڵکی باکتریا و سغد لاشەی مردوو ئەوانەی بەهۆی پیری و بیمـاری لەکاردەکـەوتن، دەیاغـستە بەردەم(سەگ)انێك کە تایبەت بۆ ئەو مەبەستە پەروەردە دەکران و پێیان دەوتـرا (ئانناخیاسـتا = گۆرهەڵکەن) لەلایەن ئەسکەندەرەوە قەدەغەکرا و خەڵکی سغدیشی هاندا تا ئاگایان لە بـاوك و دایکیان بێت و لـە ناویـان نەبـەن، نـەریتێکی تریـشی بـە نـاوی(خویـداوس = ژن و مێردایـەتی کردنی نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان) کۆتایی پێهێناو ئێرانیەکانیشی تێگەیاند، کە ڕێـز لە دایکیان بگرن و لەگەڵیاندا هاوسەرگیری نەکەن[١١٩٩].

---

[١١٩٩] مري بويس و فرانتزگرنر: تاريخ كيش زرتشت، پس از اسكندر گجسته، ج٣، ص٨-٩.

# بەشی سێیەم

## باسی دووەم
## دەرەنجامە زانستی و رۆشنبیری و هونەری و هزری و ئایینیەکان
### تەوەرەی یەکـــەم: لە بواری زانستی و رۆشنبیری و هونەریدا

ئەو گۆڕانکاریە سیاسیە گەورەیەی لەسەر دەستی ئەسکەندەر و لە دوای شەڕی گۆگامیلادا هاتە ئارا، وەك باقی لایەنەکانی تر کاری بەسەر بواری زانست و رۆشـــنبیری و هونەریشدا دیارە.
ئەو وەك کەسایەتیەکی مێژوویی بەو هەموو سەرکەوتنانەی لەو تەمەنە کورتە و ماوە کەمە، بەدەستی هێنا، ئێستاش سەرچاوەیەکە بۆ سروشـــی داهێنەران، لە بوارەکانی وەك هونەری تەشکیلی و شعر و ئەدەب و شانۆ و سینەما[1200]، بۆتە یەکێك لە ناسراوترین پیاوانی دنیا کە لە هەموو ئاسیا تاچینیش ناوبانگی هەیە و باسدەکرێ[1201]، ژیان و کەسایەتی و کارەکانیشی لە دوای مردنیەوە، زۆرترین ئەو بابەتانەن کە بەدید و ڕاڤەکردنی جیاواز لە لایەن مێژوونوسانی

---

[1200] حسن حماد: الفن والحرب في العصور القديمة، رؤية انثروبولوجية، مجلة عالم الفكر، الحرب، (٢٠٠٧)، مج(٣٦)، ص١٠٥.
[1201] برسي سايكس: تاريخ ايران، ج١، ص٣١٩.

هیللنستییەوە لێیان کۆڵراوەتەوە و بڵاوکراونەتەوە[1202]، چونکە لەشکرکێشی ئەسکەندەر هەر تەنها داگیرکردن نەبوو بۆ داگیرکردن بەڵکو بەپێی قسەی مێژوونووسان ئەسکەندەر چەند عەودالّی دەسەڵات بوو هێندەش حەزی لە زانست و زانین بوو[1203].

شەڕی گۆگامیلا(ئەربیلا)ش کە وەك سەرکەوتنی سیاسی و سەربازی و سیمبولی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵات، لای هونەرمەند و مێژوونوس و سیاسیەکانی ئەوروپای سەردەمە کۆنەکان، هێندە گرنگ و بایەخدار بووە کە ناوەڕۆکەکەی لەو سەردەمەدا، ببوو بە مایەی سروش و بەهرە وەرگرتن بۆ نووسینی چەندین داستان و شانۆنامە و بابەتی هونەری دیکە، بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان ئەو سەرکەوتنەی ئەسکەندەریان بەسەر دارا دا، بەبیر خۆیان دەهێنایەوە[1204].

لەو بارەشەوە ئەسکەندەر بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی جۆراوجۆر شانبەشانی لەشکرکێشیەکەی، کە بەهۆیەوە لە ماوەی دەساڵ(٣٤٤-٣٢٤پ.ز)دا دەستیگرت بەسەر ئاسیای بچووك و سوریا و میسر و بابل و وڵاتی ئەخمینیان و سەمەرقەند تا گەیشتە سنووری هند[1205]...و دوای بوونی بە میراتگری دەستوری ئیمپراتۆریەتی ئەخیمنی و بە تواندنەوەی گیانی هیلینی و ڕۆژهەڵاتی لەیەك بۆتەدا، ڕێگای بۆ بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری و شارستانیەتی گریکی کردەوە[1206]، بەمەش سەرکەوتنی سەربازی و ژیاری بەدەستهێنا و شارستانیەتی گریکی گەیاندە کەنارەکانی هندو دەروازەکانی یەکترناسینی گەلانی بەرووی یەکتردا کردەوە، بەرادەیەك هانی تێکەڵاوبوونی شارستانیەتیدا، کە مێژووی مرۆڤایەتی بەو شێوەیەی بەخۆیەوە نەبینیبوو[1207].

---

(1202) مفيد رائف العابد: تاريخ الاغريق، ص١٥١.

(1203) WILCKEN.U:ALEXANDER THE GREAT,( Newyork:١٩٧٦),p١٠٤.
ريڤون گست: مادة الاسكندر، دائرة المعارف الاسلامية، اعداد النسخة العربية، احمد الشنتناوي واخرون، مج٣،ج١٧،ص٣٢٠.

(1204) فەرهاد پیربال: وێنەی کورد لە ئەرشیفی ڕۆژهەلاتناسەکاندا، (هەولێر:٢٠٠٥)، ل٩.

(1205) احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٧٤-١٧٥.

(1206) نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط في الفترات الهلنتسية- المسيحية- الساسانية، القاهرة: ١٩٩١)، ص١١.

(1207) الاب ميتوديوس زهيرا: الاسكندر الكبير، ص١٧؛
,vol.١.p٣٧٤ )Princeton:١٩٨١ ( Academic American encyclopedia ,

ئەو ماوەیەش کە بە مردنی لە(٣٢١پ.ز)دەست پێدەکاتو بە لەناوچوونی دەسەڵاتی کیلۆپاترا- دوافەرمانڕەوای بەتالیمە لە میسر-ودامەزراندنی ئیمراتۆریەتی ڕۆمانی لە(٣١پ.ز)لەسەر دەستی (ئۆگستس)، کۆتایی دێت، سێ سەدە دەگرێتەوە، لای گریکەکان وەك دەرکەوتنی سەردەمێکی نوێ، بە(هیلینستی[١٢٠٨])، ناسراوە هەرچەند گونجاو نییە ئەو ڕووداوە بکرێتە سنووری یەکلاکەرەوە، چونکە ڕیشەکانی گیانی هیلنستی پێشتر دەستیان بەدەرکەوتن کردبوو و(ئۆگستس)یش لە ڕاستیدا جیاکەرەوەی دوو سەردەم نانوێنێ، بەلاّم ئەو گۆڕانکاریە شارستانی و ڕۆشنبیریەی لەداگیرکاریەکانی ئەسکەندەر پەیدابوو، وایکرد سەردەمەکەی دوای خۆی سروشتێکی جیاواز لە پێش خۆی وەربگرێت[١٢٠٩]، لەسەر ئەو بنچینەیەش وتراوە پێویستە جیاوازی بکرێ لە نێوان شارستانیەتی هلینی کە تایبەتە بە گریك وشارستانیەتی هیلنستی کە لە ئەنجامی کارلێکی شارستانیەتی گریك لەگەڵ هی گەلانی ڕۆژهەڵات سەریهەڵدا،واتا دوای تێکەلاوی هەردووکیان پەیدابوو[١٢١٠].

لە ڕاستیدا بە هاتنی ئەسکەندەر، زۆر شت لە جیهانی کۆندا گۆڕا، ئەو گۆڕانەش دوای مردنیشی بە درێژایی چوارسەدە هەر بەردەوام بوو، سەرچاوەیەك ئەو چاخەی بە دوو قۆناغ دابەشکردووە، کە لە یەکەمیان گەشەکردنی زانست و ئەدەب و فەلسەفە لە دووەمیشیاندا لاوازی بیری هیلینستی و هەڵسانی گەلانی ڕۆژهەڵات بە ئاژاوە، دژی فەرمانڕەوایانی بیانی، هەست پێدەکرێ و بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی لاوازی بەرهەمی ژیریش، لە قۆناغی دووەمدا، کەمی ژمارەی گریکە پێداگر و دڵسۆزەکان بەتایبەت دوای ساڵی(٢٠٠پ.ز)و تێکۆشانی

---

[١٢٠٨] (هیلینستی): لە وشەی (هلینیزو)وە هاتووە کە ماناکەی (قسەکردن بەزمانی یونانی )یان(پشتگیری یونانیان و شانبەشان وەستانیان)دەگەیەنێت، دوای ئەوەی ئەسکەندەر توانی هەردوو شارستانیەتی یۆنانی(هلینی) و ڕۆژهەلاّتی تێکەڵ بکات، سەرەتای سەردەمێکی نوێی هێنایە گۆڕێ کە لە دوای مردنی ئەوەوە لە(٣٢٣پ.ز)واتە دوای هاتنی سلوقی و بەتالیمەکان ودابەشبوونی ئیمپراتۆریەتەکەی دەست پێدەکات، بۆ جیابوونە لە سەردەمی پێش خۆی بە(هیلینستی)ناسراوە، ڕۆشنبیری ئەو ماوەیە بەتەنها ڕۆشنبیری یونانیەکان نیە و مۆرکی ڕۆشنبیری هەموو ئەو گەل و شارستانیەتانەی پێوەیە، کە(زمانی یونان)یان کردە زمانی قسەکردنی خۆیان. اندرو روبرت برن: تاریخ الیونان، ص٤٥٦-٤٥٧.

[١٢٠٩] احمد محمودصبحي: في فلسفة الحضارة الاغريقية ، ج١، ص١٧١.

[١٢١٠] مروان المدور: الارمن عبر التاريخ، (بيروت:١٩٨٢)، ص١٣٨، هامش١.

بەردەوامی –هێزی راپەڕینی ڕۆژئاوا- بۆ تێکشکانی گیانی مەعنەوەی گریك، بەهۆکار دەزانێ[1211].

ناوبراو لەمیانەی لەشکرکێشیەکەیدا، ئەو زانایانەی لەگەڵیدا بوون هەریەکە بەگوێرەی شارەزاییان، بۆ کارێك دەستنیشانکرد لەگەڵیاندا ئەندازیار و زەویناس هەبوون لە نێویاندا گورکوسی ئەندازیاری کانگاکانی ڕاسپاردبوو کە بەدوای کانزای وڵاتە داگیرکراوەکاندا بگەڕێت، (بیتون و دیوجینت) دەبوو پێوانەی ڕێگاکان دووریەکانیان دیاری بکەن و لەسەر نەخشە بیانچەسپێنن، (ئەرخیاس و ئەندوستین) جوگرافیزان بوون کەسێکیش بەناوی(ئەرخلاس) دیاریکرابوو تا زانیاری لەسەر ئاووهەوا و دەرامەت و نەریتی خەڵك، کۆبکەنەوە و وەسفی شارەکان بکەن، (ئەرستوبون)ی ئەندازیار و مێژوونوس و ئەندامی دیوانی سەرۆکایەتیشی، ڕاسپاردبوو کە گۆڕی کورش نوێ بکاتەوە و بیڕازێنێتەوە، هەروەها دوو ئەندازیاری بە ناوەکانی(دیمتروس، دیاد)ی لەگەڵدا بوون کە تایبەتمەندبوون لە دروستکردنی ئامێری جەنگی، لە گەمارۆی سەر(صور و غەزە)دا دەرکەوتن، پردیان بۆ پەڕینەوە لەسەر ڕووباری فورات و دیجلە دروستکرد و ڕۆڵی زۆریشیان بینی لە دروستکردنی مەنجەنیق بۆ ڕوخاندنی شورە و لێدانی قەڵا، دواتریش لە سند گروپی تری ئەندازیاری کاری دروستکردنی کەشتیان خستنەپێش، کە لە قوبرس و میسرەوە هاتبوون ژمارەیەکی زۆر کەشتیان دروستکرد، دواتر فەرمانیدا لە وەرشەکانی فینیقی پارچەی کەشتی دروست بکرێت و بەرێی وشکانیدا بهێنرێنە بابل و لەوێ ڕێکبخرێن بۆ هێرشی داهاتوو، گرنگیشی بە ئاژەڵ و ڕووەکدا، بۆ ئەوەش زانایانی هاوسەفەری شارەزا لەو بوارەی هاندا، کە بەدوای شتی نوێدا بگەڕێن و لەهەر یەکێکیش نموونەیەك بۆ ئەرستۆ بنێرن تا لێکۆڵینەوەکانی تەواو بکات و بڕیاری ناردنی هەندێك ئاژەڵی ناوازەیدا، بۆ مەکدونیە بەهیوای چاککردنی توخمیان، بەهیوای دۆزینەوەی هەسارەی نوێ و چاککردنی نەخشەی گەردونیش(تحسين خارطهم الفلكية)یان ژمارەیەك گەردونزانی هێنابوو و چەندین فاڵگرەوەشی لەگەڵدابوو بەناوبانگترینیان کەسێك بوو بەناوی(ئەریستاندەر) کە لەخزمەتی فلیپی باوکیشیدابوو[1212].

[1211] محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج٣، ص١١-١٢.
[1212] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص ٧٦-٧٨.

واتە ئەسکەندەر لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێك زانای هێنابوو کە دەیتوانی بە یارمەتی ئەوان سەدان نموونەی مێژوویی و سروشتی بۆ ئەرستوی مامۆستا ڕەوانە بکات، کە بەزانستەوە خەریك بوو لە ئەسینا و لەمیانەی هەڵسان بەکارە ترسناکەکانیشی نێرژەی دۆزینەوەی جوگرافیایی(الاستکشافات الجغرافیة) ڕەوانەی سەرەوەی ڕووباری نیل کرد، بۆ زانینی هۆکاری لافاوی ساڵانە و یەکی تریش بۆ کەنارەکانی دەریای قەزوین، چونکە تا ئەو کات لای باکوری نەناسراوبوو[١٢١٣]، هەروەها زاناکان نەخشەیەکیان بۆ وڵاتی تورکستان و ڕووبارەکانی کێشا[١٢١٤].

دەڵێن ئەرستۆ کاتێك هەواڵی لەبارەی ڕووباری نیل پێگەیشت بەدڵخۆشیەوە گوتی: ((چی تر لافاوی نیل بۆ ئێمە بەنهێنی نامێنێتەوە))، بۆ دەریای قەزوینیش دەیانەویست بزانن، داخۆ هیچ ڕێڕەوێك هەیە بیگەیەنێتە سەر دەریای ڕەش، هەروەها گریکەکان بۆ یەکەجار زانییان کە لە زەریای هندی هەڵکشان و داکشان(المد والجزر) هەیە، هەروەها ویستی بابل بە ئەسکەندەریەوە ببەستێتەوە و بۆ مەبەستی زانیاریش لەبارەی دورگەی عەرەب و دەریاکانی دەوری سێ گەشتی دەریایی یەك بەدوای یەك دەرێخست[١٢١٥].

جگە لە دۆزینەوە و دەستخستنی زانیاری نوێ وەکو بەشێك لە بەرئەنجامەکان، گریکەکان چەندان زانیاری نادروستی خۆیان ڕاستکردەوە. ئەوان تاپێش لەشکرکێشیەکە و بیرکردنەوەیان لەبارەی زۆر ناوچەی تریش نادروست بوو، بۆ نموونە لە خەیاڵی ئەواندا پروماسیوس(هندکۆش) بەدرێژبووەوە و دامێنی قەفقاس دەزانرا، لە ڕاستیشدا ئەسکەندەر و هاوڕێکانی لە هیچ شوێنێك هیچیان نەدەزانی و شارەزا نەبوون، بەڵام لە سایەی چالاکی(حسابگەرانی کات = گاھ شماران) —ئەوانە کە بە ئامێری سەرەتایی دووری نێوان شوێن پێ و جێگایان دەچەسپاند و هەژماردەکرد- جموجۆڵی ئەو سەربازانە بە درێژایی و پانایی ناوچاکان، بنچینەی نوێیان دەربارەی زانست و زانیاری جوگرافیای ئاسیای ناوەند بەدیهێنا، کەدواتر بەهۆی جوگرافیزانێکی گەورە بەناوی(ئیراتوسپینوس- Eratusthenes) سوودی زۆری لێبینرا، لە

---

[١٢١٣] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٠٤-٣٠٥.

[١٢١٤] SAUILL,A.Alexander The great and his time,(NEWYORK:١٩٩٣),P٧٠.

[١٢١٥] الاب میتودیوس زهیراتي: الاسکندر الکبیر، ص٩٥.

ســۆنگەی ئەوەشــەوە دەکــرێ بــوترێ، کــە لەشکرکێــشیەکە تــەنها دەســتاوردی ســەربازی بەدەستنەهێنا، بەڵکو لە هەمانکاتدا گەشتێکی دۆزینەوە(استکشافی)یش بوو[1216].

هەر لەو ڕووەشەوە بۆ یەکەمجار لە دوای شەڕی گۆگامیلا، دەوڵەمەنـدی کوردسـتان بـە(نـەوت)و توانست و سروشتی بەکارهێنانی ئەو وزەیە بۆ گریکەکان ئاشکرابوو[1217]، چونکە ئەسـکەندەر دوای ئەو شەڕە و ڕۆیشتنی لە ئەربیلەوە بەرەو بابل، دیمەنی زۆر سەرنجڕاکێشی ئاگری هەمیشەیی بینیوە و کە وەك ئاو لە زەوی هەڵدەقوڵا پانتایەکەشی وەك دەریاچەیەکی گەورە هاتۆتە بەرچـاو، لە ڕێی ئەزموونکردنیشی لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکە، ئەویش بەرژاندنی نەوت بەدرێـژی ئـەو ڕێگایـەی پادشـا پێیـدا دەگەیـشتە شـوێنی حەوانـەوە، پاشـان ئـاگر تێبـەردانی، کـە ڕێگاکـەی ڕۆشنکردەوە، ئینجا تاقیکردنەوەی لەسەر جەستەی سەربازێك بە ناوی ئیستیفانوس، کە خەڵکی ئەسینا بوو ئەویش لەسەر پێشنیاری خزمەتکارێکی بـەناوی ئەسـینوفانس بـۆ ئەسـکەندەر، کـە دوای چەورکردنی جەستەی خۆی بەو مادەیە، گڕی لە خۆی بەرداو لەلایەن کەسانی دەورووبەریـەوە لـە مـردن ڕزگـارکرا[1218]، هەسـت بـەهێز و گرنگـی بـەکارهێنانی کـرا، شـایانی باسـە لـە سەرچاوەیەکدا داهاتووە، کە ئەسکەندەر دوای تێپەڕینی لە زێی بچووك سەرچاوەکانی نـەوتی لـە نزیك ئارابخا بینیووە و بلوتارکی نووسەری یۆنانیش ئاماژەی بەوە کردووە کـە(ئەسـکەندەر دوای شەڕی گوگامیلای نزیك ئـەربیلا بـەرەو بابـل لـە ڕێـی ئـەرباخی (کـە مەبەسـتی لـە ئارابخایـە و بـەتلیموس بەشـێوەی Arhapap نووسـیوە) ڕۆیـشتووە و قەڵاکـەی چـاککردۆتەوە –قـەڵای کەرکوك-تویژەرەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە بلوتارك وتوویەتی لەسەر زەوی ئـەرباخی ئـاگرێکی داگیرسـاوی بـەردەوامی بینیـوە، ئەمـەش لەگـەڵ هـەمان شـوێنی ئێستای کـەرکوك دێتـەوە و بابەگوڕگوڕیش بەشێوەی کورکورا Korkoura کە گوایە لەگەڵ کەرکوك بەشێك لـە سـاترابی میدیایان پێکهێناوە و میدیەکان پاشگری زاگرۆزیانەی ak-uk یان بۆ ناوەکە زیادکردووە و بە شێوەی Korkou-uk – korkur-ak (کورکوراك یان کورکوروك)ی لێهاتووە، کە ئێـستا

---

[1216] هرمان بنگوسون: یونان وپارسان، ص٣٢٤.

[1217] دەگونجـێ سـەرنجی دەوڵەتـە داگیرکـەرەکان بـۆ داگیرکردنـی کوردسـتان لـەو زانیاریانـەوە دەستی پێکردبێ، کە ئێستاشی لەگەڵدابێ، گرنگی خۆی لەدەستنەداوە و بۆتە مەسەلەیەکیش کە زیاتر لە سەدەیەکە بەهۆیەوە و لەمیانەی ململانێی زلهێزەکان و دەوڵـەتانی دەوروبـەردا گاڵتە بە چارەنوسی کورد دەکرێ.

[1218] بلوتارك: السیر، ج٣، ص١٢٨٨.

به کەرکوك گۆ دەکرێت[١٢١٩]، هەرچەندە زۆر گونجاوە کە مەبەست لەو شوێنی ئاگرە کەرکوك بێ، بەڵام جێی داخە کە نە لە وەرگێڕدراوە عەرەبییەکە و نە لە فارسییەکەشیدا وشەی (ئەرباخی و کورکورا)م لەو شوێنە کە باس لە دیمەنی ئاگرەکە دەکات، بەرچاونەکەوت.

هەروەها لە سەردەمی دوای لەشکرکێشیەکە زانایەك بەناوی ئەرستەرخس(ئەرستاخۆس ٣٢٠-٢٥٠پ.ز) بە بەڵگە سەلماندی، کە زەوی بەدەوری خۆی و لەگەڵ هەموو هەسارەکانیش بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، لە کاتێکدا گشت خەڵك و ئەو زانایانەش، کە دوای ئەو هاتن بڕوایان وابوو زەوی چەقی گەردوونە و خۆر و هەسارەکان بەدەوریدا، دەخولێنەوە[١٢٢٠]. ئەو تیوریەیان بەگریمانەیەك دانا، کە لەگەڵ تێبینی و هۆکارە تەکنۆلۆژیەکان کە ئەو سەردەمە پێی گەیشتبوون، نەدەهاتەوە، بۆیە نەیاریی فەیلەسوفەکانی وروژاند، سەرکردەکانی ڕەواقی[١٢٢١] دوودڵ نەبوون لەوەی هەر کەسێك زەوی بە چەقی گەردوون نەزانێ، تاوانبار بە پێشێلکردنی پیرۆزیەکانی، بکەن و لەنێو ئەو زانایانەش، کە بڕوایان بە ناوەندیەتی خۆر نەبوو(ئەرخمیدس) بوو، ئیتر ناوەندیەتی زەوی وەك بیروباوەڕێك تا هاتنی کۆپەرنیکوس(١٤٧٣-١٥٤٣ز)، بەجێگیری مایەوە[١٢٢٢].

لە ئەنجامی تێکەڵبوونی هەردوو کەلتوری ڕۆژهەلآت وڕۆژئاوا دوای شەڕی گۆگامیلا پێشکەوتن لەلایەنە جۆربەجۆرەکانی ئەستێرەناسیش بەشێوەیەکی سەرسامکەر دەرکەوت، ئەراخوس(ئەستێرەناس و جوگرافیزان و بیرکاریزان و فەیلەسوفی گریکی سالآنی(٢٨٤-١٩٢پ.ز)، دەستی بۆ پێوانەکردنی دووری گۆی زەوی برد و ئەو ژمارەیە کە پێی گەیشت نزیکە دروستبوو[١٢٢٣]، (هیبارك) لە(١٩٠-١٢٠پ.ز) لیستی ئەستێرەکان و خشتەی مانگ گیرانەکانی داناو هەردوو هاوسەنگ بوونی شەو و ڕۆژی دۆزیەوە و وەسفی کردن و

---

[١٢١٩] جمال رشید احمد: کرکوك في العصور القدیمة، ص٤٣.

[١٢٢٠] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٣١؛ هیرمن کندر و ڤیرنر هیلغیمن: اطلس dtv، تاریخ العالم، ص٧١.

[١٢٢١] لە تەوەرەی دووەمی ئەو باسەدا لێی دەدوێین.

[١٢٢٢] اندریە ایمار وجانین اوبوایە: تاریخ الحضارات العام، مج١ ، ص٥٢٩-٥٣٠.

[١٢٢٣] ا. برگرودیگران :تاریخ جهان باستان ،ج٢ ، ص٢٩٧.

چارەنووسی مرۆڤی لە زانستی ئەستێرەگەریدا بە هەسارەکانەوە بەستەوە[١٢٢٤]بەپێـــی یەك لـە سـەرچاوەکانیــش گــەورەترین زاناکانـــی ئەستێرەناســی خەڵکـی میــسرو بابـل بـوون و بینراوەکانــی ئـەو بـوارەش لـە سـەدەی یەکەمــی زاینـــی بەخـــەتـــی بزمـاری بابلـی نوســــراون و بابەتــەکانـــی ســــەردەمـــی ئەخمینـــی بـــۆ زمانــــی گــــریکی وەرگــێردراون[١٢٢٥].

ڕێگایەکی تر بۆ بەدەستهێنانی ئـارامی و ئاسـایش لـە سـەردەمی هلنـستیدا، بـڕوا هێنـان بـە ڕێبازی سۆفیانە و بڵاوبوونەوەی زیاتری بڕوای نهێنی ئامێز دەربارەی تەوەرەی خودایانی(گریـكو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست)، بوو، دوا کاریگەری دەسەڵاتی ئەو ناوچەیەش لەسەر ڕۆژئاوا، کە دەکرێ ئاماژەی پێ بکەین، بەخت گرتنەوە(طالع بینی)ی بابلی[١٢٢٦] بوو، گریك و ڕۆمەکان لە ڕەوشی ناونانی ئەستێرەکاندا لەسەر بنەمای ناوی خودایان، شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرت، بـەو پێیـەش ئەستێرەی مەردۆخی بابلی لای گریکـەکان نـاوی(زیـوس)و لای ڕۆمـان(ژوپیتـەر)و عەشـتاریش نـاوی(ئـەفرۆدێت و ڤینـۆس)ی وەرگـرتن، ئەستێرەناسـانی کلـدانی لـە هونـەری پەنهانزانیـدا، ناوبانگیان هەبوو تا ئێستاش داوێنی ئەو ناوبانگە هەر بەردەوامە[١٢٢٧].

هەروەها تێبینی کردنی هەڵکشان و داکشانی ئاو لە ئۆقیانوسەکاندا، دووچاری گـرفتی زانینی هۆکارەکانی کردن، هەندێك لە نێویاندا دوو کەس بە ناوەکانی(کیتیاس و بیتیاس) وایـان دانـا کە پەیوەندی بە کاریگەری مـانگەوە هەیە و کەسیش نەیتوانی ڕەتی بکاتەوە. بەڵام ڕەتکردنـەوەی ڕۆڵی(با)ش، کە ئەرستۆ ئەو دیاردەیەی بۆ دەگێڕایەوە، نەچەسپێنرا[١٢٢٨].

---

[١٢٢٤] هیرمن کندرو ڤیرنر هلغمین: اطلس – dtv تاريخ العالم، ص٧١.

[١٢٢٥] لوکاس دوبلویس و روبارتوس وان دراسپیك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٩-٢٢٠.

[١٢٢٦] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی پێگەی بەناوبانگی بابل لـە بـواری ئەستێرەناسـی وبەختزانی بڕوانە: هاری ساکز: عظمة بابل موجز حضارة بلاد واد الرافدين القديمة، ترجمة عـامر سليمان، (الموصل-١٩٧٩)، ص٣٣٦-٤١٣.

[١٢٢٧] لوکاس دوبلویس و روباریوس وان در اسپك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٧.

[١٢٢٨] جـایمس هنـري برستد: العـصور القديمـة، ص ٣٣٢-٣٣٣؛ اندريـة ايمـار وجـانين ابوابـە: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص ٢٥٧-٢٥٨.

بای وەرزی کە لەگەڵ هەر وەرزێك، ئاراستەی دەگۆڕا، لەگەڵ جۆرێك لە ماسی کە دڕندانە پەلاماری کەشتیەکانیان دەدا و بە دەنگی چەك دووریان دەخستنەوە، دوو شتی تری سەیربوون کە، دەریاوانە گریکەکان لە کەنداوی عەرەبی(کەنداوی فارس) بەرچاویان کەوت[1229].

بۆ یەکەمجار گریکەکان تێبینی ئەوەیان کرد، کە ولاتی ئەخمینیان دابەش دەبێ بۆ هەرێمی کەناری گەرمی لمین، هەرێمی ناوخۆ کە ئاوهەواکەی مامناوەندە و جۆرەها میوەی لێدەڕوێ، جەنگەڵی بەرفراوانی لێیە و بەدواشیدا هەرێمی سارد دێت، کە بەفر دایپۆشیوە سروشتێکی سەختی شاخاوی هەیە[1230]. زانایەکیش بە ناوی (تیوکراستوس) جوگرافیای ڕووەکی دامەزراند[1231] هەروەها گریکەکان بۆ یەکەمجار لە هیندستان بە ڕووەکی کەتان(پەمۆ)ئاشنابوون[1232].

جوگرافیزانەکان بنچینەی زانستی کارتوگرافی(نەخشەسازی)یان داهێناو هەڵسان بە هەڵسەنگاندنی بارودۆخی زەوی بە شێوەیەکی ورد و سەرنجڕاکێش، ئەویش لەسەر بنچینەی ئەو بەڵگانەی کە لەلایەن زانا و دۆزەرەوەکانی ئەو سەردەمە کۆکرابوونەوە[1233].

هەروەها وەك یەك لە ئەنجامەکانی تری ئەو هەوڵ و کۆششەکە لەو سەردەمە دەستی پێکرا، ئەوەبوو دان بە(گۆیەتی زەوی) دانراو هەوڵی دیاریکردنی پێوانەکەشیاندا و(ئیراتوسپینوس) گەوهەری ئەو بابەتەی بەدیهێنا، بەبڕوای ئەو(ئەسوان)و (ئەسکەندەریە) لەمیسر دەکەونە سەریەك هێڵی درێژی، لادانی (تیشکی خۆریش)ی لە کاتی بارگۆڕانی هاوینەدا، بە گوێرەی ئەو دوو شارە لێکدایەوە، ڕێگای تایبەتی بۆ پێوانەکردنی دووری شارەکان بەدیهێنا، لە ڕێی ئەو پێشکەوتنانەشەوە هەوڵدرا نەخشە(خرائط) دابنرێت، بۆ ئەو مەبەستەش زانیاری لەبارەی دووریەکان کۆکرایەوە[1234]، ئەو کە زانایەکی گەردووناس و بیرکاری زانێکی گەورەش بوو، توانی قەبارەی زەوی بە تێبینیکردنی خۆر، کە لە هاویندا، بەرەو باکور لە بورجێکەوە بۆ

---

[1229] البرمالة: تاريخ البرمالة،ج١، ص٣٠٥.

[1230] ل .لوكهارت: فارس في نظر الغرب، تراث فارس، ص٤١٧.

[1231] اندريه ايمار وجانين اوبوايه: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص٥٣٠.

[1232] H.F.TOZER: Ahistory of Ancient Geography(London:١٩٣٠),p٣٦.

[1233] SARAH B. POMEROY and others: Ancient Greece, p.٤٦٠.

[1234] اندريه ايمار وجانين اوبوايه: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص٢٥٨.

بورجێکی تر دەچێت و هەر کاتێکیش بگاتە خاڵی بارگۆڕانی هاوینە، تیشکەکەی بەستونی لەلای تاڤگەی یەکەمی نیل، لەبنی(بیر) دەدات، دۆزیەوە[1235]. ئەو کە بۆی لوا بەشێوەیەك کە بۆ کەسانی پێش خۆی نەگونجابوو، لە دوو توێی کتێبێکدا، ڕاستی و زانیاری کۆکردەوە و توانی هەرێم و ناوچەکانی- دەوروبەری دەریای ناوەڕاست بەوردی لەگەڵ نەخشەی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقا، دیاری بکات، هێڵەکانی درێژی پانیشی تێدا نەخش کرد و بوو بە دامەزرێنەری جوگرافیای زانستی[1236]، پاشانیش زانیاری لەبارەی ئۆقیانوسی هیندی و بڕوای باو بە دانەخراوی دەریای قەزوین لە باکور و زانایەکی تر بەبوونی کیشوەرێکی دیکە لەناوچەی مام ناوەندی باشور، خستەڕوو، گەردونناسیش دەرفەتی بۆ دروستکرد تا بۆ یەکەمجار بەشێوەیەکی نزیك لە ڕاستی وێنەی بازنەی جەمسەری و بازنەی بارگۆڕان (دائره الانقلاب)و هێڵی یەکسانی بکێشێ[1237]. ئەو جیهان بەسێ قارە تێدەگەیشت و دابەشبوونی مرۆڤایەتیشی بۆ گریك و بەربەر بە بنەماگرتنی ئەوبۆ دیاریکردنی دۆست ودوژمن و ڕەچاوەنەکردنی ئەگەری بوونی خەڵکی چاك لە قارەکاندا لاپەسند نەبوو ،کە گریکەکان بڕوایان پێی بوو لە سەرۆکەکەشیان دەویست مامەڵەی پێبکات، بەپێوەرگرتنی خەسڵەتی باش وخراپی بە باشتر دەزانی، تێبینیکردنی ئەوخاسیەتانەش لە میللەتان و بینینی حوکمڕانی سەرسامکارانەی هەندێك گەل بۆ نموونە وەك هیندی وئاری، نەشیاوی بنەماکانی دابەشکاری پێشووی دەرخست و بوو بەهۆیەکیش بۆ ئەسکەندەر کە خۆی لە ئامۆژگاری وپەیامی ئامۆژگاریکارانی ببوێرێت و پێشوازی لەو ناگریکانە بکات کە پێگەی باشیان هەبوو[1238].

لە سەردەمی سلوقیش گەردونناس و ئەستێرەناسەکان بەردەوامبوون لە تۆمارکردنی جوڵەی تەنە ئاسمانیەکان لەسەر تاتەکان، پەرستگاکانیش ڕووداوە هاوچەرخەکانیان بە گوێرەی

---

[1235] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٣١.

[1236] اندریە ایمار وجانین اوبوایة: تاریخ الحضارات العام، مج١، ص٥٣٠. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٦).

[1237] نفس المرجع، ص٥٢٨. ئەو پێوانەی گۆی زەوی دیاریکرد و بەپێی ڕێکخستنی مێژوویش ساڵی(١١٨٤پ.ز)ی بە سەردەمی هێرشی تەروادە و(٧٧٦پ.ز) بۆ بەرواری یەکەم یاری یاریەکانی ئۆلمپی دیاریکرد. هیرمن کندر وڤێرنر هیلغمین: اطلس – dtv، تاریخ العالم، ص٧١.

[1238] STRABO :THE GEOGRAPHY,BOOK ١,p٢٤٤-٢٤٩.

بەدوایەکداهاتنی مێژوویی یاداشت دەکرد ژمارەیەك ئەفسانە و ڕێوڕەسمی (مناسك وتراتيل) کۆتیان ڕونووس(استنساخ)کردەوە[١٢٣٩].گومانیشی تێدا نیە کە گەردونناسیی سوودی لە تێبینی کەڵەکبووی پەرستگاکانی بابل بینییێ و لە بابلیش ئەو تێبینیانە لێکدراونەتەوە و پیاوێك بەناوی کیدینو-کیدناس لەلای گریکەکان- زانایەکی ڕاستەقینە بوو لەو بوارەدا[١٢٤٠].

لە بواری بیرکاریشدا ئوکلیدیس (دەورووبەری ٣٠٠پ.ز) کتێبی ئەندازە و ڕەگەزەکانی داناو جەبری ئەندازەیی بوو بە بنەمای پێوانەیی پێکەوەبەستراوی هەمیشەیی، (ئەرخمیدس سیرکوزی ٢٨٠-٢١٢پ.ز)و کەسانی تریش زۆر دۆزینەوەی بیرکاری و سروشتیان ئەنجامدا، لە نێوانیاندا(بنەمای ژمارە، چەندیەتی بچوك، زانستی هاوسەنگی و پەستانی مادە شلەکان، ژمارەی تەواوکاری(حساب التامل)، دیاریکردنی قورسایی جۆری، ئامرازی هاویشتن(الات الرمی) بۆ بەرگریکردن لە بەرامبەر ڕۆمەکان و شتی تریش[١٢٤١]، تا ئێستاش ئوکلیدس ناوبانگی هەیە و کتێبەکەی لەبارەی ئەندازە کە لەسەر بەڵگە لوژیکیەکان (البراهن المنطقیة) بنیاتنراوە، لە سەردەمی نوێ لە قوتابخانە ئینگلیزیە نوێیەکان دەخوێنرا و بە کۆنترین کتێبی خوێندن دادەنرێت[١٢٤٢].

زانا فیزیاییەکان بوونە پێشەنگ بۆ توێژینەوەی باری بالیستی(تەقەمەنی)و بەکارهێنانی پاڵەپەستۆی هەوا وەك سەرچاوەی هێز لە کاتێکدا هەندێکی تر خەریکی تاقیکردنەوە بوون لە بەکارهێنانی هەڵم بۆ مەکینە سادەکان[١٢٤٣].

هەر لەمیانەی تێکەڵاوبوونی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و لە ئەنجامی ئەوهەلومەرجەی دوای شەڕی گۆگامیلا بۆ زانایان ڕەخسا تاپەرە بە زانستەکەیان بدەن، لە زۆر بواریتردا زانست پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوەبینی، لە هونەری سەربازیدا پایەی یەکەم بۆ چەکی بەرگری و گەمارۆدان بوو(مەنجەنیق و فالانکس، تیر، گولەبەردی بەکێش دووبوت، کە مەودای هەڵدانیان دوور بوو،

---

[١٢٣٩] جورج روو: العراق القدیم، ص٥٥٩.

[١٢٤٠] اندریه ایمار: تاریخ الحضارات العام مج١، ص٥٢٩.

[١٢٤١] اندریه ایمار: تاریخ الحضارات العام، ص٥٣٠؛ هیرمن کندر وفیرتز هیلغمین: اطلس – dtv تاریخ العالم، ص٧١.

[١٢٤٢] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٢١.

[١٢٤٣] SARAH **B.POMEROY and others:** Ancient Greece, p.٤٦٠.

ئەو کەلوپەلانەش تەنها لە ڕێی ئەندازیارانی بە ئەزموونەوە بەدەست دێن، هەواڵی ئەو جۆرە ئەندازیارانەش لە نووسینەکانی ئەو سەردەمەدا دیارە، ئەکلیدوس بناغەی ئەندازەی تەختکردنی دانا، (ئەرخمیدس)یش گەلێك نامەی تیوری وەك(هاوسەنگی Equilibe، چوارێەککردنی بەش Quadrature delaparabole (سەرئاوکەوتنی تەنەکان و تیشکدانەوە(یاساکانی ئاوێنە)، یاسای کاروکاردانەوەی تیشکەکانی گەرمی بەهۆی ئاوێنەی ڕووتەخت و کوڕ) نووسی، دەڵێن بۆ پارێزگاریکردن لە وڵات لە ساڵی(٢١٢پ.ز) وبۆ ئاگرتێبەردانی کەشتی ڕۆمەکان، لەو ئامرازانە سوودی بینیوە[١٢٤٤]. بۆیەش وتراوە، کە ئەو بە دروستکردنی ئامرازەکانی جەنگی و تیورە فیزیاییەکانی بەناوبانگ بووە و بڕواش وایە، کە شاگردی ئەکلیدوس بووبێ[١٢٤٥].

ئەرخمیدس لە گەورەترین زاناکانی ئەو سەردەمە دەژمێردرێت و سیستەمی خولخولە (نظام البكرات)یش لە گرنگترین داهێنراوەکانیەتی، کە بەهۆی بەهێزی جوڵە، کە بەرادەی جێی باوەڕنەکردن، زیادی دەکرد و هەر تەنها بە خولاندنەوەی، بۆ یارمەتیدانی دوڵابێکی سووك دەیتوانی کەشتیەکی گەورەی بارکراو، بجوڵێنێ ... لەبەرئەو کارانەش کە لێی بینراون، خەڵکی بڕوایان پێی کرد، کاتێ وتی (شوێنێکم پێ بڵێن لێی ڕاوەستم زەویتان بۆ دەلەرزێنم)، جگە لەوە ئامرازی جەنگی بەهێز و بکوژی، دروستکردن. ئەو بەهۆی ئەو زانستەی دۆزیەوەکە بە(قورسایی جۆری) ناوەزەدکراوە، دەیتوانی زێری پوخت لە زێری قەڵب جیابکاتەوە، هەروەها نامەو نامەکاری لەگەڵ زاناکانی تردا هەبوو، لە ئەسکەندەریە کە لەوێ کۆمەڵەیەکی زانستیان دروستکردبوو و هەموویان لە مۆزەخانەدا دەژیان و موچەی مانگانەیان وەردەگرت، بەتالیسەکان خەرجیان دەکێشان، بەمەش حکومەت پایەکانی یەکەمین دامەزراوەی زانستیان دامەزراند، ئەوان خۆیان تەرخانکردبوو تەنها بۆ کاروباری زانستی و کتێبخانە و ئامرازی پێویستیان لەبەردەستدابوو و کتێبەکانیشیان بوون بە ئینسکلوپیدیای زانستە جۆراوجۆرەکان، ئەوەی

---

[١٢٤٤] آ.برگرودیگران: جهان باستان، ص٢٩٧.

[١٢٤٥] ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم، ج١، ص٢٥٨.

یەکەمی پیاوانی زانست لە مۆزەخانەی ئەسکەندەریە، شانازیان بەوە دەکرد کە (ئەکلیدوس)ی گەورەترین بیرکاریزان، لە خۆیانە[١٢٤٦].

هەروەها زانایانی بواری توێکاری لە زانستی شەقکردن و نەشتەرگەری جەستەی مردوو و زیندوان پێشکەوتنی زۆریان بەدیهێنا، بۆ نموونە (هیروفلیوس)، زانیویەتی کە دەمارەکان، هەوا ناگوێزنەوە بەڵکو ئەو خوێنە دەگوێزنەوە کە دڵ پاڵی پێوە دەنێ[١٢٤٧]. ئەو کە بەدۆزەرەوەی دەمارەکان و مێشك و ناوەندی کۆئەندامی دەمار، دادەنرێت لەگەڵ (ئیرایستراتۆس)، کە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەی سووڕی خوێن(تیوری بنومـا)بوو، لەسەدەی سێیەمی پێش زایین هەڵساون بە توێکاری جەستەی ئادەمیزاد[١٢٤٨].

واتە گریکەکان لە ئەسکەندەریەی میسر تاقیگەیەکیان بۆ توێکاری(تشریح) هەبوو، کە بەتالیمەکان ئەو کەسانەیان بۆیان ڕەوانە دەکرد، کە تاوانبارەکران تا ئەزموونی نەشتەرگەریانەیان بە زیندوویی لەسەر بکرێت، لەوەشەوە هەستیانکرد، کە دەمارەکان تەلی ناردنی پەیامی(چێژ و ئازاری) ئەندامەکانی لەشن بۆ مێشك و دەرکەوت، کە مێشك ناوەندی کۆئەندامی دەمارە، هەر لەوێشەوە زانرا کە دەمارەکانی هەوای سیەکان ناگوازنەوە، وەك بە هەڵە لێی تێگەیشتوون[١٢٤٩].

واتە دۆزینەوە گرنگەکەیان پەیوەندی هەبوو بە مێشك و سیستەمی دەمارەکان[١٢٥٠]. ئەو دووپزیشکە (هیرۆفیلۆس Herophilus و ئیرایستراتوس Erasistratus) لە زانستی چاو و سیستەمی کۆئەندامی زاوزێ و هەرسکردنیش دۆزینەوەی بنەڕەتیان ئەنجامداوە، بۆ پێشکەوتنی توێکاری و زانستی پزیشکی لەسەر لاشەی زیندەوەرانیش ئەزموونیان دەکرد، بەتایبەتیش

---

[١٢٤٦] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٣٠-٣٣١؛ محمود السيد: تاريخ اليوناني والروماني، (اسكندرية: ٢٠٠٠)، ص٩١. يش ئاماژەی بە ڕۆڵی بەتالیسەکان لە پێشخستنی زانیاریە و ئەسکەندەریە وەك مەڵبەندی زانست و ڕۆشنبیری کردووە.

[١٢٤٧] اندريه ايمار وجانين اوبوايه: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص٥٣٠.

[١٢٤٨] هيرمن كندر وڤيرنر هيلغمين: اطلس – dtv، تاريخ العالم، ص٧١.

[١٢٤٩] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٣٣.

[١٢٥٠] IRWIN ABRAMS and others: Ahistory of world civilization, vol.I, p.١٦٣.

لەسەر لاشەی ئەوانەی تاوانبارەکران و لەلایەن دەسەلاتدارانەوە دەنێردرانە شوێنی ئیشکردنی پزیشکەکان[1251].

بەگشتی لەو سەردەمەدا دەستاوردی پزیشکی بەتایبەتی نەشتەرگەری پێشکەوتوو بوو (هیرۆفیلۆس)ی پزیشك و نەشتەرگەر کاری گریکی،لە دایکبووی سالی(٣٣٥پ.ز)، لە نووسینەکانیدا ئاگایی قوولی دەربارەی زانستی توێکاری کە لە ڕێگای شەقکردنی جەستە بەدەستهاتووە، ئاشکرا دەکات، هیاکلیدوسی تارنتی، نەشتەرکاریش لەشتی(بێ هەستکەر) سوودی دەبینی[1252].

جێی ئاماژەیە کە زانستی سەردەمی هیللنستی لەناونەچوو، بەلکو بەپێچەوانەوە بۆ هاندانی خوێندکارانی داهاتوو تا ماوەیەکی نزیك بەر لە ئێستا بەردەوام بوو ، لە سەدەی (دووەمی دوای زاین)یش بەهەولی چەند کەسایەتیەك کارە پێشەنگە گەورەکانیان لە بواری دەرمانسازی بەسەرکەوتوویی تۆمارکراو بۆ سەردەمەکانی داهاتوو پارێزرا[1253].

بەپێی یەك لە سەرچاوەکان ناوبانگ و کارامەیی نەوەکانی سەردەمی ڕەخساوی دوای شەڕی گۆگامێلا، سەرنجڕاکێشە، کە دەستپێشخەربوون لە زۆر بواردا بەتایبەت لە پراکتیزەکردنی زانستی کاروپێداویستیەکانی ڕۆژانە، هەندێك شت ئاماژەی پێکراوە، کە دروستکردنیان لە ئێستاشدا بڕواپێکردنی گرانە. وەك دروستکردنی دەرگا کە بێدەست بۆبردن بکرێتەوە و پێوەبدرێت، دەستشۆر کە بەپێی پێویست سابون و ئاو پێشکەش بکات، دروستکردنی ڕێگای تەل و پەت بۆ خلۆرکردنەوەی بەرد لە کانەبەردە بەرزەکان و بەکارهێنانی چەرخ، بۆ هەلکێشانی ئاو بەبڕێکی زۆر، زۆربەشیان بە هەوا ئیشیانکردووە، هەروەها دروستکردن و دانانی کاتژمێری ئاوی لەگەل کاتژمێری خۆریی(شمسی) هی میسریەکان لە بازاڕە گشتیەکان بۆ زانینی کات، و بەتالەکان (بەتایسەکان) هەولی دەستکاریکردنی ڕۆژمێریشیاندا، بەلام گەل ڕازی بەلادان لە نەریتی خۆیان نەبوو،[1254] هەروەها سلوقیەکانیش ڕۆژمێری تایبەتیان داهێنا[1255].

---

[1251] SARAH B.POMEROY and others :Ancient Greece, p.٤٦٠.

[1252] ا.برگر وديگران : تاريخ جهان باستان، ج٢، ص٢٩٨.

[1253] IRWIN ABRAMS and others: Ahistory of world civilization, vol.I, p.١٦٣.

[1254] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٩.

[1255] بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەوە بڕوانە محمد الزين: التقويم السلوقي ،مجلة دراسات تاريخية، العددان(٨٥-٨٦)، ص٣٣و لاپەڕەکانی دوایی.

هەرچی کۆسپی بەردەم زانستی سەردەمی هیللنستیش بوو، نادیاری ئارەزووی تاقیکردنەوەی تیورەکان بەشێوەی زانستی و فەراهەم نەبوونی ئامرازی پێویست بوو بۆی، زانایان لایەنگری زانستی کاری بیری، بوون نەك پراکتیکی، چونکە تەکنۆلۆژیای ئەو سەردەمە بواری بەکارهێنانی ئەو بیرانەی نەدەدا، هەرچەندە هەندێك دژی ئەو ڕایە بوون و پێیان وابوو، داهێنەرە هیلینستیەکان دەتوانن بە نموونە جولێنەری هەلمی دروستبکەن، کە بیریان لێیکردبۆوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ وایدابنێین، کە سەرکەوتنی زانستی ئەو چاخە، بۆشایی لە دەستدانی خۆ ڕێبەری سیاسی تێهەڵهێناوەتەوە (پرکردۆتەوە)[١٢٥٦].

ناوهێنانی زانا یۆنانیەکانیش لەڕاستیدا وەك پێشتریش گوتمان ئەوە ناگەیەنێ، کە هەموو ئەو دەستاوردانە لە بیری ڕوونی گریکیەکانەوە هەڵقولابن و گەلانی ژێردەست هیچ ڕۆڵیان تیایدا نەبوو بێت، بەلام وەك باسمانکرد، چونکە دەسەلات بەدەست گریکەکانەوە بوو و بۆ هەموو بوارەکانیش زانای پسپۆڕیان لەگەڵدابوون و ئەوانیش لەسەر بنەمای بیری خۆیان و زانیاری و زانستی ناوچەکان، داهێنانیان کردووە بۆیە نەگریکەکان توانیان دەستاوردەکانیان، گریکیانەی ڕووت دابهێنن و نە گەلانی ژێردەستیش توانیان پێشکەوتنی گریك بە پێشکەوتنی خۆیان دابپۆشن، بۆیە دەبینین دەستاوردەکان بەتەواوی لە هیچیان ناچن و مۆرکی هەدوولاشیان پێوەیە، ئەوەش کە ئەوە دەسەلمێنێ ئەوەیە کە" چەندین سەدە پێش ئەسکەندەر لە ولاتی میسوپۆتامیا و سەرزەمینێك، کە ئێستا پێی دەلێن ئێران، زانستی جۆراوجۆر بەتایبەت پزیشکی و ڤێرتێرنەری(بیطرية) برەوی هەبووە و ئەو هێرشەش بووە بەهۆی ئەوەی، کە شێوازەی حکومەت و پێکهاتەی کۆمەلایەتی ڕۆژهەلات پەرتەوازە بێت و زۆر لە زانایان کوژران و سەرچاوەکانی زانستی بۆ یۆنان گوێزراونەتەوە و ئەو سەرچاوانەش کە بۆ زمانی گریکی وەرگێڕدران ڕۆلیان بینی لە گەشەکردنی زانستی دیاری گریکان، ئەوان بوونە خاوەنی هەموو شت و دواتر میراتی خۆیان بەناونیشانی(دیاری) پێدابنەوە، شارستانیەتێك کە ئەمڕۆ بە دەستی ئەوروپاییان بوونی هەیە لەسەر بنەمای ئەو شارستانیەتەیە، کە گریکەکان بنیاتیان ناوە، ئەوانیش لە میللەتانی ڕۆژهەلاتی وەك ئێران و میسر و سوریە و بابل و هند، وەریانگرتووە - واتە بە تێکەلکردن لەگەڵ ئەوەی بۆ خۆیان هەیانبووە، چونکە نکولی ناکرێ کە خۆشیان خاوەنی شارستانی بوون - بۆ نموونە ئەو کە هێرشی کردە سەر ئێران هەر تەنها شێوازەی

---

[١٢٥٦] ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم، ج١، ص٢٥٨-٢٥٩.

کاروباری وڵاتی تێکنەدا، بەڵکو سەرچاوە زانستیەکانیشی لەناوبرد، چونکە زانست بەدەست موغەکان و ئاتەشگەکانیش لەجێی کتێبخانەبوون، نووسراوەکان لەسەر پێستی گا نووسرابوون، ئەو کاتێك بڕیاری سوتاندنی ئاوێستایدا فرمانیشی دەرکرد، کە شتە زانستی و پزیشکیەکان وەربگێڕدرێنە سەر زمانی گریك و بۆ ئەو وڵاتە ڕەوانەبکرێن و نوسخە ئەسڵیەکەی ئاڤێستاشی سوتاند، بێگومان لە هەلومەرجی ئاوادا ڕوخساری ناسنامەی زانیاری ئێران بزر دەبێ ئەوەی دەشمێنێتەوە، ناسنامەی گریکی وەردەگرێت و دواتر ئەو فەرهەنگە لە سەردەمی سلوکی دەسەڵاتی پەیدا کرد و لە سەردەمی (ئەشکانیەکان[1257])یش هەر بەردەوام بوو[1258].

لە سەرچاوەی تریشدا هاتووە، کە زانست و کتێبی جۆراوجۆری زانستی و ئەستێرەناسی و حیکمەت، کەهی ئێرانیان بوو، بە فرمانی ئەسکەندەر وەرگێڕدرانە سەر زمانی سریانی پاشان گریکی و بەرە و ئەو وڵاتە ڕەوانەکران، ئەوانیتریش سوتێنران تاوای لێهات لە نێو عەجەمدا هیچ کتێب نەمان[1259]، بەنیسبەت ناوچەکانی تریش، کە داگیریکرد ئەوە هەر ڕێی تێدەچێ. خۆشی گوتەنی فەرمانی بە زانا یۆنانیەکان کردووە، لێکۆڵینەوە لەسەر زانستی ڕۆژهەڵات بکەن وبیاگۆڕنە سەر زمانی خۆیان وداواشی لە خەڵکی ئەوەی کردووە کتێبەکانی گریکی بخوێننەوە[1260].

یەکێ لە کاریگەریەکانی تری دوای شەڕی گۆگامیلا کە لە شارستانی هیلینستیدا ڕەنگیدایەوە، ڕزگاربوونی زانستەکان بوو لە فەلسەفە، لە ڕاستیشدا کاریگەری زانایانی ئەو سەردەمە وەك (ئەرخمیدس و ئەکلیدوس- کە پێشتر ئاماژەمان پێدان ) لە کاریگەری

---

[1257] ئەشکانیەکان:گەلێکی نیمچە کۆچەری ئێرانی بوون لە سەدەی(٣پ.ن)لە بەشی باشوری ڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوین دەژیان لە دەوری(٢٥٠پ.ن) لەسەر دەستی ئارشاکی ڕێبەریان لە دەست سلوقیان ڕزگاربوون، ئەردەوانی دواپادشایان لە(١٢٦)بەدەستی ئەردەشیری ساسانی کوژرا و بوون بە بەشێك لەوئیمپراتۆریەتە. نخبة من العلماء: موسوعة الاثرية العالمية، ص٣٠٤؛ كلين دانيال: موسوعة علم الاثار، ج١، ص١١٣-١١٤.

[1258] عباس قدياني: تاثير فرهنگ وتمدن ايران در جهان، (تهران:١٣٨١)، ص٢٦٣-٢٦٤.

[1259] الطبري: تاريخ الطبري، ج٢،ص١٠؛ گرديزي: زين الاخبار تاريخ، تصحيح عبدالرحمان حبيبي، (تهران:١٣٦٣) ، ص٥٩.

[1260] نسطور ماتساس: مذكرات الاسكندر الكبير، ص١١٨.

فەیلەسوفەکانی ڕەواقی و ئەبیکور[١٢٦١]ی و گومانکاران کەمتر نەبوو، ئەو ڕەوشەش – ڕزگاربوونی زانست لە فەلسەفە- ڕەنگدانەوەی گیانی سەردەم بوو، پێشتر و لە سەردەمی کلاسیکدا تایبەتمەندی لە کاردانەبوو، بۆ نموونە فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستۆ، میتافیزیقیا(ئەودیوی سروشت)و زانیاری، دەروونزانی، ڕەوشت، و سیاسەتی دەگرتەوە و لە ژیانی کرداریشدا مرۆڤ لە بواری جۆراوجۆردا ڕۆڵیدەگێڕا، بۆ نموونە سوکرات لە کاتێکدا فەیلەسوف بوو، سەربازێکی لێهاتووی شەڕ و بەڕێوەبەرێکی باش‌و یاسادانەریش بوو...، بەڵام بەکۆتاییهاتنی سەدەی سێیەمی پێش زاین، کۆمەڵگەی شار، کە پێشتر لەسەر خۆ بژێوی بوو، ئێستا ئاڵۆزتربوو، ئەمەش پێویستی دەکرد تایبەتمەندی لە کاردا پەیدابێ، هێنانی بەڕێوەبەر و زاناو پسپۆڕانی بواری فیزیاو بیرکاری و فەلسەفە...هتد –کە باسمانکرد- بۆ ڕاییکردنی ئەوکارە ڕۆڵی زۆری گێڕا[١٢٦٢]. یەکێکی تر لە دیاردەکانی ئەو سەردەمە بڵاوبوونەوەی فێرکردن و دەرکەوتنی قوتابخانەی تایبەتی کوڕو کچان بوو[١٢٦٣].

خوێندنیش وەك باقی ڕواڵەتەکانی تری ژیان، کە سەرەڕای ڕەخسانی بۆ ڕەگەزی نێرو مێ هێندە دواکەوتوانە بوو کە ئەو خوێندەوارییەی بەرهەمی دەهێنا زیاتر لەوەی بەشداری بکات لە فیکردا پەستی و نیگەرانی بڵاودەکردەوە [١٢٦٤].جگە لەوە بۆ هەموو کەسێکیش نەبوو.

بەگشتیش دەتوانین بڵێین کە گەورەترین جوڵانەوە لە سەردەمی هیللنستیدا جوڵانەوەی زانستی بوو لە ڕووی چالاکی و ژیان و هەمەجۆری بەرهەمەوە، لە هەریەك لە بوارەکانی جوگرافی و گەردونناسی و ئەستێرەناسی و بیرکاری و توێکاری فیزولوجیا...هتد [١٢٦٥].لە پێشخستنی ئەو بوارانەشدا بێگومان کتێبخانەی ئەسکەندەریە کە لە سەردەمی بەتالیسەکان لە میسر دامەزرا،

---

[١٢٦١] لە تەوەرەی دووەمی ئەو باسەدا باسی دەکەین.

[١٢٦٢] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٩٣.

[١٢٦٣] محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج٣، ص١٢.

[١٢٦٤]احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٨٩.

[١٢٦٥] اندريه ايمار وجانين اوبوايه: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص٥٣٠.

رۆڵی بەرچاوی بینیوە، بەتایبەت کە لە وێدا بە هەزاران سەرچاوە لە بواری جۆراوجۆردا دەستدەکەوتن و زۆر لەو زانایانەش، کە ناومان بردن لەوێ خوێندویانە و کاریان کردووە.[1266]

یەکێکی تر لە گۆڕانکاریەکان تێکەڵاوبوونی زمانی نەتەوەکان بوو، کە هەر لەسەردەمی ئەسکەندەرەوە دەستیپێکرد و دواتریش بەردەوام بوو[1267]، داگیرکاریەکانیشی، وایکرد کە جڵەوی دەسەڵات بەدەست مەکدونیەکانەوە بێت و لە ڕووی شارستانیشەوە گریکیین و بە زمانی گریکی و بەو شێوازە گفتوگۆیان دەکرد، کە خەڵکی ئەتیکا پێیدەدوان، ڕۆژهەڵاتیەکان وا تێگەیشتبوون، کە (گریکی –شێوازێکی ئەتیکی-) زمانی بەڕێوەچوونی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتە، بەهۆی ئەوەش، کە لە سەوداو مامەڵەی بازرگانیدا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە بازرگانە گریکیەکان لەسەروکاردا بوون و لە ژێر دەستی ئەوانیشدا چاویان بە زۆر کتێبی سەرنجڕاکێش و بە نرخ دەکەوت، دۆخەکەوای دەویست، کە ئەوشێوە زارەی زمانی یۆنانی کە خەڵکی ئەتیکا بەکاریان دەهێنا، برەوی هەبێ و پشتی پێببەسترێ لەسەر ئەو بنەمایەش بوو، کە یەهودیە نیشتەجێکانی ئەسکەندەریە دەستیان کرد بە وەرگێڕانی(عهد القديم = تەورات) لە عیبرانیەوە بۆ گریکی تاکو چینی ڕۆشنبیر(سفرەکانی) بخوێننەوە، ئیتر گریکی بوو بە زمانی بڵاو لە شارەکان و لە جیهانێکی بەرفراوانیشدا، کە لە سەقلیە و باشوری ئیتاڵیاوە بەسەر هەردوولای دەریای ناوەڕاستدا، بۆ ڕۆژهەڵات درێژ دەبۆوە[1268]، واتە کاتێك سنووری نێوان شارەکان و دەوڵەتەکان هەرەسیهێنا، شێوە زارەکان و زمانەکان لە زمانێکی هاوبەشدا یەکیان گرت و ئەو زمانەش بوو بە زمانی ڕۆشنبیری و فیکر، لە هەموو جیهانی هیلینستیدا، ڕۆشنبیریەکان تێکەڵاوبوون، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە شارستانیەتێکی جیهانی هاوبەشدا بەشداریانکرد[1269].
ئەو زمانەش کە وەك زمانی هاوبەش بۆ هەموو گەلانی ناو ئیمپراتۆریەت دەرکەوت، شێوە زمانی(کوینی Koine)بوو کە لە ڕیشەی شێوە زاری ئەتیکییەوە هاتبوو[1270].

---

[1266] بۆ زیاتر زانیاری لەسەر کتێبخانەی ئەسکەندەریە بڕوانە: ابرهيم نصحي: تاريخ مصر في عصر البطالمة،(القاهرة:دت)، ج٤، ص٢٢٥–٢٨٨.

[1267] هاروڵدلەمب: كورش كبير، ترجمة رضا زاده شفق، (تهران:١٣٨٢)، ص٣٨٨.

[1268] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٠.

[1269] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٩٣.

[1270] محمود ابراهيم السعدني: تاريخ مصر في عصر البطالمة والرومان، ج٢، ص١٢.

ئەمەش مانای ئەوەنیە کە لەو سەردەمەی وڵاتی گریکدا تەنها یەك زمان هەبووە، بەڵکو چەند شێوە زارێکی گریکی و چەند زمانێکی نووسینیش هەبوون، بەڵام ئەتیکی گەورەترین شێوەزاری ڕۆشنبیری بوو لە جیهانی گریکدا، بۆیەش تەشەنەی کرد، ئەوەش کە لەوەدا، یارمەتیدەری بوو جێبوونەوەی هەندێك تایبەتمەندی ئەیۆنی بوو تیایدا، بەتایبەتیش گرنگی ئەو ڕۆڵەی ئەسینا لە ژیان و شارستانیەتی گشتیدا، یاری کرد، هەروەها بنەماڵەی مەکدونیش بە ماوەیەکی زۆر پێش ئەسکەندەر کردبوویان بە زمانی کۆشك و بەڕێوەبردن، ئەسکەندەریش هەر بەو زمانە دەدوا، زمانی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆی تەنها لە هەندێك بارودۆخی تایبەت نەبێ، بەکارنەدەهێنا، بەوەش زمانی ئەتیکی گەوهەری(کوینی) وەك زمانی هاوبەش کە لەخۆوە و یەکسەر دوای سەرکەوتنی ئەسکەندەر، سەریهەڵدا، پێشخست، ئەویش بە دەوری خۆی وەڵامی پێداویستی ئەو سەردەمەی جیهانیدایەوە، بەهۆیەوە گریکەکان بە ئازادی و بێ لەبەرچاوگرتنی زێدیان، هاتووچۆیان دەکرد و گرووپی تازەشیان تیایدا پێکهێنا، کە هەستکردن بە پشتگیری یەکیخستبوون، هەرچەندە ئەم زمانەش(ئەتیکی) روون نەبوو، بەڵکو کاریگەری شێوەزاری ئەیۆن(گریکەکانی ئاسیای بچووك)یشی پێوە دیاربوو، زمانی کوینی بەشداری کرد لە دروستکردن و بەردەوام مانەوەی یەکێتی ئەدەبی و فیکری جیهانی گریك و فێربوون و قسەپێکردن، پێنووسینیشی تا سەردەمی ڕۆمانەکان هەر مابۆوە[١٢٧١].

هەیە بڵاوبوونەوەی زمانی گریکی لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات لەسەر حسابی زمانی ئارامی بە یەکەمین ڕواڵەتی شارستانیەتی هیللنستی دادەنێ، بەتایبەت لە شار و مەڵبەندە ئاوەدانەکان، لە نێویدا وڵاتی ئێران و ئەویش بە زۆری لە نێو توێژی ڕۆشنبیران و شارنشینەکان، کە شانبەشانی زمانی خۆیان بەکاریاندەهێنا و لە هەندێك شار دەخوێنرا هەتا لە سەردەمی پارتیەکانیشدا (ئەشکانیەکان) کە لە دەوڵەتی سلوقی جیابوونەوە، هەر بەردەوام بوو[١٢٧٢].

سەرچاوەیەك جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سەرەڕای بڵاوبوونەوەی ئەو زمانە و پێشوازیکردن لە ئاداب و ڕێوڕەسمی گریك بەتایبەت لەلایەن چینە باڵاکانەوە، فەرهەنگی ڕەسەنیش بەردەوامی بە زمانی خۆیدا، وەك نموونەش بابل باس دەکات، کە تیایدا ڕوداو نامەکان، یاداشتی ئەستێرەناس و بەختگرتنەوە و بڕیارنامەکان، بە خەتی بزماری دەنووسران، تەنانەت ئەدەبیاتی

---

[١٢٧١] اندريه ايمار وجانين اوبوايه: تاريخ الحضارات العام، مج١، ص٥١٣.

[١٢٧٢] طه باقر واخرون: تاريخ ايران قديم، ص٨٧-٨٨.

دینی سومەریەکانیش لەو چاخەدا زیندوکرایەوە و پەرستگاکانی میسریش هەر بە شێوەی پێشووی خۆیان دروستدەکران، دیوارەکان بە خەتی هیرۆگلیفی نەخێشنران پاپیرۆس[1273]، نووسراوەکان بە زمانی میسر لەگەڵ هی نووسراو بە زمانی گریك کە جێماون، ئەو ڕاستیە دەسەلێنن، بەڵام مێژوونووسانی خۆجێیی کە بە زمانی داگیرکەر دەیانووسی هەندێك شانازی میللی خۆیان لەبیردەکرد[1274].

بەهۆی هاتنی هەزاران گەنجی خانەدانان بۆ ناو ڕیزەکانی سوپا بەو هاوسەرگیریەش کە لە نێوان گریکی و ڕۆژهەلاتیاندا بەئەنجام گەیشت و بەدروستکردنی داگیرگە و بازار، بەرێوەبردن... هی تریش وایانکرد، زمانی ئارامی کە زمانی ڕەسمی فەرمی سەردەمی ئەخمینیان بوو، وازی لێبهێنرێ و زمانی گریکی جێی بگرێتەوە وردە وردەش حوکمی زمانی نێودەوڵەتی پەیداکرد و تا سەردەمی (پارتە ئەشکانیەکانیش) لە شارە گریکەکان دەخوێنرا ئەمەش وایکرد کە زۆربەی دوو زمان بزانن و ناوچە شارنشینەکانی ئێران و هەندێك ناوچەی دەوروبەری تا چەند سەدە دوای ڕوخانی دەوڵەتی سلوقی، پارێزگاری لەو زمانە کرا، نووسراو و نیشانەو بەڵگەنامە چەرمینە دۆزراوەکانی هەورامان[1275] لە کوردستان بە زمانی گریکی ئەو ڕاستیە دەسەلێنن، بەمشێوەیە و بەبێ هیچ ناچارکردن و سیاسەتی تایبەت هاتە ئارا لە نێو ئێرانیانی شارنشین هەموو تاکەکانی چینی باڵاو ناوەندو هەتا کرێکارانی ئازادیش لە شارەکان، کاریگەری هەبوو، بەڵام لە گوندەکان کاریگەری کەم یان هەر نەبوو[1276]، بەڵام نەببوو بە زمانی ڕەسەنی زۆربەی خەڵك هەرچەندە زۆریان بەجۆرێك لەجۆرەکان فێری قسەپێکردنی بوون و نووسەرانی شارە نوێیەکانیش کتێبیان بەو زمانە دەنووسی، ئەدەبەکەشی جەماوەر و شوێنکەوتەی بۆ پەیدابوو، لە ژینگەیەکیشدابوو، کە بەهۆی دەسکەوتە زۆرەکانی شەڕو فراوانی جیهانەکەی لە چاو جیهانی

---

[1273] کاغەزێکە میسریەکان لە ڕووەکی زەل (الورق البردي) دروستیاندەکرد وبۆ لەسەر نووسین بەکاریاندەهێنا، بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(12) .

[1274] لوکاس دوبلویس وروبارتوس وان دراسپیك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٤.

[1275] مەسەلەی دۆزینەوەی ئەو قەواڵانە وئەو زمانەی پێی نووسراوەو ناوەرۆکەکەی، لەزۆر شوێندا باسکراوە، بڕوانە: ئەیوب ڕۆستەم: هەورامان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کەلتوریە، (سلێمانی:٢٠٠٤)، بەرگی یەکەم، ل ١٦-١٧.

[1276] رمان گیرشمن: تاریخ ایران از غاز ا اسلام، ص٢٩٧-٢٩٨.

گریك، بروا وابوو بۆ ماوەیەكی درێژ لە گەشەكردنی بەردەوام بێت، بەم پێیەش ڕۆشنبیری گریكی بلاوبۆوە، بەڵام شوێنەواری كەمتر لە گوندەكان دەركەوت[١٢٧٧].

هەروەها سەردەمی هیللنستی گەشانەوەیەكی بەرچاوی لە بواری خوێندنی گشتی بەخۆیەوە بینی، ئەمەش بۆ كۆمەڵێك هۆكار دەگەڕێتەوە لەوانە" ڕزگاركردنی ئافرەت كە بایەخی زۆری پێدرا لە بواری پێشكەوتنی ئەدەبدا، گەشەكردنی گشت لە مافی تایبەتدا، واتە بەهۆی گەشە و ئازادی تاكەكان جۆراو جۆریەتی نووسین دەركەوت و خەڵكێكی زۆر كەوتنە بایەخدان بەو بوارانەی حەزیان لێبوو، لەلایەكی تریش پێشكەوتنی ڕۆشنبیری و دەرچوونی ژمارەیەكی زۆر كتێبی لێكەوتەوە، ئەویش بە بەكارهێنانی (پەپیروس و پاچمێنت)[١٢٧٨]، لەگەڵ تەرخانكردنی پارە لەلایەن بەڕێوەبەرە دەوڵەمەندەكانی كتێبخانە و پەیمانگاكان و دابینكردنی پێداویستیەكانی خوێندن بۆ فێرخوازان(زەماڵە)، هەموو ئەمانە هانی كۆبوونەوەی قوتابیان و فراوانبوونی ئەدەبیاتیان وەك ڕووداوێك، دا. ئەو زەمانە لەلایەن بازرگانەكان لە هەموو شوێنێ بەكاردەهات و لە ڕۆماشدا، زانیاری گریكی لەلایەن پیاوانی ڕۆشنبیر، بە بەهابوو و تا ئێستاش هەندێك لە گریكەكان بەم دیالێكتە كۆنانە دەنووسن، هەرچەندە ڕۆژهەڵاتیەكان و ڕۆمانەكان توند دەستیان بە زمانی خۆیانەوە گرتبوو و پاراستیان، بەڵام شێوە زاری (كوینی) وەك زمانێكی جیهانی كتێبەڕكێ كاری نەبوو، گرنگی ئەم ڕووداوەش كاتێك دەركەوت، كە جولەكەكان(عهد القديم = تەورات)یان گۆڕی بۆ زمانی گریكی –كە پێشتر باسمانكرد- ئەو بەڵگە كۆنانەشی تێدا نووسراوە[١٢٧٩].

لە سەرچاوەیەكدا هاتووە كە (گشت خەڵك) بەتایبەت لەسەر ڕۆژانەی بازرگانی و بەڵگەنامەی ئاسایی(وصل اعتيادي)یان بە مەرەكەب لەسەر پارچە گڵینە دەنووسی، بەڵام (سەنەدی گرنگ)یان لەسەر گەڵای زەل(الورق البردي- پەپیرۆس) دەنووسی، ئەو جۆرە نووسینانە لە ماڵەكاندا كەڵەكەدەكران، هەروەك چۆن ئێمە نووسراو و نامەكانمان لە كتێبخانەكاندا

---

[١٢٧٧] ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم، ج١، ص٢٥٧-٢٥٨.

[١٢٧٨] پاچ مێنت: پێست یان كەوڵی ئاژەڵ كە بۆ لەسەر نووسین بەكاریان دەهێنا. گیرشمن، ص٢٩٧ ،هامش١.

[١٢٧٩] IRWIN ABRAMS and others: Ahistory of world civilization, vol.١, p.١٥٧.

کۆدەکەینەوە، لەبەر ئەوەش کە کەشوهەوای میسر وشکە سەیر نیـە کـە پـەڕەکان لـە لەناوچـوون دەپارێزران زۆریشیان لە ژێر پاشماوەی داروپەردووی خانوەکانا دۆزرانەوە[١٢٨٠].

لێهـاتوویی زانایـانی ئەسـکەندەریە بـۆ هێنانـەدی ئـارەزووی ئوسـتادەکانیان بێـسنوور بـوو، نووسەرەکان داهێنانی گەورەیان لە ئەدەبیاتی گریکەکاندا کرد، لە نێویدا باسکردن لـە ڕەوشـی ژیان و شوێنی خۆش بەشێوەی مەنەلوج(گفتوگۆی شێوەی هۆنراوەی کورت)، ستایلی(پاستورالْ Pastoral) کـە ئـەدیبێك بـەناوی سـیوکریت (ثیوکریـت دەوروبـەری ٢٧٠پ.ز) دایهێنـا دەرزدادان و ئامۆژگاری خەڵك بۆ خواپەرسـتی هێنایـە نـاو ئـەدەبی ڕۆژئـاوا، شـاعیرێك بـەناوی کالیمـاخۆس(٣١٠-٢٤٠پ.ز) گرنگـی بـە هـۆنراوەی فێرکـاری(شـیعری تعلیمـی)دا، ئـەو لـە کارەکانیدا زنیارییەکانی بە وشەو دێڕی جوان، لە بارەی ئەفسانەی شاراوە و نادیار و دابونەریتی سەیری دەرەوە کە لە فیستیڤاڵەکانی سەرانسەری جیهانی گریکدا کراون، بە شـیعر باسـکردووە، شوێنکەوتووە تازەکانیشی وزە و توانای زیاتریان بەخشیە داستانە کۆنەکان[١٢٨١].

واتە لەو سەردەمەدا چەند شاعیرێك سەریانهەڵدا، کە هەریەکەیان لە چوارچێوەی ئـەو ڕێـچکەیە جۆرێك شتیان لە زەیندا هەڵگرتبوو، کالیماخۆس (کـە فەرمانبـەری کتێبخانـەی ئەسـکەندەریە بوو) هۆنراوەی شێوەنگێڕی(مراثي) هجو و غەزەل و چیرۆکە هۆنراوە لەسەر پەیـدابوونی نـەریت و جەژنەکان دەنووسی، سیوکریتیش لە سیراکوزە قەسـیدەی شـوان و لادێیـی، ئـەپولونیوس لـە ڕۆدس(٢٩٥-٢١٥پ.ز) داستانی سەرکێشانە(مغامرين)یان دەنووسی[١٢٨٢].

یەکێکی تر لە گەورەترین دەستکەوتەکانی ئەو سەردەمە- کە پێشتریش ئاماژەمـان پێکـرد- لـە گۆڕەپانی ئەدەبیاتدا خوێندنی دەرەوەیی(بەزەمـالە) و دابینکردنی زانـست و جەختکردنـەوە بـوو لەسەری، کـە پێـشتر ئـەو دەرفەتـە نـەبوو خـەڵکی بـە دروسـتی ئاواتـەکانیان بـۆ نەدەهاتـەدی، کالیمـاخوس و هـاوڕێ فیلولوجیـەکانی(ئەوانـەی لـە زانـستی زمـان دەکۆڵنـەوە)هـی تـری وەك (Zenodotus)و (Aristarcha) خوێندنی ڕەخنەسازیان لە زمـانی گریـك و ئەدەبیاتـدا، دامەزراند و تێکـستی سـتانداردیان بـۆ نووسـینی هـۆنراوە لەسـەر هۆنراوەکـانی(هـومیروس) و

---

[١٢٨٠] جایمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢١-٣٢٢.

[١٢٨١] SARAH B.POMEROY and others: Ancient Greece, p.٤٥٧.

[١٢٨٢] هيرمن كندر و ڤيرنر هيلغمين: اطلس – dtv تاريخ العالم، ص٧١.

شاعیرەکانی تر ئامادەکرد و بەمەش بوون بە دامەزرێنەری ئەو ڕێبازە کە ئێستا ئێمە بەکاری دەهێنین[1283].

هەر لەو سەردەمەدا ڕێژەیەکی زۆر پەخشانی ئەدەبی بەرهەم هات، کە زۆربەیان لەناوچوونو لەگەڵ کۆتایی هاتنی دیموکراسی شار وتاری سیاسیش ئامانجەکانی خۆی لە دەستدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك شت وەك چیرۆکی سەرگوزشتەیی، واتە سەرگوزشتەیەك کە لە گێڕانەوەیدا چێژ دەبەخشێ کە نەدەتوانرا خامۆش بکرێت، مایەوە، لە گێڕانەوە باوەکانی دوادواکانی سەردەمی هیللنستیدا، درێژ دادڕی و بریقەداریی زۆر دیارە ئەوەش ستایلێکی ئەدەبییە کە بە(ئەشیاتیك = Asiatic) ناسراوە و لەسەر حسابی سنووردارکردنی زمانی ئەتیکی، باوی سەند، بەمشێوەیەش وتاردان، بوو بە بابەتێك بۆ کەیف خۆشی[1284].

سەرکەوتنی ئەسکەندەر بەسەر دارادا کاری گەورەیکردە سەر هونەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کۆن، ئەو هونەری هیلینییەش، کە لەسەدەی چوارەمی زاینیەوە دەرکەوتبوو، دەربڕی تێڕوانینێك بوو بۆ ژیان، کە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو و ڕیالستیانە (Realism الواقعیە) دەرکەوت. بە وردی لە دروستکردندا و وێناکردنی سۆزە مرۆڤایەتیەکان، کە خەسڵەتی تاکایەتی(الخصائص الفردیە) دەردەخست، جیادەکرایەوە و لە تێکەڵاوبوونی هونەری هیلینیش بە هونەری خۆجێیی کۆن لە دەمی دەسەڵاتی مەکدونیەکان و ڕۆمانیەکاندا، جۆرێکی تری هونەر هاتە ئارا کە بە شێوازی هیللنستی ناسراوە و لە هەموو ئەو ناوچانەشدا دەرکەوت، کە کەوتبونە ژێر کاریگەری سەردەمی هیللنستی[1285] یاخو بە واتایەکی تر هونەری گریکی لەو سەردەمەدا لەگەڵ شێوازەکانی هونەر لە وڵاتە ژێر دەسەتکراوەکاندا، کارلێکی کرد و ستایلێکی نوێی بۆ هونەری گریك هێنایە گۆڕێ و لە مەمالیکە جۆراوجۆرەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەسکەندەر و جێنشینەکانیدابوون، بڵاوبۆوە، خاسیەتی ئەو چەشنەی لەو سەردەمەدا سەریهەڵدا ئەوەبوو، کە

---

(1283) SARAH B.POMEROY and others: Ancient Greece, p.٤٦٠.

بۆزیاتر زانیاری بڕوانە:

(1284) ARWINABRAMSand others: Ahistory of world civilization, p١٥٨-١٥٩ .

(1285) نعمت اسماعیل علام: فنون الشرق الاوسط في الفترات الهلنستیة والمسیحة والساسانیة، ص١٤.

هونەرمەندەکان گرنگیان بەریالیزم(واقعیە)دا کە (ڕاستەقینەیی) وێنا دەکرد، وێنەی جەستە لەجموجۆڵی توندی جۆراوجۆردا، دەکێشرا و هەستکردن بە ئازار و خەموترسی، دەردەخست، هەروەها هونەرمەندەکان دەستیشیانکرد بە وێنەکردنی هەژاری و بابەتەکانی ڕۆژانەی گەل، وێنەی تاکەکانیان لە هەموو قۆناغە جیاوازەکانی ژیاندا، دەکێشا.[١٢٨٦]

هونەرمەندەکانی کە لە ولاتی گریك یان هەر ناوچەیەکی تر دەهاتن، دەبوایە بە کرپارە گریکەکانی خۆیان و ڕۆژهەلاتیە بە گریکی بووەکانیش، کە بالاترین و دەوڵەمەندترین چینی کۆمەلگایان پێکدەهێنا و لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی گریك و بە گوێرەی شێوازی زیندەگی ئەوان سەلیقەی خۆیان ڕێکدەخست، بە تەواوی قایل بکەن، هونەرمەندانی خۆجێیش کاریان بۆ ئەوان دەکرد لە ژێر دەسەلاتی ڕەوتی هونەری ڕۆژئاواییدا قەراریان گرت، شتی وایان دروستکرد کە نە گریکی تەواو و نە ڕۆژهەلاتی تەواو، بەلکو ئەوەی بەدەستدەهات حالەتێکی ناوەنجی بوو، بەمشێوەیەش هونەری گریکی –ئێرانی و پێشتریش گریکی- سوری و گریکی- ولاتی نێوان دوو ڕووبار و دواتریش گریکی- هندی، گریکی –بودایی- یان بەگشتی هونەری هیلینستی خولقا[١٢٨٧].

ئاستی بە پەرۆشی جێنشینەکانی ئەسکەندەر بۆ گەیاندنی ئەو پەیامەی هیلینیەت، لەو گەشەکردنەدا ڕۆڵی بینیوە، بۆ نموونە دەبینین بەهۆی لە ئاستی پێویستدا نەبوونی بەتالیمەکان بۆ ئەو ئەرکە وایکردبوو، کە ئەو هونەرە تازەیە هەر لە ئەسکەندەریەدا چڕببێتەوە، بۆیە ئەگەرچی لە ژیانی تایبەتیاندا هەر بەرێی گریکەکاندا دەیانگوزەراند، بەلام کاریگەری ئەو هونەرە لە میسردا سادەبوو بەهۆی بە پەرۆشی پادشاکانی سلوقی بۆ شارستانیەتی میللەتەکەیان، کاریان لەسەر بلاوکردنەوەی هونەرەکەیان کرد و دانیشتوانی ئەو هەرێمانەش، کە کۆچیان کردبوو و تێیدا نیشتەجێ ببوون ڕوخساری ئەو شارستانیەتەی وەرگرت[١٢٨٨].

هاوڕێ لەگەڵ گۆڕانکاری ڕۆشنبیری، کە لە سەردەمی هلینیدا دەرکەوت، هونەری هەلکۆڵینیش گۆڕانی بنچینەیی تێدا بەدیهات، هونەرمەند ڕووی کردە(واقع) لە جولە و دەربڕیندا و لەو

---

[١] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط والعالم القديم، (القاهرة:١٩٨٠)، ص٢٨٦.

[١٢٨٧] رمان گيرشمن: تاريخ ايران از اغاز تا اسلام، ص٣٢٠-٣٢١.

[١٢٨٨] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط، ص٤١.

بابەتەش کە هەڵیدەبژارد، گرنگیدانی پەیکەر تاشەکانیش بە زۆری چڕبیۆوە لەسەر دروستکردنی پەیکەری کەسایەتی پاشاو خوداوەندان و کەسایەتیە میللیەکان[١٢٨٩].

هەر لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی گریك و ڕۆژهەڵاتیەکان، سروشتی هونەری پەیکەرتاشی پێشو، کە تیایدا گرنگی بە دەرخستنی جەستە دەدراو، ئارەزوو و چێژی سیکسی (شهوة، لهو لذة) دەردەبری لەو سەردەمەدا زیاتر ڕەنگدانەوە(نەفس —ناخ)ی مرۆڤ بوو، ئەوەش بۆچوونێکی سۆفیانەیە، چونکە سۆفیەکان وا دەبینن کە لە ئارادا، نەفس و جەستە هەیە و زۆرتریش گرنگی بەنەفس دەدەن تاجەستە و بڕواشیان وایە، کە تا ئەو دووانە بەیەکەوە پەیوەست بن نەفس لە زینداندا دەبێ و تەنها بە مردن و جیابوونەوەش نەبێ، ئاسوودە نابێ[١٢٩٠]، بەڵام لەگەڵیشیدا گرینگیدان بە جەستە فەراموش نەکرابوو ، لە بەناوبانگترینی پەیکەرەکانی ئەو سەردەمە ئافرەتێکە کە سەردەمەکەی بۆ سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی پێش زانین دەگەڕێتەوە، هەروەها خانمێکە کە لەسەر بەردێك دانیشتووە و پێیەکی لەسەر شانی گەنجێك داناوە کە لە ڕووبارێکدا مەلە دەکات،[١٢٩١] لە جوانترین کاری قوتابخانەی ئەنتاکیاش پەیکەری خواوەند(ئەفرودیت)[١٢٩٢]ە کە سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری(٢٠٠پ.ز)و دیارە کە خەریکی دانانی جلوبەرگیەتی و بۆ ناو ئاو دادەبەزێ و نەشزانراوە کێ دروستیکردووە[١٢٩٣].

ئەو شتانەش کە هەڵکۆڵین کارەکان(نحات)ی ئەسینا دروستیانکردن شوێنی زۆریان لە هەڵکۆڵین کارەکانی برغامی (برگام —برجام )ی هەڵکەوتو لەسەر کەناری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك هەبوو، تەنانەت وەك سروش(وحی) وابوو بۆیان، کە وایلێکردن لەسەر بەردێك چەند وێنەیەك هەڵبکەنن و لە هەموویان وێنەیەکی تێکەڵ پێکبهێنن کە زۆر کاریگەر و سەرنجڕاکێش بوو. ڕۆژگار شتێك لەو داهێنراوە ئەسینایانەی بۆ جێهێشتووین و ئەوەی لە هەموویان جوانتر دەنوێنی تابوتی نەخشێنراوی ئەسکەندەرە، کە ڕەنگ و نەخشی سەرنجڕاکێشی لە خۆی گرتووە و باس لە شەڕی ناوبراو دەکات لەگەڵ ئەخمینیەکان و وێنەی ئەسکەندەری تێدا نیشاندراوە، کە

---

[١٢٨٩] نفس المرجع، ص٤٢.

[١٢٩٠] اندریه ایمار وجانین اوبوایه: تاریخ الحضارات العام، مج١، ص٥٠٣.

[١٢٩١] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٣).

[١٢٩٢] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٤).

[١٢٩٣] نعمت اسماعیل علام: فنون الشرق الاوسط ، ص٢٨٦.

خەریکی ڕاوکردنی شێرێکە لە شێرە گەورەکان، وێنەکێشە گەورەکانیش لەو سەردەمەدا ئارەزوویان بوو، کە ڕووداوە ترسناك و خەماویەکان لەوپەڕی توندوتیژیدا، نیشانبدەن[1294].

سەرچاوەیەك سەردەمی دروستکردنی تابوتی ئەسکەندەر، کە لە نموونەی هەڵکۆڵینی بەرزە(نحت بارزە) دەگێڕێتەوە( ٣٠٠ -٢٢٥پ.ز)[1295].

لە نێو ئەو زنجیرە پەیکەرە بەرجەستانەی تر، کە لەماوەی سەدەی( ٣و٢ پ.ز) کە بەرهەمی بیری ڕسکاو لە هەلومەرجی دوای شەڕی گۆگامیلا بوون لە لایەن پەیکەرسازەکانی گریك دروستکراون، پەیکەری خواوەندی سەرکەوتنی چاکەیە، و سەردەمەکەی بۆ(٢٠٠پ.ز)، دەگەڕێتەوە و خانمێکی باڵدار دەنوێنێ لە کاتی نیشتنەوەیدا لەسەر پێشەوەی کەشتیەك و سەرکەوتنی لە شەڕدا بەدەستهێناوە و هونەرمەند سەرکەوتوو بووە لەوەی کاتێك جوڵەی ئەو خوداوەندە، کە بۆ پێشەوازی(با)دەڕوات (با)ش جلەکانی دەجوڵێنێتەوە[1296]، زیرەکانە نیشانداوە[1297]و پەیکەری(نیل)یش کە لەلایەن هونەرمەندانی قوتابخانەی ئەسکەندەریە دروستکراوە، یەکێکی ترە لە پەیکەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە، کە ڕووباری نیل وەك پیاوێکی کامڵ دەردەکەوێ و لەگەڵیدا شانزە منداڵ هەیە[1298] ئەو منداڵانەش لقەکانی دەنوێنن[1299].

پەیکەری(لائوکۆن ودوو کوڕەکە) شی لە نموونەی ئەو پەیکەرانەیە، کە دیزاینێکی ئاڵۆز و تێکەڵ (تصميمات معقدة ومركبة)یان هەیە، سەردەمی دروستکردنی بۆ ماوەی نێوان(١٦٠-١٣٠پ.ز) دەگەڕێتەوە، تیایدا جوڵەیەکی توندوتیژ تێبینی دەکرێ، کە(زەیوانەکە ودوو کوڕەکەی) لە شەڕکردنیان لەگەڵ منداڵەکانیدا پێی هەڵدەستێ و بە گوێرەی ئەفسانەی پەیوەست بە شەڕی(تەڕوادە)، گوایە(لائوکۆن) زەیوانی شارەکە - (كاهين طروادة)- ئامۆژگاری

---

[1294] جایمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٨.

[1295] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط والعالم القديم، ص٢٨٩. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (١٥)

[1296] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٦)

[1297] فئودور.ب.کوروفکین: تاریخ یونان باستان، ص١٧٢؛ نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط والعالم القديم، ص٢٨٦-٢٨٩.

[1298]نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط والعالم القديم، ص٢٨٩.

[1299] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط ، ص٢٢. بڕوانە:پاشکۆی ژمارە(١٧)

هاولاَتیانی کردووه، که قایل نەبن بە هێنانە ژوورەوەی ئەسپە دارینەکە، کە لە ناویدا سوپای دوژمن خۆی حەشاردابوو، بەهۆی ئەوەش کە(خواوەند ئەسینا) لایەنگری گریکەکان بوو، دوو ماری بۆ تۆلەکردنەوە لەو زەیوانە، ڕەوانەکردووە[1300]. ئەمەش یەکێکە لەو وێنە سەرسوڕهێنەرانە کە هونەرمەند بۆ نمایشکردنی ئازاری مرۆڤایەتی خولقاندوویەتی[1301].

دەکرێ بڵێین هونەر پەیکەرتاشی(نحت) لەسەردەمی هیللنستیدا پەرەیسەند و خەلاَتیش بۆ ئیشی باش تەرخانکراو ڕۆمانەکانیش زۆر بە پەرۆش بوون، تا لەو هونەرەدا دەستی بالاَیان هەبێ، لە کۆتایی سەدەی دووەمی پێش زایین دروستکردنی پەیکەر لە بازاڕەکانی ڕۆمان بۆ ژمارەیەك هونەرمەندی گریك، بازرگانیەکی بە بەرهەم و پارەهێن بوو، ئەوانی تریش داواکاری دەوڵەمەندانی ڕۆژهەلاَتیان دابیندەکرد، گەلێك لەوانەی گریك نیشتمانی خۆیان جێدەهێشت و لەو شارانە نیشتەجێ دەبوون، کە تیایدا پارێزەری ئەدەب و هونەر بە ئاسانی دەستدەکەوتن[1302].

هەلکۆلێنیش وەك دەرەنجامێکی تری ئەوهەلومەرجە مەیلی ڕیالیزم (الواقعیە) هەبوو، کە هەندێك جار پێکەنیناوی و هەندێك جاریش سۆز ئامێزبوو، منداڵی کوڕ لە وێنەکانی ئەواندا پەسندترین بابەت بوو و تیایدا ناوچاوانیان بە جوانی دەردەخست، کە نیشانەی پاکی و هێزی دەگەیاند، نیشاندانی دیونیسوس و منداڵە بچوکەکانی خواوەندی خۆشەویستی و منداڵێك کە زۆرانبازی لەگەڵ قازوقولێنگ دەکات لە نموونەی جوانی ئەو تێڕوانینەن، نەخشی چاڵ(ناتیْ = غائر) لەو سەردەمەدا زیاتر گرنگی خۆی لەسەر دیمەنە ئەفسانەییەکان و ژیانی ڕۆژانە چڕکردبۆوە وەك دیمەنی ژیان لە کەنار ئاوێك یان شارێك یان گوندێك جگە لەمە زۆر لە وێنەکان ڕواڵەتی سروشتیان پێوەدیار بوو[1303].

---

[1300] ف.ب.كوروفكين: يونان باستان، ص١٧٣-١٧٤؛ نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط والعالم القديم، ص٢٨٩.بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (١٨)

[1301] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٨.

[1302] IRWIN ABRAMS and others: Ahistory of world civilization, v.I, p.١٥٤.

[1303] اندريه ايماوجانين اوبوايه: تاريخ الحضارات العام، ص٥٠٧.

بێگومـان بـارودۆخی گـشتی خولقـاوی دوای شـەڕی گۆگـامێلا کاریگـەری لەسـەر هونـەر و وێنەکێشانیش هەبوو، کە وایکرد زۆر جیاواز بێت لە هـی سـەردەمی کلاسـیکی، گۆڕانیش بـە تایبەتی لە هەلومەرجی ماددیدا دەردەکەوێت، سەرهەڵدانی پادشانشینانی گـەورە وسیاسـەتیان لە یارمەتیدانی هونـەرە جوانـەکان و کەڵەکـەبوونی سـامان و کێبـەرکێی نێـوان کۆمەڵـەکان و مەیلی تاکەکان بۆ خۆ نواندن(الفخفخە)، تێکرا ڕۆڵیان هەبوو لە زیـادبوونی گـەورەی خواسـت لەسـەر دروسـتکراوە هونەریـەکان، بـەهای گـشتیش بـە گـوێرەی ئـەو پێـشکەوتنەی ڕوویـدا، بەهەمانشێوەی پیاوانی بیر، کاریگەری باشی لەسەر ژیانی مـاددی هونەرمەنـدان و پلەوپایـەیان لە چینە کۆمەڵایەتیەکاندا هەبوو، ئەمەش هەر بـە تـەنها نـەبوو بـەهۆی زیـادکردنی ژمارەیـان، بەڵکو ڕۆڵی لەسەر فراوانکردنـی هەلومـەرجی کـارکردنی هەریەکێکـیشیان هـەبوو، زیـاتر لـە پێـشوو گرنگیـان بـە بـەکارهێنانی کەرەسـەی خـاوی گرانبـەها و دەگمـەن دەدا، کـە پایـەی دروستکراوەکانیانی لە چاوی کڕیارەکاندا بەرزتر نیشاندەدا، ئەمەش بازاڕیانی زیادکرد و چەند ئەنجامێکی بەدوای خۆی داهێنا لەوانە" لاسایی کردنەوەی دروستکراوە بەناوبانگەکان و قـازانجی چینی مامـناوەندی و گەورەبوونی بازنەی ئەوانەی گرنگی بەشتی جوانکاری دەدەن و فراوانبوونی خـەرجکردنیـان و بەرەبـەرە لەناوچـوونی(وەهمـی) کۆمەڵایـەتی کـۆن و دەرکـەوتنی چـەند هونەرمەندی تازە، کە لەگەڵ ئەسکەندەر هاتنە ئاسیاو چەند کەسی تر لـە بـواری پەیکەرتاشـی، واتە لەوە دەرچـوو، هونەرمەنـدانی پەیکـەرتاش، چـەند کەسـێکی دیـاریکراوبن و بڵاوبوونـەوەی بەرهەمـەکانیـان هەر لە گریك قەتیس بێنن[1304].

لەوسەردەمەدا وێنەکێشە گەورەکانیش وەك پەیکەرتاشەکان پێیان خۆش بوو کە ڕووداوە ترسناك و خەماویـەکان لەوپـەڕی توندوتیژیـدا وێنابکـەن، ئـەوەش لـە وێنـەکردنی شـەڕێکی نێـوان ئەخمینیـەکان و گریکەکانـدا دەردەکـەوێت، تیایـدا ئەسـکەندەر هێـرش دەکاتـە سـەر دارای سێیەم[1305] و بە شەڕی ئیسوس سـاڵی(٣٣٣پ.ز) نـاوی دەبـات[1306]، لـە سەرچـاوەی تریـشدا جەختی لێکراوەتەوە[1307]، یەك لە توێژەران بە شـەڕی ئـەربیلای دەزانـی و پێـی وایـە لـە لایـەن

---

[1304] نفس المرجع ، ص٥٠٢-٥٠٣.

[1305] بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٩).

[1306] جایمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٨.

[1307] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط ، ص١٤.

هونەرمەندێکی ئیتالی بە ناوی (پاولو ئوجێللۆ) بە موزایك و بەشێوەی دیواربەند لە سەدەی پانزەهەم دروستکراوە[1308] کە ڕەنگە ڕاستی بۆ چووبێ، چونکە ئەوە شەڕی گۆگامیلا بوو کە هەروسی بە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی هێنا نەك ئیسوس وبە بەشێك لە ئاواتەکانی گەیاند، پێدەچێ هەر ئەو جیاوازی ناوهێنانی تابلۆکەش بێ، کەوای کردووە یەك لە نووسەران شەڕەکانی لێ تێکەڵ بێت و هەردووکیان بەیەك شەڕ بزانێو لە میانەی نووسینێکدا ئاماژەی بە وێنەکە کردووە و لە ژێریدا نووسیویەتی (شەڕی ئەربیلا کە پێشی دەڵێن ئیسوس)[1309].

وتراوە کە پەیکەرتاش وێنەکێشان لە گۆڕەپانی کارەکانیاندا دەرکەوتن و ئیشە نەمرەکانیان لەوەی کە وێنەیان کردووە، شێوە و ڕوخساری ڕاستەقینەی ئەو کەسایەتیەمان دەخەنە بەرچاو، کە دەینوێنن، واتە ئەگەر لە وێنەکان بڕوانین دیمەن و شێوەی دەموچاوریانمان بۆ دەردەکەوێ دەڵێن" نیگارکێشی خۆشەویستی ئەسکەندەر بە ناوی(ئەپلاس) جارێك وێنەی ئەسکەندەری کێشاوە، کە سواری ئەسپەکەی ببوو، ئەوەندە سەرنجڕاکێشەرانە ئەسپەکەی ڕەنگ کردبوو کە دەتوت ئەسپێکی تەواو زیندووە تا جارێك ئەسپەکەی چاوی پێیدەکەوێ، بە حیلاندنەوە بۆ لای ڕادەکات[1310].

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی ئەو چاخە دەرکەوتنی وێنەی کەسی ڕەنگاوڕەنگی پیاو و ژن و منداڵانو جێگیرکردنیان بوو لەسەر ڕووی تابوت، لە بری ڕووە هەڵکەنراوەکان، ئەو وێنە ڕەنگاوڕەنگەش لەسەر قوماش دەکێشراو بە گەچ دادەپۆشرا یان هەر ڕاستەوخۆ لەسەر تابلۆیەکی تەختە دروستدەکرا[1311] و مەبەستیش لێی پاراستنی شێوەی مردووەکە بوو تا یارمەتی گیان(روح) بدات لەسەر مانەوە[1312].

لە دارشتنـــی(تصمیم)کاری کانزاکاری سەردەمـــی هیللنستـــیدا کاریگەری ئەخمینی دیارە بەتایبەت لە دروســـتکردنی قاپی مەی تێدا خواردنەوە و دروستکردنـــی ســـتون(عمود = کۆڵەکە) کە تاجـــی بەسەرەوە بوو کە بە نەخشـــی گوڵ یا ئاژەڵ دەرازێنرایەوە و لەو شێوە

---

[1308] فەرهاد پیربال: وێنەی کورد لە ئەرشیفی ڕۆژهەڵاتناسەکاندا، ل٩.

[1309] وهيبه شوكت محمد:انتفاظة الميديين بقيادة فرورتيس ضد الامبراتورية الاخمينية ،مجلة گولان العربي العدد٣٢، ١٩٩٩،ص٦١.

[1310] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٢٨-٣٢٩.

[1311] بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ٢٠).

[1312] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط ، ص٣٤.

تاجانە دەچوون کە لە کۆشکی پەرسیپۆلس هەبوون، ئیشی زێڕ و زیویش لە قاڵبی گەچدا دادەڕێژران پاش ئەوەی شتە پێویستەکانی لەسەر هەڵدەکەندران و کانزاکەی تێدەکرا، دۆزینەوەی قاپێکی گەچ لە دەڵتای نیل کە ڕازێنرابۆوە بە نەخشی خوداوەندان، ئەوە ڕووندەکاتەوە، هەروەها لە سەردەمی هیللنستیدا بیری نەخشکردنی وێنەی پادشایان لەسەر پارەی زێڕ و زیو[١٣١٣]، بوونی هەبوو و تەشەنەی کردبوو، دەسەڵاتداران بۆ دروستکردنی سوودیان لە نیگارکێشانی گریك وەردەگرت بوونی پارە زێڕ و زیوو کە وێنەی ئەسکەندەر یان بە تلیموسی یەکەمی لەسەر بوو لێرەو لەوێ دەستی لێکۆڵەران کەوتووە سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە و جگە لەوانەش لە سەردەمی بەتالیمەکاندا گەردنبەند(میدالیا[١٣١٤])ی برونز بە بۆنەی کۆچی دوایی ئەسکەندەر دروستکران و گومانیشی تێدانیە ئەوەی وێنەی ئەسکەندەری دروستکردووە و لەسەر پارە چەسپاندوویەتی ئەنتیفولسی نیگارکیش بووە[١٣١٥].

هەروەها کاریگەری ئەم بارودۆخە یارییەکانیشی گرتەوە، وای کرد کە لەو سەردەمەدا زۆربەی یاریەکان بەرەو پووکانەوە بچن و یاری(ملاكمە) بڵاوبێتەوە کە دەربڕی دیمەنی هێزبوو لەو کۆمەڵگایەدا کە لەسەر هێز بنیاتنرا بوو، تا بشبێتە گوزارشێك بۆ بێدەسەڵاتی ئەو کۆمەڵگایە کە ببوونە سەیرکەرێکی بێنەخش لە بەرامبەر ئەوەی دەگوزەرا لە گۆڕەپانی ململانێی نێوان دەسەڵاتداراندا[١٣١٦].هەر لە ئەنجامی لاساییکردنەوەی هونەری ڕۆژهەڵات، هونەری گاڵتەوگەپ پەیدابوو وەك وێنەی کورتەباڵا سادەکان، سەماکەری کۆمیدی لە جیاتی هونەری جوانکاری[١٣١٧].

---

[١٣١٣] بەپێی سەرچاوەکان پارە (عملة=Coins)ی سەردەمی ئەسکەندەر و دوای ئەو ،کە وێنەی هەمەجۆریان لەسەر نەخشکراوە لە زۆر ناوچە و لە کوردستانیش دۆزراونەتەوە، ئێستا نموونەیەکی گەورەکراوی لە مۆزە خانەی سلێمانیە.

[١٣١٤] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢٢).

[١٣١٥] نعمت اسماعيل علام: فنون الشرق الاوسط ، ص٢٩-٣٠.

[١٣١٦] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٨٩.

[١٣١٧] اندريە ايمار جانين اوبويە :تاريخ الحضارات العام ،مج١،ص٥٠٧.

سەرەڕای هەموو ئەوانەی باسکران ئەسکەندەر بەو کردەوانـەی لـە میانـەی لەشکرکێشیەکەیدا، بەتایبەت دوای ئەنجامـدانی شـەڕی گۆگـامێلا، خـۆی خزانـدە نـاو کلتـور و فەرهـەنگی میللـی گەلانی ناو سنووری چوارچێوەی دەسەلاتەکەی و لە زەینی دانیـشتواندا شـوێنەواری بەجێهێـشت ،ئێستاشی لەگەڵدابێ لە بوار و کەلێنی جیاجیادا لێرە و لەوێ ،ئەو شوێندانانە ئامادەیی خـۆی پاراستووە ،دەشێ ڕەواجی ئەسکەندەر وەك ناو بۆ ناونانی منـدالاَن کـە بـەزەقی بەرچـاودەکەوێت شوێنگرتنی لە نێو گۆرانی گۆرانیبێژان و بەیت وئەفسانە[1318] و دین[1319] ،پشت قـایمکردنی، (شانازی بەخۆوەکردن)بە وتەی هەڵبەسترا بە دەمی ئەسکەندەرەوە[1320]

گەڕاندنـەوە و پەیوەسـتکردنی نـاوی شـوێن وناوچـە و قـەلا[1321] ...بەچـیرۆك و بەسـەرهاتی ئەسکەندەر و گریکەکانی هـاوڕێی ،کـە لـە کوردسـتان بەرچـاودەکەون وەك نموونـە، ڕاسـتی ئـەو قسەیە بسەلێنن.

---

[1318] بۆ نموونە بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢٣).

[1319] بڕوانە شوکری ڕەشید الخیراڤایی :الاسکندر المقدوني في التاریخ واساطیر الشعوب ،مجلة لالش ،العدد ٢٢،(دهوك:٢٠٠٥)،ص٣١-٣٧.

[1320] بۆ نموونە لە قەدی دیوارێکی چەمچەماڵ نووسراوە (ئەسکەندەری مەکدۆنی وتوویەتی لە شەڕی چەمچەمالاَ بۆم دەرکەوت کە پێویستە گەلی یۆنان ئازایەتی کوردو عینادی فارسیان هەبێ).(مەهدی تاهیر کاکە حەمە)ش لە گۆشەیەکی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە٢٢٢٥،سێ شەممە ٢٠٠٨/٨/١٥ئاماژەی هەمان قسەی نووسیوە وخۆی گوتەنی لە مجلە حوار ، عدد(٥و٦)،١٩٩٤ی وەرگرتووە .

[1321] وەك بەڵگـە بـۆ بڵاوبوونـەوەی یۆنانیـان وکاریگـەری و تێکـەڵاویان لەگـەڵ دانیـشتوانی ناوچەکە ڕیـشەی گـەلێ شـوێن وەك (پێنجوێن )بـە پێـنج یۆنـانی و(بیتـوێن )بـە مـاڵی یۆنانیـان ...لێکدراوەتەوە .بڕوانە: جمال رشید احمد وفوزی رشید :تاریخ کرد القدیم ،ص١١٩.هەروەها لە شاخی سورێنی نزیك بانی شاریش ڕێگایەك هەیە بە ڕێگای ئەسکەندەر بەناوبانگە ،دەڵێن گوایە ئەسکەندەر لەو ڕێگەوە گالیسکەی جەنگی سەرخستووە وهێرشی کردۆتەسەر شارەزورو وێرانـی کـردوە تائێـستاش شـوێنەواری دیـارە .بڕوانـە: لـەیلان: گـوڵ گەشـتێك بەناوچـەکانی کوردستاندا، (سلێمانی :١٩٨٤)، ل١٥.

لەلێکۆڵیەوەیەکیشدا هاتوە کەلەکێوەسەختەکانی هەوراماندا شوێنێك هەیە پێی ووتراوە زیندانی ئەسکەندەر،گوایەئەسکەندەر شازادەکانی بنەماڵەی ئەخمینی لەسالانی نێوان ٣٣٠-

لـه ڕۆژانـی دوای ئەسکەندەریـشدا، گریکـەکان لەسـەر پەرەپێـدانی بڵاوکردنـەوەی کـەلتوری سـەرەکییان، لەسەرتاسـەری - ملکـی خۆیـان تـا بەسـەر ڕۆژئاوایـدا بـسەپێنن، ئـیتر خـەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ژێر سایەی دەسەڵاتی گریکی- ڕۆمانی پلەوپایە و توانا و لەگەڵیـشیدا زۆر لە کۆنترین دابونەریتیان لەدەستدا[١٣٢٢].

---

٣٢٧پ.ز بردبوو تێدابەند کردبوو بنەماڵە حوکمڕانەکانی هەورامانیش لەڕێی بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیار خۆیان بەپاشماوەی ئەوشازادانە دەزانن: ئەیوب ڕۆستەم ،هەورامان لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی کەلتوریە،بەرگی یەکەم،ل٢٢.(شەرەفخانی بەدلیسی)ش فەرمانی سپاردنی دروست کردنی قەڵای بەدلیسی بەکەسێك بەناوی (بەدلیس )لەلایەن ئەسکەندەرەوە بەبەسەرهاتێکی ئەوەوە پەیوەست کردوە سەرچاوەی ئەوبڕیارەشی بۆسەرسامی ئەسکەندەر بەدڵگیری ناوچەکە وسازگاری ئاوەکەی لەچاوگشت شوێنانی تر کاریگەری ئاوەکەی لەسەردەرێکی بێ دەرمان کەتوشی ببو پزیشکان لێی بێهیوابوبون، دەگێڕێتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: شەرفخانی بەدلیسی ،شەرەفنامە، وەرگێڕانی هەژار، ل٤٤٤-٤٤٨؛ لەیلان: گەشتێك بەناوچەکانی کوردستاندا،ل٢٤-٢٨.

(١٣٢٢) F.C.BURITT and others: The Legacy of EISRAEL,(London;١٩٦٩),p٣٠.

## تــــەوەرەی دووەم
## لە بـواری هــــزری و ئاییــنیدا

بەرەنجامەکانی شەڕی گۆگامێلا هەر بە تەنها ئەوانە نەبوون کە لە تەوەرەکانی تردا باسکران بەڵکو زۆر بە ڕوونی کرانەوە و ئاوێزانبوونی هەردوو کەلتوری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاتی ،لەگەڵ یەکتردا، لێکەوتەوە کەبواری هزری و ئاینیش کایەیەکی بەرچاوی ئەم کارلێککردن و ئاوێزانبوونەیە .

هەرچی فەلسەفەی گریکە، کە لەکاتی هێرشەکەدا بۆ سەر ڕۆژهەلات، لە لوتکەی گەشانەوە و پەرەسەندندا بوو و لە سەرانسەری ولاتی گریکدا بلاوبیوەوە[١٣٢٣]، کاردانەوەی کۆتایی هاتنی دەوڵەتە شار (بە ناونیشانی یەك یەکەی سیاسی سەربەخۆ)ی، تێدا دیاربوو[١٣٢٤]، واتا بەهۆی لە دەستدانی سەربەخۆیی دەوڵەتە شارەکان بەدەست مەکدۆنیەکان گیانێکی نوێی بەسەردا، تێبینیدەکرا، چونکە ئەو نارەحەتیەی خەڵکی شارەکان بە باڵا دەستی ئەوان و شەڕەکانی ناوخۆ تووشی بوون، لێنەگەڕا گریکەکان تەنها مەیلیان بەلای فەلسەفەدا بڕوات بەڵکو، پێویستیان بە چارەسەرێکی تربوو کە بەهێزیان بکات ئەویش لە نێو دین و ڕەوشتدا نەك فەلسەفە بە تەنیا، بۆیە فەلسەفەی دوای سەردەمی ئەرستوتالیس٣٨٤(-٣٢٢پ.ز) -سەردەمی دوای شەڕی گۆگامیلا- زیاتر بیرکردنەوە(نزعە)یەکی ئاکاری و دینی بەسەردا زاڵە[١٣٢٥].

---

[١٣٢٣] حەمید عەزیز: بنەڕەتەکانی فەلسەفە، ل٢٣.

[١٣٢٤] لوکاس دوبلویس و روبارتوس وان دراسپك: دیباچە برجهان باستان، ص٢١٨.

[١٣٢٥] طە باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٥٩٩.

تەنانەت تیـۆری ڕامیـاری ئـەفلاتۆن وئەرستۆش کـە لەسـەر بنـەمای فەلـسەفە دانرابـوون، لـە چوارچێوەی شاری کۆنی گریکیدا دەسوڕانەوە و بەداگیرکردنەکانی ئەسکەندەر، کە چەمکی بیری سیاسی، نوێکردەوە، بزربوو[١٣٢٦].

چونکە سیستەمی دەوڵەتە شار کە لە قۆناغی کلاسیك کۆڵەکەی شارستانیەتی گریك بـوو و هـاوڵاتی پەیوەندیـەکی ئەنـدامی پێیـەوە هەبوو،لـە بۆچـوونی فەیلەسوفەکانیـشدا بـۆ (شـاری نموونەیی) ،هەرچی تایبەتی دەخوێنرێتەوە کە لە دەوڵەتی ئەسـکەندەر، دوای شـەڕی گۆگـامیلادا بەدی نەدەکرا [١٣٢٧].

لەلایـەکی تـریش ئـەو شارسـتانیەتە لەگـەڵ هـی ڕۆژهـەلاتی، بـەو جـۆرە کـە لـە ڕێـی میـسر و کلدان(بابل)و ئێرانیانەوە نیشان درابوو، تەواو جیاواز بوو بەتایبەت کە ئەو لـە کـۆتی دەسـتورە زۆرە ملێکانی حوکومەتی دینی، کە بەلای کۆمـەڵگەی ڕۆژهەڵاتیەوە، ئازیز بوو، ئازاد ببـوون و تێدەکۆشان زیندەگی مرۆڤ لەسەر بنەمای لێکدانەوەی هزر ڕێکبخـەن نـەك بـەپێی تێگەیـشتنی ڕەمەکیانە(تلقینات غريزيه)[١٣٢٨].

سەرچاوەیەك پێی وایە ئەگەر سـەرنج بدرێتـە نـاوەڕۆك و فـۆرم و ڕوخـساری فەلـسەفەی گریـك و بابەت و بەرهەم و کەلەپوری شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی و بەراوردبکرێن، دەردەکەوێت کە هـەردوو بابەتەکـە زۆر لـە یـەکتر جیـان و ڕەنگدانـەوەی نموونـەی دوو جیهـانی جیـاواز دەنـوێنن و لـەو سەردەمەدا ڕۆژهەڵات بەگشتی لاهوت و داستان و ئـاین و گریکـەکانیش فەلـسەفەیان هـەبووە، هەرچی ئاینی ڕۆژهەڵاتیان بووە ڕێگاو مەودای ئـازادی بیرکردنـەوەی تەسـککردۆتەوە ئەگـەر لـە بوارێکیشدا پێشکەوتن بەدیهاتبێ، لە چوارچێوەی ئاین و لاهوت و داگیری خواردووە و بـۆ ئـەو مەبەستەش سوودی لێبینراوە لە کاتێکدا ئاینی گریك هەرگیز نەبۆتە کۆسپی ڕێی ژیانی ئـازاد و فەلسەفە و پەرەسەندنی کۆمـەڵ و زانست[١٣٢٩] بەڵام ئەمە ڕێژەییە وئاین بنەمای شارستانیەتە و لە باری یەکتا پەرستیەکەیداکاریگەری زۆری لەسـەر پێشکەوتنی کۆمـەڵایەتی داناوە.

---

[١٣٢٦] ابواليزيد علي المتيت: تطور الفكر السياسي، ص٣٣.

[١٣٢٧] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٨٢.

[١٣٢٨] هيراند پاسدر ماجيان: تاريخ ارمنستان، (تهران: ١٣٧٧)، ص٣١.

[١٣٢٩] حەمید عەزیز: بنەڕەتەکانی فەلسەفە، ل٢١-٣٤.

هەرچەندە مادام فەلسەفەش باوەڕێکە بۆ ئاراستەکردنی مرۆڤ لە ڕەفتاریدا بەرامبەر جیهانی دەوروبەری، ئەوە ناکرێ نکوڵی لەوەبکرێ، کە کۆمەڵگاکانی تریش فەلسەفەیان زانیوە و ئەوەی سەرەوەش مانای ئەوە نییە کە فەلسەفە موڵکی گریکەکانە،چونکە کەسانیش هەن کە لەبارەی دەرکەوتنی فەلسەفە لە(سێ هەزارو دوو هەزار پ.ز) لە شوێنی وەك میسر و بابل قسەیان کردووە[1330].

بە هاتنە سەر کاری ئەسکەندەر و فراوانکردنی قەڵەمڕەوی ڕووە و ڕۆژهەڵات کە گەل و وڵاتی زۆری لە خۆگرت، تێکەڵاوبەکی هزری وگیانی لە نێوان ڕۆژهەڵات وگریکدا پێکهات و لەوە تێپەڕی کە ئامانجی لەشکرکێشیەکە تەنها لایەنی سیاسی وئابوری وسەربازی بێت، بەڵکو لایەنی تری وەك هزر و فەلسەفەشی گرتەوە، ئیتر فەلسەفەی گریك گەیشتە وڵاتە داگیرکراوەکان و بڕوا و ئەفسانە و نەریتی ڕۆژهەڵاتیش لە نێویاندا ئاینی زەردەشت، ئەفسانەی لاهوت وسۆفیزم وزوهدی ڕۆژهەڵاتی چوونە ناو بیر و ڕەوشتی ئەوان و ناو وڵاتەکەیان [1331] واتا بەو پرۆسەیە دەوڵەت سنووری شاری تێپەڕاند و ڕەوشێکیشی بۆ بیرکردنەوە هێنایە ئارا کە لە هی دەوڵەتە شار جیاواز بوو، بەوپێیەش ((فەلسەفە وەك جۆرێك لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی مۆرکی سەردەم و قۆناغ و دەوروبەری بە ئاشکرا پێوە دیارە، وەك هەوڵ و کۆششێکی گشتی زانستیانەش هەوڵ ئەدات وەڵامی پرسیارەکانی ژین و جیهانبینی بداتەوە و لەو قانون و ڕێوشوێن و داب و دەستورە بکۆڵێتەوە کە هەمەکی و سەرتاپاگیرن و هۆ و مایەی پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵ و بیروهۆشی مرۆڤن، لەم ئەرکەشیدا ئەقڵی کردووە بەسەر مەشق))[1332]، وەك دەرەنجامی بارودۆخی تازەش لە شارەکانی هیلینیدا دەیان فەیلەسوف دەرکەوتن تیۆرەکانی خۆیانیان ڕاگەیاندووە، بەڵام پتر بەدوای باوەڕی پێشینانیانەوە بوون، یان فراوانتریان کردوون، بەتایبەتیش لەسەر مەسەلەی ڕەوشت وەستاون[1333].

---

[1330] محمد الاسعد بن ابوبكر الحفصي: الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص١٥٨.

[1331] حەمید عەزیز: سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی گریك، (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل٢٦٤.

[1332] حەمید عەزیز: بنەڕەتەکانی فەلسەفە، ل١٩.

[1333] آبرگر وديگران: تاريخ جهان باستان، ج٢، ص٢٨٨.

ئەوان مرۆڤیان زیاتر وەك تاكە كەس دەبینی تا ئەندامی شارێك، ئەمەش لەبەر ئەمانی دەسەلاتی دەوڵەتە شار وپیرۆزی جارانی بوو كە خەڵكی چیتر بە پێویستیان نەدەزانی لایەنگری یان شانازی بە شارێكی تایبەتیەوە بكەن وجیهان بوو بە نیشتیمان، بەلام بێنەوەی بایەخی پێبدرێت، بەرپرسیاریەتی مرۆڤ و ئاكاری كەسی وئەو پرسەش كە تاك تا چەند دەتوانێت بگاتە خۆشبەختی بوونە جێی سەرنج و ڕووتێكردن، بەگشتیش دیمەنە ئاشكراكانی ئەم سەردەمە ئاڵۆزە لە بواری فەلسەفەدا بۆ ئادەمیزاد، خۆی لە چۆنیەتی سەرنجدانی ڕەوشت وئاین وكاروباری ڕۆژانە و ژیانی ئەودنیا و نەمری و ترسی مەرگ و دڵنیایی دەروونی شەكەت و هەوڵدان بۆ سەرفیرازی، دادەنواند [١٣٣٤] لەبەرئەوەش كە بڕوا و هێز و تێڕوانینە فەلسەفیەكانی فەیلەسوفان و قوتابخانەكان كە لەو تەوەرەیەدا دێنە بەرباس، بە زادەی ڕەوشی ئاوێزان بوونی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا و گۆڕانی چەمكی دەوڵەت و نیشتمان وسنوور و فۆرمی مامەڵەكردن و پەیوەندی كۆمەلاّیەتی دوای شەڕی گۆگامێلای تێدەگەم بە پێویستی دەزانم لەمیانەی ناوهێنانی قوتابخانەكان لەسەر هەندێك باوەڕ وەك بەرەنجامی هێزی سەرچاوەگرتوو لەو ڕەوشە هەڵوەستە بكەم .

یەكێك لە دیارترین ڕێبازە فەلسەفیەكانی زادەی ئەوسەردەمە نوێیە فەلسەفەی ئەبیكورە كە لەلایەن ئەبیكۆرس (٣٤١-٢٧٠پ.ز)، دامەزراوە و ڕێبەرایەتی كراوە و هەر لەناوی ئەویشەوە ئەو ناوەی بەسەردابڕاوە[١٣٣٥].

قوتابخانەكە دوای جێگیربوونی ئەبیكۆر(٣٠٦ پ.ز)، لە ئەسینا كاری گەورەی لەسەر بیری سیاسی هەبوو، ئەو دیدی بۆ ئەو ئامانجانە هەبوو، كە دەبوو فەیلەسوف بەدییان بێنێ كە بریتی بوون لە ڕواندنی خاسیەتی خۆ بژێوی تاك یان پشت بەخۆبەستنی تاك (الاكتفاء الذاتي) لە دەروونی فێرخوازەكانیدا و فێری دەكردن كە ژیانی باش(الحیاة الفاضلة) چەشتنی چێژە، چونكە چێژ چاكەیە و سەرەتا و كۆتایی پیرۆزی ژیانە[١٣٣٦].

---

[١٣٣٤] لوكاس دوبلویس و روبارتوس وان دراسیك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٨؛ حەمید عەزیز: سەرەتایەك لە فەلسەفەی كلاسیكی گریك، ل٢٦٦.

[١٣٣٥] حەمید عەزیز:سەرەتایەك لە فەلسەفەی كلاسیكی گریك، ل٢٧١.

[١٣٣٦] غانم محمد صالح: الفكر السیاسي القدیم والوسیط، ص١٢٧.

واته گەوهەری وانەی ئەو قوتابخانەیە، بریتی بوو" چاکەی گەورە چێژە جا چ عەقلی بێت یا جستەیی، بەمەرجێ لە بازنەی چاکە(الفضیلة) دەرنەچێ، دواتر(ئەبیکۆری) بوو بە پەند(ضرب المثل) بۆ نقوم بوون لە خۆشی و ڕابواردن بۆ زیادەڕۆیان وچلێسانی خواردن، خودانی ئەو خەسڵەتە بە ئەبیکۆڕی ناودەبران قوتابخانەکە لایەنگری زۆری بۆ پەیدابوو، بەڵام دواتر وردە وردە خەڵك لەپەیڕەوەکەی لایانداو تێکیاندا، تا کردیانە بیانووی ڕۆچوون لە ئارەزووی شەهوانی تا وایلێهات پەندێکی ڕۆژهەڵاتیانی بەسەردا جێبەجێ بوو و بوو بە دروشم بۆیان کە دەیگوت"(بابخۆین و بخۆینەوە و دڵخۆش بین، چونکە سبەی دەمرین)[1337].

جێی ئاماژەیە کە سەرای ئەوەی قوتابخانەی ئەبیکوڕ لەگەڵ قوتابخانەی قورینائی(ئەریستوبیسی قورینائی٤٣٥-٣٥٠پ.ز)لە مەسەلەی دانانی چێژ بە بناغەی ئاکار مەبەست و ئامانجی ئادەمیزاد، لەیەك دەچن، بەڵام ئەبیکۆڕی تەنها وەك چێژێکی هەستی ڕووت (لذة حسیة صرفة) یان مەبەستی باڵا ناڕوانێتە چێژ، بەڵکو پێی وایە چێژی ئاوەز (اللذة العقلیة) بە بەهاترە لە چێژی جستەیی(اللذة الجسمیة)، چونکە جستە جگە لە چێژی هەنوکەیی(اللذةالحاضرة)، هەست بەهیچ چێژێکی دی ناکات، لە کاتێکدا ئاوەز (عقل) بەیادکردنەوە تامی چێژی ڕابردوو دەکات و هیواخوازی چێژی داهاتووشە، ئەمە جگە لەوەی کە ئەبیکوڕ هەندیك ئازار (الآلآم) بە باشتر لە چێژەکان، دەزانێت، چونکە بەڕای ئەو دەشێ ئەو ئازارانە ببنە هۆی چێژی گەورەتر.[1338]

بە بڕوای ئەو دین و مەرگ دوو سەرچاوەی سەرەکی ترس بوون[1339]. ئەو ڕێبازە دەیەویست مرۆڤ لە ترسی خواوەند و مەرگ ڕزگار بکات، هەوادارانی بۆ بەشداریکردنی چالاکانە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، تێدەکۆشا کە بەپەنهان بژین، تا ئاسایشی دەروونیان تێکنەچێ، ئارامی ڕەهای گیان بە قسەی ئەوان بەخششی خودایانە[1340].

---

[1337] جایمس هنري برستد: العصور القدیمة، ص٣٣٩.

[1338] بڕوانە: زکي نجیب محمود واحمد امین: قصة الفلسفة الیونانیة، (القاهرة:١٩٣٥)، ص٢٥٢-٢٥٣.

[1339] غانم محمد صالح: الفکر السیاسي القدیم والوسیط، ص١٢٧؛ اندریه ایما وجانین اوبویە: تاریخ الحضارات العام، مج١، ص٥٣٣.

[1340] ا.برگر ودیگران: تاریخ جهان باستان، ج٢، ص٢٩٨.

ئەو فەلسەفەیە لە ڕووی سیاسیەوە وەك دەرەنجامێکی خولقاوی هەلومەرجی دوای شەڕەکە کشانەوەی لە ژیانی گشتی و هەڵبژاردنی ژیانی پەنهانی بەمەرجی ئارامی هۆشی مرۆڤ ونەبوونی دوژمن دانابوو،چونکە بڕواوابوو چەندی ڕادەی هێزی مرۆڤ زیادبکات ناحەزانیشی زیاددەبن و هەوڵی زیان پێگەیاندنی دەدەن[١٣٤١]،زەمینەی لەوجۆرە بۆ هەڵبژاردنی ئەوچارەسەرە بە ڕوونی لە گۆڕانی پەیوەندی ئەسکەندەر و هاوسەفەرەکانیدا دیارە.

هەروەها ئەو لە باسی تاکو دەوڵەتدا جەختی لە بەرژەوەندی تایبەتی وەك مەبەستی باڵای ژیان کردۆتەوە، پێی وایە جگە لە ئەو، گشت ڕێکخستنی کارەکانی تری مرۆڤ سروشتی خو (العرف)وەردەگرن کە لە دیدی دانادا ،مانایەکی نیە، بەلای ئەوانەوە دەوڵەت بۆ دەستەبەری ئاسایشە و بەرژەوەندیش پاڵنەری بەشداری تاکە لە دەزگاکانیدا بۆیە یاسا دەبێتە ڕێککەوتنی سوود گەیاندن (اتفاق المنفعة)، لە بڕوای ئەبیکۆریدا تاکەکان هەموو خۆپەرست و بەرژەوەند ویستن، ئەگەر هەندێك چاکەیان کرد ئەوانی دی گەندەڵی دەکەن بۆیە دەبێ پێك بێن و زیان بەیەك نەگەیەنن، واتا ئەوان وایان سەیری یاساو دەوڵەت دەکرد، کە گرێبەستە و مامەڵەی تاکەکان ئاساندەکات بوونی ئەو گرێبەستەشیان بە مەرجی دادگەری دەزانی، لەبەرهاتنە ئارای ئەوانیش بۆ ئاسایشی گشتی توانستی بەدیهێنانی ئامانجیان لە سزادا دەبینیەوە[١٣٤٢].

یەکێکی تر لەو ڕێبازە فەلسەفیانەی لە هەناوی ئەو گۆڕانکاریانەدا سەریهەڵدا، زۆر لە چالاکترین پیاوانی چاخەکانی دوایی لە گریك و ڕۆمانەکان، باوەڕیان پێهێنا ( قوتابخانەی ڕەواقی ) (Stoicism)[١٣٤٣] بوو و لەلایەن زینو Zenoدامەزراوە کە لە دەورووبەری ماوەی(٣٣٣-٢٦٢پ.ز) ژیاوە لە(کیتیوم)ی هەڵکەوتوو لەناو دورگەی قوبرس، لە ژێر هەیوانێك (رواق)ی پڕ کۆڵەکەی نەخشێنراو بە وێنە، لە کۆڕێکی فێرکردنا وانەی وتۆتەوە و لەوێشەوە ناوی رەواقی بەسەر ڕێبازەکەیدا براوە[١٣٤٤].

---

[١٣٤١] بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە رەواقی و رەواقیەکان وردەکاری بەرنامەیان بڕوانە: عثمان امین: الفلسفة الرواقیة، (القاهرة:١٩٤٥)ص١٢ ولاپەڕەکانی دوایی.

[١٣٤٢] نفس المصدر، ص١٢٧-١٢٨.

[١٣٤٣] اندرو روبرت برن: تاریخ الیونان، ص٤٥٤.

[١٣٤٤] غانم محمد صالح: الکفر السیاسي القدیم والوسیط، ص١٢٩، هامش ٢.

لەبەرئــەوەی قوتابخانەکــە بــە زۆری پەیوەســتە بــە ســەردەمی داگیرکارییــەکانی ئەســکەندەر و دەنگدانەوەی مردنی و وروژانی هەســتی چــاو لــەدوی شــوێنکەوتوەکانی ئــەو هەلومەرجــەی لــە ناکۆکی نێوانیان کەوتەوە، کەبوونە بابەتی بەدواداچوونی زینۆ و هــەوادارانی ،[1345] ئەگەرچــی لە خاکی گریــك دامــەزرا، بــەڵام ڕاســترە بــە مــوژدەدەری گەشــەکردنی کــارلێکی ڕۆژهــەڵات و ڕۆژئاوای دابنێین نەك تەواو گریکــی بەتایبــەتیش کــە تێکــڕای بیریارەکــانی هــی دەرەوەی وڵاتــی گریك بوون[1346] و خودی (زینۆ)ش نەوەی دوای شەڕی گۆگامیلایە و قوتابخانەکەشی دیــارترین ڕەوتی فەلسەفەیە کە ئەوکات گوزارشتی لە تێکەڵاوبوونی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئــاوا دەکــرد، چــونکە فەلسەفەکەی تێکەڵەیەك بوو لە ڕەگەزی هەردوولا، بەڵام پەیکەری بیرکردنەوەکەی لــە مــامۆســتا یۆنانیەکانی و گەوهەری بیرکردنەوەکەشی لە بڕوای پێشینە کلدانیەکان وەرگیراوە[1347].

واتــا ڕێبازەکــە لــە ســەرەتاوە هیلینــستی بــوو نــەك گریکــی و پێــشینەکانیش وەك دەرەنجــامی کارلێککردنی کۆمەڵایەتی لەیەکنەچوونی ڕامیاری (تناقض)ی لێیدەڕوانن[1348].

ئەوەش قۆناغی هەڵگەڕانەوەی مرۆڤ بوو لە دەروونی خۆی و هەستکردن نەگونجاوی نەریتی کــۆن بوو بۆ ژیانی نوێ، دەریخست کە تاکە بناغەی ژیانی تازە سەرلەنوێ داڕشتنەوەی دەستور(نظــم) ە لەسەر بنەمای یەکێتی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بۆیە دەشێ بووترێ، کە ڕەواقیەت بۆ ئــەوە هــات کــە داوای ئەسکەندەر لە برایەتی جیهانیدا، بگۆڕێ بۆ تیۆرییەکی فەلسەفی[1349].

هەوادارانی ئەو فەلسەفەیە ((... لە سەرەتاوە گروپێکی کەم لە پیاوە گــەورە دانــاو شــکۆدارەکان بوون، تێکەڵبوونیان لەگەڵ خەڵکی ئاسایی دژواربوو...))[1350]، بەڵام لە مــاوەی چــوار ســەدەدا توانی لە بزاڤی هزری جیهانی ئەو کاتەدا پایەی سەرەکی دەستبخات و لە لای فەرمانڕەواکانیش جێی خۆی کردەوە و نزیکــەی هــەموو جێنــشینەکانی ئەسکەندەر و گــشت پاشــا ســەرەکیەکانی

---

[1345] نیقولا زیادة: الحکم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفکر العربي، العدد (٢٢)، ص٢٠٠.

[1346] غانم محمد صالح: الفکر السیاسي القدیم والوسیط، ص١٢٩.

[1347] محمود السید: تاریخ الروماني والیوناني، ص٨٩.

[1348] نیقولا زیادة: الحکم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفکر العربي، عدد ٢٢، ص٢٠١.

[1349] محمود مراد: دراسات في الفلسفة الیونانیة، (اسکندریة: ٢٠٠٤)، ص٣٢٣-٣٢٤.

[1350] ســیڤین ئیریــك لیــدمان: مێــژووی بیروبــاوەڕی سیاســی لــە ئەفلاتۆنــەوە بــۆ هابرمــاس، (سلێمانی: ٢٠٠٤)، ص٧٣.

ئەوەی دوای(زینۆ) ڕایانگەیاندووە کە (ڕەواقین)و ڕۆمانەکانیش شانازیان کردووە، کە بیری ڕەواقی دەربڕی فەلسەفەکانیانە[١٣٥١].

بەلای ئەوانەوە داناو وردبینێك دەتوانێ خۆشی دەستبخات، کە ڕاستەقینەیی بدۆزێتەوە، لە ژیانی خۆیدا بەکاری بهێنێ و بە ئارامی ڕەهای ڕوح بگات خەمەکانی ئەو جیهانە بەسەریدا زاڵ نەبن و بە هیچیان نەزانێ، لە هەژاریدا خۆی بە دەوڵەمەند بزانێ و، لە زینداندا بە ئازاد، لە نەخۆشیدا، شاد، مرۆڤ بەگوێرەی ڕێنوێنیەکانی و بە ڕیسواکردنی هەموو کەڵك (خیرات)و ئازار(الالم)و هەستەکان (المشاعر)، بە ملکەچی تەواو بۆ ژیری کە دەرفەتی مومارەسەکردنی چاکە (الفضیلة)ی بۆ دەڕەخسێنێ، دەگاتە بەختەوەری (السعادة)[١٣٥٢].

ئەو بیرەی کە وای دەبینێ لە جیهاندا یەك یەکەی مێژوو هەیە (فی العالم وحدە تاریخیە واحدە) لە گەوهەردا بیرێکی ڕەواقیە، لە کاتێکدا کە فەلسەفەکە خۆی بەرهەمی ڕەسەنی سەردەمی دوای ئەسکەندەرە و لە هەمان سەردەمیشدا بیری مێژوویی جیهانی داهات[١٣٥٣].

ئەوان بڕوایان وایە، کە توانستی وردەکاریانەی خودا بەسەر جیهاندا فەرمانڕەوایە و مرۆڤیش لەو توانا خواییە تاڕادەیەك بەهرەمەندە، ئازادی بەدیدی ئەوان ڕزگاربوونە لە پەشێوی و بڕوابوونیشیان بە پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان بوونەوەران، ڕێگای بۆ تەشەنەکردنی بەختگرتنەوە = طالع بینی)ڕۆژهەلاتیان خۆشکرد[١٣٥٤]، بەلای ئەوان ئامانجی ژیان پارێزگاری کردنی پێکهاتن (کینونە) و بوونە، جا بوونەوەرەکە هەرچیەك بێ، چێژیش دەستکەوتێکی ناوەند(ئانوي)یە و بەرایی کردنی ئەرکەکان بەشێوەی سروشتی لەلایەن مرۆڤەوە لە شوێنی کارکردنیدا، بەدیدێت جا ئەو شوێنە ماڵ بێت یان هەر شوێنێك، کە لەلایەن دەسەلاتەوە یان

---

[١٣٥١] غانم محمد صالح: الفکر السیاسی القدیم والوسیط، ص١٣٠؛ بۆ زانیاری زیاتریش لەبارەی ڕۆڵ و بەردەوامی بیری ڕەواقی لە سەردەمی ڕۆمانەکان ودواتریش بڕوانە: عثمان امین: الفلسفة الرواقیة،ص١٧٦ ولاپەڕەکانی دواتر .

[١٣٥٢] اندریة ایمار وجانین اوبویە: تاریخ الحضارات العام، مج١، ص٥٣٤؛ آ.برگر ودیگران: تاریخ جهان باستان، ج٢ ، ص٢٩٩.

[١٣٥٣] ر.ج.کولنجوود: فکرة التاریخ، (د.م: ١٩٦٨)، ص٧٩.

[١٣٥٤] لوکاس دوبلویس و روبارتوس وان دراسپك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٩.

خوداوەندەوە بۆی بڕیاردراوە، پێیشیان وایە، کە مرۆڤ بە دورکەوتنەوە لـە سیاسـەت لـە ناڕەحـەتی ڕزگاریان دەبێ[1355].

جەختیشیان لەسەر بڕوای برایەتی مرۆڤ دەکردەوە، ڕقیان لە جیاوازیکردنی نێوان مرۆڤەکان بوو کە لە بیرکردنەوەی گریکیدا باوبوو، پێیان وابوو، کە تاکەکان بوونەوەری ژیرن و لە بنەڕەتدا وەك یەکن، ملکەچی هەمان یاسای سروشتن و مافی وەك یەکیشیان هەیە، ئـەوەش لەگـەڵ سیاسـەتی سەردەم دەهاتەوە و سەرکەوتنی گەورەشی بەدیهێنا، لەو بڕوایەشەوە تیۆری سیاسەتی جیهانی لە دایك بوو[1356]. واتە ڕەواقیەکان وایان دەبینی، کە ناشێ پەیوەندی تاکەکانی مرۆڤ تەنها لە نێو نەوەکانی یەك نیشتماندا چڕ بکرێتەوە، چونکە جیهان تێکڕا یەك گەلـە ، جیـاوازیش لـە نێـوان کەسێكو یەکی دیکەدا نیە و بەدیدی ئەوان مادام هـەموان یـەك ڕەچـەڵەکن هـیچ بیانویـەك بـۆ لەیەکدی هەڵاوێردنی مرۆڤەکان لە مامـەڵەکردندا بوونی نیە، تێکـڕا ئەنـدامی یـەك جەسـتەن و ملکەچی یەك یاسان، پێویـستە لەگـەڵ هەمووانـدا مامـەڵـەی چـاك بکرێـت وکۆیلـە (العبیـد) کانیش هەڵنەهاوێردرێن، ئەوانیش شایەنی ڕێز وچاودێری و گرنگی پێدانن[1357].

واتـە ئـەوان داوای یـەکێتی گیـانی و نکـۆڵی جیـاوازی گریکـی و نـاگریکی مرۆڤیـان دەکـرد، کەهەمان بانگەوازی ئەسکەندەر بـوو، دواتـر دەرکـەوت، کـە ڕێبازەکـە دەیـەوێ لـە بـەدیهێنانی یەکسانیدا دەربڕی ئاواتی گەلانی هیلینستی بێت(بەتایبەت ڕۆژهەڵاتیان) و بیری یەکێتیش لای ئەوان بە بەهێزی (پادشای هیلینستی )یەوە پەیوەستە و چونکە ئەو سەردەمە لە سەردەمی پێش ئەسـکەندەر جیـاوازە بـوو، ئـەو دەوڵەتانـەی دوای ئەسـکەندەر دروسـتبوون دەبـوو گریـك و ڕۆژهەڵاتیەکان یەکبخەن ئەوەش تەنها بـە پادشـایەتی ڕەهـا دەکـرا، ئـیتر پادشـا هـەر سـەرۆکی دەوڵەت نەبوو، بەڵکو دەبوو دەوڵـەتیش بـێ، بەخواکردنیـشی کـە پەیوەسـتە بـە ئەرکەکەیـەوە و لەســەر ئەو بــنەمایە ڕێکخـرا، کـە یـەکێتی لـە وڵاتەکەیـدا بڵاودەکاتـەوە وەك چـۆن خـوا لـە جیهاندا کردویەتی[1358].

---

[1355] اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ص٤٥٥-٤٥٦.

[1356] غـانم محمـد صـالح: الفكـر الـسياسي القـديم والوسـيط،ص١٣١؛ محمـود الـسيد: التـاريخ الروماني واليوناني، ص٨٩.

[1357] زكي نجيب محمودواحمد امين: قصة الفلسفة اليونانية، ص٢٤٣.

[1358] نيقولا زيادة: الحكم السلوقي في بلاد الشام، مجلة الفكر العربي، العدد (٢٢)، ص٢٠١.

بـوونی ڕەگــەزی سروشــتیش لــە بــیری ڕەواقیەکانــدا دواتــر وایلێکــردن، کــە پــشتیوانی لــە تیۆری(جیهانی نیشتمانی) بکـەن[١٣٥٩]. یـان وەك وتـراوە" ((بانگـەواز بـۆ(شـار-جهـان) واتـە جیهان تێکرا ببێتە یـەك کۆمـەڵگا، کـە ژیـان لـە ناویـدا پڕبێـت لـە هـۆگری و خۆشەویـستی، خوداوەند و مرۆڤەکان تیایـدا هـاولاتی بـن و (دەوڵـەت-جیهـان)یـش چـاودێری کاروبـاری ئـەو کۆمەڵگایە بکات[١٣٦٠]، گرنگترین بنەماکانی ئەو دەوڵەتـە پێـشنیارکراوەش لـە دیـدی ئەوانـدا بریتی بوو لە(یەکێتی بوون)، یەکێتی مرۆڤایـەتی و ژیـان بـە گـوێرەی سروشـت، بـاوەڕبوون بـە دەسەلاتی خۆشەویستی بەسەربووندا))[١٣٦١]، بەگشتی ئەو دوو قوتابخانەیە بـە پێـچەوانەی پـێش خۆیان، هەڵقولاوی سەردەمی خۆیان بوون و لەگەڵیدا دەگونجان[١٣٦٢].
شایانـــی باسە جگــە لەم قوتابخانـە فەلـسـەفیانە، گومانکـــردن و ڕێـــبازی گــومانیش وردە وردە پەلیان هاویشتە ناو جیهانـی فەلـسـەفەوە، ڕاپـەڕ و لایەنگـیریان بـۆ پەیـدابوو، جـاڕی بـۆ ئەدرا و داکۆکی لێئەکرا، تائەوانیش سەرئجام لەچەند قوتابخانەیەکدا ڕێکخـران، گــومانکاریش مرۆڤێکــی ماندوی پەککەوتەی ڕاڕای گــۆشەگـیر بوو، کە پیرۆزیەکانـــی دوێنــێ و ئــەورۆی، خـــرابوونە ژێرپـــێ و کەسیـــش لەسەری نەدەکــردەوە، بۆیـــەش لـە بەرامـــبەر هەرشـــتێکدا، دوورەپەرێز دەوەســـتا و لە بەرامـــبەر هەرشـتێك بەڵـــێ و نـەخێری نـەبوو تـەنها دەیگــوت (نازانـم)، ئەوان پشـتیان بە هەســـت و ژیـری دەبەســت، پێـشـــیان وابـوو، کـە هەستیـــش لـە ڕواڵەت بەولاوە ناتوانـێ ڕاســـتەقینەی شتمان پێ بڵێت، (ژیری) ئەقڵیش دەســـەلاتی نیە بۆیە دەگــەنە ئەو ئەنجامە، کـە ناتوانـــن هـــیچ دەربـارەی ســـروشت و ڕاســـتیەکان بزانـــن، نابـێ هـــیچ حوکـــمێك نە بەچـاك و نە بەخـــراپ بـــدەن ئـەنجامی ئەمـەش گـوێ بـە هـیچ نـەدان و کەمـــتەرخەمیە، ئەمەش لەخۆیدا فەزیلەت و بەختەوەریە[١٣٦٣].

---

[١٣٥٩] آ.برگر و دیگران: تاریخ جهان باستان، ج٢، ص٢٩٩.
[١٣٦٠] نیقولا زیادة: الحکم السلوقي في بلاد الشام ، مجلة الفکر العربي، العدد( ٢٢)، ص٢٠١.
[١٣٦١] بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر بنەماکانی ڕێکخستنی پێشنیارکراو بڕوانە: محمود مراد: دراسات في الفلسفة الیونانیة، ص٣٢٧-٣٦٣.
[١٣٦٢] محمود السید: التاریخ الروماني والیوناني، ص٨٩.
[١٣٦٣] بـۆ زیـاتر زانیـاری بڕوانـە: حەمیـد عـەزیز: سـەرەتایەك لـە فەلـسەفەی کلاسـیکی گریـك، ل٢٩٠-٢٩٢.

هەرچی دینی گریکەکانیش بوو لە زۆر ڕووەوە لە دینی شارستانیەتەکانی ڕۆژهەلاتی وەك میسۆپۆتامیا و میسر دەچوو، بت پەرستی (وثني)بوو و لەسەر بنەمای هاوبەشی (الشرك)و لێکچوون (التشبیه)بنیاتنرا بوو، خاسیەتەکانی مرۆڤی – شێوە و سۆز و زیندەگی- یان دەدایەپاڵ، لە بڕوای ئەواندا هەر خوایەك تایبەت بوو بە دیاردەیەك وکارێك لە کارەکانی گەردونیان پێ سپێردرابوو کاریگەریشیان لەسەر چارەنوسی مرۆڤ هەبوو، لە خەلکیان دەویست دادگەر بن و چونکە لە ڕێی هێز وتوند و تیژیشەوە بووبێ پێویست بوو خەلك قایلیان بکەن، بەلاّم کە ڕێنمایی فەلسەفی و زانست و شانۆ و گێڕانەوە ئەدەبیەکان بلاّوبوونەوە، بەرەبەرە گومان لای خەلك بەتایبەت ڕۆشنبیران دروستبوو و بڕوای ئاینیش لەقبوو، ئەفسانە و خورافەی دراوە پاڵ خواکان پشتی تێکرا، ئەمەش وەك بزافێك لای گریکەکان هەر لە سەدەی (٦ی پ.ز) یەوە دەستی پێکردبوو، تیایدا دەستکرابوو بە بیرکردنەوە لە ژیان و سەردەم و ڕەوشت و جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵە و چاك و خراپ، بڕواش بە خەسلەتی دڕندەیی خواکان نەماو فەیلەسوفانیش بە قسەکردن لەسەر یەکتاپەرستی و ڕەتکردنەوەی بنەمای لێکچوون و ڕاکانی تریان گۆڕانیان لە ئاینەکاندا دروستکرد و دینەکانی دەرەوەی گریکیش بێ کاریگەر نەبوون[١٣٦٤].

ئەمە مانای هەوڵدانیانی، بۆ وازهێنان لە دینی باوی(تقلیدی) کۆمەڵەکەیان دەگەیاند، ئەویش وەك وەلاّمدانەوە بۆ ئەزموونی ئازاری گشتی، کە بەهۆی زانین لە کۆمەلگا شارستانیەکان نویکومینەکان- المجتمعات المتمدنه)[١٣٦٥]ی جیهانی کۆندا سەریهەڵدابوو و چارەسەریشی لە ڕاستەقینەیی ڕەهای گیانی ئەودیو دیاردەکاندا، دەستکەوت، کە ئەمەش نە لە خواوەندەکانیاندا بەرجەستە دەبوو، نە دینەکانیش دەرفەتی پێدا پێگەیشتنیاندەدا، لەبەرئەوە بزافێك لە سەدەی شەشەمی پ.ز، لەلایەن پێنج کەسایەتیەوە لە پێنج ناوەندی شارستانی کە ئەوانیش ( زەردەشت لە ئێران، بوزا لە هند، کۆنفوشیوس لە چین، یەشیعای دووەم لەمیسر و ولاّتی شام، فیساگورس(٥٨٠-٤٩٧پ.ز) لە ولاّتی گریك) بوون، دەستی پێکرد، کە تیایدا چوارچێوەی کۆمەلاّیەتی باوی دینەکانیان بەزاند و پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ئەو ڕاستەقیە گیانیە

---

[١٣٦٤] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، ص٥٥٦-٥٦٣.

[١٣٦٥] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر چەمکی (ئیکۆمین)و سەرهەڵەدان و ئەو شوێنانەی دەیگرتەوە بڕوانە: ارنولد توينبي: تاريخ البشرية، ج١، ص٣٩-٤٨.

بنیاتنا، بەلاّم تەنها زەردەشت و پەشیعای دووەم دەرکیان بەوەکرد، کە ئەو (ڕاستەقینە ڕەهایە) کەسایەتیەکی شێوە مرۆیی ناوازەی هەیە و لە خواوەندە پایە نزمکراوەکان جیاوازە، بێ وێنەیە(فرید)و توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ و لە بازنەی خوایەتیشدایە، و نەگەیشتنی گریکەکان بەوەها تێگەیشتنێك، کۆمەڵگاکەیانی ناچار بەدەست بەرنەدان لە دینەکانیان کردە ئازارە گیانیەکەشی هەر بە بەردەوامی هێشتەوە، مانەوە و زیاتر بوونیشی بە تێپەڕینی کات، دروستکردنی ئەو پەیوەندیە کردە پێویستی و واشیکرد هەر بەوەندە وازنەهێنێ، کە ڕاستەوخۆبێ، بەڵکو دەبوو (سوز)تێر بکات و وەڵامی خواستە دەروونیەکان بداتەوە، ئەمەش کۆمەڵێك ڕێوشوێنی دەوێ، کە تەنها بە دروستبوونی پەیوەندی لە نێوان دوو کەسایەتی، یەکیان مرۆیی و ئەویتر خودایی، واتە (پێغەمبەر و خوا) بەدیدەهات،[١٣٦٦] هەر کاتێکش ئەو بۆشاییە ڕوحیە لە هەر کۆمەڵگایەك سەریهەڵدابێت و بڕوا و ئاینی خۆماڵی نەیتوانیێ پڕی بکاتەوە، هاولاتیانی هیوادارکردووە، کە لە دین و بیروباوەڕی خەڵکی تردا وەڵامەکەی بدۆزنەوە، ئەم حاڵەتە لە وڵاتی گریکی سەردەمی ئەسکەندەردا زۆر بەرچاو بوو وگەیشتبووە چڵەپۆپە .

دەشێ لێبوردەیی دینی و هەندێ جار قبوولکردنی نەریتی دینی خەڵکی تر لە لایەن کەسانی وەك کوڕش و دارا، کە پێشتر لێی دواین و ئەسکەندەریش لە ئارەزووی تێرکردنی ئەو بۆشاییە گیانیەوە سەرچاوەی گرتبێ. بۆیەش دەبینین لە شەڕەکانی گریکی -ئەخمینی پێش لەشکرکێشیەکە، نەفرەتی ئێرانیان لە دینی گریکی و ڕقی گریکەکان لە دینی ئەخمینی، لە ڕاستیدا، نەخشی سەرەکی و گرنگی نەبووە و ئەگەر زیادەڕۆیش لە ستەم، هاتبێتە پێش، ئەوە پێداویستی نەخوازراوی ئەو جەنگانە بەدیان هێناوە. واتا ئێرانیان کە پەرستگاکانی بابل و گریکیان وێرانکردووە لەبەرئەوە نەبووە، کە خودایانی بێگانە سەرچاوەی شەڕ و ناپەسندی بوو بوون، بەڵکو لەبەرئەوە بووە کە تالاّنکردنی پەرستگاکان ئاسنترین ڕێگای بەهێزبوون و بە تالاّنبردنی پەیکەری خودایی گەلانیش، بۆ تێکشکاندنی تواناو وورەی بەربەرەکانی خەڵك، شتێکی باوبووە لە ڕۆژهەلاّتدا[١٣٦٧] .

لەسەر ئەو پێودانگەش ئاساییە، کە سەدەی چوارەمی پێش زاین سەرەتای ڕەخسانی زەمینەیەکی لەباربووبێ بۆ تێکەڵبوونی دینەکان و بلاّوبونەوەیان لە دەرەوەی نیشتمانی خۆیاندا، بەتایبەتیش

---

[١٣٦٦] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ارنولد توینبي: تاريخ البشرية،ج١، ص٢٨٠-٢٩٤.

[١٣٦٧] سموئيل كندي ادي: آيين شهرياري در شرق، ص٢.

ئەگەر زانیمان، کە گریکەکان تا دەهات باوەڕیان بەخودایانی کۆنی خۆیان لە دەست دەدا، هەڵبەتە ئەمەش مانای ئەوە نەبوو، کە ئەوان کەمتر مەزهەبی بووبن یان نکوڵی بوونی خودایانیان کردبێ و بە تەواوی دەستبەرداریان بووبن، بەڵکو هەر شارێك خواوەندێکی وەك گەورەترین خواوەند سەیردەکرد و، بەدرێژایی سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتە شارەکان و بۆ دروستکردنی شاری نوێش، ئامادەیی هەبوو و ڕێوڕەسمی ڕێزگرتنیشیان بۆی، لە وەرزشگاکان ئەنجامدەدا[1368].

دیاریشە کە شارستانیەتی گریك لەسەر ئەو سیستەمە، بیناتنرابوو کە تیایدا، شارەکە نیشتمان و دینیشیان لە خواوەندەکەیدا، بۆ هاوڵاتیانی، خۆی دەنواند، کە ئاکارە کۆمەڵایەتیەکەی لە باوەڕی بنج گرتووی چیرۆکە میللییەکان، کە پەیوەندی ئەندامی بە شارەکەیان، دەردەبڕی، سەرچاوەی گرتبوو نەك دین، بۆیە بە لابردنی دیواری نێوان شارەکان، خەڵکی گریك شار و دینەکەشیان لە دەستدا و ئیسپاتیش بوو کە خواوەندانی شار توانای پارێزگاری کردنی شاریان نەماوە، باوەڕی خەڵکیشیان بەخۆیان لەقکرد، ئەمەش بۆشاییەکی دروستکرد، کە دڵەکان نەیاندەتوانی تیایدا بژیەن و پڕکردنەوەشی ئاسان نەبوو[1369].

ئاشکراشە بڵاوبوونەوەی دینی بیانی و قبوڵکران و تێکەڵابوونی بە دینە خۆجێیەکان لەمەودایەکی دووردا، لەبەر دەستەوەستانی ئەو دینانەیە، لە پڕکردنەوەی پێداویستی گشتی مرۆڤایەتی، ئاینێك کە بتوانێ خواست و شکۆی مرۆیی لە ململانێی لەگەڵ سەردەمی پەشێویدا، بچەسپێنێ،[1370] واتە بۆشایەکی گیانی هەیە، کە بیروباوەڕە ناوچەییەکان لە ئاستی پڕکردنەوەیدا نین، کۆمەڵگا هیواداره لەوەی تازەدا، پێی بگات، کە ئەمە لە جیهانی گریکدا بە زەقی دیاربوو. تەنانەت وایلیێهات پرۆگرامی رەواقی و ئەبیکوری لای چینی ڕۆشنبیری پایەی دینیان وەرگرت و خواکان وەك نەبن، وایانلێهات، ئەوانەش کەدان بەبوونیان دانرابوو، تەنها وەك بوونەوەری مرۆیی شکۆدارکراو هەژمار دەکردان و هیچی تر، چونکە بەپێی هەندێك ئەفسانە بڕوا وابوو، کە خوداوەندە گەورەکان لە سەرەتادا پاشای زۆر زیرەك و لێهاتوو بووبن، هەوڵی

---

[1368] لوکاس دوبلویس و روبارتوس وان دراسپك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٥.

[1369] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٨٧.

[1370] ارنولد توينبي: تاريخ البشرية، ج١، ص٢٨٢.

زۆریانداوه بۆ به شارستانی بوونی ڕهگهزی مرۆڤایهتی، بۆیه دوای مردن پهرستراون، خهڵکی ڕهشۆکیش نهخوێندهوار بوون و نهیانتوانیوه له فهلسهفه تێبگهن و لهبهر دهستکورتیش نهیاندهتوانی بچنه قوتابخانه تا تیایدا فێربن، پێویستی به(خوا)و لاوازبوونی بڕواشیان به خواوهندهکانی خۆیان وایکرد مهیلیان بهلای ڕێزگرتنی خواوهندانی ڕۆژههڵاتدا بڕوات، کاریگهری لهسهر ژیانیان پهیدا بکات[١٣٧١].

وتراوه که ئهسکهندهر چۆن لهگهڵ گهلان ئازادیخوازبوو لهگهڵ خواوهندانیش وابوو، گشت خواوهندهکانی قبوولکرد و پهرستش و قوربانی بۆیانکرد، تا به ئاستێك گهیشت که بۆ ئهوهی دهسهڵاتی بهسهر ئیمپراتۆریهکهیدا بشکێ، پهیوهندی خۆی به ئهوانهوه ڕاگهیاند، ئیتر دهنگۆی ڕهچهڵهکی و ئهو شته سهرسوڕهێنهرانهی هاوسهردهمی لهدایکبوونی و قسهکردنی لهگهڵ (ئاموون) بهرامبهر پهیکهرهکهی له مێرگی سێوه له میسر، بهناو خهڵکدا بڵاوبۆوه[١٣٧٢].

ئهسکهندهر لهگهڵ گهیشتنی به بابل خانهدانان پیاوانی ئاینی پێشوازیان لێکرد و له دهروازهی شاریش پیاوانی ئاینی(روحانیان) زهردهشتی له ڕیزی پێشهوهی پێشوازیکهران وهستابوون یان وتراوه، که (موغهکان هاتن پاشتان سرودبێژان ئینجا پێشبینیکاران، شاعیران، و لاوێنهر (نوازندگان)ی بابلی، که نهریتیان وابوو له پێهه‌ڵدانی شادا، سروودیان دهگوت، پێشبینی کارانیش که لهبارهی ڕهوتی ئهستێرهکان و ئاڵوگۆڕی وهرزهکان هموالیان ڕادهگهیاند[١٣٧٣].ئهسکهندهریش دهستوری قوربانی بۆ مهردۆخی خوای بابلیهکان و سهرله نوێ دروستکردنهوهی ئهو پهرستاگایانهیدا، که لهسهردهمی خشایرشا(٤٨٦-٤٦٥پ.ز) پادشای ئهخمینی وێرانکرابوون. و ڕێز و پهیوهزی زۆری بۆ دین و نهریتیان پیشاندا[١٣٧٤].

ئهوهی له میسر و بابل گوزهرا دهریدهخات که له جهنگی نێوان گریك و ئهخمینیهکاندا، ئهخمینیهکان نوێنهری گهلانی ڕۆژههڵات نهبوون و جیاوازی بیروباوهڕی ئاینیش له نێوان

---

(١٣٧١) جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٤٠.

(١٣٧٢) جلال يحيى: التاريخ الاوروبي ، ص٧٠.

(١٣٧٣) بانومري بيوس: تاريخ كيش زرتشت، هخامنشيان، ج٢ ص٤١٥-٤١٦.

(١٣٧٤) جورج رو: العراق القديم، ص٥٢٢؛ محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي:الغز و اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير، ص٥١.

ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا نەخشێکی لە قوولکردنەوەی ناکۆکیەکان تا ئاستی شەڕی یەکلاییکردنەوە، نەبووە. ئەگەر دەسەڵاتدارانیش دەرفەت بڕەخسێنن جیاوازی ئاینیەکان ڕەنگە نەبێتە ڕێگری بەردەم پێکەوە ژیانی میللەتان.

ناوبراو سەروەری ئاینی بۆ بابل گێڕایەوە، چونکە بەپێی یەك لە سەرچاوەکان خشایرشای ئیمپراتۆری ئەخمینی بڕیاری دابوو، کە نابێ جگە لە ئاهورامزدا-خواوەندی گەورە و هێزی خێر لە ئاینی زەردەشتیدا-، هیچ خوایەکی تر بپەرسترێت، هەرچەندە خەڵکی بابل جێبەجێیان نەکرد و گوێ لە مستی ئەو بڕیارە نەبوون، بەڵام کاریگەری هەبوو، هیچ نەبێ ناچاربوون ناوەکانیان کە پەیوەندی بەخواوەندانی سامیەوە هەبوو، بگۆڕن بە(ناو)ی پەیوەست بە خودایانی ئاری[١٣٧٥].

لە سەرچاوەیەکدا هاتووە، کە بایەخدانی ئەو بە قوربانیکردن بۆ خودایانی بابل و میسر و بەرز ڕاگرتنیان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکی دەروونی و تێرکردنی هەستێکی قووڵی دینی بوو، بەتایبەتیش، کە ئەو لەسەر دەستی ئەرستۆ، لە بارەی بیری یەکتاپەرستی لە دیندا هەندێك کاری تێکرابوو، کە لە وڵاتی گریکی ئەوکات برەوی هەبوو، وایدەڕوانیە خواوەندی ناوچەکان وەك ناوی جۆراوجۆر بۆ ئەو هێزەی، کە گەردوون بەڕێوە دەبات لەلایەك، لەلایەکی تریش لە شوێن هەڵگرتنی فیرعەونیدا ئەو بڕوایەی بۆ جێگیربوو، کە ئاگرێکی پیرۆز لە ناخیدایە و کاتێکیش سەردانی پەیکەری ئامونی کرد لە مێرگی سێوە لە میسر زیاتر دڵنیابوو، بیروباوەڕی بابلیش-کە لە دوای شەڕی گۆگامێلا پێیگەیشت-لە بیری جیهانیانەی بێگومانی کرد، چونکە ئەوان پێیان وابوو کاتێك پادشا دەستی مەردۆخ دەگرێت ئەو چوار لای ئاوەدانی پێدەبەخشێ، واتە دەیکاتە شای هەر چوارلا[١٣٧٦] بەمەش ئەسکەندەر بەدوا مەنزڵی ئەو بڕوایە گەیشت، کەدایك و دەوروبەری لەلایان دروستکردبوو، بۆیەش وەك دواتر دەیبینین خۆی بەخوا ڕادەگەیەنێت.

هەرچی یەهودیەکانیش بوون، لە مێژوودا هاتووە کە ئەسکەندەر ڕقی لێیان هەڵساوە لەبەر بەشداری نەکردنیان لە دروستکردنی پەیکەری(بعل = بل) مامەڵەی توندی لەگەڵ کردوون و ئازاری داون و غەرامەی دارایشی کردوون، بەڵام دواتر کارەکەیان باشکردووە و دڵی

---

[١٣٧٥] جورج رو: العراق القديم، ص٥٥١.

[١٣٧٦] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص١٠٨.

داگیرکەریان ڕازیکردووە و لەگەڵی پێکهاتوون و ژمارەیەکی زۆریشیان چوونەتە ناو سوپا و شانبەشانی مەکدونیەکان جەنگاون ،لە بەهیللنی کردنی ڕۆژهەڵاتیش -واتە دەست ڕۆیشتنی ئاداب و فیکر و شارستانیەت بەسەر گەلان و زمانیاندا- هەڵنەهاویردران، بەڵام لەو جولانەوەیەدا بەشی یەهودیەکانی فلسطین زیاتر بووە تا هی بابل، ئەوان لە سەردەمی سلوقیەکانیشدا پایەیان بەرزبووە و شانبەشانی ڕەگەزەکانی تر، لە شارە گەورەکان نیشتەجێ بوون و خۆشیان شاری تایبەتیان هەبووە، بەڵگەش بۆ بەرزی پلەیان لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبار(میسۆپۆتامیا) ئەو نامەیەیە، کە ئەنتوخیوسی سێیەم پاشای سلوقی، ناسراو بە گەورە(٢٢٣-١٨٧پ.ز) بۆ والی لیدیە(زوش = زوکس = Zeuxis)ی ناردووە تیایدا وتویەتی (دەمەوێ دوو هەزار خێزانی یەهودی لە بابل و وڵاتی میسوپۆتامیا بە چەکەوە بکەمە پارێزەر، لە شوێنە هەرە گرنگەکانیان، دایمەزرێنم، چونکە لە پێشینەکانی خۆمەوە دەستپاکی و گوێڕایەڵی ئەوانم بۆ سەلماوە[١٣٧٧].

خاڵێکی تری پێویست بە ئاماژە پێکردن لە بابەتی پەیوەست بە پەیوەندی گریك و یەهوددا ئەوەیە، کە چەندین زانای یەهود کەوتنە ژێر کاریگەری فەلسەفەی گریکی لە نێویاندا (فیلونی ئەسکەندەری =فیلونی یەهودی ٠پ.ز-٥٤ز)، کە زۆر بایەخی بە فەلسەفەی ئەفلاتۆن داوە و ناسراو بوو بە(ئەفلاتوتی یەهود)، شێوازی فەلسەفەکەشی بریتی بوو لە لێکدانەوەی هێمایی بۆ تەورات (التأويل اليهودي للتورات)، ئەو دەریخست کەحەقیقەت لەناو تەوراتدایە و ئەفلاتۆنیش لە ڕێی سروش(وحی) ەوە پێی گەیشتووە ، فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی یەهودی ئامانجیان گەیشتنە بە حەقیقەت و (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ)ش ڕێنمایەکانیان (لە موساو تەورات) وەرگرتووە[١٣٧٨].

سەرچاوەیەکیش لە میانەی جەختکردنەوەی لە ئاشنایی یەهودیەکان بە شارستانیەتی گریك بەتایبەت لە ئەسکەندەریە و پێشوازیکردنی هاوشاریانی ئورشەلیم و تەنانەت کاهینە گەورەکانیش لە ئاداب و ڕێوڕەسمی داگیرکەران جەخت لەسەرئەوە دەکات، کە هیچ کام لە فەرمانڕەوایانی سلوکی و بەتالیمە هەوڵی بە گریکی کردنی زیندەگیانی نەداوە، پاشان باسی

---

[١٣٧٧] يوسف زرق الله غنيمة: نزهة المشتاق في تاريخ يهود العراق، (لندن:١٩٩٧)، ص٨٤-٨٥.

[١٣٧٨] محمد عبدالرحمن مرحبا: تاريخ الفلسفة اليونانية من بداياتها حتى مرحلة الهلينيستية،(بيروت:١٩٩٣،ص٣٢٠-٣٢١.

چەند جار ڕاپەڕینی ئەوان دەکات دژی دەسەڵاتی سلوکی، لەوێش ئاماژە بە مەسەلەی نارەزایی و بەشداری نەکردنیشیان لە دروستکردنی پەیکەری(بعل شمن = یل = زیوسی گریك) لە ئۆرشەلیم کراوە، بەڵام لە سەردەمی سلوکیەکان نەك ئەسکەندەر،- بۆیە پێدەچێ دووجار ئەو حاڵەتە ڕوویدابێ- چونکە ئەوان یەکتاپەرست بوون و گونجاوە، کە نارەزاییان لەو مەسەلەیە پێشاندابێ[1379].

جێی ئاماژە پێکردنە، کە سیاسەتی مامەڵەکردنی نەرم لەگەڵ دینەکان وەك لە بابل و میسر ئەنجامیدا لەلای ئەسکەندەر گریکەکانی هاوڕێی نەبۆتە شتێکی ستاندارد و لەگەڵ هەمووان و لە هەموو جێیەك وەك یەك نەبوو، ئەم دوو فاقیەی مامەڵەکردنەش تا دوای شەڕی گۆگامیلا و گرتنی پەرسپۆلس لە(٣٣٠پ.ز) دەرنەکەوت. بەتایبەت لەگەڵ زەردەشتیەکان، کە ئومێدی ئەوە زیاتربوو لەگەڵیان بگونجێ، و وتراوە ئەو لە ڕێی ئەرستۆی مامۆستایەوە لە بارەی ئەوان و کۆمەڵی کۆنی موغەکان، ڕێزگیری زۆری بیستبوو، کەچی لە ڕووداونامە و هەواڵە بەجێماوەکاندا هیچ ئاماژەیەك بۆ ڕووبەڕوویی و بەیەکگەیشتنی ئەسکەندەر و موغەکان، بوونی نیەو هیچ جۆرە نیشانەیەکی دڵفراوانی و خەڵات و بەخششی ئەو بە پیاوانی ئێرانی و پەرستگاکانیان بەدەستنەکەوتووە، لە کاتێکدا، کە بێئەندازە لە ڕووی پەرستگاکانی سەر زەمینی جۆراوجۆر، کە لێی جەنگاوە، ئیرادەی تایبەتی خۆی دەرخستووە و ڕێزی خوداوەندە جۆراوجۆرەکانی گرتووە، لە هەمووش ئاشکراتر- باسمانکرد- لە بابل و میسر ئەنجامیدا[1380].

ئەو بڕیاری سوتاندنی پەسیپۆلسیدا، کە وەك دەڵێن((تەنها هەر پایتەختی دەوڵەتی ئەخمینی نەبوو، بەڵکو بە یەکێ لە شوێنە پیرۆزەکان دەژمێردرا، هەموو ساڵێك مەراسیمی ستایشی شای گەورەی لەلایەن خەڵکی شوێنکەوتووی ئەخمینیەکان، تێدا ئەنجام دەدراو ببوو بە قیبلەگای ئەو میللەتانە))[1381].

لەوێ سەرەڕای ئاگرتێبەردانی کۆشکی پادشا و تاڵانکردنی ماڵ بەماڵی خەڵك و ڕەشەکوژی پیاوان و بە کەنیزەکردنی ژنان، لە نێو ئەو کوشت و کوشتارەشدا پیاوانی ئاینی(روحانیان)یش بەرکەوتن، کە لە ئارامگای سەڵتەنەتیدا، خەریکی پاڕانەوە بوون یاخود لە ئاتەشگەکاندا

---

[1379] لوکاس دوبلویس و روبارتو وان دراسپك: دیباچه بر جهان باستان، ص٢٢٠-٢٢٢.

[1380] مری بویس وفرانتز گرنر: تاریخ کیش زرتشت، پس از اسکندر گجسته، ج٣، ص١٢.

[1381] ادوین اریدویچ گرانتوسکی ودیگران: تاریخ ایران، ص١١٥.

(ئاگرخانه) خەریکی پارێزگاریکردن بوون له مەراسیمی نه کوژانـەوەی ئـاگری پـیرۆز، ئەوانـەش که له پەرستگاکاندا خەریکی خزمەتکردن بوون، یان سەرگەرمی وەڵامدانەوەی کاروبار و نیازی خـەڵکی ئاسـایی و دەربـاریـان، بـوون لەگەڵیـشیـاندا پیـاوانی ئـایینی قوتابخانـەکانی مەڵبەنـدی زانایان(حوزة علماء)ی تەختی جمشید، بەناونیشانی ناوەندی زەردەشتیگەری، ئەوانەش کـە سـەر بەو خێزانانه بوون و له بەڕێوەبەرایەتیەکانی دەوڵەتدا کاریان دەکرد، لەناوبران[١٣٨٢].

له سەرچاوەکاندا هاتووە که ئەسـکەندەر دوای ڕوخانـدنی قـەڵای ئەخمینیـەکان و ئاتەشـگەکان و کوشتنی هربزەکان(پیاوانی ئایینی زەردەشتی) سـوتاندنی کتێبـەکانیان، ڕۆیشت بـەرەو هنـد و پـاش کـوژرانی پادشـاکەی و داگیرکردنـی شـارەکانی، خانـەی بتـەکانی وێرانکـرد و کتێبـە زانستیەکانیان سوتاند[١٣٨٣].

بەپێی سەرچاوەیەك مانەوەی بێبیانووی ئەسکەندەر لەپەرسیپۆلس(تخت جمشید) بۆ ماوەی چەند مانگێك دوای داگیرکردنی، ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێ، که ویستویەتی لەلای خودایانی هەر گەلێك خـۆی بـە فـەرمی وەك سـەرداری ئـەو گەلـە بناسـێنێ، بـۆ ئـەو مـەبەسـتەش ویـستویەتی پیـاوە ئاینیەکان ڕازی بکات، بەوەی سەرپەرشتیاری نەورۆزی ئەو ساڵە بـۆ خـۆی بەدەسـتەوە بگرێـت و ڕۆڵی شای ئێران له کۆشکی جێنشینەکانی دارا —دارای یەکەم- دا بگێڕێـت، بـەڵام ملنـەدانی سەرسەختانەی ئەوان، بۆتە جێی توڕەیی ئەو و کۆشکەکانی کردە خۆراکی ئاگر، ئەمـەش لەگـەڵ خو و سروشت و خسڵەتی ئەسکەندەر دێتەوە[١٣٨٤].

لەوبارەوە وتراوە، ئەسکەندەر له بابـل و میـسر خـۆی وەك فریـادرەس و ڕزگارکـاری خـەڵکی لـە کۆت و بەنـدی ئەخمینیـەکان ناسـاند، کەچـی لـە ئێـران خـۆی بـە تۆڵەسـێن و تاڵانـچی و بکـوژ نیشاندا، کەسی بەو جۆرەش دەتوانێ تەنها یەك نەخـشی هـەبێ ئـەویش ئەوەیـە، کـە ئافەریـدەی ئەهریمەنە، بۆیە له دەستوری زەردەشتیدا بەنەفرەتلێکراو(ملعون = گجسته) نـاوزەدکراوە[١٣٨٥].

جگە له پێبەخشینی ئەو نازناوەش له بەرامـبەر کوشـت و کوشـتار و تاڵانکـاری ئـەو شـارە، کـە بەبێ هیچ بەربەرەکانیەکی چەکدارانە و بەدڵنیابوونی تەواو له بەخـشین، ڕادەسـتبوو، ئەنجامیـدا،

---

[١٣٨٢] مري بويس: تاريخ كيش زرتشت، هخامنشيان، ج٢، ص٤١٧-٤١٨.

[١٣٨٣] الطبري: تاريخ الطبري، ج٢، ص١٠؛ ابن الاثير الجزري: الكامل في التاريخ، مج١، ص٢١٧.

[١٣٨٤] مرى بويس وفرانتز گرنر: تاريخ كيش زرتشت، پس از اسكندر گجسته، ج٣ ، ص١٤.

[١٣٨٥] همان مأخذ ، ص١٢-١٣.

کسێکیش کە لە چاوی هەر زەردەشتیەکی بە باوەڕ، بە ئامراز و هۆکاری دەستی ئەهریمەن بناسرێت، بە درێژایی مێژوو نازناوی(روحانی کوژ)ی پێ دەدەن[١٣٨٦].

هەڵوێستی ئەسکەندەر بەرامبەر زەردەشتیەکان و تێڕوانینی ئەوان بەرامبەر لەشکرکێشیەکەی ئەسکەندەر، بەرەنجامێکی تری گرنگی شەڕی گۆگامیلایە لەسەر ئاستی دین کە بەدەر نەبوو لە هەڵوێستی سیاسی.

پیاوە ئاینییەکانی زەردەشتی بڕوای تەواویان هەبوو، کە ئەسکەندەر سەراپا بە ئەهریمەن پەیوەستەو دەبوو خانەدانانی ئێرانیش وەك زەردەشتی، هەمان هەڵوێستیان هەبایە، بەلاّم هەلومەرجی نوێ و ویستی پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی ئەوان یان بەشێکیانی والێکرد، لە پێناو پاراستنی پایە و سامانی پێشوویان لەگەڵ ئەسکەندەر بن، دەشێ ڕێزی لێهاتوویی لە هونەری جەنگی و کەسایەتیە کێشکارەکەشی ڕۆڵی هەبووبێ لە گۆڕینی هەڵوێستیان و دەشێ بەشێکیش بە ئومێدی گرانەوەی گرێی بەختیان (فرشاهی = خورنە = بەختی یونانی) لەگەڵ ئەو کافرە بێگانەیە —کە پێشتر شتی لەو جۆرەیان بینیبوو- هاوپەیمانی ئەویان بە مافی خۆیان زانیبێ بەشێکیش وەك پیشە و لە پێناو بژێوی دەچوونە ناو سوپا جیا فەرماندەکەیان هەر کەسێك با، بەلاّم روحانیەکان هیچ پیشەیەکیان نەدەزانی تا سوودێکی پێ بەرژێمی ئەسکەندەر بگەیەنن، و هیچ شتێکیش نەبوو تا لە و نارەحەتیە، کە لەو هەلومەرجەی خراپی و وێرانیە بۆیان هاتبۆ پێشێ، کەمبکاتەوە، بەهایەکیشیان لای مەکدونیەکان نەبوو، تا ببێتە هۆی نزیکبوونەوەیان، ئەگەرچی ئەسکەندەر هۆگر و سەوداسەری فاڵ و پێشبینی بوو، بەلاّم نەیدەویست بە ئێرانیان پشت ببەستێ بەتایبەت، کە ئەوان زیاتر لە هەر شتێك ئارەزوویان بوو پێشبینی ڕۆژی ڕەشی پێبدەن، هەمور ئەمانەش بۆ ئەو گریمانەی هۆشمەندانە بوون تا بەر کەناریان بکات، زۆریش شیاوە، کە موغەکان بەربەرەکانی گریکە خراپکارەکانی ڕاسپاردەی ئەهریمەنیان بە ئەرکی خۆیان زانیبێ و خەلکی تریشیان هاندابێ، وەك چۆن لە هندستانیش برهمەنەکان، ڕاجەکانی دانیشتوانی ناوچەی (سەفلا)ی سندیان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی گریکەکان، هاندا[١٣٨٧]، نووسەرێك پایەدارکردنی گیانی سەربازی لای بەرهمەنەکان، بە هۆکاری

---

[١٣٨٦] مري بويس: تاريخ كيش زرتشت، هخامنشيان، ج٢، ص٤١٨.

[١٣٨٧] مري بويس وفرانتز گرنر: تاريخ كيش زرتشت، پس از اسكندر گجسته، ج٣، ص١٣-١٤.

بەربەرەکانی کردنی ئازایانەتری هیندیەکان، لە هەر شوێنێکی تر دەزانێ، کە لـە بەرامبەریـشدا ئەسکەندەر سزای توندیدان[١٣٨٨].

سەرچاوەیەك ڕۆڵی موغەکان و وابەستەیی خەڵك بە نەبەزاندنی هێڵـەکانی نـاو دەسـتوری دیـنی زەردەشت، هێندە بە کاریگەر گرتووە، کە لە پشتی هەموو ڕاپەڕین و شۆڕشـەکانی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاوای وڵات، کە لە دوای ڕۆیـشتنی ئەسـکەندەر بـەرەو هنـد، ڕوویانـداوە، گومـانی هانـدانی موغـەکان دەکـات، تەنانـەت ڕادەسـتکردنی (بریـاکیس) لەلایـەن ئەتروپاتـەوە بـە ئەسـکەندەر بەنیـشانەی بردنەسـەری بـەڵێن لێکدەداتـەوە، پێـی وایـە لـە دیـنی زەردەشـتدا تەنانـەت ئەگـەر نەگبەتێك سوێندی وەفاداری خوارد دەبوو پێی وەفادار بێت، هـەتا ئەگـەر لاکـەی تـر کەسـێکی کافریش بێت[١٣٨٩].

لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونەی دوایی کاڵ و کرچی لە بیرکردنەوەدا پێوەدیارە و ڕەنگـە بەدیوێکیـشدا لەگەڵ ڕای پێشتری دژی یەك بن، چونکە سەرەتا ئەوە ڕەنگە بۆ پیـاوە ئاینیـەکان دروسـت بێـت، بەڵام مەرج نیە سەرکردەیەکی سەربازی بە قسەی خۆی بەژەوەندی پەرست کـە لەبـەر پایـەکانیان وەگەڵ ئەسکەندەر کەوتبن ڕەنگە دروسـت نـەبێ، جگـە لـەوەش دیـنی زەردەشـتی نمایـشی شـەڕی هێزی خێـر (ئـاهورامزدا) دەکـرد دژی بـەرەی شـەڕ(ئەهریمـەن)، وتیـشمان کـە گریکـەکان وەك ڕاسپاردەی ئەهریمەن سـەیر دەکـران، کەواتـە ئـەو سـەرکردەیەش کـە دژی پـەیامهێنی ئەهریمـەن ڕاپـەڕیبوو، ڕاسـتەوخۆ یـا ناڕاسـتەوخۆ پـەیامی ئـاهورامزدای جێبـەجێ دەکـرد، کەواتـە دەبـێ ئەتروپات گوێ لە مستی کام دەقی ناو ئاڤێستا بووبێ؟ کەوەك وتوویەتی خۆی زەردەشتی بـووە، کەچـی دژە ئەهریمـەنێك ڕا دەسـتی ئەهریمـەن بکاتـەوە! لەلایـەکی تـریش ئەگـەر هـەموو زەردەشتیەکان هێندە وابەستەبووبن بە بەڵێندان، خۆزانیمان، کە پادشـای ئێـران لای ئـەوان وەك هەڵبژاردەی خودا وابوو، ئەتروپات و بەسوز مـازیوسیش لە کەسایەتیە نزیکـەکانی بـوون و هـەر هـیچ نـەبێ ڕۆژهـەڵاتی بـوون، ئەگـەر وایـدابنێین هاودینیـشیان نـەبووبێ، نـەریت و زمـان و هەڵسوکەوتی لێیان نزیك بوو و بە کەسی پیرۆزیش دەزانرا لە بەرامبەر ئەسکەندەر، کە بـەنیازی داگیرکردن هاتبوو و دەشترسـان تۆڵـەی ئەسـینایان لێبکاتـەوە کردیـشی، کەچـی پێـی وەفـادار نەبوون، تەنانەت پەنای بردە ناوچەی میدیا کەچی ئەتروپات داکۆکی لێی نەکرد. خۆ ئەگەر وەك

---

[١٣٨٨] الفريد فن گوتشميد: تاريخ ايران ، ص٣٤.

[١٣٨٩] مري بويس وفرانتز گرنر: تاريخ كيش زرتشت، پس از اسكندر گجسته، ج٣، ص١٥.

وتـرا موغـەكانیش ڕۆڵیـان لـە هـەموو شـۆڕش و ڕاپەڕینەكانـدا بوویـێ، دەبـێ بـۆ پـشتی ئـەو سەركردەیان نەگرتبێ، كە دژی گریكەكان ڕاپەری؟ یان بۆ بـەریان لـە ئـەترویات نـەگرتووە، كـە وەها كارێك ئەنجام نەدا؟

بەتایبەت كە وتراوە (بە هاتنە ناو ئێرانی ئاداب و نـەریتی هیلـینی هـاوڕێ لەگـەڵ سـەربازان و كاربەدەستانی دەوڵەت و نیشتەجێ كـراوان، قـەرار گـرتنی شانبەشـانی دابونـەریتی خـۆجێیی و بەشێكی خەڵك بڕوایان پێی هێنا، بەڵام ئەوە ڕاپەڕینی توندی كەسـانی دژە هیلـینی لێكەوتـەوە كە ئەوانیـان وەك لە دین دەرچوو ناوبرد[1390].

لە كاتێكدا ئەسكەندەر هێندە توندوتیژ بوو كە ئەگەر بەشێكی پیاوە ئاینیەكان بە بەربـەرەكانی خۆیان و هاندانی خەڵكی تر بوویانە جێی سەرنج، ئەوا ئەو نەك هەر ئامادەبوو بڕیاری كوشـتنی ئەوان بـدات، بـەڵكو دوورنـەبوو خـەڵكی تریشیان پێـوە بكـوژێ، تـا كەسـانی تـر، لـەو جـۆرە هەڵوێستە خۆیان بپارێزن، هەر ئەوەش بوو وایكرد پیاوە ئاینیـەكانی زۆر مـەڵبەنـدی زەردەشـتی لەناوبچن. لە كاتێكدا ئەوان لای گریكەكان ناوبانگی باشیان هەبوو، تەنانەت لـەباس نـەكردنی ئەو كوشتارەش لای ڕووداونووسە گریكەكان، ئەگەری ئەوە دەكرێ ئەو ناوبانگە بەهەند گیرابـێ و پێیان وابوو ڕاگەیاندنی ئەو باسە زیادەیەك ناخاتە سەر ناوبانگی ئەسكەندەر[1391].

بە بۆچوونی یەك لە نووسەران ((هەوڵدان بۆ لـە نـاوبردنی ئـەو دینـە، بـۆ ڕوخانـدنی پایەیـەكی گیانی میللەت، بوو، دوای لە ناوبردنی سوپاو یەكێتی هەرێمەكانی، چونكە سوپا تێكدەشكێ و سەریش دەكـەوێ، بـەڵام لـە بـەینبردنی تـەواوی دیـن و پڕكردنـەوەی شـوێنەكەی بـەبت پەرسـتی كۆڵەكەیەكی تێدا دەڕمێ، كە ئیتر هەڵناسێتەوە، كاركردنیش لەسەر شلۆقكردنی ئەو ئەسـتوندە دەبێتە كۆسپی بەردەم گەڕانەوەی یەكێتی سیاسی میللەتەكە، بانگەوازكردنیش بۆ گەڕانەوەی ئەو یەكێتییە بێ پەیوەستكردن بە گەڕاندنەوەی دین، بەرهەمی نابێ))[1392].

بێگومان ئەو بۆچونەش زاڵی سۆزی ئاینی تێدا دیارە و لە نكـوڵیكردن لـە پێكـەوە هـەڵكردنی ئایدیا جیاوازەكان دەچێ، بۆیە بەرەهایی بەستنەوەی یەكێتی سیاسی میللەت تەنها بە دینەوە بە

---

[1390] سموئیل كندي ادي: آیین شهریاري در شرق، ص٤٦.

[1391] مری بویس وفرانتز گرنر: تاریخ كیش زرتشت، پس از اسكندر گجسته، ج٣، ص١٥-١٦.

[1392] یحیی الخشاب: التقاء الحضارتین العربیة والفارسیة، ص٨.

بیریکی ژیرانە تێناگەم، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ کە لەو چوارچێوە سیاسیەدا جگە لەو، هیچ(ئینتیمایەکی) تر بوونی نەبێ و توانای پێکهێنانیشی مەحاڵ بێ.

هەوڵی ئەسکەندەر بۆ لە ناوبردنی ئاڤێستای کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان لە دوای شەڕی گۆگامێلای ساڵی(٣٣١پ.ز)و لەناوبردنی دەوڵەتی ئەخمینی، گەورەترین زەبربوو کە بە درێژایی مێژووی خۆی بەریکەوت، کاتێك دەستیگرت بەسەر کتێبخانەی شاهنشاییدا، کە تیایدا بەرگەکانی ئاڤێستا پارێزراوبوون، گشتیانی لەگەڵ بەڵگەنامە نووسراوەکانی تردا سوتاند، جگە لە چەند بەشێکی نەبێ هیچی بەساغی دەرنەچوو، هەشتاو سێ هەزار(٨٣٠٠٠)ووشەی بەشە سوتاوەکانی نەوە دوای نەوە تاکۆتایی دەسەڵاتی سلوقی لەسەرگنی پیاوە ئاینیەکان هەڵگیرا[١٣٩٣].

دەڵێن کە"ئەسکەندەر زۆر لەموغەکانی کوشت و گەلێك لەئاگرە پیرۆزەکانی کوژاندنەوەو زەندی[١٣٩٤] ئاوێستای بۆ وڵاتی گریك رەوانەکردووەو روونووسێك (نسخە)یەکیشی کە لەئاتەشگەدابوو، سوتاند ئەوەش، کە سوتا لەسەر(١٢)دوانزە هەزار پێستە گا نوسرابوو و نزیکەی سێیەکی ئەوەش لە سنگدا هەڵگیرا[١٣٩٥] واتە خەڵك لەبەریکردبوون.

هەرچی خوداکانی گریك بوون، وا هەستدەکرا خەسڵەتی جیهانیان وەرگرتبێ، ئەوەش بەتایبەت لە بارەی زیوس، زیاتر ڕاست بوو، پەرستش و باوەڕ بە دەستوری خودایانی گریکی تەنها چەمکی رووت مابوو و(قەدەر)و (چارەنووسیش)، بەناونیشانی یەزدانی نوێ دەرکەوتن، کە تەنانەت خوداوەندەکانیش دەسەڵاتیان بەسەردا نەدەشکا، پەیوەندی گرتن لەگەڵ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاریگەری لە بیروکرداری ئاینی گریکەکاندا هەبوو، گریك خودایانی خۆیان وەك زیوس بەخودای باڵا وەك (بعل شمن، خودای ئاسمان لە سوریا، ئامونی میسری، مەردۆخی بابلی، تەنانەت خوداوەندی ئیسرائیل، دەچواند) و هی تری نوێشیان هێنایە ناو پێکهاتەی

---

[١٣٩٣] مسعود محمد: لسان كرد، (بغداد: ١٩٨٧)، ص١٥.

[١٣٩٤] کتێبەکە ناوی ئاڤێستایە دواتر ڕاڤەی کردووە (شرح) کتێبە ڕاڤەکراوەکەی ناو ناوە زەند، ئەویشی شیکردۆتەوە و شتی تریشی پێوە زیادکردووە بە بازەند ناوی بردووە: خالد السيد محمدغانم: الزاراداشتية تاريخ و عقيدة و شريعة (دراسة مقارنة) ، (دمشق:٢٠٠٦)، ص١٠١-١٠٤ ؛ يحيى الخشاب: التقاء الحضارتين العربية والفارسية، ص٢٢.

[١٣٩٥] يحيى الخشاب: التقاء الحضارتين العربية والفارسية، ص٨-٩.

یەزدانی خۆیان، بۆ نموونە (ئیزیس)[١٣٩٦] خواوەندی میسر لە جیهانی هلنستی و ڕۆمیش دەپەرسترا، لەبەر بڕوابوونیشیان بەوە کە لە چارەنوسدا توانادارترە، لە پلەی باڵاتری خواوەندەکانی گریکدا قەراری گرت، ئەو خودایانە بۆ ئەوەی لەلای خەڵك پێشوازیان لێبکرێ، تەواوی تایبەتمەندی گریکیان وەرگرت[١٣٩٧].

پەرستنی (میترا[١٣٩٨])ی ئێرانیش ڕووی کردە ڕۆژئاوا و بەرەو ئەنادۆڵ و ئیتالیا ڕۆیشت، تا وایلێهات لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بوویە بە کێبەرکێ کارێکی ترسناکی ئاینی مەسیحی و لەگەڵیشیدا ململانێیەکی توند و تیژ لە پێناو ژیاندا، پەیدابوو[١٣٩٩]. فراوانی بڵاوبوونەوە و شوێنگرتنی شکۆ و پێگەی ئەو خواوەندە بەتایبەت لای جەنگاوەران لەوەوە هاتبوو، کە ئەو بە بەخشیاری سەرکەوتن(یهیب النصر) بوو[١٤٠٠].

لە شار و پەرستگاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کۆندا، خودایانی ڕۆژهەڵاتی، سەرەڕای هەندێك کاریگەری دەسەڵاتی گریك بەسەریانەوە، هەر دەپەرستران، کاری ئاینی، پەرستش و پەرستگاکانیش شێوەی باوی خۆیان پاراست، ئاسیای بچوك زیاتر لە هەر شوێنێك، کەوتە ژێر کاریگەری ئەوان -گریك- کەچی خواوەندەکانیان، کە ناوی ئەوانیان هەڵگرتبوو لە ڕووی خەسڵەتەوە خۆماڵیانە مانەوە، بەڵام لە ئەنتاکیا، کە بوو بە پایتەختی دەوڵەتی سلوقی، دینی سووری زیاتر بەهیلینی بوو[١٤٠١] ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە پێشینەیەکی مێژوویی

---

[١٣٩٦] ئیزیس: خواوەندێکی بەناوبانگی میسریەکانە و وەك هێمای دڵسۆزی بۆ مێرد و چاودێری تەواوی کۆرپە سەیر دەکرێ، لە تێکڕای سەردەمی فیرعەونیەکاندا پەرستراوە، سەردەمێك وەك خواوەندی چارەسازی نەخۆشی و توانادار لە سیحردا پەرستراوە و پاشان بۆتە خواوەندی پیت و بەرەکەت هاوسەری (ئوزیرس)ی خاوەندی مردن و زیندووکردنەوە لە ئاینی میسریدا. بڕوانە: سمیر ادیب: موسوعة الحضارة المصرية القديمة، (القاهرة: ٢٠٠٠)، ص٢١٨-٢١٩؛ امام عبدالفتاح امام: معجم ديانات واساطير العالم، مج٣، ص٧٤-٧٥.

[١٣٩٧] لوکاس دبلویس و روبارتوس وان دراسپك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٥-٢١٦.

[١٣٩٨] میترا:خواوەندێکی ڕۆژهەڵاتیانە و بەرپرسی زامنکردنی ڕەوتی سروشتی ژیانی کۆمەڵگا و یەکخستنی خەڵکە، وڵات لە ناکۆکی و شەڕ دەپارێزێت و سزای دوژمنان دەدات، بە کوڕی خواوەندی حیکمەت و مێینە خواوەندی زەوی ناسراوە و سەرەتای دەرکەوتنی پەرستنی بۆ هەزارەی چوارەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە. أ.س.ميغوليفسكي: اسرار الالهة والديانات، ترجمة ميخائيل اسحاق، (دمشق: ٢٠٠٦)، ص٨٧-٩٠.

[١٣٩٩] هارولد ادريس بيل: الهلينية في مصر، ص٦٠؛ د.حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، ، ج١، ص٥٧.

[١٤٠٠] أ.س.ميغوليفسكي: اسرار الالهة والديانات، ص٨٧.

[١٤٠١] لوکاس دوبلویس و روبارتوس وان دراسپك: دیباچە بر جهان باستان، ص٢١٨.

پەیوەندی یۆنـان بەو ناوچانەوە هـەبووە بەتایبەتـــی کەنارەکانـی ئایۆنیـا لـە ئاسـیای بـچـوك .
بەگشتیـش لە بارەی ئاینەوە زۆر سەختگیریان نەدەکـرد ، چونکە پێیان وابـوو کـە ئـەو کـارە نـە
پێویـستە و نە دەشکـرێ[١٤٠٢] .
لە سەردەمی هیلینستیدا وەك یەکێکی تر لە دەرەنجامەکانی تێکەڵاوبوونی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا
پڕوپوچی (خرافە) خەیاڵ پڵاوی(اوهام) بڵاوبۆوە و لەگەڵ خۆشیدا گەشبینی و ڕەشبینی هێنـاو
ژمارە حەوت(٧) کە لـە ڕۆژهـەڵات پێـشینەیەکی دوور و دێـرینی هـەبوو[١٤٠٣] پـیرۆزی پێـدراو
کەوتە سەر زاران، لە زۆر شتدا بەدیان دەکرد، لەلای ئەوان ((حەوت ئەسـتێرەی گـەڕۆك، حـەوت
ڕۆژ لە هەفتەیەکدا، حەوت شتی سەرسوڕهێنەر(عجائب)، حەوت تەمەن بۆ مرۆڤ، حەوت ئاسمان
و حـەوت دەرگـای دۆزەخ)) هـەبوو، هـەروەها لـە بـڕوای هەموانـدا چەسـپا، کـە ئەسـتێرەی
خواکان(نجوم آلهـة) ڕۆڵ لـە چارەنوسـی تـاك و دەوڵـەتی بـچوك و گـەورەدا، دەگێـڕن، تەنانـەت
ئافەریدەبوونی مـرۆڤیش، ئـەو ئەسـتێرەیە دیـاری دەکـات، کـە لەگـەڵ لەدایکبوونیـدا هەڵـدێ،
هەڵاتنی(موشتەری) لەو کاتەدا هێمـای شـادومانی بـوو، بـەڵام(زوحـەل) بەدبـەختی دەگەیانـد،
ئەوەش بێگومـان ڕەنگدانەوەی لەسەر بیر هەبوو، بۆیە دەبینین ڕەوتە فیکریەکان، یا گوزارشـتیان
لە ڕاستی ژیان، دەکرد یان کاردانەوەیان بۆی نیشاندەدا، هەندێکیـان بانگەوازی چێژیان دەکـرد
هەندێکیش بۆ دەستبەردان لە ژیان پڕوپاگەندەیان دەکرد، ڕەوتێکی تریش هـەبوون (نـازانم = لا
ادری)یان وەك خۆشبەختی مرۆڤ لە گوماندا، بەدیدەکرد[١٤٠٤] .
هێنانـە نـاوەوەی دەسـەڵاتی ڕەهـاو مـافی خـودایی پادشـایان بـۆ ئـەوروپا یـەکێکی تربـوو لـە
ئەنجامەکانی سەرکەوتنی گریك بەسەر ئیمپراتۆریـەتی ئەخمینیـدا، ئەسـکەندەر دوای چـوار سـاڵ
بینی، کە ئەو خوایەتیەی ئـەو لـە خۆیـدا دەبینـێ، پێویـستی بـە ڕاگەیانـدن و شـتی ڕوکەشـیش
(اعلانات ومظاهر خارجية)هەیە، دەبێ هەندێك ڕێـوڕەسمی لەگـەڵ ئـەنجام بـدرێت، تـا خوایـەتی
خۆی بەسەریانەوە، بەکۆمەڵ و جیهانیش بلێ، بۆ ئەو مەبەسـتەش بـەپێی نـەریتی ڕۆژهـەڵاتیان،
دەبوو هەموو ژێردەستەکانی لەبەردەمیدا بچەمێنەوە تا ناوچاوانیان دەگاتە سـەر زەوی، پاشـان
پـەیامێکی فەرمیـشی نـاردە هـەموو شارەکانـی گـریك، کـە پەیمانـی لەگەڵیـاندا
بەسـتبوو تیایـدا هەڵوەشـاندنەوەی پەیمانەکـە و بوونـە خـوایی خـۆی بەسـەریاندا
ڕاگەیاندبوو[١٤٠٥] .

---

[١٤٠٢] محمود زنجاني: تاريخ تمدن ايران باستان، ج١، ص٤٢٧.

[١٤٠٣] بۆ زانیاری لە بارەی دیرۆکی سەرهەڵدانی حەوت وەك ژمارەیەکی پیرۆز و گوزارشت و هێماکانی لە ڕۆژهەڵات بڕوانە: حكمت بشير الاسود: الرقم سبعة في حضارة بلاد الرافدين الدلالات والرموز، (دمشق: ٢٠٠٧).

[١٤٠٤] احمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية، ج١، ص١٩٠.

[١٤٠٥] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٠٦.

دەڵێن بۆ ئەرستۆی نوسیبوو، کە((هیچ هاوتایەکی نیە، خۆی خاوەنی قسە و دەسەڵاتی باڵایە ئەگەر بیەوێ (اذا ماتولی) وەك خوا وایە لەناو خەڵکدا، بەکرداریش بۆ شارەکانی گریکی نووسی، کە بەخوای دابنێن، ئەوانیش زۆربەیان تەنانەت ئەسپارتەش قورسیان لە قبوولکردنیدا نەبینی، ملکەچی داواکەی بوون))[1406].

واتە ئەو پێی وابوو داواکردنی(خوایەتی) لەسەر بنەمای باوەڕی ئەوان، کارێکی شیاوی بێ مشتومڕە، ئەو لەبەر بە ئاسایگرتنی گریکەکان بڕوای وابوو، کە بێ هەستکردن بە سەرشۆڕی و بێ زۆرلێکردن سەری بۆ دادەنەوێنن، لەوەش کە لەلای ئەوان هێڵێکی ڕوون لە نێوان پایەی خواوەند و مرۆڤدا نیە، گەیشتە چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ مەسەلەی ناوەندیەتی دەسەڵاتی لە مەملەکەتەکەیدا، ویستی بە سیفەتی خوداوەند حوکمڕانی بکات، نەریتی کۆنی باوی چەندین سەدەی ڕۆژهەڵاتیەکانیش بەتایبەت میسریەکان، کە سەیری پادشایان وەك کوڕی خوادەکرد، لەو بیرەیدا یارمەتیدەری بوون بەتایبەتیش، کە ئەو لەوێ وەك کوڕی ئامون ناسرا[1407]. لە سەرچاوەیەکیش کە بنەمای ئەو بڕیارە گریکیانە سەیر دەکات، دەریدەخات کە بەلای ئەوانەوە کەسێك بەو هەموو دەستاوردانە بگات، مافی ئەوەی هەیە کە بەپایەی خودایان بگات، بۆیەش کە بەدل و بەگیان دەرکیان بەداواکەی ئەو کرد و بوو بەڕێ و شوێنیش بۆ پادشایانی دوای خۆی[1408].

هەیە ئەوە وەك گیانی شەیتانی سەیر دەکات و بەشێکی بە زادەی تێگەیاندنی (تلقین)ی کالستن[1409] دەزانێ، کە ویستویەتی بەجێگیرکردنی بیری خوایەتی لە زەینیدا، بەردەوامی بەداگیرکردن بدات[1410]، چونکە ئەو لە گەورەترین مەراییکاران و خوازیارانی بەخوابوونی ئەسکەندەر بوو[1411].

---

[1406] طه باقر وآخرون: تاريخ ايران قديم، ص٨٣.

[1407] جايمس هنري برستد: العصور القديمة، ص٣٠٥-٣٠٦.

[1408] هرمان بنگسون: يونان وپارسان، ص٣٢٨؛ اولريش ولكن: اسكندر مقدوني، ص٢٦٩-٢٧١.

[1409] کالستن:هاوڕێی ئەسکەندەر و قوتابی و یەك لە خزمو خۆشەویستانی ئەرستۆ بووە ئەسکەندەر بەتاکە کەسی زانیوە کە بتوانێ چیرۆکی گەشتەکەی بنوسێتەوە، چونکە وەك خۆی گووتەنی لە یەکەم ساتەوە لەگەڵی ژیاوە و وڵات بە وڵات لە داگیرکاریەکانی لەگەڵی بووە لەسەر مەسەلەی کڕنۆش بۆ نەبردن کوشتویەتی. بڕوانە: نسطور ماتساس: مذكرات اسكندر الكبير، ص٣٢-٣٣.

[1410] عبدالحسين زرين كوب: تاريخ مردم ايران، ج١، ص٢٤٨.

[1411] الاب ميتوديوس زهيراتي: الاسكندر الكبير، ص١٢٠.

له ڕاستیدا لەسەر مەسەلەی جێبەجێکردنی کڕنۆشبردنە، کە ڕای جیاواز هەیە و مانـاو ئامـانجی دژ بەیەکی بۆ لێکدراوەتەوە، وتراوە، کە کڕنۆش لای گریکەکان بە چەماندنەوەی بـالاّ یـان هـەر تەنها سەر و بە هەلّدانی ماچێك بەسەری پەنجە بووە و ئەوەشیان تـەنها لـە بەرامبـەر خودایانـدا، ئەنجامداوە، بەلاّم ئەخمینیەکان کاتی دیدار، لەبەردەم پادشـا دەچوونە سـەر زەوی و ناوچـاوانیان لێیـدەدا مەبەسـتیش لـە ئـەنجامی ڕێزگـرتنی پادشـا بـوو، کـە بەهەلّبـژێردراوی خـوای گـەورە (ئاهورامزدا)یـان دەزانـی نـەك بـەخودا، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئـەم شـێوازی کڕنۆشـبردنە لای هەندێك جێی گومانە، بەلاّم ئیزوکراتی هاوسەردەمی(٣٣٨پ.ز) وای ئاماژەپێداوە و گریکەکان پێی سەرسام بـوون و سـەیریش نیـە بـە پەرسـتنیان دانابـێ، بەلّگـەش بـۆ ئـەوە کڕنوشـنەبردنی بالّوێزانی ئەسپارتە بوو بۆ خشایارشا، گوایە لەمیانەی سەردانێکیاندا بۆ ئێران وتویانە (ئێمـە مرۆڤ ناپەرستین) کە زۆری نەمابوو بەهۆیەوە قەیران لە نێوان هەردوو دەولّەت بەدی بێ[١٤١٢].

واتە نەریتی کڕنوشبردن، کە پێویست دەکات هەموو کەس لەبەردەم پادشا پێی هەلّسێ، بـەلای ئەخمینیەکانەوە کارێکە و ڕێوڕەسمی فەرمی سەپاندویەتی، مـانای پەرسـتنی پادشـاش ناگەیـەنێ، بەلاّم بەلای گریکەکانەوە، دروست پەرستن دەگەیەنێ، ناشبێ مرۆڤ کڕنۆش جگە لەخوا بۆ کەسی تر بەرێت[١٤١٣].

نوسەری وا هەیە، کە مەسەلەی کڕنۆشبردن لای ڕۆژهەلاّتیەکان وەك نیشانەی ملکەچی تەواو بـۆ دەسەلاّتی ڕەها لێکدەداتەوە، ئەو بۆچوونەش، کـە گوایـە ئەسـکەندەر لـە هێنانـە نـاوەوەی ئـەو نەریتە ویستیی وەك خوا بیناسن ، بەهەلّە دەزانێ، ئەو ئەوە بە ڕێگایەك بـۆ بەرقـەرارکردنی وەك یەکی نێوان هەردوو میللەت سەیری دەکات، پێی وایە ئەگەر لە نێـو کەسـە نزیکـەکانی کـە لـە هەلّگرتنی باری هەموو نارەحەتیەکان هاوڕێ بوون، نەبایە، دەستی بۆ ئەوکارە نەدەبرد[١٤١٤].

واتە پێی وابوو ئەخمینیەکان پەیوەنـدی ئـەو لەگـەلّ سـەربازان بـەو شـێوەیە، کـە لای گریکـەکان هەبوو، بەجۆرێك لە پێشێلکردنی سنووری پیرۆزی پاشایەتی دادەنێن، کەدەبێ پادشای ئـەخمینی بیپارێزی و کڕنوشبردنیش یەك لە هێماکانیـەتی، ئەمـەش ئەسـکەندەری تووشـی هەلّوێسـتێکی شـێواو کـردووە، چـونکە لـە ترسـی لـەقبوونی ملکەچـی ڕۆژهـەلاّتیان بـۆی، نەیویـستووە وازی لێبێنێ و پێویست کردنیشی تەنها لەسەر ئەوان، لەگەلّ ئەو یەکسانیە نەدەهاتـەوە کـە بـۆی لـە هەولّـدابوو، بۆیـە بڕیاریـداوە هـەمووان ئـەنجامی بـدەن، بـەپێی ئـەوەبێ پڕۆسـەکە بـەخوابوون ناگەیـەنێ، بـەلّکو ویـستویەتی بەمـە دەسـەلاّتی لـە بەرامبـەر هـەمووان وەك یـەك نیـشانبدات ڕاییبـوونی ئـەوەش بـەلای گریکەکانـەوە نـاڕەوا بـوو، بۆیـە بەشـێك ڕەتیانکردۆتـەوە، تەنانـەت

---

[١٤١٢] نفس المرجع، ص١١٩-١٢٠.

[١٤١٣] طه باقر وآخرون: تاريخ ايران قديم، ص٨٣.

[١٤١٤] اولرش ويلكن: اسكندر مقدوني، ص١١٠.

کالستین[١٤١٥] – پێشتر ئاماژەمان پێدا- توانی بەدانانی گیانی، ئەو پلانە لەبارەیGU[١٤١٦]، بەمەش مەسەلەکە لای هەندێك کەس زیاتر ڕوانگەیەکی سیاسی وەرگرتووە تا دینی[١٤١٧].
که لەڕاستیدا دەکرێ هەردووکیانی لێبخوێنرێتەوە، چونکە لەلایەك ئەو ویستویەتی دەوڵەتێکی جیهانی دروستبکات، سەقامگیربوونی ئەو دەوڵەتە جیهانیەش، بە بەرقەرارکردنی یەکسانی و یەکێتی نێوان پێکهاتەکانی و ناوەندیەتی دەسەڵات مسۆگەر دەمێنێتەوە، لەلایەکی تریش زانیمان ئەو بیری خوایەتی لە مێشکدا بووە هەر بۆیەش نەك هەر هەژمارکردنی بە کوڕی خوا لەلایەن دایکی و کەسانی دەوروبەری و دواتر لەلای میسریەکان، ڕەتنەکردۆتەوە و بە نەشیاوی نەزانیوە، بەڵکو دڵنیابووە، کە کوڕی ژوپیتەرە و بە لاسایی کردنەوەی پاڵەوانە بە خوابووەکانی گریكو ئاواتی وەك ئەوان لێهاتنی ، پراکتیزەکردنی ئەو ڕاستیەیە و بوونی بڕوایەکی وەهاو گەیشتن بەو هەموو سەرکەوتنانە و تێبینی ڕاییکردنی ئەو شێوە سیستەمە لە ڕۆژهەڵات لە نێویاندا بابل و میسر، جگە لە هەموو ئەوانە – کە پێشتریش ئاماژەمان پێکردوون- پادشا لە ئێراندا تەواوی ئەرکی دینی و بەرپرسیاریەتی سیاسی لە دەستدابوو و تێکڕای چالاکیە مرۆییەکانیش پەیوەندی نزیکیان بە بیروباوەڕی ئاینییەوە هەبوو[١٤١٨]. لەبەرئەوانە شتێکی ئاسایی بوو، کە ئەسکەندەری گەیاندبێتە ئەو بڕوایە دەست بۆ وەها بڕیارێك ببات.
لە گێڕانەوەی مێژوونووسەکانیشەوە دیارە، کە بۆ تێدا جێبەجێکردنی ئەو بیرە، تەنها هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی لەبەرچاونەگرتوو وتراوە کە "عەرەبەکانی دوورگەی عەرەبی، جگە لە تێکڕای ئەستێرەکان بەتایبەتی(ڕۆژ) دوو خواوەندیان پەرستووە، کە ئەسکەندەر ئەوەی بیستووە، خوازیاربووە داگیری بکات تا ببێتە خوای سێیەم بۆیان[١٤١٩]. لە بیرەوەریەکانی خۆشیدا ئاماژەیەکی وا دەخوێندرێتەوە[١٤٢٠].
سەرچاوەیەکیش پێی وایە، کە پایەی بەرەو پووکانەوە ڕۆیشتنی خودایان، بە پەیدابوونی پەرستنی فەرمانڕەواکان، ئاشکرابوو، بڕواشی وایە کە ئەو جۆرە پەرستنە خۆبەخۆ پەیدابووە و لە شارەکانی گریکیش، جگە لەوە پیاوانی بەناوبانگیش دوای مردنیان لە لایەن خزمەکانیانەوە بۆ سەر ڕەچەڵەکی خودایان دەگێڕدرانەوە، لەسەردەمێکی تایبەتی پادشاکانی

---

[١٤١٥] لە بارەی بەڕێوەچوونی پرۆسەکە و نەیاریی کالستن بڕوانە: بلوتارك :السیر ،ج٣، ص١٣٠٤-١٣٠٥؛ فوکس ویبرن: الاسکندر الاکبر، ص٩٥-٩٧.
[١٤١٦] الاب متیودیوس زهیراني: الاسکندر الکبیر، ص١٢٠-١٢١.
[١٤١٧] مرتضی راوندي: تاریخ اجتماعي ایران، ج١، ص٥٨٨.
[١٤١٨] سموئیل کندي ادي: آیین شهریاري در شرق، ص٤٦.
[١٤١٩] عبدالمنعم الهاشمي: تاریخ العرب، العصر الجاهلي، ص٣٥.
[١٤٢٠] نسطور ماتساس: مذکرات الاسکندر الکبیر، ص١١.

سلوکی و بەتالیمەکانیشدا[١٤٢١]، ئەو پەرستنە بۆ مردووە نزیکەکانیان ئینجا خزم و پاشان بۆ هاوسەرانیش قەراریگرت[١٤٢٢].

ئەمەو پێکهاتنی یەك چینی (گریکی – ئێرانی)یش بەئاداب و نەریتی تێکەڵاو لە سەردەمی سلوکیاندا، کە لە ئەنجامی تەماس گرتنی ئێران لەگەڵ ڕێورەسمی دینی گریك و چوونە ژێرباری، هەندێکیان و کاریگەری ڕەوش و دەستوری دینی ئەوانیش لەسەر ئەوروپاییەکان، پەیدابوو[١٤٢٣]، لەو ئەنجامانە بوون، کە شەڕی گوگامێلا دەرگای بەدیهێنانی بۆ کردنەوە.

---

[١٤٢١] سەرەڕای ئەمە لە لایەك یەك لە پادشایانی بەتالیمە، ئاینێکی نوێی بەناوی(سەراپیس Sarapis) سەریهەڵدا، بەڵام سەرنەکەوت و خەڵك بڕوای پێنەهێنا و ناویشی تەنها لە هەندێك بەڵگەنامە و نەخشی دەرەوەی سنووریان تۆمارە فەرمیەکاندا مایەوە:محمود ابراهیم السعدني: تاريخ مصر في عصري البطالمة والرومان، ج٢، ص٣.

[١٤٢٢] لوکاس دویلویس و روبارتوس وان دراسپك: دیباچەی بر جهان باستان، ص٢١٧.

[١٤٢٣] سموئیل کندي ادي: آيين شهرياري در شرق، ص٤٨.

# کـۆبەند

باسکردنی شەڕی گۆگامیلا(ئـەربیلا)ی سالّی ۳۳۱پ. ز و پێداچـوونەوە بـە مێـژووی هـەردوو بـەرەی شـەڕ و توێژینـەوەی هۆکـار و دەرەنجامـەکانی، بـە چـەند ئـەنجامێکی گەیانـدین کـە گرنگەکانیان لەو چەند خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

۱-لەشکرکێشی بۆ سەر خاکی یەکتر و ململانێ و شەڕ لە نێـوان دەوڵـەتی ئـەخمینی ومیللـەتی گریك، ڕابردوویەکی دوور و دیرۆکێکی لە مێژینـەی هـەبووە و بەزانـدنی سـنووری یەکـدی وەك ئامانجێکی ستراتیژی پەیوەست دراو بە ئاواتی جۆراوجۆرەوە، لای هەردوو بەرە بـە هەنـد گـیراوە، هەمیشەش هەستکردن بە بەهێزی یەك هەڵوێستی ولـە خـۆڕابینین، بەسـبووە بـۆ هەرلایـەك کـە هێرش بکاتە سەر ئەویتر شەڕی گۆگامێلاش وەك دوا ئەڵقەی زنجیرەی ئـەو ململانێیـە، شـوێنی خۆیگرت .

۲-لە سروشتی یەك بەیەکی شەڕەکاندا خولقانی ڕەگـەزی بـەردەوامبوون، ئامـادەیی هـەبووە، چ ئەوە کە لایەنی سەرکەوتوو بەتێبینیکردنی لاوازی بەرامبەر، وورەی بۆ سەرکەوتنی زیاتر دنەیداوە یان ئەوە، کە سەرکەوتوو بە نواندنی ڕەفتارەکانی لە زەینی ژێرکەوتوودا –کە پێشێلی سـەروەری و پیرۆزیەکانی خۆی تێدا خوێندۆتەوە-تۆوی تۆڵەکردنەوەی چاندووە.

۳-ئەزموونی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخمینی لەلایەن کۆرشی گەورە و فراوانبوونی دەسەلاتی بـە ئاسانی و هەژموونکردنی بەسەر میللـەتانی جۆراوجـۆر، هەڵوێـستی پێـشوازیکارانەی هەنـدێك ناوچـە و دووبارەبوونـەوەی ئـەو حاڵەتانـە بـۆ فلیـپ و ئەسـکەندەری مەکـدۆنی لـە بنیاتنـانی ئیمپراتۆریەتەکەیدا، بەشێکی پەیوەستبوو بە ڕەوشی گوزەرانی ئەو میللەتانـە..گرفتاربوونیـان بە تەنگژەی جۆراوجۆر و ڕەشبینـی و ڕقیـان لـە حوکمڕانـە کانیـان، هیـواداری کردبـوون کـە لـە سایەی دەسەلاتو سیستەمی تازەدا شتە لەدەستچووەکانیان بۆ بگەڕێتەوە و بە ئەوانەش بگـەن،

که به ئاواتی بوون. بەشێکیشی بەندبوو بە لێزانی و کارامەیی سیاسی ئەوسەرکردانە، لە مامەڵەکردنی ژیرانەیان لەگەڵ واقیع وگرتنەبەری سیاسەتێك، کە لە ڕوخساری ئەجێندای گەیشتن بە ئامانجە تایبەتیەکانیاندا، بەرژەوەندی ئەوانی گوزارش دەکرد. تەبایی نێوان هەردوولاش تا ئەو کاتە بەردەوام دەبوو، کە بەرژەوەندیەکانیان تێکیدەکردەوە، بە زۆریش لەگەڵ جێگیربوونی دەسەڵاتی سەرکردەکان و دیتنی سێبەری خۆیان کۆتایی دەهات ،ئەمەش ڕاستیەك بوو کە هەمیشە ئەگەری دووبارەبوونەوەی هەیە .

٤-لە ڕێی توێژینەوەکەوە دەردەکەوێت، کە شەڕ وەك دیاردەیەکی زەق لە مێژووی پەیوەندی میللەتاندا ئەگەرچی زۆرجار بە نواندنی هەڵوێستێك یان ئەنجامدانی کارێك، هەڕەشەیەك یان جێبەجێ نەبوونی خواستێك کەیەك لەویتری داوادەکات و ..هتد، دەستپێبکات و هۆیەك لە ڕوودانیدا خۆی گەورەتر بنوێنێت و ڕۆڵی سەرەکی یاری بکات، لە ڕاستیدا دروستبوونی ئەو ڕەوشە کە شەڕی وەك تاکە ئامرازی چارەسەرکردن تێدا لەبەرچاوەدەگیرێت، لە شتی دیکەوە سەرچاوەی گرتووە و لە پشت ڕوودانیدا هۆکاری جۆراوجۆری تری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، بوونیان هەیە، لەم ڕووەوەیە کە بۆ شەڕی گۆگامێلاش هۆکاری جۆراوجۆر دەستنیشانکراون.

٥-ڕەوشی ئابووری خراپ و زیادبوونی بەردەوامی ژمارەی دانیشتوان، نەبوونی دەرفەتی کار و تێکچونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی، لە وڵاتی گریك و دەنگۆی دەوڵەمەندی ڕۆژهەڵات و بیستنی پەیوەندی خراپی نێوان دەوڵەتی ئەخمینی وگەلانی ژێردەستی، بە دەرفەتزانینی بوونی ئارەزووی تۆڵەکردنەوە. ئەفسانەو بنجگرتن و کاریگەری لەسەر هەنگاونان بۆ پێشڕەویکردن و بەرزبوونەوەی ورە، بەهۆی سەرکەوتن لە شەڕەکانی گرانیکۆس وئیسۆس، ڕا دەستبوونی هەندێك ناوچە بێ بەربەرەکانی و بە لاواز لە قەڵەمدانی پێشنیاری داراش بۆ پێکهاتن لەلایەن ئەسکەندەرەوە...لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی هەڵگیرسانی ئەو شەڕە بوون.

٦-ڕەوشی شەڕەکە ویەکلاییبوونەوەی بە قازانجی گریکەکان، بەهێزی کەسایەتی ولێهاتوویی ئەسکەندەر و ورەبەرزی جەنگاوەران و هەماهەنگی نێوان یەکەکانی سوپا و تەکتیك و هونەری سەربازی ومەشقی ڕێکوپێکی سەربازەکانی بەرەی گریك و باوەڕ بوون بە مژارەکەیانی، لە هەمبەر بێهێزی داریوش ولاوازی پەیوەندی بەشەکانی لەشکر و نەبوونی خواست وکەمی ئیرادەی شەڕکردن و سوود نەبینین لە چەکەکان وبێ پلانی لە بەرەی ئەخمینیدا، دەرخست.

٧-سەرنەکەوتنی گەلانی ناوچەکە لەبەربەرەکانی داگیرکەران و پارێزگاریکردنی سەربەخۆیی و بێناکامبوونی ڕاپەڕین وبەرخودانەکانیان، بە درێژایی دەسەلاتی هەردوولا، لە نایەکگرتوویی و نەبوونی هەستی یەکێتی و بێنەخشەیی خەبات و ناکۆکی ناوخۆ و یەکتر قبوولنەکردن سەرچاوەی گرتبوو. کوردیش وەك یەك لەوگەلانە کە بە ڕابوونی بەردەوامی لێرەولەوێی، شوێن پەنجەی بۆ تێکۆشان لە ڕەتکردنەوەی داگیرکەران لەو ماوەیەدا زۆر دیار بوو، ئێستاشی لەگەڵدابێ بە داوی ئەو نەخۆشیەوە گرفتارە .

٨-ئەو شەڕە دەروازەی دروستکردنی دەوڵەتێکی گەورەی بۆ ئەسکەندەر کردەوە، کە بەشێکی زۆری جیهانی زانراوی ئەو سەردەمە-ئاسیاو ئەوروپا وئەفریقا-ی لەخۆگرتبوو .

٩-ئەسکەندەر دوای شەڕی گۆگامێلا بە ئەنجامدانی هاوسەرگیری و ڕاسپاردنی ژمارەیەکی زۆری ئەفسەر وسەربازەکانی بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە و هێنانە ناوەوەی خەڵکی ڕۆژهەلاتی بۆ ناو لەشکرەکەی، دروستکردنی شاری زۆر و هاندانی کۆچکردنی گریکەکان، کە بەریەککەوتن و کار لە یەککردنی هزر و ڕۆشنبیری و کەلتور و شارستانیەت و..هتد،یشیانی بەدواداهات، هەنگاوی بۆ ئاوێتەکردن و بە ئەویدیبوونی گەلانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات هەلێنا و دەروازەی سەردەمێکی نوێی کردەوە، کە هەندێك بە سەردەمی هیلینستی لە مێژووی شارستانیەتی گریکی ولە هەمانکاتدا ڕۆژهەلاتیش، ناویدەبەن.

١٠- لەشکرکێشیەکە سەرەڕای زەوتکردنی ئازادی میللەتانی ناوچەکە وئەو کوشت و کوشتار و مالوێرانیەی بۆ هەندێك شوێن لەگەڵ خۆی هێنابووی، گریکەکانی بە گەلێك جێگاگەیاند، کە بۆ ئەوان نەناسراو بوو، زۆر دیاردەی سروشتیان بەرچاوکەوت، کە نەیانبینیبوو، نهێنی ڕوودانی هەندیکیانی هەلێنا، کە عەودالی زانینی بوون، هەندێکشیان ڕاستکردەوە، کە بە هەلە تێیگەیشتبوون.

١١- بە تێکەڵبوونی بیر و توانا و کاری میللەتانی جۆراوجۆر، ئەویش بەو هەلومەرجەی لە دوای شەڕی گۆگامێلا هاتە ئاراوە، زانست و زانیاری پێشکەوت وگۆڕان بەسەر بواری ئابوری و کۆمەلایەتیدا هات هزر و فەلسەفە و بڕوای ئایینی سنووری ناوچەکانی خۆیان تێپەڕاند، ئەدەب و هونەریش، ڕوخساری تایبەت بە سەردەمەکەیان وەرگرت.

# لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم/کتێب**

**بە زمانی عەرەبی:**


١. العهدالقديم

٢. آبتري: مدخل الى تاريخ الاغريق وادبهم وآثارهم، ترجمة يوئيل يوسف عزيز، الطبعة الثانية، مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر، (الموصل: ١٩٧٧).

٣. ابرهيم نصحى: تاريخ مصر فى عصر البطالمةمكتبة الأنجلو المصرية ، (القاهرة:دت) ، الجزءالرابع.

٤. أ.س.ميغوليفسكي: اسرار الآلهة و الديانات، ترجمة حسان ميخائيل اسحاق، الطبعة الثانية دار علاءالدين، (دمشق:٢٠٠٦).

٥. أبواليزيد على المتيت: تطور الفكر السياسي، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر، (القاهرة: ١٩٧٠).

٦. ابن الاثير أبي الحسن علي بن أبي الكرم محمد بن بن عبدالكريم بن عبدالواحد الشيباني المعروف بإبن الاثير الجزري الملقب بعزالدين: الكامل في التاريخ، تحقيق أبي الفداء عبدالله القاضي، الطبعة الرابعة، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٣)، المجلد الاول.

٧. احمد زماني: بحوث حول النظام العسكري في الاسلام، الطبعة الاولى، الدار الاسلامية للطباعة والنشر والتوزيع، (بيروت: ١٩٩١).

٨. أحمد محمود صبحي: في فلسفة الحضارة، الحضارة الاغريقية مؤسسة الثقافة الجامعية، مطبعة الوادي، (الاسكندرية: د.ت)، الجزء الاول.

٩. ادون ڤن: ارض النهرين، ترجمة الاب انستاس ماري الكرملي والاب لويس مرتين الكرملي، مطبعة المعارف، (بغداد: ١٩٦١).

١٠. ارنولد توينبي: تاريخ البشرية، ترجمة نيقولا زيادة، الاهلية للنشر والتوزيع، (عمان: د.ت)، ج١.

١١. ـ: تاريخ الحضارة الهيلينية، ترجمة رمزي جرجيس، مراجعة صقر خفاجة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، مكبة الاسرة، (د.م: ٢٠٠٣).
١٢. اريك موزير: مدخل إلى التاريخ العسكري، ترجمة اكرم ديري وهيثم الايوبي، الطبعة الثانية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، (بيروت: ١٩٧٩).
١٣. أكرم ديري: آراء في الحرب الاستراتيجية وطريقة القيادة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، (بيروت: ١٩٧١).
١٤. اندرو روبرت برن: تاريخ اليونان، ترجمة محمد توفيق حسين، مطبعة التعليم العالي، (بغداد: ١٩٨٩).
١٥. اندرية ايمار وجانين اوبويه: تاريخ الحضارات العام(الشرق واليونان القديمة)، ترجمة فريدم. داغر و فؤاد ج.ابوريحان، عويدات للنشر والطباعة، (بيروت: ٢٠٠٣)، المجلد الاول.
١٦. اندري بارو: بلاد اشور نينوى و بابل ، ترجمة و تعليق عيسى سليمان وسليم طه التكريتي ،دار الحرية للطباعة ودار الرشيد للنشر ،(بغداد:١٩٨٠).
١٧. باقر ياسين: تاريخ العنف الدموي في العراق، الوقائع-الدوافع-الحلول، الطبعة الاولى، دار الكنوز الادبية، (بيروت: ١٩٩٩).
١٨. بسام العسلي: الاسكندر الكبير المقدوني(٣٥٦-٣٢٣ق.م)، الطبعة الاولى، (د.م:١٩٨٠).
١٩. بلوتارك: السير، ترجمة جرجيس فتح الله، الطبعة الاولى، دار اراس للطبعة والنشر، (أربيل: ٢٠٠٥).
٢٠. بيوارخنسي: الاثار في خنس واهميتها، الطبعة الاولى، دار اراس للطباعة والنشر، (ربيل:٢٠٠٦).
٢١. تشارلز الكساندر روبنصن الابن: اثينا في عهد بركلس، ترجمة انيس مريحة، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، (بيروت: د.ت).
٢٢. تغريد جعفر الهاشمي وحسن كعلا: الانسان تجليات الازمنة، تاريخ وحضارة بلاد الرافدين-الجزرية السورية، الطبعة الاولى، دار الطليعة الجديد، (دمشق: ٢٠٠١).

